٣٤٠

# چاوپێ خشاندنێك بەمێژووی جیهاندا





وەرگێرانی لەعەرەبی یەوە بۆ کوردی
رؤوف محمد زهدي

بەرگی دووەم ۞ ۱۹۹۰

لەسەر ئەرکی زانکۆی صلاح الدین لەچاپ دراوە

(السىر ئەركى زانكۆى سەلاحەدين لە چاپ دراوە)

بەشى دووەم

# چاوپێداخشاندنێك بە مێژوى جيهاندا

## جواهر لال نەهرۆ

لە عەرەبيەوە كراوە بە كوردى

وەرگێر

رۆوف محمد زهدى



١٩٩٠ بغداد

# مـاركســــيزم

## ١٦/شوبات/١٩٣٣

حەزم دەکرد لەنامەکەی پێشوومدا شتێـکـت لـەبـابـەت بـیـروبـاوەڕی مارکسیزمەوە بۆ باس کەم کەوا سۆشیالیستەکانی ئەوروپای پـێـوەخـەریـك بووبوو ، بەلام نامەکە درێژەی کێشا ئنجا دوام خست بۆ ئەم نامەیە ، ئەم شتە بەلایمنەوە ئاسان نییە ، چونکە شارەزای ئەم بیـروبـاوەڕە نـیـم ، لەواقیعدا شارەزاوزاناکان ، خۆیان لەم ئیشەدا ناکوکن و رێك ناکەون ئنجـا وەسفیکی تایبەکاری مارکسیزمت دەدەمی ، بەلای بەشە گرانەکانیـدا نـاچـم چونکە مەبەسم ئەوەنییە کە لەم نامانەدا وێنەیەکی تەواو ، دورو درێـژی ئەم کارەت پێشکەش بکەم.

پێم و تبوویت سۆشیالیستی گەلێك جورە ، گەرچـی هـەمـوویـان لـەنـاو خۆیاندا رێك کەوتوون لەسەر ئەوەی کەوا دەولەت دەسەلات داربیت بـەسـەر هۆکانی بەرهەم هێنانـدا ، وەکـو زەوی ، و زار ، و کـانـگـاکـان ، و کارگەکان ، و ئەوانەی لەم بابەتەن لەگەل هـۆکـانـی دابـەش کـردن ، و شەمەندەفەر ، و بانکەکان و ئەوانەی کە وەکو ئـەمـانـەن ، وە بـەنـدو حیکمەتیش لەمە ئەوەیە کەزەلامیك نەتوانیت ، هیچ هۆیەك و دامەزراوێـك لەمانە ، وەیا فرمانی خەلکی تر بەکاربێنیت بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی چونکە زۆربەی ئەم هۆیانە بەدەست چەند کەسێکەوەن بەکـاریـان دێـنـن ، وەسامانێکی زۆریان لێدەست دەکەوێت ، کەچی کۆمەلکـە بـەتـێـکـرایـی پەرێشانن ، وەجەماوەریش لەهەزاریەکی بێئەندازەدان ، دیسـانـەوە ئـەوی ئاشکرایە بەشێکی زۆر لەچالاکی خاوەن ئەم دامەزراوانە لەبەگژیـەکـتـریدا چوون و بەربەرەکانیکردنی یەکتریدا بەکاردەهێنرین ، خۆ ئەگەر لەجیاتـی ئەم جەنگەتاکیە (الحرب الفردية) رژێمێکی راست و ماقولی بەرهەم هێـنـان

و دابەش کردن بهاتایە کایەوە ، ئەوسا دەتوانرێت ، دەست بلاوی ، و بەفیرۆدان ، و بەربەرەکانی کوشندە نەمێنێت ، ئیتر باری نارەوایی لەدابەش کردنی ساماندا لادەچێت و ئەو جیاوازییەی کەهەیە لەنێوان چینەکانی میللەتدا خۆی دەشارێتەوە ، وە بۆیە پێویستە کە دەولەت دەست بداتە خۆمالیکردن (التأمیم) و رێکخستنی بەرهەم هێنان و دابەش کردن و کارەکانیتر ، واتە ئەم شتانە بەدەست میللەتەوە بێت ، نەك چەند کەسانێك ، ئامەیە بنەرەتی بیروورای سۆشیالیستی.

بەلام جۆری دەولەت و حوکومەت لەسۆشیالیستیدا ئەمەشیان شتێکی ترە پێویست ناکات ئێستە باسی بکەین گەرچی لەجێی خۆیدا گرنگە.

با ئیستە لەبیروورای سۆشیالیستیەوە بێینەوە سەر رێبازی هێنانەدی سۆشیالیستی. لێرەدا سۆشیالیستەکان لەناوخۆیاندا رێك ناکەون و جیا دەبنەوە ، دەشی بکرێن بە دوو بەشی سەرەکییەوە: یەکەمیان بروای بە گۆرانێکی پلە پلەی لسەرخۆ هەیە لەرێی بەرلەمانەکانەوە، ، حیزبی کرێکارانی بەریتانیاو (فاییە) کان لەمانەن ، دووەمیان بروای بە شۆرش هەیە ، و بروا بەسەرکەوتنی رێبازیبەرلەمان کەری ناکات زۆربەی ئەمانە مارکسیەکانن.

بەشی یەکەم لەکەم بوونەوەدان ، و بیهێز دەبن تەنانەت سۆشیالیستەکان لە ئینگلتەرەدا لەئازادەکان (الاحرار) و حیزبە ناسوشیالیستەکان زیاتر نزیك دەبنەوە ، بەم جۆرە دەتوانین بلێین سوشیالیستیەکەی ئەمرو سوشیالیستی مارکسیانەیە ، گەرچی مارکسیەکانیش لەئەوروپادا بوو بوون بەدوو بەشەوە ، بەشی رووسی لەلایەك ، وەسوشیالیستە دیموکراتیەکانی ئەلمانیاو نەمساش لەلایەکیترەوە ، ئەم سوشیالیستە دیموکراتیانە لەشوێنەکانی خۆیاندانەمان و لەکیسیان چوو ، سەبارەت بەوەی پشتیان کردە بیروباوەرەکەی خۆیان لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا ، و لەدوای جەنگەکەش ، ئنجا گەلێك لەسەرکردە بەپەرۆشەکانیان هاتنە رێزی شیوعیتی بەلام ئەوانەی مانەوە هەر بەدەسەلاتداری مابوونەوە بەسەر هەندێك لەنەقابەکانی کرێکاران دا ، لەئەوروپای رۆژئاوادا. بەلام شیوعیتی بەهۆی سەرکەوتنیەوە لەروسیادا هاتە پێشەوە ، ئەمرۆ شیوعیتی دوژمنێکی سەختی سەرمایەدارێتییە لەئەوروپاو لەهەموو جیهاندا بەگشتی.

ماركسێتی چییە ؟ بریتییە لەرێبازێك بۆلێك دانەودی مێژوو ، سیاسەت ، و ئابوری وژیان ، و خواستەكانی ئادەمیزاد ، بریتی لەنەزەرییەو ، بەرنامەیەك ، هەروها فەلسەفەیەكیشە هەموو كەل و قوژبنێكی چالاكی ئادەمیزاد دەگرێتەوە. وەتەقەلایەكە تاكو مێژوو بەرابوردوو ، و ئیستاو ، پاشەرۆژییەوە بكاتە رژێمێكی راست و دروست ، وەكو شتێكی موقەددەر ، كە لەناو ، دوو توی ، و قەدەكانیدا چارەنووسی تێدابێت ، بەڵام خەڵكی لەگوماندان كەژیانیان وەهاراست و دروست بێت بدم شێوەیە ، وەپشت بەرژێمێك و پەیرەوێك ببەستێت كەبریاری لەسەر درابێت واتە ئادەمیزاد چارەنووسی خۆی بەدەست خۆی بێت ، بەڵام (ماركس) هەروەكو زاناكان مێژووی كۆنی هێنایەوە ، و روونیكردەوە ، لەمەوە چەند ئەنجامێكی تایبەكاری لیدەرهێنا ، تەماشای كرد كە ئادەمیزاد هەر لە سەرەتای بوونییەوە ، لەتێكۆشاندایە لەپێناوی مانەوەیدا دژی سروشت و دژی ئادەمیزادی برای ، هەوڵیداوە شتێك پەیدابكات ، برسی نەبێت ، و پێداویستەكانی ژیانی خۆی مسۆگەركات ، هەرچەندە زەمان بەسەردا تێپەرێت رێبازی پەیداكردنی پێداویستیەكانی دەگۆرریت ، بۆیە (ماركس) بڕوای وابووە ، كە هۆكانی بەرهەم هێنانی ، بژێو (ئەوەی ژیانی پێوەبەندە) لەهەموو شتێك زیاتر ئادەمیزادو كۆمەلگەی پێوە خەریك بووە لەهەموو زەمان و شوێنێك دا ، ئیتر هۆكانی بەرهەم هێنان ، دەسەلاتی هەبوەو ، زاڵ بووە ، بەسەر هەرچ قۆناغێك لەقۆناغەكانی مێژوودا ، وبەسەر چالاكیو ، پەیوەندەكانی كۆمەڵایەتیدا دەسەڵاتدار بووە ، هەرچەندە ئەم هۆیانە گۆڕابن وپێشكەوتبن ئەوەندە مێژوو و كۆمەلگە گۆراوە. ئیتر تارادەیەك شوێن پێی ئەنجامی ئەم گۆرانانەمان هەلگرت ، و دوایكەوتین ، وەكو لەكاتێكدا كەیەكەم جار كشت وكال پەیدابوو ، گۆرانێكی گەورە بەسەر ژیانی ئادەمیزاد داهات ، كۆچەرەكان نیشتەجێ بوون ، دێهات و شاریان دروست كرد ، كەبەروبوومی كشت وكال زیادی كرد ژمارەی دانیشتوان و سامان زیادیان كرد ، وەكامەرانی پەرەیسەند ، هونەرو پیشەكان پەیدابوون ، لەووێنەو نموونانەی كەروون و ئاشكران ، پەیدابوونی شۆرشی پیشەسازییەكەوا جیاوازییەكی مەزنی لەژیان و

گوزەراندا پەیداکرد ، لەئەنجامی بەکارهێنانی ئامێرە زلەکان لەبەرهەم هێناندا ، هەروها گەلێك نموونەی تریش هەیە.

ئیتر قۆناغی گۆڕان بێشکەوتنی هۆکانی بەرهەم هێنان لە ماوەیەکی تایبەتیدا پێوەرە (مقیاس) بۆ گوران و پێشکەوتنی خەلکی لەو ماوە تایبەتیە لەمێژوودا ، خەلکی لەناو خۆیاندا لە پەیوەند بەستن دان ، لەسەر بنچینەی پێداویستەکانی بەرهەم هێنان ، و ئەو کردارانەی کە پێوەی بەندە ، وەکو گۆڕینەوە (المنایضە) ، و کڕین و فرۆشتن ، و ئاڵ وگۆڕی پارە ، و ماڵ و هیتری لەم بابەتە. ئەم هەموو پەیوەندایەتیە ، بوون ، و مەوجودیەتی قەوارەی ئابوری لەمەر کۆمەلگە پێك دێنێت ، ئنجالەسەر ئەم بوون ، و مەوجودیەتی قەوارەی ئابوریە ، یاسا ، و سیاسەت ، و نەریت و رەوشت و خو ، وەبیروباوەرەکان و گەلێك شتیتر دروست دەبێت ، بەم جۆرە (مارکس) باوەری وایە کە: گۆڕان و پێشکەوتنی هۆکانی بەرهەم هێنان ئەنجامەکەی گۆران ، و پێشکەوتنی ، بوون و مەوجودیەتی قەوارە ئابوریەکەیە ، کەوا ئەمیش لەلایەن خۆیەوە ، گۆڕان و پێشکەوتنێکی گونجاو پێك دێنێت لەیاساو ، بیروباوەرە سیاسیەکان و شتیتری وەکو ئەمانەدا.

(مارکس) دەنوارێتە مێژوو کەوا تومارێکە بۆ ناکوکیەکانی نێوان چینە جوربە جورەکان و دەڵێت:ـ (مێژووی کۆمەلگەی ئادەمیزاد بەرابوردوو ، ئێستا یەوە بریتییە لەناکۆکی چینایەتی) ئەوی دەسەلاتدارە بەسەر کۆمەلگەدا ئەو چینەیە کەوا هۆکانی بەرهەم هێنانی بەدەستەوەیە وچینەکانی تری پێ دەچە وسێنێتەوە ، وە لەسەر حیسابی چەوساندنەوە کە دەوڵەمەند دەبێت ، چینە رەنج کێشەکانی بەرامبەر بەرەنج کێشانیان وایان نادرێتێ ، و پێ رەوا نابیژێت بەلکو ئەوەندەیان دەدرێتی کە لەبرساندا نەمرن ، و کەمترین پێداویستیان جێبەجێ بکات ، کەچی زیادیەکەی کەرەنجی ئەمان دوروستی دەکات ، دەچێتە لای چینە چەوسێنەرەوەکە ، تاکو زیاتر دەوڵەمەندتر بێت. دام و دەزگای دەولەت بەدەست ئەم چینەوەیە کە هۆکانی بەرهەم هێنانی بەدەستەوەیە ، کەوا ئەرك و پێویستی سەرشانی دەولەت ، وایلێدێت دەبێتە پاراستنی ئەم چینە وەیا وەکو (مارکس) دەڵێت:ـ "دەولەت بریتییە لەلیژنەی راپەراندن ، بۆ پارێزگاری

بەرژەوەندیەکانی چینە فەرمان رەواکان بەگشتی". بۆ ئەم مەبەسە یاسا دەبەن ، بە هۆی پەروەردەو فێرکردن و ، ئاین و هۆکانی ترەوە خەڵکی بەلای خۆیدا دێنێت ، وە دەیان خاتەسەر ئەو باوەرە کە گوایا دەسەلاتی ئەم چینە مافێکی رەوایەو ، کارێکی سروشتیو دروستە. تا لەتواناى دابێت هەموو هەولێك دەدات لەرێی ئەم وەسیلە ، و رێبازانەوە سەر لەخەلکی بشێوێنی ، وەراستیو حەقیقەتی ئەو حوکومەتەو ، یاساکانی لەخەلکی گوم کات و ، بیشارێتەوە ، تاکو چینە چەوساوەکان و رەنج کێشەکان پەی بەراستی نەبەن ، و تێی نەگەن و هەستی پێنەکەن. نەوەکو وەرس ، و هەراسان ببن ، خۆ ئەگەر یەکێك راستیەکەی زانیو لێی وەرس ، و هەراسان بوو ، وە هەرەشەو گورەشەی لەبوونی رژیمە کە کرد ، ئیتر بە دوژمنایەتیکردنی کۆمەلگەو رەوشت ، و دەستور ، و نەریت تاوانبار دەکریت ، وەدەفەوتێنرین.

بەلام هەرچەندە هەول وتەقەلایەکی مەزن بدرێت بەتەنها ناتوانێت ئەم چینە بهێلێتە وەلە فەرمان رەواییدا ، چونکە هەر ئەو هۆیانەی کەیارمەتیدا ، و دەسەلات و چەوساندنەوەی خەلکی تری دایە وپێبەخشی ئێستاکە هەر ئەم هۆیانە کنە دەکات لەبنھێز بوونیدا ، ئەم چینە بۆیە توانی دەسەلات وەرگریو بچەوسێنێتەوە چونکە زال بوو بەسەر هۆکانی بەرهەم هێنانی ئەوسادا ، کەوا هەبوون ، ئیتر کەهۆی بەرهەم هێنانی تازە پەیدابوو ، هەمان دەستور چینی تازەیشی لەگەلدا پەیدا دەبێت کەوا نایەوێت لەژێر گرانباری چەوساندنەوەدا بنالێنی ، ئنجا بیروراى نوێ مێشك و بیرکردنەوەی خەلکی دەجولێنی ، وەشۆرشێکی بیرورا لەناویاندا هەلدەگیرسێنێت ، کەوا کۆت و سنوری بیروراو ، باوەرە کونەکان دەشکێنی ئنجا ناکوکیو هەرا لەنیوان چینە بیکەیشتوەکەو ، چینە کونەکەدا بەریا دەبیت ، کە دەترسیت جلەوی بەدەستەوە نەمێنێت ، بێگومان چینە پێگەیشتوە کەسەر دەکەویت ، چونکە هۆ نویکانی بەرهەم هێنانی بەدەستەوەیە ، بێگومان چینە کۆنەکەش کەوالە مێژوودا دەورێکی بینیوە ، دەپوکێتەوە ، و بەرەو نەمان دەچێت.

سەرکەوتنی چینە نوێکە ، باری ئابوری ، و سیاسی دەگرێتەوە ، ئەمە بریتییە لەسەرکەوتنی هۆ نوێکانی بەرهەم هێنان ، ئنجا دوابە

دوای ئەمە گورانێك لەتان و پۆی کۆمەلگەدا بە تێکرایی لەرووی فیکریو سیاسی ، و یاسایی ، نەریت و رەوشت و شتی ترەوە پەیدا دەبێت ، ئیتر ئەم چینە نوێیە ، دەبێتە چەوسێنەرەوەی چینەکانی خوارخۆی ، تاکو دوای خۆی چینێکی تر دێتەجێی ، ئنجا تێکۆشان هەر بەردەوامە ، تاکو کۆمەلگە دەکاتە قۆناغێك کەوا چینێك ناتوانێت چینێکی تر بچەوسێنێتەوە ئەمەش کاتێك روو دەدات کە لە کۆمەلگەدا چینەکان نەمێنن ، تەنها چینێك دەمێنێتەوە ، ئیتر رێی چەوساندنەوە نامێنێت ، چونکە چینێك خۆی پێناچەوسێتەوە ، هەر ئەمەیە تاکە رێبازیك ، کەتەبایی ، و یەکسانی لەکۆمەلگە کەداپێك بێنێت ، وەیارمەتیدان جێگەی ناکۆکیو بەربەرەکانیەی کە ئێستا هەیە دەکرێتەوە ، بەم چەشنە ئەسبابی مانەوەی دەولەت لەپێناوی چەسپاندنی دەسەلاتیدا نامێنێت ، چونکە ئەو چینەی پێویستی بەپاراستن هەبوو ، بۆ بەردەوامی چەوساندنەوەکەی فەوتاو نەما ، ئەمەش کارێکی وا دەکات کەبوونی دەولەت پێویست نەبێت ، و بەرەو نەمان بچێت ، هەروها ئاواتی ئازاوەکەرەکانیش دێتەدی.

بەلای (مارکس)ەوە مێژوو بەم جۆرە بریتی بوو لەزنجیرەیەك لەناکۆکی ناچاری چینایەتی. (مارکس) بو ئەمە پشتی بەست بەگەنجینەیەکی مەزن لەوردە بابەت و نموونە ، تا بۆمان شیتەل و روون کاتەوە ، کەوا چۆن ئەم ناکۆکیە لەکار دابووە لەرابوردوودا ، وە چۆن رژێمی دەرەبەگایەتی ، گۆرا ، و بو بەسەرمایەداری لەئەنجامی پەیدابوونی ئامێرەکان وە پەیدابوونی بورجوازیەکانەوە ، لەجێگای چینی دەرەبەگ ، (مارکس) بروای وایە کە قۆناغی ناکۆکی چینایەتی ئێستا لەنێوان چینی بورجوازی ، و چینی کرێکاراندایە ، سەرمایەداری خۆی دەستی کردوە بەدروست کردنی ئەم چینەو پەروەردەکردنی ، وەسەرکەوتن هەر بۆ ئەم چینەیە ، کەوا کۆمەلگەیەکی سۆشیالیستی بێ چینایەتی تێدا دروست دەکات.

بیروراکەی (مارکس) دەربارەی مێژوو پێی دەوترێت (نەزەرێیەی مادی لەمەر مێژوو) بۆیە پێدەوترێت (مادی) چونکە (مثالی) نەبوو ، ئەمیش وشەیە کە فەیلەسوفەکان بۆ مانایەکی تایبەتی لەزەمانی (مارکس)دا بەکاریان هێناوە. خەلکی بەبیروباوەری گۆرانکاریەوە خەریك بوون و

بەدڵیان بووە ، هەروەکو پێشتر پێم وتبویت (داروین) دەربارەی بنەچەی فرەچەشنەکان (اصل الأنواع)و گۆڕانیان ، تێگەیشتنی ئەمەی لای خەڵکی ئاسان کردبوو ، بەڵام (داروین) لەبابەت پەیوەندەکانی نێوان ئادەمیزاد ، بۆی لێك نەدرابوەوە ، وە بەلایدا نەچوو بوو. هەندێك لەفەیلەسوفەکان ویستیان پێشکەوتنی ئادەمیزاد بەبیروڕای (مثالی)یانەی نەناسراو ، لەبابەت پێشکەوتنی عەقلی ئادەمیزادەوە لێك بدەنەوە ، (مارکس) ئەم تەقەلا (مثلی)یە بۆشانەی بەدڵ نەبوو ، بەرهەڵستی کرد ، وە هەڵەی ئەم جۆرە بیروڕایەی ئیسپات کرد ، وەبڕوای وابوو ، کەوا مەترسییەکی تێدایە ، چونکە خەلکی والیدەکات بیر لەشتی خەیالی بکاتەوە ، وە وایدانێت کەئەمە راستیە کە شایانی سەلماندنە. (مارکس) بەشێوازێکی زانیارانە لەرووداوەکان کولیەوە ئەمەیە مانای (مادیەت).

(مارکس) هەمیشە باسی چەوساندنەوەو ، ناکۆکی چینەکانی دەکرد ، گەرچی زۆربەی ئێمە رق و قینی لەدەست درێژی کردنی دەوروبەرمانە ، (مارکس) دەلێت پێویست ناکات بەرق هەڵسان و بەئاموژگاری چاکە لەبابەت ئەم کارانەوە چونکە ئوبالی چەوساندنەوەکە بەئەستۆی چەوسێنەرەوەکە نیە ، چونکە زال بوونی چینێك بە سەرچینەکانی تردا ئەنجامی گۆڕانێکی میژوویی بووە. وە رۆژێك لەرۆژان رژێمێکی تری دێتە جێگە. خۆ ئەگەر کابرایەك لەچینی چەوسێنەرەوان بوو ، خەلکی تری چەوساندەوە ئەم گوناهێکی وای نیە کەشایانی‌جنێوبێت لەسەری چونکە ئەم تەنها ئەندامێکە لەرژێمێکی خراپدا. گەلێك جار تاکە زە لامیك و رژێمێك لەیەك جیاناکەیتەوە ، ئەمرۆ هیندستان لەژێرموتەکەی ئیستیعماری ئینگلیزییەوەیە ، ئێمە تالەتوانامانداپەبەرهەڵستی ئەم ئیستیعمارە دەکەین ئەو ئینگلیزانەی کەوا بارو ، زروف لەم رژێمەیەوە پێچاون شایانی سەرزەنشت نین ، چونکە ئەمانە تەنیا بزمارێکی رووتی بچوکن لەئامێرێکی زلدا ، ناتوانن بیگۆڕن وەیا بیجولێنن ، بێگومان هەندێکمان زۆر رقی لەرژیمی دەرەبەگایەتە لەهیندستاندا ، چونکە گەلێك زیان دەگەیەنێت بەچینە بێهێزە کە ، بەجۆرێکی ناشیرین دەیچەوسێنیەوە ، بەڵام ئەم واناگەیەنێت کەسەرزەنشتی دەرەبەگە گەورەکە بکرێت لەم رژێمەدا ، هەرهەمان شت لەرژیمی سەرمایەداریشدا ، دەبێت سەرزەنشتی رژێمەکە خۆی

بكرێت نەك سەرمایەدارەكان تاك ، تاك ، كەوا وا راهاتوین پیان بڵێـیـن (چەوسێنەرەوان).

بەڵام (ماركس) خۆی داوای ناكۆكی چینایەتـی نـەكـردوە ، بـەڵـكـو دەریخستوە كە ئەم ناكۆكییە هەر هەبوە. بۆیە هەموو مەبەسێكی لەكتێبی (سەرمایەدا) ئەوەبوە كەوا (یاسای ئابوری لەمەر كۆمەڵگە نوێ)كە دەرخات وەبەمەیان ئەو ناكوكییە توندو تیژە ئاشكرا كات كە لەنێوان چینەكـانـی كۆمەڵگەدا هەیە ، وە ئەم ناكۆكییەش گەلێك جار ئاشكرا نییە ، چونكـە چینە چەوسێنەرەوەكە هەمیشە هەول دەدات دەق و چۆنیەتی‌چینایەتیەكەی‌خۆی بشارێتەوە، بەڵام مەترسی ئەگەر رووی كردە ئەو رژێمـەی كـە هـەیـە ؛ ئیتر چینەكە پەچەكەی لادەداو ، رووی خۆی هەڵدەماڵێت ، لەم كاتەدا هەر چی سفەتی تایبەتی چینەكە هەیە ئاشكراو ، ناكۆكی چینـایـەتـی بـەرزە بلیس دەبێت ، هەروها دیمەنی دیموكراتیەت ، وە یاسـا ئـاسـایـیـەكـان نامێنێت ، و ئەم ناكۆكییە چینایەتیە ئەنجامی باش لەیەك نەگەیشـتـن و هاندانی هاندەرە (سەرسەریەكان) نییە هەروەكو هەندی كـەس دەی لـێـت بەڵكو لەناو كۆمەڵگەدا رەگی داكوتاوە ، ئنجا هەرچـەنـدە وشـیـاری ، و رۆشنبیری و ، رێك نەكەوتن لەنێوان بەرژەوەندیەكاندا زیاد بكات ئەوەندە ئەم ناكۆكییە چینایەتیە زیاد دەكات.

با بەراوردێك لەنێوان ئەم نەزەرییەی (ماركس) ، و بـاری ئـەمـرۆی هیندستاندا بكەین گەرچی حوكومەتی بەریتانیا دەڵێت كە گوایا حوكومڕانـی كردنی هیندستان لەلایەن ئەمەوە ، لەسەر مافێكی رەوا ، و دادپـەروەری ، و چاكە ، وبەرژەوەندی خەلكی هیندستانە ، بێگومان پیاوە كۆنەكانـمـان لەو باوەردابوون كەواتەی ئینگلیزەكان رەنگە هەندێك راستی تێدابێت بەلام بەرپابوونی بزوتنەوە یەكی راستەقینەی گەل كارێكی وای‌كرد كەفەسالی بەد و لەش و لاری رووتی دەركەوێت ، وە حـەقـە رەقـەكـە ، بـۆ هـەمـوان ئاشكرابێت كە ئەم حوكومرانییە پشتی بەنووكی رم بەستووە. ئیتر پەچـە نەخشاوەكە كەوتە خوارەوە ، و گفتارە شیرینەكان بـزر بـوون ، و یـاسـا دانرا بۆ دانانی سنور بۆ ئازادیە ئاساییەكانی وەكو ئازادی لەقسەكـردن ، و كۆبوونەوە ، و روژنامەگەریدا ، هەرچەندە شۆڕش بەهێزبێت ، ئەوەندەش تین هێنان بۆ خەڵك و پەلاماردان زیاد دەبێت ، ئەمەش كاتـێـك لـەبـاری

چۆنیەتی چینەکاندا روودەدات ، کەچینێك زۆر بۆ چینێکی تر دێنێت و هەڕەشەی لێدەکات ، ئا ئەمە ئەمرۆ لەولاتەکەماندا دەبینین کەچ حوکوم و بریارێکی دڕندانە بەسەر کرێکارو فەلاحەکاندا دەدرێت.

کەوابوو نەزەریە مێژووییەکەی (مارکس) کۆمەڵگە لەبارێکی هەمیشە گۆڕان و پێشکەوتندا دادەنێت کەچەقین ، وەستا نی بۆنیە ، کەرژێمێکی کۆمەڵایەتی جێی رژێمەکەی تر دەگرێتەوە ، هەرچەندێك تەگەرە و کۆسپی بێتەری ، ئیتر رژێمە کۆنەکە کاتێك دەفەوتی کە تەواو نەش و نمای کردبێت و پێگەیشتبت ، خۆ ئەگەر نەش ونمای کۆمەڵگەکە زیاتر بێت لەهی رژێمە کۆنەکە ، ئەوسا کۆمەڵگەکە لایدەبات و ، دای دەگەنێت ، هەروەکو چۆن یەکێك کراسێکی کۆنی شرکە پەکی جولانی دەخات ، ئاوا دایدەکەنێت و دەی گۆڕێت بەکراسێکی نوێی پان و پۆڕ.

(مارکس) سەیری کرد کە چارەنووسی ئادەمیزادەکە پاڵی پێوەناوە لەبەشداربوونی لەم گۆڕانکاریە مەزنە مێژووییەدا ، چونکە ئادەمیزاد قۆناغەکانی پێشووی بڕیوە ، و دوا قوناغی لەبەردەمدا ماوەتەوە ، کەئەمرۆ دەرکەوتووە بریتی لەقۆناغی ناکۆکی نێوان بورجوازیەت و چینی کارکەران. (باوای دانێن ئەمە هەر لەولاتە پیشەسازەکاندا کەسەرمایەداری تیایدا نەش ونمای تەواو کردووە رودەدات ، بەڵام ئەو ولاتانەی کەسەرمایەداری تێدا پێش نەکەوتووە ، هێشتا دواکەوتووە ، ناکۆکی تیایدا بەجۆرێکی جیاوازو نارێکە هەرچەندە هەندێ دیمەنی ناوکۆیی (مشترك) شیان هەیە ، سەبارەت بەلەیەك کەوتن و چنك دانە یەکتری بەرژەوەندییەکانی ولاتان خۆبەخۆی خۆیان). (مارکس) وتویەتی: تەنگ و چەڵەمە دوای تەنگ و چەڵەمە ، کێشە دوای کێشە روو دەکاتە سەرمایەداری تاکو سەرەنگری دەکات ئەمە بەهۆی کرداری راست کردنەوە ، و تەوازونەوە دەبێت کەلەکۆمەڵگەدا رەکی داکوتاوە. شەست ساڵ بەسەر نووسینەکانی (مارکس)دا رابورد ، سەرمایەداری لەم ماوەیەدا گەلێك تەنگو چەڵەمەی بری ، و هەرماوە ، بەڵکو زیاتر بەهێز بووە ، ئەمە جگەلە روسیا کەسەرمایەداری تیایدا ریشەکێش کرا. بەڵام من کە ئەم چەند دێرە دەنووسم دەبینم نەخۆشی لەهەموو لایەکی جیهاندا ، لەشتی سەرمایەداری

گرتۆتەوە ، و پزیشکەکان دەبینم سەردەلەقێنن هەروەك بێزاربووبن لەوەی کەسەرمایەداری دەردەکەی بەریبدات و چاك بێتەوە.

دەڵێن سەرمایەداری توانی تەمەنی خۆی درێژە پێبدا بەهۆی شتێکەوە کەبەخەیالی (مارکس) دا نەهاتوە لەچەوساندنەوەی ولاتە ژێر دەستەکان و موستەعمەرەکان لەلایەن دەولەتە ئەوروپاییەکانەوە پەیدابووە ، چونکە ئەم چەوساندنەوەیەمەوادی بەهێزکردن دەدا بەلەشی سەرمایەداری ، دیارە ئەمە لەسەر حیسابی چینە هەژارە چەوسێنراوەکەیە.

ئێمە گەلێك هاوار دەکەین لەبابەت چەوساندنەوەی هەژاران و کرێکاران لەلایەن دەولەمەندو سەرمایەدارەکانەوە سەبارەت بەبوونی رژێمی سەرمایەداری وە ئەمە دوبارە دەکەینەوە ، و دەی لێینەوە ، ئەمە راستیەکە هیچ گفتوگۆی لەسەرنیە ، گەرچی خەتاکە دەگەرێتەوە بۆ رژێمەکەی کەچەوساندنەوەکەی لەسەربنیات نراوە ، نەك بۆ تاکە زەلامە سەرمایەدارەکە خۆی ، با لەبیرمان نەچێت ئەم رژێمی چەوساندنەوەیە تەنها سەرمایەداری دروستی نەکردوە ، بەڵکو لەبەختی کرێکاران ، و هەژاراندا بووە ، لەهەموو چەرخێك و گشت رژێمەکاندا ، بەڵام سەرەرای ئەم چەوساندنەوەی سەرمایەداریتیە ، هێشتا ژیانی ئەم چەوساوانە ئەمرۆ گەلێك باشترە لەچاو چەرخەکانی پێشوودا ، گەرچی ئەمە وا نا گەیەنێت کەدستایشی سەرمایەدارێتیە چونکە ئەمە هێشتا شتێکی زۆرتیە.

گەوردترین مارکسیەت خوازی نوێ (لینین) بووە ، کەوا هەر لێکۆڵیندوە ، و بەوکردنەوە ، و روون کردنەوەی مارکسیەتەوە نەوەستاوە ، بەڵکو زۆر دڵسۆزیشی بووە وەهەموو ژیانی خۆیی لەپێناویدا بەخت کردوە ، لەگەڵ ئەمەشدا ئامۆژگاری کردوین کە لەو باوەرەدانەبین ، کە ناگونجێت بۆ دەستکاریکردن ، و گۆرانی بەبێ بار ، و زوروف. (لینین) لەراستیدا کاکل ، و جەوهەری مارکسیەتی دەزانی ، وەبروای پێکردبوو ، بەڵام ئامادە نەبوو ، کە وردە بابەتەکانی وەکو خۆی بهێلێتەوە ، و بیخاتە کار بە نەشارەزایی ، و بێ وشیاری ، لەهەموو جێگەیەکدا. (لینین) پێی وتووین: "ئێمە نەزەرییەی مارکس بە کارێکی تەواو ، بێ هەڵە دانانیین بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمەوە بریتیە لە بەردی بناغەلەو زانیاریە کۆمەلایەتیەدا کەپێویستە سۆشیالیستەکان ، بەهەموو لایەکدا بیگۆرن و

بیخەنە کار تاکو لەرێ ڕەوی ژیان بەجێنەمێنن ، ودبـاوەرمـان وایـە کـە ئەرکی سەرشانی سۆشیالیستە رووسەکانە بەتایبەتی ، کە بەهەڵسەنگاندن ، و تێگەیشتنی ئەم نەزەریە مارکسیەوە خەریك بن بەجۆرێکی تایبـە کـاری چونکە نەزەرییە یەکی گشتییە لەوانەیە لە ئینگلتەرەدا بەجۆرێکی جیاواز بەکاربهێنریت ، تاکو لەفەرەنسەدا ، وە لەفەرەنسـەدا جـیـاوازتـر ، تـا لەئەلمانیادا وە لە ئەلمانیادا بەکارهێنانی جیاواز تر بێت تا لە رووسیادا.

لەم نامەیەدا هەوڵم داوە ئاگـادارت کـەم دەربـارەی نـەزەریـەکـانـی (مارکس) بەڵام نازانم ئەم وێنە پەرپووتە کە بێشکەشم کردیت بیروڕایەکی روون و ئاشکرات دەداتێ لەبابەت نەزەریەکانی (مارکس) ەوە ، وا چـاکـە ئەم نەزەریانە بزانین ، چونکە ئەمرۆ بەخەیالـی گـەلـێـك پـیـاوان ، و ئافرەتاندا دیت ، ڕەنگە ببێتە یارمەت دەرێك بۆمان لەولاتـەکـەمـاتـدا ، میللەتی رووسی مەزن ، وەهەمو ، ولاتەکـانـی یـەکـیـەتـی سـۆڤـیـەت (مارکس)یان کردوە بەپێغەمبەرە گەورەکەی خۆیـان ، وە لـەم جـیـهـانـە شیواوەماندا گەلێك لەمیللەتان بەچاوێکی گەورەییەوە تەماشایان دەکەن ، سا بەشکو تێیان بگەیەنن کە چۆن چارەسەرێك بۆ مەینە تیەکانیان دەدۆزنـەوە وە ئەم نامەیە بەم سێ دێرە لەهەڵبەستی بویێژی ئینگلیز (تینسون) کۆتایی دێنم:

جیهان دەگۆڕێت ، جێی خۆی چۆڵ دەکات بۆ رژێمێکی تر
خوا بوونی خۆی بەگەلێك جۆر دەر دەخات
چونکە جیهان لەوێنەو بیستیکە بمێنێتەوە بێکەلك دەبێت.

# ئیمپراتۆریەتە شارراوەکەی ئەمریکا

**٢٨/شوبات/١٩٣٣**

شەرو شۆرەشەکەی ناوخۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵکی فەوتاند ، ئەرکێکی گران ، وقەرزێکی زۆری لەدوای خۆیەوە بەجێهێشت ، لەبەر ئەوەی کەولاتەکە هێشتا بدیاربو ، دەستکاری نەکرابوو ، وزە ، و توانایەکی چاکی هەبوو ، بۆئەش ونماو گەشەکردن ، کانگایەکی زۆری لە سەرچاوەکانی ساماتی سروشتی ، وە بەتایبەتی مەعدەنەکان تێدایە ، ئەو سی مادانەی زۆرە کە بڕبڕەی پشتی پیشەسازی نوێ ، و شارستانیتین ، وەکو خەلوز (خەلوزی بەرد وەرگێر) ، و ئاسن ، و نەوت ، وە توانای ئاوی تێدایە کە وزەی کارەبای پێدروست بکرێت ، وەکو تافگەکانی (نیاکارا).

ئەمەریکا ولاتیکی پان و بەرینە ، ژمارەی دانیشتوانیشی کەم بوو ، بۆیە رێیدا کەهەموولایەك لەم زروف ە و هەلکەوتە باشەی سوود وەرگرێت و ئەمەریکا بەرەوپێش بچێت ، وە ببێتە ولاتێکی گەورەی پیشەساز ، لەم رووەوە ئەمەریکا هەنگاوی خێرایـنا ، تاکو لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بەهاوشان و ، بەربەرەکانیگەری بەریتانیا لە لەبازارەکانی دەرەوەدا لەرووی پیشەسازیدوە. بەم جۆرە ئەمەریکاو ئەلمانیا بەجووت بەشداربوون لەفەوتاندنی دەسەلاتی بەریتانیا بەسەر بازارەکانی جیهاندا ماوەی سەد ساڵ.

لەهەموولایەکی جیهانەوە کۆچ کردوان رژانە ئەمەریکا ، لەئەوروپاوە: ئەلمان ،و ئەسکەندەنافیەکان ،ئیرلاندەییەکان ،ئیتالی ،جولەکە ،پولندەیی هاتن گەلێك لەمانە ، لەچنگ ستەم و زۆرداری سیاسی لەناو ولاتەکەیاندا

هەڵهاتبون ، ئەوانی تریان کە هاتبوون هەوڵیان دەدا ، ژیان و گوزەرانی خۆیان چاکترکەن ، ئەوروپا کەوا قەلەبالغ و دانیشتوانی زۆر بوویوو ، زیادیەکەی رووی کردە ئەمەریکا ، ئەم زیادیەش هەرەمەیەك بوو لەهەمەجەشن رەگەزو ، میللەت ، و زمان ، ئاینە جۆر بەجۆرەکان ، دوای ئەوەی کە هەریەکێك لەمانە لەجیهانە ئەوروپاکەی خۆیدا دەژیا ، دوور لەم جیهانەی ئێستای ، پێشی رق و کینەی دەخواردەوە ، لەوانیتر ، بەڵام خۆیان لەجیهانێکی نوێدا دی کە رێی کینەو کۆنە قینی تێدانەبوو. ئنجا پەیرەوی بەزۆر فێرکردن (التعليم الأجباري) یارمەتی ئەوەیدا کەرەوشتە نەتەوایە یتە کۆنەکە ، لەبوتەیەکی ئەمەریکاییانەی نوێدا ، دارێژێت و مشتومالْ کات ، ئەوانەی کە لەبنەچەیەکی ئەنکلوسکسونییەوە هاتبونە خوارەوە خۆیانیان بەئەرستوکراتی دادەنا ، وە پێشەوا کۆمەلایەتیەکان لەمان بوون دوای ئەمان ـ کەزۆر دوور نەبون لێ یانەوە ـ ئەوانە بوون کە لەسەرووی ئەوروپاوە هاتبون ، بەڵام ئەوانەی کە لەخوارووی ئەوروپاوە هاتبون بەتایبەتی ئیتالیایەکان لەوان بەنزمتر دادەنران ، وە بەچاوێکی سووك سەیر دەکران ، بەڵام قولە رەشەکان جیاوازبوون ، وەلەسرەی خوارووی کۆمەڵایەتیدا بوون ، هەرگیز تێکەڵ بەرەگەزی سپی نەبوون ، (چین)یەکان و (ژاپون)یەکان و هیندیەکان لە کەناری دەریای رۆژئاوادا دابەزین ، لەکاتێکدا کە زۆر پێویستی بەکرێکارو پالە هەبوو ، وە ئەم ئاسیاییانەش دیسانەوە زۆر جیاواز نەبوون.

بوونی شەمەندەفەرو تەلغراف (برقیە) بەشەکانی ئەم ولاتە پان و بەرینەی پێکەوە بەست ، کەجاران ئادەمیزاد بەچەندە هەفتەو مانگێك ئنجا دەیتوانی ولاتەکە ، لەم بەری کەناری دەریاوە تا ئەوبەری کەناری دەریا ببرێت ، پێشتر دیمان کە ئیمپراتۆرە مەزنە کان لەئاسیا ، و ئەوروپادا پەیدابوون ، بەڵام ئەم ئیمپراتوریەتانە ، بەیەکەوە نەبەسترابوون چونکە هاتوچو ، و بەیەك گەیشتن لەنێوان بەشەکانیدا زەحمەت بوو ، وەهەندێك لە بەشەکانی دەیتوانی جیا بێتەوە ، کە ئەگەر بەئارەزووی خۆی دڵسوز ، و مل کەچ نەبوایە بۆ ئیمپراتۆر ، بەم جۆرە ئیمپراتورەکان کۆمەڵێکی یەك نەگرتوو بوون گەرچی مل کەچی تەنها پیاوێك بوون ، بەڵام ولاتە

یەکگرتوەکانی ئەمەریکا سەبارەت بەشەمەندەفەرو هۆکـانـی تـری بـەیـەك گەیشتنەوە (وسائل المواصلات) ، لەگەڵ پەیرەوێکی یەك گرتووی پـەروەردە و فێرکردن ، توانی رەگەزە جۆربە جۆرەکان ئاوێتەی یـەگـتـرکـات ، وە میللەتێکی نوێی لێدروست کات ، گەرچی ئەم تێکەڵ بوونـەش هـێـشـتـا کۆتایی نەهاتوە. پێش ئەمە لەمێژوودا رووی نەداوە ، کەمیللەتانـی جـۆر بەجۆر بەم وێنەیە لەناو یەکدا بگونجێن.

ولاتە یەکگرتوەکە هەوڵیدا دوور کەوێـتـەوە لـەکـاروبـاری دەولـەتـە ئەوروپاییەکان و دەسیسەکانی ئەم دەولەتانەوە ، هەروها لەم دەولەتانەشـی ویست ، دەست نەخەنە ناو ئیش و کاری هەردوو ئەمەریکـاکـەوە ، کـچـم لەپێشدا باسی بیرو باوەرەکەی (مونرو) کە سەرەك جمـهـوری ولاتـە یـەك گرتوەکە بوو ، وە ئەم دای نابوو بوم کردیت تاکو نەهێلـێـت دەولـەتـە ئەوروپاییەکانی بەتایبەتی دەولەتەکانی یەکیەتیە پیـرۆزەکـە (الاتـحـاد المقدس) دەستی بخەنەکاروباری ناوەوەی ئەمەریکا ، وەیا دەست بێنن بـۆ ئیمپراتۆریەتی ئەسپانیا ، (مونرو) بڵاوی کردەوە ، ولاتە یەکگرتوە کەری نادات بە هیچ دەولەتێکی ئەوروپا بەهۆی سوپاود دەیست بخاتە کـاروبـاری قارەی ئەمەریکاوە ، ئەم بیروباوەری (مونرو)یە جمهوریەتـە سـاواکـانـی ئەمەریکای لەئەوروپا پاراست ، تەنانەت ئەوەندەی نەمابوو کە ببێتە شـەر لەگەڵ ئینگلتەرەدا ، لەگەڵ ئەمەشـدا ئـەمـەریـکـا تـا سـەد سـاڵ ئـەم بیروباوەرەی بەرنەدا.

جمهوریەتەکانی خوارووی ئەمەریکا زۆر جیاواز ترن لەجموریەتـەکـانـی سەرووی ئەمەریکا ، بەو سەد سالە هێشتا ئەم جیاوازیە هەرماوەتـەوە ، و نەفەوتا ، هەرچەندە (کندا) کەوتۆتە سەرووی ولاتەیەکـگـرتـوەکـەوە رۆژ بەرۆژ ، زیاتر لێی نزیك نزیك دەبێتە وە ، وپەی دەکات. پێـم وتـیـت کە: جمهوریەتەکانی ئەمەریکای(١) خواروو بەجمهوریەتی (مکسیك) یشـەوە کە بەرئەمەریکای سەروو دەکەوێت ، پێان دەڵێن (جمهوریەتە لاتینی)یەکـان بەڵام لەناو سنوری ولاتە یەککرتوەکان و (مکسیك)دا دوو میللەتی جـیـاواز هەن لەرووی نەتەوایەتی ، و رۆشنبیریەوە. جمهوریەتەکانی ئـەمـەریـکـای خواروو ، کەوتونەتە خوارووی ئەمەریکای ناوەراستەوە ، کەوا خەلکـەکـەی

بەزمانی ئەسپانی ، و پورتەغالی قسە دەکەن ، زمانی ئەسپانی زیاتر لەوێدا بەکار دێت ، چونکە وا بزانم زمانی پورتەغالی تەنها لە (برازیل)دا بەکار دەهێنرێت ، ئەمەریکای لاتینی ، لەبارەی رۆشنبیرییەوە دەنوارێتە ئەسپانیا لە مەوە گیانی رۆشنبیری وەرلدەگرێت ، بەلام جیاوازی رەگەزایەتی (التفريق العنصري) ، وەیا رەگەزپەرستی لێرەدا کەمترە لەچاو ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو کنداد ، بەهۆی ژن ، ژن خوازەوە لەنێوان ئەسپانیا بیەتیشتەجێکان و هیندیە سوورەکان دا ، دانیشتوانی ئەسلی ئەوێن - وە تارادەیەکیش قولە رەشەکان - نیکەلاوییەکی نوێ پەیدابووە.

هەر چەندە سەد ساڵ بەسەر سەربەستی جمهوریەتەکانی ئەمەریکای لاتینیدا تێپەریوە ، باری سیاسیان دامەزراو نییە ، بەڵکو جاروبار شۆڕش و دیکتاتوریەتی سوپایی بەهەمیشە تێدا روودەدات زەحمەتە بزانین هۆی گورانە بەردەوامە سیاسی ، و حوکومەتیەکان لەوێدا چێیە ، (أرجنتین و برازیل و شیلی) لەجمهوریەتە گەورەکانی ئەوین ، گەرجی (مکسیك)یش کەوتوتە ئەمەریکای سەرووەوە دیسانەوە پێشەنگی ولاتە لاتینیەکانی ئەمەریکایە.

ولاتە یەکگرتووەکە ، ئەمەریکای لاتینی پاراست لەدەست خستنە کاروباریانەوە لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە ، بەهۆی بیروباوەری (مونرو)وە ، گەرچی ولاتەیەك گرتوەکە خویشی دوای ئەوەی دامەزراو ، و فراوان بوو ، دەگەرا بۆ جێگەی تازەو ، پان و بەرین ، ئیتر چاوی بڕییە ئەمەریکای لاتینی ، بەلام هەوڵینەدا ، کە ئیمپراتوریەتیك بەرێبازە کونەکەی ئیستیعمار دا بنیات بنیت ، بەڵکو روو یکردە برکردنی بازارەکان لەگەل وپەل ، ئنجا پارەو سەرمایەکانیشی بەکارهێنا لەراکێشانی هێلی شەمەندەفەرو کانگاکان (المناجم)و کارو فرمانەکانی تردا ، پارەی بەقەرزدەدا بەحوکومەتە شەر کەرەکان لەکاتی بەرپابوونی شۆڕشەکاندا ، هەرچەندە ئەوانەی بەم کردەوانە هەڵدەستان سەرمایەدار ، و خاوەن بانقە ئەمەریکاییەکان بوون ، بەلام حوکومەتی ولاتە یەکگرتوەکە لەپشتیان بوو ، وەپشتی دەگرتن ، خاوەن بانقەکان بەهۆی قەرز پێدانەوە ، و بەکارهێنان

و دامەزراندنی بارەکانیانەوە توانیان دەسەلاتیان بسەپێنن بەسەر گەلێک لەجمهوریەتە بچوکەکانی ئەمەریکای ناوەراست[٢] ، و ئەمەریکای خوارووداوە توانیان شەرو شۆر هەلگیرسین ، و ئاشوب بەرپاکەن ، چونکە پارەیان دەدا بەلایەك وەبەلایەکی تریان نەدەدا ، لە پشت خاوەن بانقەکان و سەرمایەدارەکانەوە حوکومەتی مەزنی ئەمەریکا هەبوو کە حوکومەتەکانی خواروو ، بەرامبەری بچوك و بێهێزبوون هەندێجار حوکومەتی ئەمەریکاش لەشکرەکانی خۆیی دەنارد بە بیانووی پارێزگاری لەرژێم.

ئیتر سەرمایەدارەکان بەم رێبازەدا توانیان بەسەر جمهوریەتە تازەکان ، و بانق وشەمەندەفەرو ، کانگاکاندا زاڵ بن وە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان بێنن ، دیسانەوە دەسەلاتیان گەیشتە جمهوریەتە گەورەکانیش سەبارەت بەبەکارهێنانی پارە ، و داراییان ، وە دامەزراندنی لەوێدا ئەمەوا دەگەیەنێت کە ولاتە یەکگرتوە کە سامانی ئەو ولاتە وەیا زۆربەی بۆ لای خۆی کێشەوە دەکات ، بێئەوەی کە بەزەبری لەشکر داگیری کات ، ئەم دیمەنە پێویستی بەتێبینیەکی ورد هەیە چونکە مانای پەیدابوونی ئیستیعماریکە بە شێوازێکی نوێ ، ئەمە ئیمپراتۆریەتێکە نابینرێت ، پشت بەئابوری ، و چەوساندنەوە دەبەستێت ، ئنجا دەسەلاتی خۆی دەچەسپێنێت بێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر کۆنە رێبازە ئاشکراکەو لەسەری بروات جمهوریەتەکانی ئەمەریکای خواروو ، ولاتێکی ئازادو سەربەستن لەرووی سیاسیو نیو دەولەتانەوە ، تەنانەت لەسەر نەخشەوا دەردەکەون ، هەروەکو ولاتێکی مەزن و ئازادبوو ، وان لەچنگی بێگانە کەچی لەراستیدا زۆربەیان لەژێر دەستی ولاتە یەکگرتوە کە دان.

بەچاوپێداخشاندنمان بەمێژوودا گەلێك چەشن لە ئیمپراتوریەتەکان لەچەرخە جۆربەجۆرە کاندا دی. سەرکەوتنی میللەتێك بەسەر میللەتێکی تردا مانای وابوو سەرکەوتوو ، ولاتی بەزیوەکەی داگیر دەکرد ، وە دانیشتوانی بەدیل دەگرت ، ئەوسا رەوشت و کردەوە وابوو! هەروەکو لەتەوراتدا هەیە کەوا جولەکەکان بەدیل گیران ، چونکە بابلیەکان لەجەنگدا بەزاندیانن ئیتر گەلێك نموونە، و وێنەی تریش هەیە ، ئەم ئیش و کردەوەیە وردە وردە گۆرا ، تاکو بوو بەجەنگ کە لەئەنجامیدا زەوی ، و خاك داگیر دەکرا بێ ئەوەی خەلکەکەی بەدیل بگیرێت وەیان بەخسیربکرێت چونکە

سەرکەوتوو ، وای بەقازانج تر دەزانی بۆ خۆی ، کە بەهۆی باج و چەوساندنەوەکانی ترەوە بە پارە ، وماڵ سوودیان لێوەگرێت ، تائێستاش ئەم جۆرە ئیمپراتۆریەتانە هەر هەیە وەکوئیمپراتوریەتی بەریتانیا لە هیندستاندا. لەوانەیە بەیادماندابێت ، کە ئەگەر بەریتانیاییەکان لە رووی سیاسیەوە بەسەر هیندستاندا زاڵ نەبوایە هیندستان وڵاتێکی ئازاد دەبو بەڵام ئەم جۆرەیان لە ئیستعماری سیاسی ، ئیستیعمارێکی زۆر پێشکەوتو ترو ، وزیاتر بەدوای خۆیدادێنێت ، ئەم ئیستیعمارەیان پێویستی بە داگیرکردنی خاکی وڵاتە بەزیوەکەنی یە ، بەڵکوهەرسامان ، وەیا سەرچاوەکانی بەرهەم هێنان لەوڵاتدا داگیردەکات ، هەربەهۆی ئەمانەیە ، ئیتر بەمە دەتوانێت ئەم وڵاتە بۆ بەرژەوەندی خۆی تا دوایی بچەوسێنێتەوە وە دەسەڵاتی خۆیی بەسەردا بسەپێنی ، ولە هەمان کاتیشدا ، ئەرك و زەحمەتی حوکومرانی ئەو وڵاتەو سەرشۆڕکردنی بۆدەمێنێتەوە لە ئەنجامدا ، ئەمەدا هەموو ، وڵاتەکەو خەڵکەکەی بەبێ ماندوو بون دەکەوێتە ژێردەستی بێگانەوە بەم رەنگە شێواز و رێبازی ئیستیعماریش گۆڕا بوو بەئیستیعمارێکی نوێ بەجورێکی ئابوریانەو شاراوە ، خەڵکی وایار دەزانی کەنەمانی بەنوایەتی راستەقینەو ، دبلیتی دەربەگایەتی ئازادیان بۆ ئادەمیزاد هێناوەتەدی. کەچی خەڵکی بۆیان دەرکەوت کەوا هێشتا ژێردەستەی تاقم و بەرە یەکی تری خەلکن کەدەسەڵاتدارن بەسەرپارەو ماڵە بەمە خەلکی تریان دیل کردوە بەنرخێکی هەرزان ، وەئازادی دوورە لەئادەمیزادو گەلێك لەوڵاتانی تری جیهانەوە ، زۆربەی خەڵکی وادەزانن کە نەمانی دەسەڵانی سیاسی بێگانە بەرونی لەهەروڵاتێکدا ئازادی دەبەخشێت و مسوگەر دەکات ، بەڵام ئەم جۆرە بیر کردنەوەیە راست نیبە ، مادام وڵاتە سەربەخۆکە لە رووی سیاسیەوە هەر ژێر دەستەی ئابوریانەی وڵاتێکی تربێت ، ئیتر ئیمپراتوریەتی هیندستان بۆ ئەمە نموونەیەکی روون و ئاشکرایە ، چونکە بەریتانیا دەسەلاتێکی سیاسی بەسەر بەشێکی هیندسناندا هەیە ، کەچی دەسەڵاتی ئابوریانەی تەواوی بەسەر گشت هیندستاندا هەیە. لەوانەیە بەم زووانە دەسەلاتی سیاسی بەریتانیا نەمێنێت بەڵام دەسەلاتی ئابوریانەی نەبینراوی هەر دەمێنێتەوە ، خۆ ئەمە ئەگەر هەروابێت ، مانای وایە چەوساندنەوەی هیندستان لەلایەن بەریتانیاوە هەرماوە.

ئیستیعماری ئابوری لەهەموو جۆرەکانی تری ئیستیعمار ، بڕئەرك ترە بۆ ئیستیعمار گەر چونکە رق و کینەیەکی توندو ، تیژ بەرامبەر ئیستیعمارکەران دروست ناکات ، ئەمەش سەبارەت بەوەیە کە خەلکی نایبینن ، خۆ ئەگەر زیفی سەندو خەلکی هەمستیان بەپێوەدانی جزوەکەی کرد ، ئەوسادە وروزین و رقیان لێی هەڵدەستێت ، بەم جۆرە گەلانی ئەمەریکای لاتینی ولاتە یەکگرتوەکەیان خۆش ناوی ، و دەدزی. گەلێك تە قەلادراوە بۆپێك هێنانی بەرەیەك لەمیللەتانی ئەمەریکای لاتینی ، بەلام تائێستا سەرنەکەوتووە ، تاکو ئەم دەولەتانە دەست بەرداری کۆدەتاکانی ناخو ، و (الأنقلابات الداخلیة) و ناکۆکیە بەردەوامەکانیان نەبن.

ئیستیعماری ئاشکرای ئەمەریکا درێژ بوتەوە ، تاکو دورگەی (فیلیبن). لە نامەیەکی پێشتردا پێم وتیت کەوا ئەمەریکا چۆن ئەم دوورگانەی گرت. دوای شەرو شور لەگەڵ ئەسپانیادا. ئەو جەنگەی کە ساڵی ١٨٩٨ زاینی بەهۆی دوورگەی کوبا . وەکە لەدەریای ئەتلەسیدایە بەریا بوو ، کوبا(٣) بەناو سەربەخو بوو ، بەڵام تائێستە کوبا ، و دوورگەی هایتی لەژێر دەسەڵاتی ئەمەریکادان.

دوانزە ساڵی لەمەوبەر نۆکەندی (باناما) هەڵکەندرا ، بەشێکی تەنگەبەر لەخاکی ئەمەریکای ناوەڕاست دەبرێت ، دەریای ئەتلەسی دەگەیەنێت بەدەریای باسنیکی ، پێش پەنجا ساڵ (فردیناند دیلیبس) ئەو ئەندازیارەی کە نۆکەندی (سویس)ی هەڵکەند نەخشەی ئەم نۆکەندی (باناما)یەشی کێشا ، بەڵام لەپرۆژەی نۆکەندی (باناما)دا سەرنەکەوت ئنجا ئەمەریکاییەکان هەڵیان کەند ، هۆی سەرنەکەوتنەکەش بڵاوبوونەوەی لەرزوتاو ریشانەوەبوو لەوناوچەیەدا ئەمەریکاییەکان میشوولەی لەرزوتا و گەلێك جرو جانەوەر کەنەخۆشی بڵاودەکەنەوە لەناویان برد ، ناوچەکەی لەبارەو ساغ کردەوە بۆ هەڵکەندنی نۆکەندەکە. نۆکەندەکە لەخاکی جمهوریەتی بچکۆلەی (باناما) دایە ، گەرچی نۆکەندەکەو جمهوریەتەکەش بەجووت لەژێر دەستی ئەمەریکادان ، ئەم نۆکەندە هەرچەندە ئەوەندەی نۆکەندەکەی (سویس) گرنگ نییە بەڵام بۆ ئەمەریکا زۆر گرنگ و بەبایەخە چونکە لەئەرکی گەڕانی کەشتیەکانی ئەمەریکا بەدەوری ئەمەریکای خوارووەدا کەم دەکاتەوە.

ولاٚته یەکگرتوەکە لەگەشەکردندا بەردەوامە ، لەهێزو ، دەولەمەنـدی ، و بەرهەم هێنانی کەل وپەلدا لەزیادیە ، وە ملیونێرانی گەلێك تێدایـە ، هەروها بالاخانەی بلندا کەسەریان گەیشتۆتە هەور تیایدا دروست کـراوە ، لەئەسبابی مەدەنیەتوشارستانینیدا بەئەوروپا گەیشتووە ، و سەریش کەوتوە بەسەریدا ، وەبوە بەیەکەم دەولەتی پیشەساز لەجیـهـانـدا رادەی ژیـان و گوزەرانی کرێکاران لەوێ ، لەهەموو ،ولاتێکی بەرزترە ، وەسەبارەت بـەم خۆشیو کامەرانیـیە ، هەروەکو لەئینگلتەرەدا لەسەدەی نۆزدەهەمدا رووی دا جێی نەزەریەکانی سۆشیالیستیو رادیکالی(٤) نابمێـتـەوە. بـزوتـنـەوەی کرێکاران لەئەمەریکادا (جگەلە هەندێ حالات) زۆر مام ناوەندیو هێمن بووە ئەمە شتێکی سروشتـیـیە چونکە داهاتی (دخل) کرێکاریکی ئەمەریکایی باش بووە بۆیە پێویستی بەسەرجلی وجەربەزەیی نەبووە ، تا ئەوی هـەیـەتـی بەفیرۆی بدات لەپێناوی شتێکی نەبەدیو ، غەیبیدا ، زۆربەی کـارکـەران لەئیتالیاییە کان بوون ، لەئاشوب ، ئاژاوە ،وبێهێزیدا دەستێکی بالایـان هەبوو بۆیە کەس رێزی لێنەدەنان. بەلاٚم ئەوکرێکارانەی کەحالیان لـەمـان باشتر بوو ، لەمان جێگەیان بەرزتر بوو.

لە ئەمەریکادا دوو حیزب بەمیوابوون ئەم دوانەش حیزبی جـمـهـوری ، حیزبی دیموکراتیە ئەم دوو حیزبەش (وەکو دوو حیزبەکەی بەریـتـانـیـاو-ابوون) نوێنەری چینی دەولەمەندی خەلکی بوون لەبـیـروورای سـیـاسـیـدا جیاوازیەکی سەرەکیان نییە.

ئەمە حال و بالی ئەمەریکا بوو ، لەکاتێکدا کە بوری جەنگی یەکەمی جیهانی لێدرا کەوا ئەمەریکای بەرەو گیژاوێکی شەرو شۆر برد.

---

١) جمهوریەتەکانی ئەمەریکای خواروو بریتیە لەم ولاتانە:

١) غیانای بەریتانی ٢) غیانای هۆلاندی ٣) غیانای فەرەنسـی ، ٤) فنزویلا ٥) کۆلومبیا ٦) اکوادور ، ٧) بـیـرو ، ٨) بـولـیـفـیـا ، ٩) باراغوای ، ١٠) اوراغوای ، ١١) ارجنتین ، ١٢) برازیل ١٣) شیـلـی ـ وەرگێری کوردی.

٢) ئەمەریکای ناوەراست کەوتۆتە ناوچەی ئیستیوا لەسەر هێڵی پان (خط العرض)ی ١٠ تا ٢٠ پلە لەسەرووەوە ، وەبریتییە لەم وڵاتانە:ـ هیندو راسی بەریتانیا ، گواتیما ، سلفادور ، هیندوراس نیگاراکوا ، کوستاریکا و باناما ، جگە لەچەند دورگەیەکیش کە لە دەریای (کاریبی) دان گەورە ترینیان دورگەی کوبایە ، ئنجا هاینی ، و جامایکاو گەلێك و ردە دورگەی تر. (کولومبوس) کە ئەمەریکای دۆزیەوە یەکەم جار تووشی ئەم دورگانە هات ـ وەرگێری کوردی.

٣) کوبا ـ دورگەیە کە لە دەریای (کاریبی)دا ئێستا لەژێر دەسەڵاتی سیاسیو ئابوری وڵاتە یەکگرتوەکەدا نەماوە ، بدتەواوەتی سەربەخۆیەو رژێمێکی سۆشیالیستی تیادا حوکوم فەرمایە ، وە بوە بەمەشخەڵێکی ئازادی بۆ ئەوناوچانە ـ وەرگێری کوروی.

٤) رادیکالی ـ ئەمە وشەیەکی بێگانەیە ، مانای پەیرەوی ئازادیخوازە توندو تیژەکانە . وەرگێری کوردی.

# داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە

## ١١/مارت/١٩٣٣

لەنامەکەی پێشووتردا باسی ئەمەریکام بۆ کردیت ، وە لەنامەیەکی تریشدا لەدەریای ئەتلەسی پەریمەوە بۆ (ایرلندە) ئێستە دەچم بۆ قارەیەکی سێیەم باسی قوربانیەکی سێیەم دەکەم لە قوربانیەکانی ئیستعماری بەریتانیا ، کە ئەویش (میسر)ە ، لەنامەکەی هەرەپێشودا مێژووی کۆنی (میسر)م دەرخست ، وە بەقوولی بۆی نەچووبووم ، چونکە شارەزاری بابەتەکە نەبووم ، خۆ ئەگەر لە مەش زیاتر شارەزا بوومایە ، نەم دەتوانی باسەکە بگێڕمە دواوە بۆ ئەو ماوەسەرەتاییە لەمێژوو ، دوای ئەوەی کە لەگەڵیدا هاتم بەرێدا ، تەنانەت ئەوەندی نەمابوو ، کۆتایی بە گێڕانەوەی کارەساتەکانی سەدەی نۆزدەهەم بینم و ، لەبەردەرگای سەدەی بیستەمدا بوەستم ، وەشتێکی راست نیە کە هەمیشە پازبدەین بۆپێشەوە ، وئنجا بگەڕێینە دواوە ، هەرچونێك بێت ، ئەگەر بمەوێت مێژووی زۆر کۆنی ولاتێك بگێڕمەوە لێشاوی ئەم نامانە راگیرنە دەکرا.

کچم وامەزانە کە چیروکی (میسر) جێگەیەکی بەرزی نیە لەمێژوودا چونکە (میسر) لەناو میللەتاندا زۆر کۆنە ، لەهەموو ، ولاتێکی تر زیاتر دەمان باتەوە بۆ زەمانێکی کۆن تر ، مێژووی (میسر) بە سەدان ساڵ ناژمێررێت ، بەڵکو بەهەزاران ساڵە ، تا ئێستاش شوێنەوارە مەزنەکان بۆلای رابوردووە دێرینە کەیمان دێنێت. (میسر) یەکەم و ، گەورەترین وڵات بووە کەوا کاروباری هەلکۆلین و گەران بەدوای شوێنەوارەکاندا تیایدا پەیدابووە ، هەرکە پەیکەرێك لەناو زەویدا بهێنرایە تە دەرەوە چیرۆکێکی ئەفسوناوی بۆدەگێڕاینەوە لەبابەت ئەو سەردەمەی کەپەیکەرەکەی تێدا تاشراوە. هێشتا هەرهەلکۆلین و دۆزینەوە بەردەوامە ، ولاپەرەیەکی نوێ دەخەنە سەر دەفتەری مێژووی کۆنی (میسر) ، هەرچەندە ئێمە ناتوانین بریاربدەین: کەی وەیا چۆن مێژووی میسردەستی پێ کردووە ،

بەڵام هەرئەوەندە دەزانین ، کە خەڵکی ، دۆلی (نیل) یان حەوت هەزار ساڵ لەمەو بەر ئاوەدان کردۆتەوە ، شارستانیەتێکی زۆر کۆنی تێدابووە ، بەزمانەکەی خۆیان ، وخەتی (هیروغلیفی) نوسیویانە ، فەخفوری ، وکوڵدانی جوانیان لەزێڕ ، ومس ، و دانی فیل (العاج) و مەرمەر دروست کردووە.

دەڵێن پێش ئەوەی ئەسکەندەر (میسر) داگیرکات (لە سەدەی چوارەمی پێش لە دایك بوونی مەسیحدا) ، (٣١) سی و یەك خێزان حوکوم فەرمایی‌یان تێدا کردووە ، لەو ماوەیە داکە چوار ، وەیا پێنج هەزار ساڵ دەبێت ، گەلێك شەخسیات چ لە پیاو ، وچ لە ئافرەت ، دیارو دەرکەوتووبوون ، هەروەکو هێشتا زیندوبن وایە ، لەمانە: بیناسازی مەزن نجومکەر ، و رۆشنبیرو ، جەنگاوەر ، و دەست درێژو ستەمکەر ، و فەرمان رەوایانی بەفێز ، و ، ژنانی شۆخ و شەنگی تێدا بووە ، لەوە دەچێت کە راوەستا وبین دەستە دەستە فیرعەونەکان[1] (الفراعنە) بە بەردەممماندا بەقۆناغ تێ پەربن ، وەهەر قۆناغێك هەزارەها ساڵ بێت ، ئافرەت دەبینین ئازادەو ، لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشتووە ، وڵاتەکە دەبینین لەژێردەسەڵاتی پیاوە ئاینیەکاندایە ، وەخەڵکی بەرگی باشە رۆژو جیهانەکەی تریان بۆ شێوە ، ئەو ئەهرامانەی کەبە زەبری بازوی بێکاری کرێکاران دروست کراون وەسیلەیەك بوون بۆ مسوگەرکردنی پاشە رۆژی فیرعەونەکان ، ئنجاروو لەم کارەسەختە وەر دەگێرین تەماشای پیاوەکان دەکەین کە کلاوی تووك (باروکا) لەسەردەکەن چونکە سەری خۆیان ساف دەتاشی ، یاری منداڵان دەبینین ، وەکو بووکە شوشە ، و هەلمات ، وکیان لەبەری بچوك کە جومگە دارن وەدجولین ئەمانە وێنەیەکی ئادەمیزادا نەمان پیشان دەدەن لەژیانی ئەو میسریە کۆنانە دا.

لە سەدەی شەشەمینی پێش زایتیدا ، واتە لە زەمانی (بوذا)دا فارسەکان میسریان داگیر کرد ، وەکردیان بە ویلایەتێك لە ئیمپراتوریەتەیان و بەرینەکەیان کە لەروباری (نیل) ە و ە تاکو روباری (راندوس) درێژ بوبوەوە ، پادشاکانیان لەخێزانی ئەخمینیەکان بوون ، وە (برسیبلوس) یان کردبووبە پایتەختی خۆیان ، ئەمانە وبستیان سەربە یۆنان

شۆڕكەن بەڵام نەیان توانی ، دوایی ئەسكەندەری گەورە شكاندنی ، كـەوا میسریەكان وەكو رزگار كەر لەدەست جەوری وستەمی فارسەكان پێشوازیـان كردن ، ئەسكەندەر ، پەیكەرەكەی خۆی لەشاری ئەسكەندەریەی مـیسـر ، بەجێ هێشت ، كە ئەم شارە بووبە مەشخەڵێكی زانـیـاری وروشـن بـیـری یۆنانیەكان.

كچم لەبیرتە لەدوای مردنی ئەسكـەنـدەر سـی سـەركـردەكـەی بـوون بەمیراتگری ئیمپراتوریەتەكەی لەناو خۆیاندا بەشیان كرد ، (میسـر) بـەر (بطلیموس) كەوت ئەم بەتلیموسیانە رەوشت وخووی (میسر) یەكانیان گـرت كەفارسەكان وا نەبوون ، بەتلیموسەكان خۆیان بـەمـیـراتـگـرو ، نـەوەی فیرعەونە كۆنەكان دادەنا ، ئیتربەكوشتنی (كلیوباتر)ەی شارن حوكرانیـان نەما ، ئنجا (میسر) بووبە ویلایەتێكی رومانی ئەمەپێش پـەیـدابـوونـی مەسیحێتی بەماوەیەكی كەم ، ئاینی مەسیح پێش ئەوەی بچێـتـە ئـەوروپـا چووە (میسر)ەوە ، ئەوانەی بوون بە مەسیحی جۆرەها ئـازاریـان لـەلایـەن رۆمانەكانە وە دەجەشت ، ناچار هەلاتن بۆ ناو جەرگەی بیابان ، لەوێدا ، پەرستگە نە هینـیەكانیان تێدا دامەزراند ، لەو رۆژانە دا جیهانی مەسیحی بربووبوو لەچیرۆكی ئەم لەخواترسانە (الرهبان) وە ئەومـوعـجـیـزە یـەی كەئەوان دەی هینندەی ، و دەی نوێنن. ئنجاكە مەسیحێتی بووبە ئایـنـی ئیمپراتوریەتی روما بەهۆی ئیمپراتور (قسطنطین) ە وە ئەم مەسـیـحـیـە میسریانە ، ویستیان تۆڵەی خۆیان بكدنەوە لەوانەی كە ئـەمـان بـێ‌یـان دەوتن (بێ باوەر) واتە لەوانەی كە لەسەر ئاینی كۆنی (میسـر) بـوون ، ئنجا ئەسكەندەریە بوبە بنكەیەكی مەسیحی بۆ زانیاری ، بەڵام مەسیحیتی بۆ بەچەند تاقم وحیزبێكەوە ، لەناو خۆیاندا هەرا ، و ناكۆكیان هەبوو ، هەریەكەیان ددیویست بەسەر ئەوی تردا زاڵ بێت ، ئەم كارە زۆری خایاند خەلك لەمەسیحێتی ، وبەرەو تاقمەكانی بێزاربوو ، ئنجا پیشوازی عـەرەب و ئاینە تازەكەیان كرد لەسەدەی حەوتەمینی زاینیدا ئەمە هۆیـەك بـوو ، لەو هۆیانەی كە داگیركردنی سەرووی ئەفەریقای بو عەرەبەكان ئاسان كـرد ئیتر مەسیحیەكان خۆیان تووشی سەغلەتی هاتن لەجیاتی ئەوەی كە ئـەمـان خەلكی‌تر سەغلەت كەن.

بەم جۆرە (میسر) بووبە ویلایەتیك لە ئیمپراتۆریەتی خەلیفەی عەرەبەکاندا ، زمان و رۆشنبیری عەرەب پەرەی سەند ، زمانە کۆنەکەی میسریە کان فەوتا ، ونەما ، دوای دوو سەر ساڵ خەلافەت لە بغداد دا لاوازبوو ، ئیتر (میسر) مل کەچی مل حوکوم فەرمایی والیە تورکەکان بوو کەوا کەمێك سەربە خوبوون ئنجا دوای سێ صەدساڵ پالەوانی ئیسلام (صلاح الدین) کەوا ئەستێرەی لەجەنگی سەلیبیەکاندا دەدرەوشایەوە بوو بەسولتانی (میسر) دوای مردنی ئەم جێ نشینەکەی دەستی کرد بەهێنانی بەندەی تورکەکان لەناوچەی قەفقاسەوە کردنی بە سەربازی خۆی ، ئەم بەندە سبیانە پێیان دەوتن مەمالیك واتە بەندەی کڕراو ، ئەمانە بریتی بوون لەبەرە ، و دەستەو تاقمێکی بەکارو ، باش بو سەربازی ، ئنجا چەند ساڵێکی نەخایاند ، تەنانەت ئەم مەمالیکانەش هەڵسان ، وە هەر لەخۆیان سولتانیان بۆ میسر دانا ، بەم پێیە حوکومرانی مەمالیکەکان دەستی پێ کردو ، دووصەد ساڵی خایاند. دوای ئەمە ماوەیەکی نیمچە سەربەخۆیی پەیدابووسێ صەد ساڵی تر دەوامی کرد ، بەمەوە مەمالیکەکان وەیا "بەندە سبیەکان" پێنج صەدساڵ زیاتر حوکمرانی میسریان کرد ، ئەمە ورووداوێکی راستی بێ هاوتایە لەمێژوودا ، گەرچی مەمالیکەکان لەبنەجەدا چینێکی جیاواز نەبوون ، وەیا چینێك بن پشتاوپشت هاتبنە خوارەوە کەچی ژمارەیان هەر لە زیاد بووندابوو ، بەهۆی هێنانی ژمارەیەکی زۆرەوە ، لەئازادانی رەسەنی قەفقاسی (کەلە رەگەزی ئاری)ن. بەڵام خاو خێزانییان ئاو ، و هەوای میسریان پێ نەدەکەوت دوای چەند پشتێك دەفەوتان ، بەڵام هێنانی بەردەوام ژمارەیانی هەربەزۆری هێشتەوە ، بۆیە تواناو جم و جۆلی ئەم دەستەیەی دەپاراست ، هەرچەندە ئەمانە بەو براسدت چینێکی جیاواز نەبوون ، بەڵام تاماوەیەکی دوورودرێژ نوێنەری ئەرستوکراتی ، وچینی فەرمان رەوابوون.

لەسەرەتای صەدەی شانزەهەمدا سولتانی ئەستانەی (ئەستەمبول) عوسمانیەکان میسری داگیرکرد ، ئنجا (میسر) بووبە ویلایەتێکی عوسمانیەکان ، بەڵام مەمالیکەکان هەربەچینێکی ئەرستوکراتی مانەوە ، کەدەسەلاتی تورکەکان لەئەوروپا داهاتە کزی ، مەمالیکەکان بەئارەزووی خۆیان کەوتنە کار گەرچی بەناو لەژێر فەرمان رەوایی سولتانی

عوسمانیەکاندا بوون. کە ناپلیون هاتە (میسر) لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ، بەسەر مەمالیکەکاندا زال بو ، وەشکاندنی ، لەوانەیە چیرۆکی مەمالیکەکەت لەبیرمابێت کەبە (سواری ئەسپەکەیەوە) هاتە بەردەمی لەشکری فەرەنسە ، داوای شمشێربازی کرد ، هەروەکو شورەسوارەکانی چەرخەکانی ناوەراست.

ئنجا دیێنەوە سەرسەدەی نۆزدەهەم لە (میسر) دا دەبینین لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا ، لەژێر دەسەلاتی (محمدعلي) دابوو ، ئەمە تورکێکی ئەلبانیە ، بووبە خدیوی (واتە فەرمان رەوایەکی تورك) بە محمدعلی یان دەوت دامەزرێنەری میسری نوی. یەکەم شتێك کەکردی فەوتاندنی مەمالیکەکان بوو ، کەبە فێل کوشتنی ، هەروەها توانی ئینگلیزەکان لەمیسردا بەراستی بشکێنی ، دان بەدەسەلاتی سولتانی تورك دانەنێت. (محمدعلی) لە شکرێکی نوێی میسری لە فەلاحەکان (نەك لە مەمالیکەکان) پێکەوەنا ، جۆگەو ئاوبارەی کردەوە ، پشتی گشت وکالی لوکەی گرت ، کەوابوو بەپیشەسازیەکی سەرەکی لەمیسردا ، ئەوەندەی نەمابوو ئەستانە (ئەستەمبول) بگرێت ، وە سولتان کەبەناو سولتان بوو لای بەرێت ، بەڵام وازی لەمە هێنا بەوەی کەسوریای خستە سەر میسر.

محمدعلی سالی ١٨٤٩ زاینی لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مرد ، جێنشینەکانی لاواز ، و دەست بڵاو ، و ناتوا نابوون ، لەراستیدا ئەگەر لەمە باشتر بوونایە خۆیان دەگرت بەرامبەرپارە دارە بێگانەکان و چاو چنۆکی ئەوروپاییەکان ، وەپارەیان لە پارەدارەکانی ئینگلیزو فەرەنسیەکان بەقازانجێکی زۆر وەرنە دەگرت تاکو لەخواست و ئارەزوەکانی خۆیاندا سەرفی کەن ، خۆ ئەگەر دوا بکە وتنایە لەدانەوەی قەرزو قازانجەکانی لەکاتی خۆیدا ، ئیتر کەشتیە جەنگیەکان لەئاسووە دەر دەکەوت ، تاکو پارەکان کوکەتەوە ، ئەمە فروفێلێکی ئاشکرای نێودەولەتانە کە پارەدارەکان ، و حوکومەتە بێگانەکان بەجووت لەسەری دەرون بۆ سەپاندنی دەسەلاتیان بەسەر ولاتێکی غەریب ونەشارەزادا ، گەرچی ژمارەیەك لە خدێویەکان بێ هێزبوون بەڵام میسر باش پێشکەوت ، رۆژنامەی (تایمس) لەژمارەی ینایری سالی ١٨٧٦ زاینیدا دەڵێت: ـ "بەراستی میسر

نموونەیەکی چاکی پێشکەوتنە ئەو هەنگاوەی ئەم ناوێتی لەهەفتا سالدا هیج ولاتێکی تر بەپێنج صەدساڵ نای نێت" بەڵام پارەدارو دەوڵەمەندەکانی بێگانە داوای (رەتلە کوشتەکە) (٣) دەکەن ، داوایان دەکرد کە بێگانەکان دەست بخەنە کاروبارەوە ، بەبیانووی چاودێری کردنی میسر کەلە نابوون بوون دایە. دەولەتە بێگانەکان بەتایبەتی ئینگلترەو ، فەرەنسە ئەم بانگەوازانەیان بەدڵ بوو ، چونکە بیانوویەك بوو لەمێژە چاوەروانیان دەکرد ، تاکو بچنە ناو ئەم ولاتە دەولەمەندەوە ، کە کەوتۆتە سەر رێگای هیندستان بەتایبەتی.

نۆکەندی (سویس) بەئارەقی ناوچەوانی کرێکارە میسریەکان ، وە بێکاریی کردن ، و ماندوو کردنیان هەڵکەندرا ، وە لەسالی ١٨٨٩ زاینیەوە کەشتی هاتوچۆی پیداکرد ، لەوانەیەشتێکی سەیربێت لێرەداباسی ئەوەبکەم کە گوایا لەسەردەمی خێزانە کۆنە کانی فیرعەونەکاندا نزیکەی ساڵی ١٤٠٠ پێش زاینی ئەوسانۆ کەندێکی وەکوئەم نۆکە ندەهەبوە. سەبارەت بەکردنەوەی نۆکەندی (سویس) ەوە ، هەرچی بزوتنەوە بەکی بازرگانی هەیە لەنێوان ئەوروپا و ، ئاسیا ، و ئەوسترالیا ئیتر رووی کردەئەم رێگەیە ، وەبو بە هۆی زیاد بوونی گرنکی وبایەخی میسر (دزرائیلی) سەرەك وەزیرانی ئینگلتەرە لەساڵی ١٨٧٥ راینیدا توانی پشکەکانی (الاسهم) میسر لەنۆ کەندەکەدا بەنرخێکی هەرزان بکرێت ، بەمەبە ریتانیا توانی بارەکانی خۆی دامە زرێنێت دیسانەوە دەسەلاتیشی بەسەرنۆکە ندەکەدابروات. ئەوپشکانەشی کە مابوونەوە بوون بە هیفەرەنسە ئیترمیسر لەنۆکەندەکەدا ، بەدەستیبەتاڵ هاتەدەرێ. لەساڵی ١٩٣٢ زاینیدا داهاتی (دخل) بەریتانیا لەپشکەکانی (الاسهم) گەیشتە سی ملیون ونیو (جنیە). کەچی پشکەکان هەمووی بایچوار ملیون بوو.

دەبوایە بەریتانیا لەمیسردا بەرژەوەندیە کانی خۆیی پەروەردە بکردایە ولەهەمان کاتیشدا دەسەلاتی خۆبی بەسەردا بسەپاندایە ، لەساڵی ١٨٧٩ زاینیدا دەستی خستەکارو باری ناوخۆی میسرەوە ، تادەولەمەندو پارەدارەکانی بەریتانیا بتوانن دەست بەسەر ئابووریە کانی ولاتە کە دابگرن. میسریەکان لەم دەست خستنە کاروبارە بێزاربوون ، حیزبێکی

نیشتمانی نێداپه یدابوو ، خۆی تەرخان کرد بۆ دەرکردنی ئینگلیزەکان لەمیسردا ، سەرکردەی ئەم حیزبە ئەفسەرێکی لاوبو ناوی (عرابی پادشا). بوو کەلە دایك و باوکێکی هەژارو لەچینی کرێکاران بوو سەرەتای ژیانی سوپایی (عرابی) سەربازێکی سادە بوو ، ئنجا بەرز بوەوە تاکو بووبە وەزیری جەنگ. فەرمانی چاو دێری ئینگلیزو ، فەرەنسەییەکانی بەجێ نەدەگەیاند ، وەلامی ئینگلیزەکان بۆ ، ئەم گوێ پێ نەدانەی ئەو ، هێرشێکی چەکدارانە ، ودابلوسین وسوتاندنی شاری ئەسکە ندەریەبوو ، ئینگلیزەکان توانیان شارستانیەتە رۆژئاواییەکەی خۆیان بسەپێنن بەسەر میسرو ، لەشکری میسر بشکێنن و ، راستەو خۆ حوکم فەرمایی میسربکەن.

بەم جۆرەبوو داگیرکرد نەکەی بەریتانیا ، ئیتر داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە جۆرێکی سەیربوو ، لەجۆری پەیوەندایەتی نێو دەولەتان چونکە میسرو یلایەتێکی عوسمانیە کان بوو ، وە پەیوەندی بەریتانیا لەگەل دەولەتی عوسمانیدا باش بوو ، سەرەرای ئەمەش بەریتانیا دەست بکرێت بەسەر پارچەیەك لە دەولەتی عوسمانیدا ، وەلە جیاتی خۆی نوێنەرێك بنێرێت کە دەسەلاتێکی بەرزی هەبێت ، هەروەك جێنشینی پادشا هیندستاندا. ئیتر خدیوی ، وەزیرەکانی دەسەپارچە بوون ، یەکەمین نوێنەر میجر (بیرنغ) بووکە بیست و پێنج سال حوکمرانی کرد وەنازناوی (لوردکرومر) بوو ، (کرومر) زۆر داربوو هیوای گەورە ئەوەبوو کە: پارەدار ، و دەولەمەند ، و خاوەن سەنەدەکان بتوانن قازانجەکانیان وەرگرنەوە ، وەبەر دەوام قازانجیان وەر دەگرت ئینگلیزەکانیش ستایشی میسرو بەساغ و سەلامەتی ئابوری میسریاندا هەلدەکوت ، ئینگلیزەکان چیان بەهیندستان کرد ئەوەیشیان بەمیسرکرد ، گەرچی بەرێوەیردن ، وکارگوزاریان چاك کرد بەلام قەرزو قولەی نەتەوایەتی ، هەروەك خۆی مایەوە ، سەرەرای ئەوەی کە بیست و پێنج سالیشی بەسەر دارابورد ، بەرامبەر پەروەردە ، و فێرکردن راوەستان ، (کرومر) پرۆژەی دروست کردنی زانکویەکی نیشتمانی دواخست ، دەتوانین بریار بەسەر سیاسەتی (کرومر) دا بدەین ، بەم رستەیەی کە لەنامەیەکدا هاتبوو کە واسالی ١٨٩٢ زاین ناردبووی بۆ (لوردسالسبوری) کەسەرەك وەزیرانی بەریتانیابوو دەلێت:ـ (بەراستی خدیوی دەبێتە میسریەکی بەجان و جگەر) هەروەك

کردەوە ی کابرایەکی میسری ، وەکو هاونیشتمانیەکی میسری بەلای (کرومر) ە وە کوناهێکی گەورەیە ، ولێ خۆش بوونی بۆنییە ، لەم بابەتەش لە هیندستاندا روو دەدات لەکاتێکدا کە هیندستانیەك بەبێ ویژدانی خۆی وەکو هیندی‌یەك رەفتار بکات ئنجا ئیگلیزەکان رقیان هەڵدەستێت ولە سەرئەمە سزای دەدەن.

فەرەنسەییەکان رقیان لەئینگلیزەکان هەستا ، چونکە هەموو دەست کەوتوو تالانەکە بۆ خۆیانیان زەوت کرد ، هەروها هەموو دەولەتەکانی تری ئەوروپاش رقیان هەڵسا بەڵام ئینکلیزە کان دەستیان کرد بەهێمن کردنەوەی دەولەتەکان ، دەیان ووت! کەئەوەندە لەمیسردا نامێننەوە ، بەم زوانە دەرۆن وبەجێی دێلن ، ئەم پەیمانەیان ، زیاد لە پەنجا جاردوو پات دەکردەوە ، مەگەر هەر خوا بەتەواوەتی بزانێت چەند جاریان وتوتەوە. تەنانەت تا ئەمرۆش هێشتا هەر لە میسر دان.

لەساڵی ١٩٠٤ زاینیدا ئینگلیزو فەرەنساییەکان ، رێککەوتن کە گیروگرفتەکانی‌ناو خۆیان جێ بەجێ کەن ، بەپێی ئەم رێککەوتنە ، ئینگللتەرە فەرەنسەی لە (مراکش) دا سەربەست کرد ، لەجیاتی ئەمە فەرەنسەش دان بنێت بەداگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە ، بەلام تورکیا ـ کە گوایادەسەلاتداربو بەسەر میسردا ، لەم رووەوە گۆی لەقسەی نەگیرا ، هەروها راوێژیش بەدەو لەتەکانی ئەوروپا نەکرا.

لەدیمەنەکانی ئەم سەردەمە: دا وکامیسریەکان نابێت بێگانەکان موحاکەمە بکەن بەڵکو دەبێت لە دادگا تایبەتیەکاندا ، کەلە حاکمە بێگانەکان پێك هاتووە موحاکەمە بکرێن ، ئەمە یەکێکە لەو دیمەنانەی کەدەسەلاتی بێگانەی درێژ کردۆتەوە ، بۆدەرەوەی سنورەکانی ولاتە داگیر کەرەکە ، یەکێك لەم حاکمانە نوسیویەتی دەڵێت:ـ

"لەو باوەرەدام کە ئەو بێگانانەی لە میسردا دانیشتوون ، زۆربەی باجەکانیان لەسەر هەلگیراوە ، ئەوانە چەند بەختیارن کەباج نادەن ، وەل کەچی دادگا ناوخۆکان نین ، سەرەرای ئەمەش هەموو هۆیەکی چەوساندنەوەی ئەو ولاتەیان هەیە کەتێایدا دەژین".

بەم شێوەیە بەریتانیا لەچەوساندنەوەی میسردا دەستی داگرت ، نوێنەرو ئاشناکانی بەریتانیا ژیانێکی گەورانە ، وشاهانە دەژیان ، ئیتر

شتێکی سروشتی‌یه کەگیانی نەتەوایەتی ، وخواستی چاکخـوازی (الأصـلاح) پێ بکات وپەروەردە ببێت ، لەهەموو چاکخوازەکان دەرکەوتوتر لە سـەدەی نۆزدەهەمدا ، پێشەوای ئاینی (جمال الدین)ی ئەفغانی بوو ، کەوا ویستی ئیسلام والێ بکات ، لەگەل وەزع و باری‌نوێدا بگونجێت ، دەی وت ئیسلام توانای ئەوەی هەیە شارستانێتی نوێ وەر گرێت ، ئەم تەقـەلایـە لـەوتـە قەلایە دەچێت کەوا لە ئاینی (هیندوسی) یشداپە یدابوو ، ئەم تەقەلایـەش بریتیە لە گەرانەوە بۆ دەستورە سەرەکیەکەی ئاین ، ئنجالێك دانەوە ، و شیتەلێ کردنی بەجۆرێك مانایەکی نوێی‌ببەخشێت ، وە مەعلوماتە تازەکیەکان ببنە بەشێکی تەواو کەر بۆبیرو راسەرەکیەکان ، ئەم هەولێ وتـەقـەلایـە لەگەل لێکۆلینەوەی زانیارانە دا جیاوازە کەئازایانە بەرەو پێشەوە دەچێت وە خۆی بەبیرو باوەرە کۆنەکانەوە نابەستێتەوە ، کاریگەری (جمال الدین) لەمیسر تێپەری کرد ، وگەیشتە ولاتە عەرەبیە دراوسی‌کان.

لەئەنجامی چالاکی وبزوتنەوەی بازرگانی لەمیسردا ، لەگەل ولاتەکانـی دەرەوەدا چینێکی نوێی ناوەراست پەیدابوو ، بووبە پالپشتی نەتەوایەتیـە تازە پێ گەیشتوەکە. (سعد زغلول) کە گەورەترین سەرداری میسربـوو لـەم چینەبوو ، هەر چەندە ئاینی زۆربەی خەلکی میسر ئیسلامە ، بەلام هێشتـا ژمارەیەکی باشی لەمەسیحیە (قبطی) یەکان تێـدایـە ، کـەلـە هـەمـو دا-نیشتوانی میسر ، خوینیان زیاتر میسریە ، چینی وەراست گەر موسلمـان و (قبطی) یەکانیشی تێدابوو ، پێکەوەتە وا ورێك و کونجاو بوون تەقـەلای ئینگلیزەکان لەناویاندا سەری نەگرت بۆنانەوەی دووبەرەکی ، دیـسـانـەوە ئینگلیزەکان هەولیان دا دووبەرەکی لەنێوان حیزبی نیشتمانیدا دروست کەن، هەندێ جار سەردەکەوتن وەکو لەهیندستاندا رووی دا ، بەهۆی دلـخـوشـی دانەوە ، و راکێشانی هەندێ لەپێشەوا مام ناوەندیەکان بـۆلای خـۆیـان ، لەنامەی داهاتوودا باسی ئەمەت بۆ دەکەم.

ئەم بوو بارو ، وەزعی میسر لەکاتی هەلگیرسانی ئـاگـری جـەنـگـی یەکەمی جیهانی‌لە سالی ١٩١٤ زاینیدا ، کەوا تورکیاش چووە پال ئەلمانیا دژی بەریتانیا ، وفەرەنسە ، وهاوپەیمانەکانی هەردوکـیـان لـێـرە دابـە ریتانیا بریاری ، دا میسربخاتە سەر مولك وموستەعمەرەکانی خۆی ، بەلام

بۆئەمە زروق لەبار نەبوو ئنجا بڵاوی کردەوە کە پاراستنی (الحمایە) میسری خستە ئەستۆی خۆی.

بەشەکانی تری ئەفەریقا چیرۆکەکانیان لەهی میسر دەچێت ، چونکە لەنیوەی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا ، بووبە قوربانی بۆ ئیستعماری ئەوروپا ، وەك واشە چۆن خۆی دەدایە نیچیردا ، بەودەستورە دەولەتە ئەوروپاییەکان خۆیان دایە ئەفەریقادا ، لەناو خۆیاندا ، بەش بەشیان کرد وەرێگەش بۆ ئەم دەولەتانە کراوە بوو ، ئیتالیا لە (حبشە) دا ساڵی ١٨٩٦ زاینی شکا ، بەریتانیا ، وفەرەنسە بەشێکی زۆریان وەرگرت ، بەشێکیان بۆ بەلجیکا ، وئیتالیاو بورتەغال هێشتەوە ، بەڵام ئەلمانیا بەشەکەی خۆی مابوو ، تاکو لەجەنگە جیهانیەکەوا شکا. ئیتر دەولەتی سەربەخۆ لەئەفەریقادا (حبشە) لەرۆژهەلات و دەولەتی بچکۆلەی (لیبریا) لە رۆژئاوادا هەبوون. بەڵام (مراکش) کەوتە ژێردە سەلاتی ئەسپانیاو فەرەنسەوە.

چیرۆکی داگیرکردنی ئەم زەمیتە پان و بەرینە ـ واتە ئەفەریقا ـ لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە

گەلێك نەنگ و ناشیرین و دورودرێژە هێشتا چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە ، لەمە ناشیرین تر ئەو شێوازانە بوو کە وا ئەم دەولەتانە بەکاریان دەهێنا بۆ چەوساندنەوەی قارەکە ، بەتایبەتی بۆ دەرهێنانی لاستیك ، چەند ساڵێك لەمەوبەر ، هەواڵی کارەساتە ناخۆش و درندایەتییەکانی کەلە کونغوی بەلجیکارا رووی دەدا ویژدانی جیهانی کە داوای شارستانیەتی دەکات ، هێنایە لەرزد ، لەکاتێکدا کە گرانباریەکەی دی کەبە ئەستۆی پیاودەرەشە ئەفەریقاییەکەوەیە.

زۆر بەبەشدکانی ئەفەریقا کە بەقارەرەشەکە بەناو بانگە بەتایبەتی بەشەکانی ناوەوە تاسەدەی نۆزدەهەمیش ، نەزانراو بوون ، تادوای چەند گەشتێکی سەرجلی ، خۆخستنەمد ترسیەوە نەبێت کە نیرراوان بۆ دۆزینەوە (البعثات الاستکشافیە) پێی هەڵدەستان ، ئەلدەستان ، ئەگینە تا ئەوکاتە ئەفەریقا بدورد ی نەخرابوە سەرنەخشە جیهان. بدناو بانگترین ئەوانەیی کە ئەفەریقایان دۆزیەوە (دیفید لیفنکستون)ی مزگێنی بەخش (المبشر)ی ئیسکوتلاندی بوو ، کەواقارەکەقووتی دابو ، بێ سەرو شوێن هەواڵی

لەجیهان برابوو. هەروەها (هنری ستانلی) رۆژنامە گەرکە ویستی بەدوای (لیفنکستون) دا بگەرێت تالد شوێند نەزانراوەکانی ئەفەریقادا دۆزیەوە.

---

١) هیروغلیفی:- بریتییە لەخەت و سیوەی نوسینە کۆنەکانی خەلکی میسر - وەرگێر.

٢) فرعون پادشاکانی کۆنی میسر پێیان دەوتن فرعون.

٣) رەتلە گۆشتەکە:- رەتلێك لە کیلویەك کەمێك کەمترە ، ئەمە چیرۆکێکە ، چاوچنۆکی ، وبێ ویژدانی ، دەولەمەندو ، پارەدارەکانی ئەوروپا دەردەخات ، کارەساتەکانی ئەم چیرۆکە لەشاری (بندقیە)ی ئیتالیادا رووی داوە: کابرایەکی بازرگانی دەولەمەند (شیلوك) ناو هەندی پارە بەقەرزدەدات بە پیاوێکی تر ، وە بۆ ئەوەی وەرگرتنە وەپارەکەی مسۆگەرکات مەرجێك دەخاتە سەنەدی قەندەکەوە کە ئەگەر قەرزدارەکە پارەی نەبوو بیداتەوە (رەتلێك گۆشت) لەسەر سنکی کابرای قەرزدار بکرێتەوە ، کابرای قەرزدار پارەی نابێت پی داتەوە ، دە درێت بەدادگا بەهۆی زیرەکی پارێزەرەکەیەوە کەلە دادگادا بەرپەرچی خاوەن قەرزدەداتەوە ودەلێت:- لێ کردنەوەی رەتلێك گۆشت لەسەر سنکی کابرای قەرزدار ، مانای کوشتنی قەرزارەکەیە. ، ئەمەتاوانی کوشتن پێك دێنێت ، بەمە کابرای قەرزدار رزگاری دەبێت. وەرگێری کوردی.

# ڕوسیای ڕژێمی پادشایەتی قەیسەر

**١٦/مارت/١٩٣٣**

روسیا ئەمرۆ ولاتێکی سوفیەتیە ، حوکومەتەکەی لەنوێنەری فەلاح و کرێکاران پێك هاتووە ، لەگەلێك رووەوە لەپێشکەو توترین ولاتانی جیهانە هەرچۆنێك بێت راستیە کەی ، ئەوە وزع وبارەی کەلە وێدایە ، وئەو بنچینەیەی کە کۆمەلکەو حوکومەتەکەی لەسەربنیات نراوە ، بریتییە لەیەکسانی کۆمەلایەتی ، بەلام روسیای سدددی تۆزدەهەم لەهەمو ولاتەکانی ئەوروپا زیاتر دواکەوتوترو کۆنە پەرست تربوو ، چونکە مەلبەندی فرەچەشن ئوتوکراتیێت ودەست درێژیەکی توندوتیژبوو ، هەرچەندە شۆرش و گۆرانکاریەکان ، رۆژئاوای ئەوروپایان گرتەوە ، بەلام قەیسەرەکانی روس مافەپیرۆزەکەی خۆیانیان لەپاڕشایەتیدا هەربەرنە دەدا ، تەنانەت کەنیسەکەش کە ئەرثودکس بوو (کاثولیکی وەیابروتستاتت نەبوو) گەلێك زۆردار تربوو ، چونکە کۆتەکی دەستی قەیسەرکان بوو. بەروسیایان دەوت:ـ (روسیای پیرۆز) وەبە قەیسەریش دەوترا (باوکە بچکۆلە) ، ئیتر حوکومدت و کەنیسە ئەم ناز ناوانەی خۆیان بۆ فریودان ، و کارکردنە مێشکی میللەت بەکار دەهێنا ، تاکوبیر لەباری سیاسی ، و ئابووری نەکاتەوە ، گەرچی ووشەی (پیرۆز) هەمیشە داردەستی چەوساندنەوە بووە بەدرێژایی چەرخە هەمە جۆرەکانی مێژوو.

ئەو قامجیەی کە واثاراستەی ناوشانی بەندەکان دەکرا لەگەل ئەوترس وتوقاندنە کەچەواشەو ، ئازارو ، کوشتنی دەگەیاند بەتایبەکاری بەرامبەربە جولەکەکان ، لە دیمەنەکانی "روسیای پیرۆز" بوون ، دیمەنێکی تریش ، جولەوانەکانی (أستبس) بوولە سیبریادا ، کەوا قەیسەرەکان بەندیخانە ، و گرتوخانە ، وەگورستانەکانی تێدا دروست

کردبوو ، ژمارەیەکی لەتاوانباری سیاسی دەنارد بـۆ ئـەوی ، هـەوارکـە فراوانەکانی ئاوارە کراوەکان ، ئاوەدا نیان تێدا دروست کردبـوو ، وەلـە هەموو لایەکەوە بە گۆرستانی ئەوانەی کە خۆیان دەکوشت دەورە درابـوو ، چونکە زۆریان بۆ ماوەیەکی دورو درێژ ، بەرگەی ئـاوارکـە دوورەکـەیـان نەدەگرت ، ئیتر دەروخان ، وورەیان بەردەدا ، چونکـە بـەرگـەگـرتـنـی ئاوارگەیەکی دوور لەجیهان و ، لەهاوری ، و لەخەلك کەوا لەخـۆشـی ، و ناخۆشیدا لەگەلیدا بن پێویست بە عە قلێکی گەورەو دڵ و دەروونێکی هێمن و فراوان وئازایەتی هەیە ، بۆیە رگەگرتنی سەغلەتیو ناخۆشی. بەم جۆرە پادشایەتی قەیسەر ، هەرسەرێك قوت ببـوایـەوە دەی بـڕی ، وە هـەمـوو تەقەلایەکی بۆ دەستکەوتنی ئازادی دەکوژاندەوە ، کۆسپی لەرێگای هـاتـو چۆکردندا دادەنا ، تانەهێلێت بیروباوەرە نوێکان لـەدەرەوەوە ، بـێـتـە ناوەوە ، بەلام ئازادی گیراو (المکبوتة) هەمیشە هـێـزێـکـی وا دروست دەکات ، کە دەرفەتێك بۆ تەقینەوە بدۆزیتەوە ، وە بە قەلە مبـازبـەرەو پێشەوە بچێت ، ئینجاتەو گالیسکەیەی کەپێوەی بەستراوە ووری دەگێـرێـت ودەمەو نوخونیدەکاتەوە.

لەنامەکانی پێشووماندا ، بەچاوپێدا خشاندنی جۆر بـەجـۆر ئـاگـادارو نارەزای چالاکیو جم و جوولی سیاسـەتـی روسـیـای رژێـمـی قـەیـسـەر لەهەموولایەکی ئەوروپا ، ورۆژ هەلاتی دوور ، و ئاسیـای نـاوەراسـت ، و ولاتی فارس ، و تورکیا بوین.

دەبا لێرەدا هەوڵ بدەین ئەم چاوپێداخشاندنانە پێکەوە ببەستین ، تاکو کەلێنێك بدۆزینەوە ، کەوێنەو دیمەنەکەی پێ رووناك کەینەوە. چۆنیەتـی باری جوغرافیەکەی دوو رووی داوە بەرووسیا ، یەکێکیان بەسەر رۆژهەلاتدا ئەوی تریان بەسەر رۆژئاوادا دەروانێت ، بۆیە بووە بەدەولەتێکی ئاسیایی و ئەوروپایی ، وە مێژوویشی دەمێك بەرەو رۆژهەلات ، و دەمێکیش بـەرەو رۆژئاوا دەچێت ئەگەر لەر ۆژئاوا دابشکێت ، رووداکاتـە رۆژهـەلات ، خـۆ ئەگەر لەرۆژهەلاتدا جێگیر بێت ، دەگەرێتەوە ، وروودەکاتە وەرۆژئاوا.

باسی هەلوەشانی ئیمپراتورە کۆنەکانی مەغولم بۆکردیت لەگەڵ ئەوکـە لە بوورەدا کە (جنگیزخان) بەجێ هێشت ، ئنجا دەربـارەی ، دەرکـردنـی مەغولەکان لەرووسیادا ، لەلایەن ئەمیرو سەردارەکانی روسەوە بەسەرکردەیی

ئەمیرو سەرداری مۆسکو لەکۆتایی سەدەی چواردەهەمدا ، لەئەنجامی ئەمددا ئەمیرو سەرزارەکانی مۆسکو ، بوونە فەرمـان روایـەکـی ئـوتـوکـراتـی بەسەرهەموو رووسیادا ، وە بەخۆیـانـیـان دەوت (قـەیـسـەر) ردوشـت ، ونەریتیان تارادەیەك زۆر مەغولیانە و دواکەو توتر بوو لەنەریتی ئەوروپای رۆژئاوا ، کەناویان نابوون درندەکان ، لەساڵی ١٦٨٩ زاینیـدا (بـطرس)ی گەورە هاتە سەرتەخت ویستی رووی روسیابکـاتـە رۆژ ئـاوا ، بـۆ ئـەمـە گەشتێکی لەولاتە ئەوروپاییەکاندا کرد ، تۆ تێ گەیشتنـی وەزع و بـاری کۆمەلایەتی ئەوی ، گەلێك رەوشت کە لەوی دیبووی ویستی بی سەپـێـنـی بەسەر خانە دانە ناشنی ، وراراکانی روسیادا ، بەلام جەماوەری میلـلـەت زۆر پەریشان و دواکەو تووبوو ، بەتەنگ ئیصلاحاتەکانی (بطرس)ی گەورەوە نەبوو. (بطرس) سەیری کرد دەولەتە گەورەکانی هاوذەمی خۆی دەسـەلاتـی دەریاییان هەیە ، ئەمە سەرنجی راکیشا بەلای گرنکی هێزی دەریایـیـدا ، رووسیا ئەوکاتە ، لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆل وقەبەبوو ، تەنها رێـگـەیـەکـی دەریایی لە دەریای بەستەلەکی سەروودا (المحيط المتجمد الشمالي) هەبـوو کەوا زۆربە-کەلکی هاتو چۆی دەریایی نەدە هات. ئنـجـا (بـطرس) رووی کردە دەریای (بلطيق) کەلە سەرووی رۆژئاوادایە ، و (قـرم) کـەوتـۆتـە خوارووەوە ، هەرچەندە نەگەیشتە (قرم) بەلام (ندوەکانی کەیشتن) ، بەلام ئەم گەیشتە (بلطیـق) دوای ئـەوەی (سـویـد)ی شـکـانـد ، شـاریـکـی روزئاواییانەی نوێی دروست کرد بیان دەوت (بطرسبورغ) لـەسـەر زارکـی خلیجی فلندا کە بۆدەریای (بلطیق) دەچێت ، وەکردیبە پایتەختی خۆی ، بەمە هەولیدا لەمۆسکو دوور کەوێتەوە کەبە ندریتە کۆنەکـانـەوە بـەنـدە (بطرس) سالی ١٧٢٥ زاینی مرد.

دوای تێپەر بوونی پەنجا ساڵ واتـە لـەسـاڵـی ١٧٨٢ زایـنـیـدا ژنـە قەیسەرێکی ترکە ناوی (کاترینا)ی دووەم بوو ، ویستـی ئـیـصـلاحـاتـی رۆژئاواییانە بێنێتە روسیاوە ، بە (کاتریـنـا) یـان دەوت (مـەزن) ئـەم (کاترینا)یە ئافرەتێکی بێ هاوتا بوو ، خاوەن هێزێکی خـواسـتـن (قـوە الأرادة) وبەتواناو رەق بوو ، لەژیانی تایبەتی خۆیدا ناوبـانـگـی بـاش نەبوو. دوای ئەوەی کە قەیسەری مێردی بەکوشت داو لەو رزگـاری بـوو ،

ئینجا ئەم ئافرەتە خۆی بوو بە قەیسەرێکی زۆردار لەولاتی روسیادا ماوەی ١٤ ساڵ ، بەروالەت خۆی وادەردەخست کە رۆشنبیری پەروەردەدە کات ، لەرێی نوسینەوە ئاشنایی لەگەڵ (فولتیر) دا پەیدا کرد ، ئەم ئافرەتە زۆر هەوڵی دا لاسایی دیوانی (بلاط) گەورەی فەرسای بکاتەوە ، هەندی ئیصلاحاتی لە پەروەردە ، وفێر کردندا هێناید ولاتەوە ، بەلام ئەمانە رووگەش و ، لەبابەتی خۆ نواندن بوون ، چونکە رۆشنبیری لەبرو بەجارێك نایەت ، بەلکو پێویستە لە ولاتدا رەگ داکوتی ، ئیتر میللەتێکی دواکەوتوو ، کە والاسایی میللەتێکی پێشکەوتو بکاتەوە (وەکومە یمون) لەواقیعدا لەوکە سەدە چێت کەزیری تیزاب بەمە عدەنیکی هەرزان بەها بگۆریتەوە. شارستانێتی ئەوروەپای رۆژئاوا: لەسەر بناغەی باری کۆمەڵایەتیەکەی کەتیایدا حوکوم فەرمابووە ، بنیات نرابوو ، ئنجا (بطرس)و (کاترینا) هەولیان دەدالاسایی سەریانی بیناکە بکەنەوە ، بێ ئەوەی هەوڵ بدەن کەوەزع وبارێك بدۆزنەوە ؛ و سازکەن ، کەوا بنچینە ، و بناغەکەیی تێدادا بریژن. ئیتر لەبەر ئەمە گرانباری ئەو گۆرانکاریە کەوتەئەستۆیجەماوەرانی میللەت ، و بەندایەتی ، ورژیمی ئۆتۆکراتی قەیسەری بەهێز کرد. بەم جۆرە ، هەر درهەمێك لەپشکەوتن لەناو رووسیای پاشایەتی قەیسەردا (قنطاریك) گەرانە دواوەی پێوەبوو. فەلاحە روسەکان لەگەڵ بەندەدا ئەوەندە جیاوازیان نەبوو ، بەزەویە کانیانەوە بەسترابوون ، بەروخسەتێکی تایبەتی نەبوایە بەجێیان نەدەهێشت ، خوێندن و فێرکردن تەرخان بوو لەسەر هەندی ئەفسەران، و رۆشنبرانی ، چینە خاوەن زەوی ، و زارەکان. چینی ناوەراست هەرنەبوون ، بەلام جەماوەر تێکرا برسەواد ، و نەفام بوو.

لەزەمانی پێشوودا فەلاحەکان گەلێك شۆرشی خوێنین یان بەرپاکرد ، سەباردت بە دەست درێژی ، وزۆرداری وستەمەوە کە بەسەریان دەهات ، بەلام بەتوندی سەرکوت دەکرا ، دەکوژێنرایەوە ، بەلام ئەمرۆ بەهۆی خوێندن ، و فێرکردنەوە ، هەندێ بیرورا کەلە زەمانی شۆرشەکەی فەرەنسە وناپلیۆندا لەئەوروپای رۆژئاوادا هەبوو هاتە ناو ولاتەکەوە. لەوانەیە لەبیرت مابێت کە ، کەوتنی ناپلیون ، لەئەوروپا دا تێکرا کردارێکی بەرپەرچ دانەوەی (رد فعل) دروست کرد ، قەیسەر ئەسکەندەری گەورە

سەرکردایەتی ئەم شەپۆلەی کرد لە کرداری بەربەرچ دانەوەی کردەوەکانی ناپلیون ، بە پێك هێنانی پەیمانە پیرۆزەکەی ، لەناو پادشاو ئیمپراتورەکاندا ، هەرچەندە ئەوانەی کەدوای هاتن گەلێك خراپتربوون لەپێشینەکانیان. لەدیسمبەری سالی ١٨٢٥ زاینیدا تاقمێك لەئەفسەرە بچوکەکان و ، رۆشنبیرەکان شۆرشێکیان بەرپا کرد ، لەبەر ئەوەی کە هەموویان لەچینی دەرەبەگەکان بوون ، بۆیە جەماوەرانی میللەت و لەشکر پشتی نەگرتن ، و شۆرشەکەیان گوزینرایەوە ، ئەم شۆرشە یەکەم سەرەتابوو لەسەرەتای وشیاربوونەوەی سیاسی لە رووسیادا ، سەبارەت بەوەی کە قەیسەر دژی هەموو بزوتنەوەیەکی سیاسی و گشتی بوو ، بۆ ئەمە ئامادە و لەسەرپێ بوو ، بۆیە پێشتر گەلێك لەکۆمەلە نەهێنی سیاسیەکان پەیدابووبوون ، ئەم کۆمەلە نەهێنیانە هەر بەدەوام بوون ، ئنجا بیرورای شۆرشگێرانە لەناو خەلکدا تەشەنەی کرد ، بەتایبەتی لەناو رۆشنبیرو قوتابیانی زانکۆکاندا.

دوای شکاندنی روسیا لەجەنگی (قرم)دا هەندێ ئیصلاحات لەولاتە کەدا کرا ، بەندایەتی سالی ١٨٦١ زاینی نەما ، هەرچەندە ئەمە لای‌فەلاحەکان زۆر گرنك بوو. بەلام ئەو سوودەیان لێ وەرنەگرت کە ئەمان دەیان ویست ، چونکە بەندە ئازاد کراوەکان ، زەوی ، و زارێکی وایان نەدەدانی ، تاکو پێی بژین ، وەبیرورا شۆرشگێرانەکەی کە رۆشنبیران هەیان بوو هەر بەردەوام‌بوو ، شان بەشانی ئەمەند قەلاکانی حوکومەتی قەیسەریش لەگەلیاندا بۆ کوژاندنەوەی ئەویش هەربەردەوام بوو. بەلام رۆشنبیرە پێشکەوتنخوازەکان پەیوەندیەکی بەتینیان لەگەل فەلاحەکاندا نەبوو ، لەبەر ئەمە ئەو قوتابیانەی کەبیرو رانەنا سراوەکانی سۆشیالیستی میسالی کاری لی کردبوون بریاریان دا بانکیشتنەکەیان بگەیەننە فەلاحەکان بۆ- بەهەزارەها قوتابی روویان کردە دێهاتەکان ، لەبەر ئەوەی کە فەلاحەکان راستی ئەم قوتابیانەیان نەدەزانی تەنگیان پێ هەلچنین ، وەلێیان کەوتنە گومانەوە ، وایان دەزانی ئەمە دەسیسەیە کەبو گەراندنەوەی بەندایەتی‌یە. ئیتر فەلاحەکان گەلێکیان لەم قوتابیانە کەژیانی خۆیانیان لەبەر ئەوان خستبووەمە ترسیەوە ، گرتنیان و دایاننە دەست پولیس. ئەمە نموونەیەکی ئاشکرایە دەربارەی بێ کەلکی هەول و تەقەلادان بێ ئەوەی لەپێشدا پەیوەندی بەمیللەتەوە بکرێت.

بێ هیوابێ ، و نامرادی ئەم قوتابی ، ورۆشنبیرانە ، لەلایەن فەلاحەکانەوە ، وەك کوتەکێکی گەورەوابوو ، کەلێیان درا ، بێزاری ، ووەرسی خستە دەروونیانەوە ، ئیتر پەنایان بردە بەر کرداری ترس و تۆقاندن وەکو فرێ دانی بومبا ، و کوشتنی پیاوانی فەرمان رەوا. بەمە بزوتنەوەی ترس و توقاندن لە روسیادا دەستی پێ کرد ، وبزوتنەوەی شۆرشگێرانەش چوە قوناغێکی نوێوە ، بەرێکخراوە توقینەرەکەی خۆیان دەوت (خواستی گەل) لەراستیدا ناوەکە وەکو ناوەرۆکەکەی نەبوو ، چونکە ئەوانەی ئەمەیان دەکرد نوێنەری دەستە ، و تاقمێکی بچوك بوون لە میللەت.

بەم جۆرە سەردەمێکی نوێ هاتەگۆری ، کە بەدیمەن بریتیبوو ، لەزۆرانبازی لە نێوان ئەم لاوە کچ و کورە خوین گەرمانە ، و حوکومەتی قەیسەردا. لەبەر ئەوەی کە گەلێك دەستەو تاقم لەمیللەتە جۆر بەجۆرەکانی روسیای فرە رەگەزو کەمایەتی کەوابە دەست بەدکاری حوکومەتە خرابەکەوە پەرێشان بوو ، تەنانەت بەکارهێنانی زمانەکەیان لە کاروباری گشیتدا لێ قەدەغەکرابوو ، دوچاری جۆرەها کەساسی ، وسوکایەتی دەبوون ئەمانە هاتنەپال هێزە شۆرشگێرەکان وزلیان کرد. پولندە کەلە پیشەسازیدا لەروسیا پێشکەو توتربوو مل کەچ کرا ، وەبو بەتەنها ویلایەتێکی روسیا ، تەنانەت ئەوەندەی نەمابوو ناوەکەشی لەکیس بچێت ، وەزمانی پۆلندەییان قەدەغە کرد. ئەوەی کە بەسەر رەگەزەکانی تر ، و کەمایەتیەکاندا هات گەلێك توندو تیژتربوو لەوەی کەبە سەر پۆلندە داهات. کە پۆلندەییەکان هەستان روسیا زۆر بەتوندی ، وبێ بەزەیی شۆرشەکەیانی بلیشاندەوە ، وەپەنجا هەزاری لێ ناردن بۆ سیبریا. جولەکەکان هەمیشە دوچاری کوشتار دەبوون ، بو یەزۆربەیان روویان کردە ولاتانی تر.

ئەم جولەکانەو ، خەلکیتر کە ئاخنرابوون لەرق و کینە چونکە حوکومەتی قەیسەر دەست درێژی لەهاوزمان ، و هاونەتە وەیان دەکرد ، بۆیە شتێکی سەیر نەبوو کە بچنە پال تۆقینەرەکانی رووس ، بزوتنەوەکانی توقاندن کەپێیان دەوت جم و جولەکانی (قەلاجوکردن) پەرەیان سەند دیارە قەیسەرەکانیش بەرهەلستیەکی خوێنینیان دەکردن بەرێزی دورو درێژ لە تاوانبارە سیاسیەکانیان دەنارد بۆ جولەوانەکانی سیبریا ،

وەزۆریان لێ کوشنن حوکومەتی قەیسەر بۆ بەربەست کردنی ئەم مەترسیە ، کەوا هەرەشەی لێ دەکات پەنای بردە بەرجۆرە پیلانێکی سەیر: جاسوس و هاندەری دەناردە ناو ریزەکانی شۆرشگیر و تۆقینەرەکانەوە ئیش و کاریان هاندان وفرێ دانی بومبا بوو ، تاکو بەمە خەلکی تری بێ تاوانبار کەن (ازیف) ناو یەکێك بوو لەم هاندەرە رەسمیانە ، کەوا پێشەنگی شۆرشگیرکان بوو ، بۆمبایان فرێ دەدا ، وە لەهەمان کاتیشدا یەکێك بوو لەسەرەکەکانی پۆلیسی نەهێنی روسی گەلێك نمونەی راستەقینەی ترهەیە کە ئەفسەرەکانی پولیسی نەهێنی ، خۆیان بۆمبابان بە فەرمانی پولیس فرێ داوە ، وخەلکی تریان بێ تاوانبار کردوە.

لەماوەی ئەم سالانەدا خاك و مولکی روسیا لە رۆژهەلاتوە درێژبوە وە تاکو گەیشتە دەریای باسفیکی ، وە کوپێشتر باسم بۆ کردیت لەناوەراستی ئاسیا داگەیشتنە سنوری ئەفغانستان ، وە لە خوارووەدا تاسنوری تورکیا. لەوگۆرانکاریە پیرۆزانەی کەلە نیوەی کۆتایی سەدەی نوزدەهەمدا رووی دا پەیدابوونی پیشەسازی رۆژئاواییانەبوو لەنا وروسیا دا ، کە تەنها ناوچەیەکی کەمی گرتبوەوە ، وەك ناوچەی (بطرسبورغ) و (مۆسکو) بەلام بەشەکانی تری ولاتەکە بەتەواوەتی کشت وکال دار بوون ، تێکرا کارکە تازەکان لە شێوەیەکی نوێ دابوون ، وە ئینگلیزەکان دەیان برد بەرێوە ، ئەمە دوو ئەنجامی هەبوو: سەرمایەداری روسیا خیرایی گەیشت لەم ناوچە پیشەسازیە کەمانەدا ، وە بەهەمان خیرایی دیسانەوە چینی کرێکارانیش بێ گەیشت ، کارکەرانی روس بوونە قوربانی بۆ چەوساندنەوەیەکی ناهەموار جونکە ناجار دەبوون کە شەو وروز ئیش بکەن ، هەروەکو جون لەکریکارە ئینگلیزەکان رووی‌دا لە سەرەتای قۆناغەکانی ، بەیرەوی کارگەکان لەئینگلتەرە دا ، بەلام جیاوازی لەنێوان هەردوو حالەتەکە بریتی بوو لەپەیدابوونی بیروراکانی سۆشیالیستی وە شیوعێتیەکی تازە کەکرێکاری روس پەسندی دەکردو بێی قایل دەبوو ، چونکە هیچ بیرو رایەکیان لە مێشکدا نەبوو ، کەچی کرێکار ئینگلیز بریتی بوو لە تۆمارێکی درێژ لەنەریت ، ورەوشت کە کردبوی بەکابرایەکی‌نەریت پەروەر ، و بەسترابوە وەبە بیرو راکۆنەکانەوە.

بیرورا نوێکان دەستیان کرد بەکرد بوونەوە ، ئنجا حیزبی کرێکارانی دیموکراتی پێك هات لەسەر بناغەی بـیـروورای مـارکـسـی دژبـە کـرداری توقاندن. چونکە نەزەری بەی (مارکسی) دەڵێت پێویستە کرێکارەکان خۆیان بکەونە کار ، چونکە تێکۆشانی تێکرایی تاکە رێگەیەکە ، کە کرێکاران ، بەئامانجی خۆیان دەگەیەنێت ، بەڵام تاك تاك کوشتنی خەلکی بۆ ترساندن کرێکارەکان ناخاتە سەرریێی هاوکاری کردنی تێکۆشان ، چونکە مـەبـەسـی کرێکارەکان روخاندنی حوکم و ، رژێمی قەسەرە نەك تەنهـا کـوشـتـنـی قەیسەرو ، وەزیرەکانی.

لەناو ئەو قوتابیانەدا ، کە بەشداری کرداری شۆرشگێرانەیـان کـرد ، قوتابیـەك هەبوو ، کەلە دواییدا لەهەموو لایەکـی جـیـهـانـدا بـەنـاوی (لینین)[1] ئەوە ناسرا. لە ساڵـی ١٨٨٧ زایـنـیـدا تـووشـی خـەفـەت و تەنگانەیەکی زل هات کە هێشتا لەتەمەنی ١٧ ساڵیدابوو ، لەکاتێکدا کـە (اسکندری) برا گەورەی کە وا زۆری خۆش دەویست بیشی کرا بـە پـەتـی سێدارەدا ، چونکە هاوکاری کردبوو لە کردارێکی تۆقاندندا ، بۆ کوشتنی قەیسەر ، سەرەرای ئەم خەفەتە (لینین) ووتی: ئازادی لەرێی تۆقانـدنـە وەدەست ناکەوێت ، بەلکو تەنها لەرێی میللەتەوەیە ، ئـەم لاوە پـێـشـی دەخوا ردەوەو ، بەو رقەوە ، رووی کردە دەرسەکانی ، تاقی کـردنـەوەی (امتحان) قوتابخانەکەیی بە یەکەم وموەتاز بری ، ئیتـر سـەرکـردە ، و دروست کەری شۆرشەکەی کەوا دوای ٣٠ سی ساڵ هەڵگیرسا لـەکـلـی ئـەم کلینجانەیەیە.

(کارل مارکس) وای دەزانی ، ئەوشۆرشە کرێکارانەیەی کە خۆی بیێش بینی بەرپا بوونی کردبوو ، لەولاتێکی پێشکەوتـووی پـیـشـەسـازی وەك ئەلمانیا سەر هەڵدەدا ، کەوا چینی کرێکارانی گەورە ، و رێك وپـێـکـی تێدایە ، وای دادەنا کە روسیا لە هەموو ولاتەکان دورترە لەپەربا بوونـی ئەم جۆرە شۆرشەوە ، لەبەر ئـەوەی کـە دواکـەو تـووە ، وە ژیـانـی ، لەژیانی چەرخەکانی ناوەراست دەچێت ، بەلام (لینین) لـەنـاو لاوەکـانـی رووسیادا تووشی هاورییانی دلسوزهات کەوا لەگەڵ خۆیدا بـەگـەرمـی تـی دەکوشان کەدەبیت جێ بکەن ، تاکو ئەو حالەی کەلـە وزەدا نـەمـاوە ، و بەرگەی ناکرن بێ فەوتێن. وەئەوی پالی پێوەنان بۆ ئەم تیکـوشـان ، و

راوێژکردند لەناو خۆیاندا ، ئەوە بوو کە دەرگای چالاکی ئازاد وەشێوازی دەستوریەکانیان بەرامبەر داخرابوو. ئەم لاوانە بەکەد لەددنیرران بۆ بەندیخانە کان و بۆ سیبریا ، وەیان بۆ ئاوارکەکانی دەرەوەی ولات ، ئیتر بو هەر لایەك بچوونایە بەردەوام بوون ؛ لەتەقەلادان و خوێندنی مارکسیزم دا ، وە ئامادە دەبوون بو روزی تیکوشان.

---

(١) لینین:- ناوی خوی (فلادیمیر ئیلیچ) ە جونکە ئەوەندە نیرراوە بۆ ناوچەی رووباری (لینا) لەسیبریادا ، بە ئاوارەکراوی ، و دووبارە لەو یۆەرای کردۆتەوە ، بۆیە نازناوی (لینین)ی دراوەتی.. وەرگێری کوردی.

# شۆڕشە سەرنەکەوتوەکەی ڕوسیا «ساڵی ١٩٠٥»

## ١٧/مارت/١٩٢٣

دەبوایە مارکسیەکان (حیزبی دیموکراتی سوشیالیستی) لە ساڵی ١٩٥٣ زاینیدا تووشی کێشە ببونایە ، لەکاتی کەراندا بۆ ئەو پرسیارە کەوا هەموو حیزبێکی خاوەن بیرورا ، و ئامانجێکی تایبەتی ، ڕۆژێك لە ڕۆژان دەبێت بۆ وەڵامەکەی بگەڕێت ، لەراستیدا هەموو ژن وپیاوێك ، کە باوەریان بەم بیرورایانە هەیە ، وبروای پێ دەکەن ، لە ژیانیاندا چەند جارێك تووشی ئەم کلێشانە دەبن ، وەپرسیارەکەی ، کەمارکسیەکان تووشی هاتن ، بریتی بوو لەنێوان:ـ سەرپشك بوون لەگرتن و بەندبوونی سەرو مربە بیروباوەرەکەیانەوە ، و لەگەڵ ئامادەکردنی شۆرشێکی کرێکارەنەدا وەیان بەردەوام بوون و ، لەسەر ڕۆیشتن و ، دواکەوتنی جێ بەجێ کردن و حەلێك کە بگونجێت لەگەڵ ئەوبارو ، زروفەدا کە حوکوم فەرمایە ، وە تەنها ڕێگە خۆش کەن بۆ شۆرشەکەی کە بەتەماین. ئەم پرسیارە لەهەموو ، وڵاتەکانی ترو ، وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژ ئاوادا پەیدابوو ، ڕەتارادەیەك لاو ازی حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستی ئاشکرابوو ، کە دووبە رەکی ناوخو وەیان شتێك لەوە بچێت کە حیزبێکی تریتیدا پەیدا ببێت ، مارکسیەکان لە ئەلمانیادا ئازایانە درکاندیان کە بریاریان داوە ، وسورن ، کەبێ چەندو چوون لەسەر بیرورا شۆرشگێریە کە برۆن ، گەرچی لەواقیعدا شل و شولیەکیان نواند ، وە دوای ڕێبازێکی ئیجگا رمام ناوەندی کەوتن ، گەلێك لە سۆشیالیستەکانی فەرەنسە وازیان لە حیزبەکەیان و بوون بە وەزیر هەروها لە ئیتالیا ، و بەلجیکا ، و ولاتانی تردا بەلام لەبەریتانیادا مارکسیەت لەوێدا لاوازبوو ، هیچ کێشەیەك رووی نەدا ، گەرجی ئەندامێکی کرێکاران بووبە وەزیر.

بەڵام بارو ، وەزع ، و هەلویست لەناو رووسیادا جیاوازبوو ، چونکە هیچ ری بە چالاکی بەرلەمانیانە ، نەدەدرا. سەرەرای ئەمەش هەست بە وەدەکراو ، لە وانەبوو ، واز لە شێوازی نادەستوری ، و نامەشروع بهێنێت لە تێکۆشاندا دژی رژێمی قەیسەر ، وەتا ماوەیەك لەسەر سیاسەتی پروپاغەندەی نەزەری بروّن و بەردەوام بن.

بەڵام هەلوێستی (لینین) لەم رووەوە ئاشکرا و ، توندبو ، بەبێ هێزی و نیمچە جێ بەجێکردن قایل نەدەبوو ، تاکو رێزی مارکسیەکان بر نەبێت لە هەل پەرستان ، بەچاوی خۆی ئەوریبازانەی دی کە حیزبە سوشیالیستەکان لە روژ ئاوای ئەوروبادا لە سەری دەرویشتن ، ئیتر کەئەوەی دی بی‌ی خوش نەبوو ، لەباشاندا باسی ئەمە دەکات ، و دەلیت:ـ "شێوازی بەرلەمانی ، کەوا دەولەتە رۆژئاواییەکانی ئەوروپا باسی دەکەن ودەیانەوێت ، جێی ئومێد نی‌یە چونکە هەموو حیزبە سۆشیالیستەکان بە شێتەیی دەکات بەهۆلی (نیاز) و ئاوات چونکە ئەندامەکانی هیچ غەمێکیان نی‌یە هەربەرزی مەنسەب ، و قۆستنەوەی نەبێت.. (هۆلی نیاز لەنیویۆرك دایە بۆتە نموونەی خراپی سیاسەت).

(لینین) گوێی نە ئەدایە ژمارەی ئەندامان (1) ، تەنانەت جاریکیان هەرەشەی کرد کەخۆی بەتەنها دەوەستێتەوە ، بەڵام سووربووله سەرئەوەی کەتەنیا ئەوانە بێنێتە ریزەوە ، کەوا لەپێناوی ئامانجدا ئامادەن بۆ لەخۆ بوردن. وەبەلای بانگەوازو هاواری جەماوەردا ناچن ، (لینین) ویستی دام و دەزگایەك دامەزرێنی لەپسپۆر ، و شارەزایان لەکاروباری شۆرش دا ، کەبتوانن ئازایانە ، و بەوریایی بزوتنەوەکە بەرێوە بەرن ، چونکە ئاوری لەوانە نەدەدایەوە کەبە سەرزارەکی لایەن کرن.

ئەم هەلوێستەی (لینین) رەق ، و ناخۆش بوو ، زۆرکەس رەخنەیان لێگرت ، بەڵام لەدواییدا هەرسەرکەوت. حیزبی دیموکراتی سۆشیالیستی بوو بەدووبەشەوە کە:ـ بە بولشەفیك ، ومەنشەفیك بەناوبانگ بوون ، گەرچی بولشەفیك لای خەلك وشەیەکی ناشیرینە ، بەڵام مانای لە (زوربە) بەولاوە هیچی ترناگەیەنێت ، وە وشەی مەنشەفیکیش مانای (کەمایەتیە).

ئنجاله حیزبەکەدا کە لەساڵی ۱۹۰۳ دابوبو بەدووبەشەوە ، لەبەر ئەوەی کەبەشەکەی سەربە (لینین) زۆرتربوون پێیان دەوترا بۆلشەفیك. ئەوی

شایانی باسە لێرەدا (تروتسکی) کەهاوڕێیەتی (لینین) ی کرد لەشۆڕشی ساڵی ١٩١٧ زاینید لەسەرەتای کاردا لەبەرەی مەنشەفیك بوو.

ئنجا چەند ئالوگۆڕێکی نەزەری لە (لندن) دا کرا نەك لەرووسیادا. وە حیزبە رووسییەیە کە ناچار بوو کەلە (لندن) کۆبێتەوە، چونکە ئەم کۆبوونەوەیە لەروسیای رژێمی قەیسەردا نەدەکرا لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەندامەکانی ئاوارە کراوبوون، وەیا جۆرەها حوکومیان بەسەرەوەبوو، وەیان لەسیبزیاوە رایان کردبوو.

لەهەمان کاتدا، لەناو روسیادا مەنجەلی شۆڕشەکە هاتبوە کوڵ، دەست پێ کردنی شێوانی سیاسەت نیشانەی قەومانی تەنگانە یەك بوو، ئەگەر لەرووی ئابورییەوە مان گرتنی سیاسی کرێکارەکان، هیچ خێرێك وئەنجامیکی چاك بوونی نەبێت، بۆنموونە وەکو زیادکردنی کرێ، تەنها بریتیبووبێت لەدەربرینی بێزاریەك لەسەر هەندی کردەوەی سیاسی حوکومەتەکە، ئەمەشیان دیسانەوە نیشانەی وشیاری سیاسیە لەناو رێزی کرێکارەکاندا. هەر هەمان بارو وەزع لەهیندستانیشدا روودەدا کە ئەگەر کرێکارەکانی ئەوی، بەمان گرتن بێزاری دەربرن، لەسەر گرتنی (غاندی) وەیا لەسەر زۆرداری حوکومەت بەجواب بن زۆرسەیرە کە ئەم جۆرە مان گرتنە سیاسیانە بە دەگمەن لەرۆژئاوای ئەوروپادا روودەدات، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێتی کرێکارانی تیدا بەهێزە. لەوانەیە هۆکەی ئەوە بێت، کە سەرکردەکانی کارکەران لەتوندوتیژی بزوتنەوەکانی کرێکارانیان کەم کردبێتەوە، لەپێناوی خزمەت کردنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا. بەلام لەرووسیادا، بەردەوامی زۆرداری رژێمی قەیسەر، هۆ سیاسیەکەی کردبە پێشەنگی هەموو مەبەستێك، بۆیە هەرلە ساڵی ١٩٠٣ زاینیەوە مان گرتنە گەورە سیاسیەکان لەخوارووی رووسیادا پەیدابوو ئەم بزوتنەوانە گەلێك فراوان بوون، وە لەکاریگەریەکەی کەم نەبوەود، مەگەر بەنەبوونی سەرکردە بەتواناکان نەبێت، بۆ سەرکردایەتی کردنی.

لە ساڵی ئایندەدا گیروگرفتێك لەرۆژهەڵاتی دووردا پەیدابوو، لەنامەیەکی پێشتردا دەربارەی هێلە ئاسنەکەی لەمەر شەمەندەفەری سیبریا ئاگادارم کردیت، کە دروست کرا، و دەشتەکانی (استبس)ی ئاسیای ژوورووی دەبری، ودەگەیشتە دەریای باسفیکی، دیسانەوە دەربارەی

ئەوشەرو هەرایەی کە لەگەڵ ژاپوندا ساڵی ١٨٩٤ زاینی ، هەروەها لەجەنگەکانی روس و ژاپون لەنێوان ساڵی ١٩٠٤ ـ ١٩٠٥ زاینی رووی دا ئاگادارم کردیت دیسانەوە باسی (یەکشەمەی سوور) (٣) م بۆکردیت کەلە ٢٢ یەنایری ساڵی ١٩٠٥ زاینیدا رووی‌دا لە کاتێکدا پاسەوانەکانی قەیسەر تەقەیان لە خۆپیشاندانێکی ئاشتیانە کرد کە قەشەیەك سەرکردەیی دەکرد، کەوا هانایان بردە بەر (باوکە بچکولەکە) ، کەنانیان بداتی ، ئیتر لەئەنجامدا شەپۆلێکی ترس دای بەسەرولاتەکە دا ، وەگەڵێك مان گرتنی سیاسی بەرپابوو ، لەپاشدا مان گرتنێکی گشتیش بەرپابوو ، سەرانسەری ولاتەکەی گرتەوە ، بەم چەشنە جۆری نوێی شۆرشی مارکسی دەستی پێ کرد.

کرێکارەمان گرەکان لەشارە گەورەکانی (بطرسبورغ) و (موسکو)دا رێکخراویکیان دروست کرد پێیان دەوت (سوفیت) ئەم رێکخراوە لەسەرەتای کاردا تەنها یەك لێژنە بوو کاروباری مانگرتنەکەی دەبردبە رێوە ، (تروتسکی) سەرۆکی سۆفێتی (بطرسبورغ) بوو ، حوکومەتی قەیسەر دووچاری تەنگانەو کێشەیەکی زل بوو ، پاش گەزبوەوە ، و پەیمانی دا کە ئەنجومەنێکی دەستوری پێك بێنێت ، وهەرلێژاردنێکی دیموکراتیانە بێتەکایەوە ، ئیتر بالە خانەوکۆشکی لوتوکراتیەت وا دیاربوو لەرخاندابێت بەم جۆرە کرێکارەکان بەمان گرتنە گشتیەکەیان ، دەست کەوتێکیان دەست کەوت. کەنە بەشۆرشە کانی رابوردووی فەلاحەکان ، وەنەبە بومباکانی توقینەرەکان ، وەنەبە سکالا ، و کوروژانەوەی دەستور بەمام ناوەندیە ئازادەکان دەستیان نەدەکەوت ، یەکەم جارە لەمێژووی رژێمی قەیسەردا ، کەقەیسەرسەر شۆرکات بەرامبەربە جەماوەری گەل. لەگەڵ ئەمەشدائەم دەست کەوت خۆی سەرکەوتنێکی بۆش بوو ، بەڵام یادی بووبوو بە مەشخەڵێك رێگەی کرێکارەکانی روناك دەکردەوە.

قەیسەر پەیمانی دا ، کە ئەنجومەنێکی دەستوری دامەزرێنێت ، ئەمە وادەگەیەنێت جێگایەك بۆ بیرکردنەوە نەك بۆ قسەکردن وەکو بەرلەمانەکانی تر. (وشەی بەرلەمان لەوشەیەکی فەرنسیەوە وەرگیراوە بەمانا "دەلێت") بەم پەیمانە کولی مام ناوەندیە ئازادەکان نیشتەوە ، خۆ مام ناوەندیەکان هەمیشە بەئاسانی قایل دەبن. بەڵام دەرەبەگەکان

٥

لەترساندا هەندێ ئیصلاحاتیان کرد فەلاحە دەولەمەندەکان سوودیان لێ وەرگرت. دوای ئەمە حوکومەتی قەیسەر ، بەرامبە رشۆرشگێرە راستەقینەکان وەستایەوە ، کەشارەزای کەم وکوڕییان بووبوو ، وەبۆ سوودی خۆی بەکاری هێنا: کرێکارانی برسیان تێدابوو کەهاواریان دەکردو ، داوای نانیان دەکرد ، لەگەڵ زیادکردنی کرێ ، زیاتر لەوەی کە بایەخ بەسیاسەت بدەن فەلاحە هەژارەکانیان تێدابوو کەهاواریان دەکردو ، داوای زەوی ، و زاریان دەکرد کەبیان دریێتی ، و بیکێڵن ، لەلاکەی ترەوە شۆرشگێرە کان هەبوون کەوا لایەنی سیاسییان لاگرنگتربوو ، داوای بوونی بارلەمانێکیان دەکرد کەلە بەرلەمانەکانی رۆژئاواییەکان بچێت ، زۆر بیریان لەداخوازیەکانی جەماوەرە قەلەبالغەکەو ، هەستەکانیان نەدەکردەوە ، وەگەلێکیش لەدەستە و تاقمە بەرەزوورەکانی کارکەرە چالاکەکان هەبوون کەلەناو ڕێکخراوییەکیەتیەکانی کرێکارەکاندا بوون ، هاتبوونەناویانەوە ، بەمەبەسی دەست کەوتنی ئامانجێکی سیاسی. بەلام جەماوەرە قەلەبالغەکەی ناوشارو ، لادێکان ، ئەوەندە بەپەرۆشەوە نەبوون ، بۆیە حوکومەتەکەی قەیسەرو پولیس هەربە هەمان ڕێباز دارۆیشتن کەهەموو زۆرەڕێك پێیدا دەروات کەبریتییە: لەدروست کردنی دووبەرەکی ، و هاندانی جەماوەر لەهەندێ کۆمەڵانی شۆرشگێر. روسەکان جولەکانیان دەکوشت ، هەروەها تاتارەکان ئەرمەنیەکانیان دەکوشت ، قوتابی ، و کرێکارە هەژارەکان بەکژیەکدا دەچوون. بەم جۆرە کە حوکومەت پشتی شۆرشەکەی لەگەڵێك لاوە شکاند لەناو ولاتەکەدا ، ئنجا رووی کردە ناخی گێژە لوکەکە ، کەبریتی بوو لەشاری (بطرسبورغ و موسکو) ، سوفێتی (بطرسبورغ)ی بەئاسانی بلیشاندەوە ، بەڵام فەوتاندنی سوفێتی (موسکو پێنج رۆژی خایاند ، چونکە لەشکر لایەنی شۆرشگێرە کانی دەگرت دوا ، بەدای ئەمە حوکومەت دەستی کرد بەکرداری تۆلەسەندن ، لەشاری مۆسکودا بەبی موحاکەمە هەزار کەسی کرد بەسێدارەداو حەفتا هەزاریشی خستە بەندیخانەوە ، ژمارەی قوربانی شۆرشەکان تێکرا گەیشتە چواردە هەزار کەس.

بەم جۆرە شۆرشی ساڵی ١٩٠٥ زایینی بەنامرادی ، و وێرانکاری کۆتایی هات ، بەڵام بووبە پێشەکییەك بۆ شۆرشە سەرکەوتوەکەی کەلە ساڵی ١٩١٧

زاینیدا روویدا. ئیتر جەماوەر پێویستی بەچەند پەندو ، دەرسێك هەیە کەلە کارەسات و لێ قەومانە مەزنەکانەوە هاتبێت تاکو وشیاریەکەی پەروەردە ببێت ، وەبتوانێت لەناوچەیەکی فراواندا بکەوێتە کار ، ئنجا جەماوەر ەکە پەندو دەرسەکەی خۆیی لەشۆرشەکەی سالی ١٩٠٥ زاینیەوە وەرگرت ، کەوا نرخەکەی گران کەوت لەسەری.

ئەنجوومەنی (دوما) هەلبژێر ا ، لەمایسی سالی ١٩٠٦ زاینیدا کۆبوەوە هەرچەندە ئەنجومەنێکی شۆرشگیرانە نەبوو ، بەلام تارادەیەکی وا ئازادبوو کە قەیسەر ریّی نەدەداو بەدلی نەبوو ئنجا دوای کۆبوونەوەکەی بەدوو مانگ و نیو ، قەیسەر هەلی وەشاندەوە ، چونکە قەیسەری بەهیچ نەدەزانی دوای ئەوەی شۆرشەکەی کوژاندەوە.

ئەندامانی ئەنجومەنی (دوما)ی هەل وەشاو کەوا لەچینی ناوەراست ، و لەدەستوریە ئازادەکان بوون ، چوونە (فلندە) کەلە شاری (بطرسبورغ) ەوە نزیکە ، [illegible] سەربە خوبوو ، گەرچی بەناو لەژێر دەسەلاتی قەیسەردابوو ئەم پەنا بەرانە بەمیللەتی رووس یان راگەیاند کەباج نەدەن ، وە نەبنە سەرباز لە لەشکر ، و لەهێزی دەریایی روسیادا ، وەك دەربرینی بێزاریەك چونکە ئەنجومەنی (دوما) هەلوەشێنراوەتەوە ، بەلام هەندێ کەس لەجەماوەرانی میللەت نەیان توانی وەکو پێویست بوو بجوولێنەوە.

لەسالی ١٩٠٧ زاینیدا ئەنجومەنێکی تری (دوما) هەلبژێررا ، پۆلیس بەهەموو جورێك هەولی دا کوسپ دابنێت ، تاپالێوراوانی رادیکالیەکان ، نەهێلێت سەرکەون لەهەلبژاردنە کەدا ، تایبەکاری بەگرتنی هەندێکیان کە ئەگەر پێویست بوایە ، سەرەرای ئەمەش ئەنجومەنە تازەکە جێی رەزامەندی قەیسەر نەبوو ، پاش کوبوونەوەی بەسێ مانگ هەلی وەشاندەوە. قەیسەر هەندێ هەنگاوینا ، تا ئەوکەسانەی دزوناحەزن سەرنەکەون ، ئەجەبە هۆی راست کردنەوەی یاسای هەلبژاردنەوەوە ، ئنجا حوکومەت لەمەیاندا سەرکەوت وە ئەنجومەنی سێیەمی (دوما) نوێنەری نەریت پەروەرەکان ، (المحافظین) و جێی رەزامەندیان بوو ، ئیتر ئەنجومەنەکە تەمەنێکی درێژی بردەسەر.

کچم لەوانەیە سەرسام بیت لەو هۆیەی کەوا پالینا بەقەیسەرەوە کەئەم ئەنجومەنە (دوما) لاوازانە هەلبژێریت ، هەرچەندە دەیتوانی بەئارەزووی خۆی حوکوم بکات ، دوای ئەوەی کە سەری بەشۆرشی سالی ١٩٠٥ زاینی

شۆڕکرد ، لەوانەیە یەکێك لەهۆی تەقەلاکانی قەیسەر قایل کردنی هەندێ لەکۆمەلە بچکولەکان بووبێت لەڕووسیادا وەکو دەرەبەگ و بازرگانەکان. باری ولاتەکە زۆر ناهەموار بوو ، هەرچەندە سەربە میللەت شۆڕکرا هێشتا داخ لەدڵ و بێزاربوو. قەیسەر وای بەچاك دەزانی ، کە دۆستایەتی ، و ئاشنایەتی لەگەڵ دەولەمەندەکاندا بپارێزێت. بەلام گرنگترین هۆی تەقەلاکەی قەیسەر خۆنواندن بووە بەرامبەر ولاتە رۆژئاواییەکان کە گوایا ئەم حوکومڕانێکی ئازاد بووە ، دوای ئەوەی خراپی حوکومەتی قەیسەرو زۆرداری بەنمونە لە ئەورووپادا دەگێڕرایەوە. وابزانم یەکێك لە پێشەواکانی حیزبێ ئازاد بووەکان لە ئینگلتەرەدا ، لەئەنجومەنی گشتی ئەویدا ، دوا بەدوای کەوتنی ئەنجومەنی (دوما) ی بەکەم هاواری کرد ، و ووتی: (دوما مرد ، بژی دومای تازە). قەیسەر زور پێویستی بەپارە بوو کە فەرەنسەییەکان دەیان دایە بەقەرز ، کەتوانی بەو پارەیە سەربە شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٠٥ زاینی شۆڕکات ، هەروها شتێکی سەیرە کەدەبینین فەرەنسەی جمهوری پشتی ئوتوکراتی روسی دەگرێت بو بلیشاندنەوەی رادیکالی و شۆڕشگێڕەکان لەوێدا ، بەلام لەواقیعدا فەرەنسەی جمهوری بریتییە لەپارەدار ، و خاوەن بانقەکان ، هەرچونێك بێت دەبوایە قەیسەر روالەت پەروەر بوایە لەبەر ئەمە (دوما)کەی بۆ ئەم مەبەسە بەکار هێنا.

بەلام بارو ، وەزع چ لە ئەوروپا ، و چ لە جیهاندا بەتێکرایی زۆربە خێرایی دەگۆڕرا ، ئنجا بەریتانیا لەروسیا نەدەترسا ، وەکو جاران کەهیشتا بەدەستی زابون نەشکابوو ، ئیتر بەریتانیا رووی کردە بەربەرەکانی کەرێکی نوێی بەترس ، ئەویش ئەلمانیابوو کەلە پیشەسازی و دەریا دا ، تەنکی بەبەریتانیا هەڵچنیبوو ، چونکە ئەم دەریای بەهی خۆی دەزانی ، دیسانەوە فەرەنسە لە ئەلمانیا دەترسا ، بۆیە فەرەنسە پارەی دەدابە روسیا ، ئیتر (کیجەلی) ئەلمانیا بووبە هۆی بوونی خۆشەویستی لەنێوان دوو دوژمنی سەرسەختدا. لەساڵی ١٩٠٧ زاینیدا بەریتانیا وروسیا ، پەیمانیکیان بەست ، بەپێی ئەم پەیمانە هەرکێشەیەك لەنێوان هەردوو لادا مابووەوە دەربارەی ولاتی ئەفغانستان ، و ئێران ، و ولاتانی تر جێ بەجێ کرا ، دوا بەدوای ئەمە رێکەوتێنکی سێ قولی ، لەئینگلتەرەو ، فەرەنسە ، و روسیا پێك هات ، لەمەیاندا مەبەس ئەوەبوو

بەرامبەر پەیمانە سێ قۆڵیەکەی ، کەلە ئەلمانیا ، نەمساو ، ئیتالیا پێك هاتبوو بوەستنەوە ، چونکە نەمسا لە بەلقاندا بەربەرەکانی روسیای دەکرد ، وە نەمساش هاوپەیمان بوو لەگەڵ ئەلمانیا و ئیتالیادا گەرچی لەسەر کاغەزیش بوو بێت ، هەردوو بارەگاکە دەستیان کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ ومیللەتانیش لەبرخەی خەودابوون نەیان دەزانی چارەنووس تووشی چ بەلایەکیان دەکات.

سالانی دوای شۆرشەکەی ١٩٠٥ زاینی سالانی بەر پەرچ دانەوە بوون ، بولشەفیك وئەندامە شۆرشگێرەکانی تر بەتەواوەتی بلیشانەوە ، هەندێ لە فەیە لەسووفەکان وەکو (لینین) لەئاوەرکەکانەوە ، زۆر بەخۆ راگرتوییەوە سوربوون لەسەر بەردەوام بوونی تێکۆشانیان ، کتێب و ، وتاریان دەنووسی و هەولیان دەدا کە مارکسیەت بگونجێنن لەگەڵ بارو زروفی تازەدا. کەلینی ناکۆکی لەنێوان مەنشەفیك ، (حیزبی کەمایەتیە مام ناوەندیەکە) ، و بولشەفیکدا فراوانتربوو ، *لەسالانی* بەرپەرچ دانەوە کە داپشکی (سهم) بو لشەفیکەکان زیادی کرد ، لەراستیدا لە حیزبەکەی تر ژمارەیان زۆرتربوو. بەلام لەسالی ١٩١٢ زاینیەوە گۆرانێکی تر بەسەر ولاتەکە داهات ، چونکە کردەوەی شۆرشگێرانە دووبارە بەهێزبوەوە ، هەروها بولشەفیکەکانیش بە هێزبوونەوە ، لەناوەراستی سالی ١٩١٤ زاینیدا ، بانگەواز بۆشۆرش لە (بتروغراد) دا بەتین بوو ، وەمان گرتنە سیاسیە گەورەکان پەیدابوونەوە - وەکو ئەومان گرتنانەی کەلە سالی ١٩٠٥ زاینیدا رووی دا. بەلام شۆرشەکان ، ئەوئەندامە بێگانانەی کەتێ هەلکیشی دەبن و دەچنە ناویەوە دەریان دەخات. ئنجا دەرکەوت کەوا لەئەندامانی لێژنە بولشەفیکە حەوت کەسیە کەی (بطرسبرغ) سێانیان لەپیاوانی سەربە پۆلیسی نەهێنی قەیسەربوون. لەئەنجومەنی (دوما) دا ژمارەی بولشەفیکەکان کەم بوو سەرۆکیان مالینوسکی بوو ، دەرکەوت کە ئەم کابرایە جاسوسێکی سەربە پولیسە کەچی لەگەڵ ئەمەشدا (لینین) متمانەی پێ دەکرد(٤).

لەسالی ١٩١٤ زاینیدا ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی کرایەوە ، لەناکاو سەرنجی بەلای هەردوو بەرە شەر کەرەکەدا راکێشا ، زۆربەی کرێکاران کران بەسەرباز ، وەبزوتنەوەی شۆرشگێرانە مرد. بەلام ئەوکەمایەتیە بولشەفیکەی کەوا جەنگەکەیان لاباش نەبوو ، و خراپیان ئاشکرا دەکرد

میللەت خۆشی نەدەویستن(٥).

ئیتر لێرەدا ، دەوەستم لەسەری ناڕۆم ، تاکو سەرنجت بەلای هونەرو ، وێژەی روسی دا راکێشم ، روسیای رژێمی قیسەر سەرەرای هەڵە زۆرەکانی کە هەیبوو لە پەرەوەردەکردنی سەمای روسیدا (بالیە) سەرکەوت ، روسیای سەددی نۆزدەهەم ژمارەیەکی لەوێژەوان هینایە مەیدان ، کە گەنجینەیەکی وێژەیی نەمریان بەجێ هێشت ، وە لە نوسینی چیرۆکی کورت ، و درێــژدا دەستێکی باڵایان هەبوو. (بوشکین) لەسەرەتای ئەم سەدەیە داژیاوە. دەڵێن مەزن ترین بویژانی روس بووە ، وهاودەمی (لوردبایــرون) و (شــیلــی) و (کیتز) بوە. (کوکول) و (تورجنیف) و (دیستوفسکی) و (تشیکـوف) لــە وێژەوانان ، و چیرۆك نوسانی سەدەی نۆزدەهەم بوون. لەهەمویان مەزن تــر (لیون تولستوی) یەکە چیروك نوسێکی بلیمەت ، و پێشەوایەکی ئاینی ، و روحی دورئەندێش بوو ، تارادەیەك ناوبانگی گەیشتبوە (غاندی) کاتــێـك کەلە خوارووی ئەفەریقابووە ، وە رێزیان لەیەکتری گرتووە ، و نامــەیــان بۆیەکتر ناردوە ، دوای ئەوەی باوەری هێز بە کار نەهینان بەیــەکــتــری گەیاندوون. تولستوی وتوویەتی: ئاشتی ئەو بنچینەیــە یــەکــەمــە ســیــح پەیرەوەکانی لەسەر بنیات ناوە ، وە (غاندی) ش بەپێی دەسـت نــووســە کونەکانی هیندوکیە کان ئەمیش گەیشتونە هەمان ئەنجــام ، هــەرچــەنــدە تولستوی وەکو پێغەمبەریك وابوو لەگەڵ بیروباوەرەکەیدا شــان بــەشــانــی یەکتری دەرۆیشتن دور لەجەماوەران ، کەچی (غاندی) ئەم بــیــروبــاوەرەی بەکردەوە ، وبە رێبازیکی باشدا لەناو جەماوەرانی خەڵــکــدا لــەخــوارووی ئەفەریقا ، و هیندستان بڵاوکردەوە ، و خستیەکار.

هەروها (مکسیم غورکی) لەنووسەرە بەناو بانگەکانی روسە لــەســەدەی نۆزدەهەمدا.

---

١) کوردواتەتی: (زۆربەو بوربی) ــ وەرگێر.

٢) یەکشەمەی خوێناو یشی پێ دەڵێن ــ وەرگێر

٣) بەلقان بریتی‌یە لەم ولاتانە: (یوغوسلافیا ، ئەلبانیا ، یۆنان ، بلغاریا ، ورۆمانیا... هتد).
٤) مالینوسکی ، وەیا مالیتوفسکی: لە بابەت ئەم کابرایەوە (لینین) وتوویەتی:ـ (بەدەستێك بەیاننامە ، ورۆژنامە ، و بیروباوەری ئێمەی بلاودەکردەوە ، بەدەستەکەی تریشی ئەندامانی ئێمەی دەناردبۆ بەندیخانە.) ئەمە وادەگەیەنێت ئەم کابرایە هەرچەندە جاسوسیش بووە بولشەفیکەکان توانیویانە سوودی لێ وەرگرن ، گەرچی لە کۆتایی دەوراندا لە دەستیان دەرنەچووە ، لە دوای موحاکمە کردنی سزای کوشتنیان داوە بەسەردا ـ وەرگێر.
دەرنەچووە.
٥) سەربارەت بەوەی کەبورجوازی ، و سەرمایەدارەکان ، بەخۆیان ، و دامەزراو ، و حوکومەتە کانیانەوە ، بە ئەدستووری بەخەڵکیان راگەیاندبوو کەئەم جەنگی یەکەمی جیهانی‌یە لەپێناوی پاراستنی نیشتماندایە ، وەبە ناوی نیشتمان پەروەری‌یەوە ، خەلکێکی زۆریان لاس دابوو ، وەبولشەفیکەکانیش بەرهەڵستی ئەم جەنگەیان دەکرد ، وەبە زۆرانبازی‌یەکیان دا دەنا لەناو دووبەرە لەجانەوەر و ، درندە لەسەرمایەدارانی نێو دەولەتان ، وەدەیان و ت هیچ سودێکی نی‌یە لەود بەولاوە کە فەلاح ، و کرێکار ، و جەماوەری چەوساوە ، و رۆلەکانیان تیادە چێت ، ئەمە لەلایەك ، وە لەلایەکی تریشەوە ، شۆرشە جیهانی‌یەکەی لەمەر کارکەران چەوساوان لەبار دەبات ، و درێژە دەدات بەکوێرەوەری ، و مەینەتی گەلان بەتێکرایی ، کەچی لەکۆتایی دەوراندا وتەی بولشەفیکەکان راست بوو ـ وەرگێر.

# نەمانی ڕژێمی قەیسەر لەڕوسیادا

## ٧/نیسان/١٩٣٣

کچم کە چیرۆکی جەنگی گەورەم بۆ گێرایتەوە دەست نیشانی شۆڕشەکەی روسیا ، و کاریگەریەیم بۆ کردیت بەسەر جەنگەکەدا ، سەرەڕای ئەمەش شۆڕشەکە ، کارەساتێکی پیرۆز ، وبێ هاوتا بوو لەجیهاندا ، هەرچەندە ئەم شۆڕشە یەکەم شۆڕش بو ، لەم بابەتە ، بەڵام ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت کەبە تاکە شۆڕش بمێنێتەوە ، چونکە بووە بەنموونە بۆ ، وڵاتانی تر هانیان دەدات چاوی لێ بکەن بۆیە پێویستی بەلێکۆڵینەوە یەکی وردەیە ، شۆڕشە کەی ڕوسیا گەورەترین ئەنجام بووکە جەنگە کەدای بەدەستەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ، کەمترین شتێك بۆ کەحوکومەتە کۆنەپەرستەکان ، وسیاسیەکانی ئەوروپا کەخۆیان خستبوە گێژاوی جەنگەکەوە بەهیوای ڕوودانی بوون. ڕاست تر ئەوەیە کە بڵێین: ئەم شۆڕشە لەچۆنیەتی مێژوویی ، وئابوری کە ئەوسا لەروسیادا هەبو ، دروست بوبو ، کە جامەکەی لەزبانیەکی زۆر و مەینەتیەك کە جەنگەکە بەجێی هێشتبو پڕبوبو ، ئنجا بلیمەتەکەی شۆڕش (لینین) بەچاکی بەکاری هێنا و سوودی لێ وەرگرت.

ڕاستیەکەی لەساڵی ١٩١٧ زاینیدا دوو شۆڕش ڕوویدا ، یەکێکیان لەمارت ، و ئەوی تریان لەنوفەمبەردا ، بەڵام دەتوانین بڵێین یەك شۆڕش بوون پێکەوە ، کە گەیشتبونە دوو لوتکەی بەرز لەم مانگەدا.

کچم لەنامەکەی دوایمدا باسی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ زاینیم بۆ کردیت ، کەوا بەرپابو لەکاتی جەنگێکدا کە روسیا پێی هەڵسابوو ، حوکومەتی قەیسەر ئەم شۆڕشەی بێ بەزەیی گوژاندەوە ، ئیتر لەسەر حوکمڕانیە ئوتوکراتیانەکەی خۆی ڕۆیشت و بەردەوام بوو ، جاسوسەکانی لە

# نەمانی ڕژێمی قەیسەر لەڕوسیادا

**٧/نیسان/١٩٣٣**

کچم کە چیرۆکی جەنگی گەورەم بۆ گێرایتەوە دەست نیشانی شۆڕشەکەی روسیا ، و کاریگەریەیم بۆ کردیت بەسەر جەنگەکەدا ، سەرەرای ئەمەش شۆڕشەکە ، کارەساتێکی پیرۆز ، وبێ هاوتا بوو لەجیهاندا ، هەرچەندە ئەم شۆڕشە یەکەم شۆڕش بو ، لەم بابەتە ، بەلاّم ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت کەبە تاکە شۆڕش بمێنێتەوە ، چونکە بووە بەنموونە بۆ ، ولاّتانی تر هانیان دەدات چاوی لێ بکەن بۆیە پێویستی بەلێکۆڵینەوە یەکی وردەیە ، شۆڕشە کەی روسیا گەورەترین ئەنجام بووکە جەنگە کەدای بەدەستەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ، کەمترین شتێك بۆ کەحوکومەتە کۆنەپەرستەکان ، وسیاسیەکانی ئەوروپا کەخۆیان خستبوە گێژاوی جەنگەکەوە بەهیوای ڕوودانی بوون. ڕاست تر ئەوەیە کە بڵێین: ئەم شۆڕشە لەچۆنیەتی مێژوویی ، وئابوری کە ئەوسا لەروسیادا هەبو ، دروست بوبو ، کە جامەکەی لەزیانیەکی زۆر و مەینەتیەك کە جەنگەکە بەجێی هێشتبو پربوبو ، ئنجا بلیمەتەکەی شۆڕش (لینین) بەچاکی بەکاری هێنا و سوودی لێ وەرگرت.

ڕاستیەکەی لەساڵی ١٩١٧ زاینیدا دوو شۆڕش ڕوویدا ، یەکێکیان لەمارت ، و ئەوی تریان لەنوفەمبەردا ، بەلاّم دەتوانین بڵێین یەك شۆڕش بوون پێکەوە ، کە گەیشتبونە دوو لوتکەی بەرز لەم مانگەدا.

کچم لەنامەکەی دوایمدا باسی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ زاینیم بۆ کردیت ، کەوا بەرپابو لەکاتی جەنگێکدا کە روسیا پێی هەڵسابوو ، حوکومەتی قەیسەر ئەم شۆڕشەی بێ بەزەیی گوژاندەوە ، ئیتر لەسەر حوکمرانیە ئوتوکراتیانەکەی خۆی ڕۆیشت و بەردەوام بوو ، جاسوسەکانی لە

ئازادیخوازەکان بەردا ، بۆ دۆزینەوە ، وبلیشاندنەوەیان ، مارکسـیـە بـو لشەفیکەکان تێك شکێنران ، سەرکردەکانیان لـەژن ، و لـەپـیـاو ، یـان لەبەندیخانەکانی سیبریا ، وەیان لە ئاوارگەکانــی دەرەوەی وڵاتـدابــوون.
بەڵام ئەم ئاوارەکراوانە کەم بوون بەسەرکردایەتی (لینین) لەتێکۆشان ، و بڵاوکردنەوەی پروپاغەندە ، و خوێندن و لێ کۆڵینەوەی شـیـوعـیـّتــی دا بەردەوام بوون ، هەموویان بروایان بەمارکسیزم هەبوو ، بەڵام نەزەرییەی مارکسی ئامادە کرابو ، بۆ ولاتێکی پێشکەوتوو لەپـیـشـەسـازیـدا وەکـو ئەلمانیاو ئینگلتەرە ، بەڵام روسیا هێشتا ولاتێکی گـشـت وکـالـدار ، و لەسەردەمی چەرخەکانی ناوەڕاستدا بوو ، پیشەسازی تێدا نەبوو ، مـەگـەر کەمێك ، ئەویش لەشارە گرنکەکانیدا. ئیتر (لینین) دەستی کرد بەراست کردنەوە ، و دەستکاری کردنی بیروراکانی نەزەرییەی مارکس تاکو لەگەڵ باری روسیادا بگونجێت ، لەم بابەتەوە (لینین) زۆری نووسی ، گفتـوگـۆ زۆرکرا لەنێوان پیاوە ئاوارەکراوەکـانــی روسـدا دەربــارەی نـەزەرییــەی شۆڕشەکە. (لینین) بروای وابوو کەدەبێت کاروبار لە دەست پیاوی شـارەزا و ، قال بوو دابێت نەك تەنها شۆڕشگێڕانی خوێـن گـەرم بـن ، و ە وای بەچاك دەزانی کە تەقەلا دان لەپێناوی شۆڕشدا ، دەبێت شان بـەشـانـی ، تەدریب و راهێنانی خەڵکی بڕوات ، کەوا چی پێویـسـتـە لـەسـەریـان ، لەکاتێکدا کە شۆڕش بەرپا دەبێت بیکەن. بەم جۆرە (لینین) و هاوڕێکانی ئەو ماوەیەی کەلە دوای ساڵی ١٩٠٥ زاینیەوە بوو ، بەکاریان هێـنـا بـۆ ئامادەکردنی خۆیان ، لەپێناوی کار ، و فرمانی ئایندە دا.

لەسەرەتای ساڵی ١٩١٤ زاینیدا خەڵکی شـارەکـانـی روسـیـا دووبـارە هاتنەوە هۆش خۆیان ، هۆشیاری ، خواستێکیان تێ گەرایەوە ، گەلێك مان-گرتنی سیاسیانە پەرپا بوو ، وەکە جەنگەکە هەڵگیرسا ، بـیـرو هـۆشـی خەلکی پێوەی خەریك بوو ، زۆربەی کرێکارەکان نێرران بۆ ناوچەی جەنـگ (لینین) و هاوڕێکانی کە (زۆربەیان لەئاوارکە بوون) هـەر لـەسـەرەتـاوە بەرهەڵستی جـەنـگـە کـەیـان کـرد ، و دوای نـەکـەوتـن ، هـەروەکـو سۆشیالیستەکان لەولاتانی تردا دوای کەوتن. چونکە (لینین) بەجەنگێـکـی سەرمایەدارێتی دادەنا کەوا بۆ چینیکرێکـاران بـێ سـوودە ، و هـیـچـی بەکەڵکی کرێکاران نایەت ، مەگەر هەرئەوەی کە دەبێتـە رێـبـازیـك بـۆ ئازادیان.

لەشکرەکەی روسیا دووچاری زیانێکی زۆربوو ، گەلێك زیاتر لەزیـانـی لەشکرە بەشداربووە کانی تر لەجەنگەکە دا ، ئەفسەرانی روس ئەوەندە بێ دەسەلات بوون گەلێك زیاتر لەو دەسەڵاتی ئەفسەرە ئاساییەکان ، سەربازە روسەکان چەکی بێ کەلك ، وبێ فیشەکان پڕنەبوو بـێـپـاراسـتـن بـوون ، لەمەیدانی جەنگدا بەسەد هەزارانیان لی دەکەوت. چەوسێنـەرە وە ، هـەل پەرستەکان لە (بتروغراد) وەیا (بطرسبورغ) و شارە گـەورەکـانـی تـردا کەوتنە جم و جوول ، وەبازرگانیان بەم مەینەتیەوە دەکرد ، و سـامـانـی خۆیان زیاد دەکرد ، دیارە لەبەرژەوەندی ئەم بازرگانانە بوو کە جەنگەکە درێژە بکێشیت تادوایی ، وەیان هەردوایی نەیەت ، بـەڵام کـرێـکـارو ، فەلاحەکان ، کە سەربازەکان لەمان بوون توانایان نەمابـوو ، بـرسـی ، و وەرس ، و بێزاربوون.

(نیقولا)ی قەیسەر ، زۆر عەقل سووك بوو جڵەوی بەدەست ژنەکـەیـەوە بو کە ئەمیش هاوتای بوو لەعەقل سووکیدا ، بەڵام لەهـێـزی خـواسـتـدا (قوة الأرادة) لەو باڵاتربوو ، کەوچ ، و گێلیان لە خۆیان کۆکـردبـوەوە ، کەس نەی دەوێرا رەخنەیان لێ بگرێت ، ئیتر کار ، و بار بەرەو خراپ تر دەچوو ، تاکو (راسبوتین) گەوجی بەناوبانگ بووبە هاوری پەسندی ژنـە قەیسەر ، (وشەی راسبوتین مانای سەکەبیس) ە سەرەتای ژیانی فەلاحێکـی هەژارو ، ئەسپ دزبوو ، ویستی ئەم کـردەوە نـاشـیـریـنـەی خـۆی بـە پەردەیەکی ئاین پەروەری ، و موبارەکی ، و (نورانی) بشارێتـەوە ، وە پێشەیەکی بەسودی هەبێت ، کە ئەوەیش پیشەی شێخیتـیە (المتـصـوف) ، ئنجا شێخیتی لەروسیادا - وەکو هیندستان - خاوەنەکانی پارەیەکی زۆریان لێی دەست دەکەوت (راسبوتین) تووکی نەتاشی ، و بـەری دایـە وە ، و درێژبوو ، قەیسەریش تەنیا کورێکی نەخوشی هەبوو ناوی (تساریفتس) بوو (راسبوتین) ئەم هەلەی لەکیس خۆی نەدا ، لەقەیسەری گەیاند کەدەتوانێـت چاکی کاتەوە ، شانس یارمەتـی (راسـبـوتـیـن)ی دا ، بـووبـە دەسـت و پێوەندێکی بەختەوەر لەلایان ، ئیترزاڵ بوو بەسەر قەیسەر ، و دامەزراندن لەفەرمان رەوایەتی بەرزی دەولەتدا. ماوەیەك ژیانـێـکـی بـەرەلایـی ، و بەرتیل خۆری ، وبەجورێکی خراپ دەسەلات بەکارهێنان ژیا.

لەم کردەوانە بێزاری پەرەی سەند ، لەم بێزاریەدا مام ناوەندی ، و ئەرستوکراتیە کانیش بەشداربوون ، خەلکی کەوتنە چپەچپ ، کە کودەتایەك (انقلاب) روودەدات بۆ گۆرینی قەیسەر ، ئنجا قەیسەر خۆی کرد بەسەرکردەی بەرزی لەشکرەکە ، بەجۆرێکی ئاشکرا دەستی خستە کاروباری دەولەتەوە ، پێش کۆتایی سالی ١٩١٦ زاینی بەچەند رۆژێك (راسبوتین) بەدەستی یەکێك لەخێزانی پادشا کوژرا ، بانگیان کرد بۆشیو کردن ، داوای لێکرا کەتەقە لەخۆیبکات ، کەتەقەی لەخۆی نەکرد لەلایەکی ترەوە تەقەی لێکرا ، خەلکی مردنی (راسبوتین) یان لاخوش بوو گەرچی پیاوە سیاسیو دیبلوماسیەکانیقەیسەریش هەلدەستان بەکرداری تۆقێنەر ، و زۆردارانە .

تەنگ و چەلەمە بەتین بوو ، گرانی ، و برسێتی پەرەی سەند ، برسیەکان لە (بتروغراد) دا لەسەرەتای مانگی مارتدا گەلێك خۆپیشاندانیان بەرپا کرد ، لەتاو تینی ئازار وستەم کە کرێکارەکان دەیان نۆشی ، لەناکاو شۆرش هەلگیرسا. لەرۆژی هەشتەمەوە تا دوانزەهەمی مارت شۆرشەکە سەرکەوت. ئەمە شۆرشێك نەبوو کە کۆشکی پادشا سەرپەرشتی بکات ، وەیان شۆرشێك بێت زۆر رێك وپێك ، وەیان سەرکردەی بەراو ، و تەکبیر کاروباری هەلسورێنن ، بەلکو شۆرشێك بوو لەپلە نزمەکانی زۆر لێ کراوەکانەوە پەیدابووبوو بەبێ وچان ، بێ رێکخستن و بێ سەرکردایەتی کردن رێگەی خۆی دەبری. حیزبە شۆرشگێرکان وەبتایبەتی بولشەفیکەکانی ناوخو لەم کەین ، و بەیندا نەیان دەزانی شۆرشەکەی ، کەلە برتووشیان بووە ، چۆنی بەرن بەرێوە جەماوەر جلەوی هەلویست ، و کاروباری گرتەدەست ، سوپاکەی (بتروغراد) لایەنی ئەوانیگرت ، بەمە سەرکەوتنی مسوگەر کرد. لێرەدا دەبێت جەماوەری شۆرشگێر لەهەرچی پەرچی جیاکەیتەوە ، کە هیچ ئامانجێکیان نیە تەنها وێران کردن نەبێت کەلە شۆرشە پیشینەکانی فەلاحەکاندا رووی دەدا ، ئەوی شایانی باسە شۆرشی مارت یەکەم شۆرش بوو لەمێژوودا ، کە چینی کرێکارانی کارخانەکان سەرکردیەتیان دەکرد پێان دەوترا (برولیتاریا) ، گەرچی ئەم کرێکارانە کەم و کوریان هەبوو لەسەرکردایەتی کردنێکی بێ هاوتادا (چونکە لینین و

هاوڕێکانی لەبەندیخانە ، وەیا لەئاوارگەدا بوون) بەڵام لەناو ڕیزی ئەماندا گەلێك کرێکاری نەناسراو هەبوون کەلە ژێردستی هاوڕێیانی (لینین)دا ڕاهێنرابوون ئەم کرێکارە ناسراوانەش لەناو ، بەدەیان لەکارخانەکاندا بون ، کەوا بربرە پشتی شۆڕشەکە بوون ، و ئەمان دەیان برد بەرێوە بەپێی نەخشەیەکی تایبەکاری.

یەکم جارە جەماوەری پیشەساز لەتێکۆشاندا ببینین ، ڕوسیا سەرو مرولانیکی کشت وکالداربوو ، حال وبالی لە چەرخەکانی ناوەراست باشتر نەبوو ، پیشەسازی نوێ تەنها لەهەندێ شاردا وەکو (بترۆغراد) کەوا ژمارەیەکی کارگە ،وکارگەری پیشەساز تێدابوو. ئیتر شۆڕشەکەی مارت بەرهەمی تێکۆشانی ئەو کرێکارانەو سەربازانەبوو کەلەم شارەدا بوون.

لەهەشتی مارتدا تەپلی شۆڕش لێدرا ، ئافرەتە کرێکارەکانی کارگەی چنین پێش ڕێزەکان کەوتن ، هەستان بەخۆپیشاندان لەشەقامەکاندا ، دوای ئەمە بەرۆژێك تێك چوون ، و پشیوی پەرەی سەند پیاوان هاتنە دەرەوە هاواری داوا کردنی نان و روخانی ئوتوکراتیەت بەرزبووەوە ، حوکومەت چەند بەلێك لەقوزاقەکان ، کە یەکەم پالپشتی قەیسەر بوون ناردنی بۆ بلیشاندنەوەی کرێکارەکان کە هەستابوون بە خۆپیشاندان ، بەڵام قوزاقەکان خۆپیشاندانەکەیان بڵاوە پێکرد بێ ئەوەی تەقەیان لێ بکەن کە کرێکارەکان ئەم هەڵوێستە ، مردانەیە ، و دڵ فراوانیەی سەربازەکانیان دی ، وا تێ گەیشتن کە سەربازەکان لایەنی ئەمان دەگرن ، بەمە جەماوەر زیاتر گەرم بوو ، ئنجا بانگەوازی برایەتیان لەگەڵ قوقازەکان دەنگیدایەوە بەڵام پولیس دووچاری رق ، وبەرد تێگرتنی جەماوەرکەبوو ، لەرۆژی دەیەمدا گیانی برایەتی جەماوەر ، و قوقازەکان بەتین بوو ؛ لەناو خەلکدا دەوترا کە گوایا قوقازکان تەقەیان لەو پولیسانە کردوە کە تەقەیان لەخەلکەکەدە کرد ، ئنجا پولیس لەشەقامەکاندا کشانەوە ئافرەتەکان بەرەو قوقازەکان چوون ، غیرەت و مەردایەتیان جولاندن ئەمانیش سونکیەکانیان کرد بەسەری تفەنگەکانیانە وە ، دەستیان کرد بەپاراستنی میللەت.

لەرۆژی یانزەهەمدا (ڕۆژی یەکیشەمە) کرێکارەکان لەناوەڕاستی شارەکە دا گردبوونەوە پۆلیس لە سەنگەرە کانیانەوە ، تەقەیان لەمیللەت دەکرد ،

هەر وهاسە ربازەكانیش ، ناچار خەلكەكە بەرەو بارەگای لەشكـر چـوون ، سكالای خۆیان پێش كەش كرد ، غیرەتی بارەگای لەشكـر هـاتـە جـۆش ، بەسەركردایەتی ئەفسەرە بچوكەكان ، هاتن تا میللەت بپارێزن ، تەقـەلـە پولیس بكەن. هەرچەندە پیاوانی بارەگاكە بەدەست كـران ، بـەلام ئـەم گرتن ، بەی دەست كرد نە درنك فریاكەوت چونكە رۆژی ئاینده ، چـەنـد بارەگایەكی سەرباز ، بەتفەنگ ورەشاشەكانیانەوەهاتنەدەرەوەلە شەقامەكاندا بو بە تەقەیەكی زۆر ، چاك و خراپ تێكەلاو بوو ، لەدوایـدا سـەربـاز ، هاتنە پێشەوە كە هەندێ لەوەزیرەكان بگرن (دوای ئەوەی هەندێكی تریـان رای كردبو) لەگەل پولیس و كارگوزارانی نهێنی (الخدمةالسـریـة) دا ، ئنجا گیراوەسیاسیەكانیان بەرەلا كرد.

شۆرش لە (بتروغراد)دا سەركەوت ، و (موسكو)ش خێرا بەرێبـازەكـەی ئەودا رۆیشت ، بەلام خەلكی لادێكان مانەوە چاوەروانی گۆرانـەكـانـیـان دەكرد. لەدواییدا بەساردی یەكەوە ، بەروودا وەكە قایل بوون ، چونـكـە ئەوی ... مەبەسیان بوو زەوی ، و ئاسایش بوو نەك حوكمرانیو سیاسەت. بەلام قەیسەر لەوكاتە دا دوور بو لە (بتروغراد)ەوە ، لەشارێكی بچكـۆلـە بوو ، لەوێوە كاروباری لەشكرەكەی دەبرد بەرێوە چونكە فەرمانـدەیـەكـی بەرزی لەشكرەكە بوو ، بەلام لەبەرهەمێكی پێگەیشتوو دەچوو ، كـەدەبـو سیس ببوایە ، و بكەوتایە خوارەوە. بەم جۆرە قەیسەری مەزنی ئوتوكراتی نەما ، كەوا لەترسی ئەو ملیونەها دەلەرزی ، و (باوكە بچكۆلە)ی روسیای پیرۆز بو ، ئیتر لەناو سەبەتەی شتە بێكەلكەكانی مێژوودا بـزر بـوو ، ئیتر ئەو رێبازە چەند سەیرە كەوا رژێمەكـانـی سـەرەبـەرەخـوار لـێـوە كلوردەبیتەوە ، دوای ئەوەی دەورە پێویستیەكەی سەرشانی ، بێنیوە ، و ئەو تەمەنەش دەژی كۆتوی دانراوە. لەكاتێكدا قـەیـسـەر هـەوالـی مـان ـ گرتنەكانی ، كرێكارەكان ، و بشێویەكانی لە(بتروغـراد) دا بـیـسـت ، فەرمانیدا بەبلاوكردنەوەی حوكمی عورفی ، هەرچەندە سەركردەی لێپرسراو ئەمەی بەرەسمی بلاوكـردەوە بـەلام فـەرمـانـەكـە نـەجـاری بـۆدرا ، و نەبلاوكرایەوە لەشارەكەدا چونكە خەلكەكە ئەمەیان نەپەسند ، و نەجێبەجێ كرد ، دام و دەزگاكانی حوكومەت پەكی كەوت ، و هەلوەشا ، قەیسەركـە نەی دەزانی چ مەترسـیـەك رووی داوە بـریـاری دا بـگـەرێـتـەوە بـۆ

(بتروغراد) ، ئنجا کرێکارانی شەمەندەفەر ، شەمەندەفەرەکەی ئەویان وەستاند ، ژنی قەیسەرکە لەقەراغ شاری (بتروغراد) بوو بروسکەیەکی (برقیە) نارد بۆ قەیسەر دایەرەی تەلغوراف بروسکەکەی گێرایە دواوە ، بەقەلەمی رەش لەسەری نوسی (خاوەن بروسکە ، جێی دانیشتنی نەزانراوە).

ئەم گۆرانکارییە ، ترسی خستە دڵی پێشەوا ئازادیبووەکان ، لە (بتروغراد) و ، ئەفسەرەکانی لەشکرەوە لەمەیدانی جەنگدا ویستیان تابۆیان دەکرێت چەندیان بۆ رزگار دەکرێت ، رزگاری کەن ، لەقەیسەر پارانەوە واز لەتەخت و تاج بێنی ، ئەمیش بەقسەی کردن ، وەیەکێکی لەخزمانی خۆی دەست نیشان کرد کەجێی بگرێتەوە ، بەلام شۆرشەکە بریاری دابو ، سنوورێك بۆ رژێمی قەیسەر دانێت ، وە پەردە بەسەر خێزانی (رومانوق) دا ، دابداتەوە کە (٣٠٠) سێ سەد ساڵ لەمێژوورا دەوری هەبوو.

ئەرستوکراتی ، و خاوەن زەوی ، وزار ، و چینە دەوڵەمەندەکانی ناوەراست ، وتەنانەت ئازاد بوەکان ، بەچاکخوازەکانیشەوە (المصلحون) سەیری تەقینەوەی بوراکانی چینی کرێکارانیان بەترس ، و لەرزەوە دەکرد ئیتر کەدییان لەشکر - کە دوا سەنگەریان بوو - دەچێتە پاڵ شۆرشگێرەکان هیچیان بەدەستەوە نەما. بەلام دیسانەوە نەیان دەزانی کامیان سەردەکەوێت ، لەوانە قەیسەر بەلەشکرێکەوە لە لەمەیدانی جەنگەوە بگەرێتەوە ، وە شۆرشگێرەکان بلیشینیتەوە بەم جۆرە ئەمانە لەحالێکدابوون خۆزگەیان پێ نەدەخوازرا: لەلایەکەوە لەکرێکارەکان دەترسان لەلایەکی تریشەوە لەقەیسەر ، ئەمانە دەیان ویست هەر زیانی خۆیان بپارێزن. بەلام ئەنجومەنی (دوما) کەوا نوێنەری خاوەن زەوی ، و زارەکان و چینی دەولەمەندە بورجوازیەکان بوو ، کە شۆرشگێرەکان (کەمێك) هیوایان پێان بوو سەرۆك و ئەندامەکانی ترسیان لێنیشت ، بۆ چارەسەری وەزع نەهاتنە پێشەوە ، وەنەیان دەزانی چیبکەن.

بەلام (سوفیت) خۆی رێکخست ، نوێنەری سەربازەکانیشی خستە پاڵ نوێنەری کرێکاران ، ئنجا سۆفیەتی نوێ لایەکی لەکۆشکی (توریـد) داگیرکرد کەبەشێکی ئەنجومەنی (دوما)ی تێدابوو ، ئیتر مەستی سەرکەوتن

گۆڕێکی نوێی دایەوە بەکرێکارو سەربازەکان ، بەلام سەرسام بوون لەوەی کەجی لەم سەرکەوتنە بکەن؟ دەسەڵاتیان دەست کەوتوە تەنها ئەوە ماوە کێ جڵەوگیری بکات؟ بەخەیالیاندا نەدەهات کەدەبێت (سوفیەت) خۆی ئەمە بکات ، بەلکو وایان ددزانی کەئەمە هەر تەرخانە لەسەرچینی بورجوازیەکان ئنجا سوفێت نێرراوێکی نارد بۆ ئەنجومەنی (دوما) داوایان لێکرد کەدەست بکات بەحوکومڕانی ، سەرەکی ئەنجومەن ، و ئەندامانی ترسان کەڕەنگە ئەمان هاتوون بیان کرن ، و نەیان ویست دەست بخەنە کاروباری حوکمڕانیەوە ، وەلە ئەنجامەکەی ترسان کەئەگەر هاتو حوکمڕانیان کرد ، کەنێرراوەکەی سوفیەت سوور بوو لەسەر داواکەی خۆی ، ئنجا لێژنەیەك لەئەنجومەنی (دوما) دوای ترس ، و دوو دڵی قابل بوو ، بەڵام میللەت وای بۆ دەرکەوت کە گوایا (دوما) یە شۆڕشەکە دەبا بەڕێوە ، ئەم جەواشە بوونە زۆر سەیرە کە ئەگەر لەچیرۆکێکدا بێخوێنینەوە کەشتی وا رەنگە رووی دابێت ، بەڵام راستیو حەقیقەت گەلێك جار لەخەیال سەیرترن!

حوکومەتە وەختیەکە ، کەلێژنەیکەی (دوما) دای ناپوو زۆر نەریت پەروەر بوو (محافظ) سەرەك وەزیرانی ئەمیرێك بوو ، لەلاکەی تری کۆشکەکەدا ، کەئەنجومەنی سوفیتی تێدابوو هەمیشە دەستیان دەخستە ناو کاروباری حوکومەتەوەختیەکەوە ، سوفیەتیش لەمام ناوەندی بوو ، ژمارەی بولشەفیکەکانی ناوی کەم بوون. بەم جۆرە حوکومەتەکە لەواقیعدا دوو روو بو ، چونکە حوکومەتەوەختیەکە هەبوو ، وەسوفیەتیش هەبوو ، لەپشت ئەم دوانەوە جەماوەری خوروشاویش کەبەردەوام بوون لەشۆرشداو چاوەروانی بەروبوومێکی زۆری شۆڕشەکە بوون. هەموو ئەو دەستکەوتەی کەبرسیەکان لەحوکومەتە تازەکەیان دەست کەوت ، بەردەوام بوون بۆ لەجەنگەکەدا ، تاکو ئەلمانیا دەشکێنن. بەڵام ئایا ئەمە ، ئەوە بوو کەشۆڕشگێرەکان هەوڵیان بۆ دەداو ، قەیسەریان لەپێناویدا دەرکرد؟

لە ١٧ نیسانی ١٩١٧ زاینیدا لەسەر شانۆی روسی لەبر (لینین) پەیدا بوو ، گەرایەوە بۆ ولاتەکەی خۆی ، چونکە لەسالانی جەنگەکەدا لەسویسرە بوو ، چاوەروانی هەڵی گەرانەوەی دەکرد بۆ نیشتمان هەر کە شۆڕشەکە بەرپا بێت. (لینین) چۆن توانی بگەرێتەوە؟ ئینگلتەرە ، و فەرەنسە

نەیان دەهێشت بەخاکیاندا تێپەربێت ، هەمان دەستور ئەلمانیا ، و ئەمساش ، لەدواییدا حوکومەتی ئەلمانیا لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی رێی (لینین)ی دا کەلە شەمەندەفەرێکی داخراودا لەسنووری سویسرەوە بچێت بۆ سنووری روسیا ، دیارە ئەلمانیا بەهیوای ئەوەبو کەبە گەیشتنی (لینین) بەروسیا حوکومەتە وەختیەکەو ، جەنگە کە لاواز بێت چونکە (لینین) بەرهەڵستی جەنگەکەی دەکرد ، بەم جۆرە ئەلمانیا وایزانی کە لە (لینین) سوود وەردەگرێت ، کەچی نەیزانی ئەم شۆرشگێرە ئەوروپاو جیهان بەم زوانە دێنێنە لەرزە.

(لینین) کەزۆر دووربین بوو ، نەهێنیەکانی جەماوەرانی دەدۆزیەوە ، گومان و شتی نەناسراوی نە دەسەڵماندو پێیان قایل نەدەبوو ، خاوەن عەقلێکی پەسەندی وابو کە بیرورا چاك و بەکەڵکەکانی دەگونجاند ، و بەکار دەهێنا بەجۆرێك کە بسازێت لەگەڵ ئەو بارو زروفەدا کە هەیە ، وە خاوەن خواستێکی پۆلاینی (الأرادة الحديدية) وابوو کەوا بەگۆرێکەوە نەخشە دانراوەکانی بەبێ سل کردنەوە لەئەنجام جێ بەجێ دەکرد. هەرکە پێی نایە خاکی نیشتمانەوە ، حیزبی بو لشەفیکی بەتوندی لەرزاند. وە لەسەر ساردو سریەکەیان سەرزەنشتی کردن ، بەشێوازێکی ئاگرین ئەرکەکانی سەرشانیانی بۆشێ کردتەوە ، ئەم گفتوگویانەی وەکو تەوژمێکی کارەبا وابوو ، کە ئازاری ئادەمیزا ددەدات بەڵام گورێکی دەداتی ، و گیانێکی دەکاتەوەبە بەردا. (لینین) وتی:– "ئێمە جووکی "دجال" نین پێویستە خۆمان رابینین کە جەماوەر پەروەربین و تەنهاپشت بەو ببەستین ، گەرچی بەم بۆنەبەوە ببین بەکە مایەتیش ، نابێت سل لەمەبگەینەوە ، چونکە وازهێنان لەسەرکردایەتی ناماوەیەك لە واتەیە بە خێر بگەریت" بەم جۆرە بیروراکانی خۆی بەرنەدا ، وەبە ئاسانی نەی دان بەدەستەوە ، ئیتر ئەوشۆرشەی کەسەرگەردان ، و بێ سەرکردایەتی وئاراستەکردن مابووەوە ، لەدواییدا پێشەوای خۆیی دۆزیەوە ، ئنجا رۆژان ئەو پیاوەی کەپێویست بوو هێنایە مەیدان.

ئایا ئێستا لەرووی نەزەریەوە جیاوازی بولشەفیك ، و مەنشەفیك ، و بەرە شۆرشگێرەکانی تر لەم قوناغە دا چیە؟ ئەو هۆیانە چین کەچالاکی

بو لشەفیکەکانی ناوخۆی یەکخست لەماوەی پێش هاتنەوەی (لیـــنیــن) دا؟ بۆچی سوفیت وازی لەدەسەلات هێنا کە کـەوتـبـوە دەسـتـی ، وە دای بـە ئەنجومەنی (دوما)ی کۆنەپەرست ، و نەریت پەروەر (المحافظ) ؟ ناتوانـم بەقوولی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە گەرچی دەبێت تۆزی بیربکەینـەوە ئەکەیمانەوێت ، تێ بگەین لەداستانە فـرەبـەشـە جـۆر بـەجـۆرەکـەی ، کەبەدوای یەکتردا هاتن ، کەوا کارەساتـەکـانـیـان لـە (بـتـروغـراد)دا بەتایبەتی ، و لەروسیادا بەگشتی لەسالی ۱۹۱۷ زاینیدا رووی دا.

نەزەریەکەی (کارل مـارکـس) دەربـارەی گـۆرانـی ئـادەمـیـزاد ، و پێشکەوتنی کەپێی دەلین: (تێ روانینی مادیانەی لەمەر مێژوو) بـنـیـات نرابوو لەسەر پەیدابوونی وەزع و بارێکی نوێی کۆمەلایەتی لەجێگای وەزع و بارە کۆنەکە لەکاتێکدا ئەمەی دواییان ذوا دەکەوێت و چی دەمێنی لـەو سەردەمەی کەتیایدا دەژی. ئنجا لەکاتێکدا ، کەشێوازی بەرهەم هێنـانـی پیشەسازی گوررا ، ئیتر بەپێی ئەم گورینە ، و بەشێنەیی رژێمی ئابوری و سیاسی لەمەر کۆمەلکەش دەگورێت روودانی ئەمەش بەرێبـازی نـاکـۆکـی بەردەوامی چینایەتیدا ، لەنێوان چینە حوکوم فەرماکـەو ، چـیـنـە سـەر بەخۆکاندا ، ئەێ دەپەرێت بەم جۆرە چینی دەرەبەگ لەرۆژئاوای ئـەوروپـادا جێگە کەی خۆی چۆل کرد بۆچینی بورجوازیەکان کەوابوون بەحوکوم فەرمـا لە (گیان)و جەستەی ئابوری ، و سیاسی لەئینگلـتـەرە ، و فـەرەنـسـەو ئەلمانیا ، و شوێنانی تردا ، ئەمانیش واتە چینی بورجوازیە کان ، جێی خۆیان چۆل دەکەن بۆچینی کارگەران ، تا ئەوکاتەش چینـە دەرەبـەگـەکـە لەروسیادا حوکوم فەرمابوو ، ئنجائەوەی لەرۆژئاوای ئـەوروپـادا رووی‌دا ، بەچوونی چینی بورجوازیەکان بۆجێگای چینی دەرەبەگەکان ئەمە لەرووسیادا رووی نەدابوو ، بۆیە گەلێك لەمارکسیەکان لەو بـاوەرەدابـوون کـەهـیـچ چارنیە کەدەبێ روسیا بەقۆناغی بورجوازی ، وبەرلەمانیدا تێپەرێت پێش ئەوەی بتوانێت کە بگاتە قۆناغی دوایی کەوا جمهوریەتـی کـرێـکـارانـی تێداپێك دێت. بەێ رای ئەمان نابێت بەسەر قوناغی ناوەراسـتـدا بـاز بدرێت. (لینین) خۆی بێش شۆرشی مانگی مارتـی سـالـی ۱۹۱۷ زایـنـی سیاسەتێکی مام ناوەندی دانا بۆهاوکاری کـردن لـەگـەل فـەلاحـەکـانـداو (بەرهەلستی نەکردنی بورجوازیەکان) تاکو بتوانن بەرامبەر قـەیـسـەرو ،

خاوەن زەویو زارەکان بوەستنەوە لەپێناوی بەرپابوونی شۆرشی بورجوازیەکاندا.

لەبەر ئەمە بولشەفیك ، و مەنشەفیك ، و هەمو ئەوانەی کەباوەریان بەنەزەربەکانی مارکس هەبوو ، باوەریان وابوو کەپێویستە جمهوریەتێکی بورجوازی ـ دیموکراتی، لەسەر شێوەی ئینگلیزی وەیا فەرەنسی پەیدابێت وە پێشەوایانیش لەنوێنەرانی کرێکاران هەرلەو باوەرەدابوون کەئەم کارە تەواوە ، و چەندو چونی تێدانیيە ، ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی پاڵ بەسوفیتەوە بنێت کەدەسەلات پێشکەش ئەنجومەنی (دوما) بکات ، وەلە سەر خۆی تەرخان نەبێت بەتەنیا ، ئەوکە سانەش وەکو زۆربەی ئیمەمانان بووبوونە بەندەی بیروەباوەریان وەنەیان دەتوانی پەی بەوە بەرن کەوەزع و بارێکی نوێ پەیدابووە وە هاتوتە مەیدان ، کە سیاسەتێکی جیاوازی دەوێت وەیان بەلای کەمەوە راست کردنەوەیەکی رێك وپێك لەسیاسەتە کۆنەکەدا بەڵام جەماوەرەکە ، لەشۆرشەکەدا لەسەرکردەکان زیاتر گەرمتربوو. ئنجا بولشەفیکەکان کەلەو کاتەدا دەسەلاتداربوون بەسەر سوفیت دا درێژەیان دایە و تەنانەت درکاندیان کە کرێکارەکان بۆیان نیيە لەم ماویەدا کێشە کۆمەلایەتیەکان بوروژێنن ، چونکە مەبەسی سەرەکیان دەستکەوتنی ئازادی سیاسیە ، بۆیە بولشەفیکەکان هەلویستیان مام ناوەندیبو ، ئیتر شورشەکەی مانگی مارت سەرکەوت سەرەرای ترس ، و رارایی پێشەواکانیان.

گەرانەوەی (لینین) هەڵوێست و باری ئاوەزووکردەوە (لینین) هەستی بە وردە بابەتەکانی بارو ، وەزعەکە کرد ، بەبلیمەتی پێشەوایەکی راستەقینە هەستابە جێ بەجێکرد بەرنامە مارکسیەکە ، بەپێی پێداویستەکانی ئەوزروفەی کەهەبوو. وەبریار دراکە تێکۆشان دژی خودی سەرمایەداری بەرپابێت لەپێناوی حوکوم ، و دەسەلاتی چینی کرێکاراندا ، بەهاوکاری لەگەڵ فەلاحە هەژارەکاندا ، ئیتر سێ بانگەوازە ، رەمزیيەکەی بولشەفیکەکان بریتیبوون:ـ یەکەم جمهوریەتێکی دیموکراتی ، دووەم: زەوت کردنی کێلگەکانی دەرەبەگەکان سێیەم: هەشت سەعات ئیش کردن لەرۆژێکدا ، ئنجا ئەم بانگەوازانە کوزج کراسی راستەقینەیان (الحقیقە) کردبە بەر تێکۆشانی کرێکاراندا ، ئیتر تێکۆشانیان بەبیرو

رایەکی نەزانراوی پووچ نەمایەوە ، بەڵکو خەباتێك بوو لەپێناوی ژیــان ، و هیوا ، بەپاشە رۆژێکی چاکتر.

(لینین) لەسیاسەتەکەیدا مەبەسی ئەوەبو کە بولشەفیــکــەکــان زۆربــەی کرێکارە کان ، بهێننەلای خۆیان ، تاکو بەمەزاڵ بن بەسەر سوفــیــت دا ، کەئەمیش لەلایەن خۆیەوە دەسەلات لەحوکومەتەوە حقیەکە دەسینی. (لینین) خێرا شۆرشێکی تری مەبەسن نەبوو ، بەلکو سووربو لەسەرئەوەی کەپێویستە کرێکاران زۆربەبن لەناو سوفیت دا ، پێــش ئــەوەی کــاتــی روخــانــدنــی حوکومەتە وە ختیە کەبێت رەق بوو لەگەڵ ئەوانەدا کەداوای یارمەتــدانــی ئەم حوکومەتە وەختیەیان دەکرد. چونکە ئەم خیانەتە بەشۆرش. هەرهەمــان دەستور رەق بو لەگەڵ ئەوانەشدا کەدەیان ویست پێش وەخت برکیشی بکــەن لەرووخاندنی حوکومەتەکەدا. (لینین) ووتی: "پێویستە لەسەر ئــادەمــیــزاد لەکاتی ئیش کردنی راستەقینەدا لەسنووری مەبەسەکە دەرنەچێت ، چونکــە ئەمە بەلای ئیمەوە تاوانێکی گەورە ، و ئاژاوەیە".

بەم جۆرە ئەم پارچە سەهۆڵەکە لەناویدا بلێسەیەکی ئــاگــر هــەبــوو ، بەرەو ئامانجێك کەبۆی کێشرابوو ، بەهێمنی ، و توانایەکی بەتــیــنــەوە کەوتەری هەروکو موقەدەرێك کەدەبێ هەر ببێت.

# بۆلشەفیکەکان دەسەلات وەردەگرن

**٩/نیسان/١٩٣٣**

بەراستی مێژوو لەشۆرشەکاندا هەنگاوێك هەڵدەنێت کە درێـژییـەکـەی حەوت رۆژەرێ یە (الفرسخ) ، هەرچەندە گۆرانکاریەکـانـی کـەبـەدەرەوەن تیژتێپەر دەبن ، بەلام گۆران لەچاو کراوەیی جەماوەردا تیـژتـر تـێـپـەر دەبێت ، جەماوەر ، لەکتێبەوە زۆر فێرنابیت چونکە هەلـی فـێـربـوونـی زایناری لەمەوە بۆهەل نەکەوتووە ، هەروها کتێبەکانیش شتـەراسـتـەکـان دەشارنەوە زیاتر لەوەی کە بلاوی کەنەوە ، کەوابو قوتابخانەی جـەمـاوەر بریتیە لەقوتابخانەی ، تەجروبە ،.و تاقی کردنەوە بەکردەوە ، و کـردار بەجۆرێکی سەخت و ناخۆش ، وە فێربونەکەش بـاشـتـر ، و راسـت تـرە. ئەوماوەیەی شۆرش کەتێکۆشانی تێدایە لەپێناوی ژیان وەیان مردندا ، پەردە لەرووی ئەو هۆراستە قینانە لادەدات کەپاڵ بەکۆمەلانەوەدەنێت ، وە پەچـە لەرووی بنچینەی راستەقینەی کۆمەلگەکە هەلدەمالێت. بەم پێیە لە سـالـی ١٩١٧ زاینیدا کەپربوو لەکارەساتە مێژووییەکان ، میللەت بـەتـایـبـەتـی کرێکارە پیشەسازەکان ، کەوا لەگەرمەی شۆرشەکەدا گەلێك دەرس و ، پەند لەکارەساتەکانەوە فێردەبوون وە بە رۆژ کاروباری خۆیانیان دەگۆری.

هێمنی و ئاسایش لەهیچ لایەکدا نەبوو ، چونکە ژیان زۆر خێرا دەگۆرا وە کۆمەلەکان ئارەزووی جوی ، جوی ناخۆشی دەخستە ناویانەوە ، هەنـدێ کەس بەدەسیسە ، ومو ئامـەرەوە خـەریـك بـوون ، خـەویـان دەبـیـنـی بەگەرانەوەی رژێمی قەیسەرەوە ، گەرچی لەچیـنـێـکـی گـرنـگ ، و بـە بایەخیش نەبوون ، بەتوانین گوێ نەدەینە ئەمانـە ، بـەلام نـاکـۆکـیـە راستەقینەکە لەنێوان حوکومەتەکەی ناوخو ، و سوفـیـتـدا بـەرپـابـوو ، هەرچەندە زۆربەی سوفیەت بەپێویستیان دەزانی کەیارمەتی بدەن ، و رێـك کەون لەگەڵ حوکومەتەکەدا ، ئنجا ئەوانەی کەداوای رێك کەوتنیان دەکـرد

دەترسان نەوەك داوايان لى بكريّت كەبيّن دەسەلات وەرگرن ، و حوكومرانـــی ولاتەكە بكەن ، يەكێك لەو تاروێژەكانی سوفيت ووتی: "كی لەئێمە دێتــە جێی حوكومەتەكە ، و ئێمەش لەترساندا دەلەرزين" ؟ئەمەمان لەهيندستاندا لەزۆركەس بيست كەدەست و دڵيان لەترسانداده‌لەرزی بەڵام كەرۆژی خۆی هــات و راستی هاتە پێشەوە ، بــازووی مــەردانــە ، و دڵ و دەروونــی ئــازا و دلێرخۆی ناشارێتەوە.

چارنەبوو دەبوايە حوكومەتی مەركەزی ، و سوفيت بەگژيەكدا بچونايـە جگە لەوەش هەندێ ئەندامانی ریكەوتنخوازيــش لــەهــەردوو لاداهــەبــوو ، حوكومەتەكە دەيويست بەبەر دەوا م بوون لەجەنگەكەدا ، هاوپەيمــانــەكــان رازی كات ، هەروهــا خــاوەن زەوی ، زارەكــانــی رووســيــاش رازی كــات بەپاراستنی بەرژەوەنديەكانيان. بۆيە سوفيت نزيكتربو لەميللەتەوە ، زياتر لەحوكومەتەكە و ، زووتر هەستی بەئارەزووی ميللەت كرد بۆئــاشــتــی ، و بەئارەزووی فەلاحەكان بۆزەوی ، و زار ، و بەسووربوونی كرێكارەكان لەسەر داخوازيەكەيان: بەكردنی رۆژی ئيش بە هەشت سەعات ، بەم جۆرە سوفيــت حوكومەتەكەی لەجوولەخست ، هەروها جەماوەرەكەش بزوتنەوەی سوفيــتــيــان يەك خست ، چونكە جەماوەرەكە لەهەموو حيزبێك و لەهەمووپــێــشــەوا يــەك زياتر بەرەو شۆرش پركێشی دەكرد.

هەوڵ دراكە حوكومەتەكە بەجۆرێك بێت كە لەگەڵ هەلوێستی سوفيــتــدا بگونجێت. ئنجا پارێزەرێــكــی (مــحــامــی) بــەرمــان پــەيــدابــوو نــاوی (كيرنسكی)بوو ، بوو بەپياوە بەرزەكانی حوكومەت ئەم پيــاوە لــەپــێــك هێنانی حوكومەتێكی هەرەمەی گــونــجــاودا (ائــتــلافــيــە) ســەركــەوت ، مەنشەفيكەكانی كەلە سوفيت دابوون هەندێك نوێنەريان بۆنارد ، ديسانــەوە ويستی ئينگلتەرە ، و فەرەنسە رازیكات ، بەهێرش بردنێكی دوژمن كــاری بۆسەر ئەلمانيا ، بەڵام ئەم هێرشەشكا چونكــە مــيــلــلــەت ، و لــەشــكــر ئامادەنەبوون بۆيی.

لەم رۆژانەدا كۆنگرەكانی سوفيت ، كەوا نوێنەری هەموو رووسيــابــوون لە (بتروغراد)دا كۆدە بوونەوە ، هەركۆنگرەيەك لەم كۆنگرانە لەوی پێــش خۆی زياتر دەستیدا دەگرت ، ژمارەی بولشەفيكەكانی كە بۆ ئەم كۆنگرانە هەلدەبژێران لەزياد بووندا بوون ، بەڵام ژمارەی مەنشەفيك و سۆشياليستــە-

شۆڕشگێڕەکان (ئەمانە حیربێك بوون لەوانەی کشتوکال پیشەیانە) کەم دەبووەوە ، دەسەڵاتی بولشەفیکەکان بەتایبەتی لەناو کرێکارانی (بتروغراد)دا زیادی کرد. ئیتر ئەنجومەنی سوفیتەکان ، لەسەرانسەری ولاتداپەیدابوون ، فەرمانەکانی حوکومەتیان بەجێ نەدەگەیاند کە ئەگەر لەسوفیتەوە ئیمزانە کرایە ، وەهۆی بێهێزی حوکومەتەکە ، نەبوونی چینێکی ناوەراستی بەهێزبو لەرووسیادا.

بەڵام فەلاحەکانی لادێکان ، . وازیان هێنابوو لەو ناکۆکییەی کەلە پایتەختدا هەبوو لەسەر حوکومرانی ، لەلادێدا فەلاحەکان دەسەلاتیان داگیرکرد ، کچم لەنامەکەی پێشوومدا ئاگادارم کردیت ، کەئەم فەلاحانە زۆر بەتەنگ شۆڕشەکەی مانگی مارتەوە نەبوون دیسانەوە بەرهەلستیشیان نەدەکرد بەلکو ، وەکو سەیرکەر وابوون. دەرەبەگە گەورەکان ترسان کەزەوی ، و زارە فراوانەکانیان داگیر بکرێت ، ئنجا بەروالەت دابەشیان کرد بەسەر چەندکە سێکدا بۆئەوەی پارێزگاری بکەن لەپێناوی بەرزەوەندی دەرەبەگە گەورەکاندا ، دیسانەوە ملکایەتی گەلێك لەشتومەکەکانیان دایە بێگانەکان ، ئەمانە هەمووی لەبەرخاتری پاراستنی ئەو زەوی ، وزارانە ، بەڵام فەلاحەکان بەم ئیشەرازی نەبوون داوایان لەحوکومەتەکە کرد کە فرۆشتنی زەوی ، و زارەکان بەفەرمانێکی حوکومەت بوەستێنرێت ، کەچی حوکومەت لەمەدا دوودڵ بوّ ، نەیویست رقی هیچ لایەکیان هەڵسێنێت ، لەبەر ئەم فەلاحەکان بەدەستی خۆیان مافی خۆیانیان وەرگرت ، لەمانگی نیساندا فەلاحەکان چەند دەرەبەگێکیان گرت ، و زەویەکانیان لێ زەوت کردن ، وە لەناو خۆیاندا بەشیان کرد ، سەربازەکان کەلەمەیدانی جەنگ گەرابوونەوە (دیارەئەمانەفەلاح بوون) لەم ئیشەدا دەورێکی سەرەکیان بینی ئەم بزوتنەوەیە پەرەی سەند تاکو گەیشتە زەویە فراوانەکان ، تەنانەت دەشتەکانی (استبس) یشی گرتەوە ، لەبەر ئەوەی سیبریا پارچە زەوی ، وزاری گەورەی دەرەبەگەکانی تێدانەبوو ، فەلاحەکان زەوی و زاری کەنیسە ودێرەکانیان داگیرکرد.

ئەوی شایانی باسەداگیرکردنی ئەم کێلگە زلانە ، لەفەلاحەکان خۆیانەوەداکەوت تەنانەت پێش قەومانی شۆڕشەکەبەچەندمانگێك. (لینین) وایبەچاك دەزانی کە فەلاحەکان بەرێبازێکی رێك وپێك ببن بەخاوەن مولك

نەك بەربەستی ئاژاوەدا ، ئیترکە شۆرشی بۆ لشەفیکەکان بەرپابوو ، زەوی و زار لەچنگی فەلاحەکان خۆیاندابوو.

دوای گەیشتنی (لینین) بە روسیا بەچەند مانگێك ئاوارە کراوێکی تری روسیش لە نیو یورکەوە گەرایەوە ، دوای ئەوەی بەریتانیا دەست بەسەری کرد لەربێبازی گەرانەوەیدا ، ئەم کابرا گەراوەیە (تروتسکی) بوو ، (تروتسکی) ئەندامێك نەبوو لەحیزبە بولشەفیکە کۆنەکەدا ، هەروها لەگەڵ مەنشەفیکەکانیش نەبوو ، بەلام خێراجووە بال (لینین) وەبوبە سەرکردەی سۆفیتی (بتروغراد) ، (تروتسکی) وتاربێژێکی رەوان کو ، وە نووسەرێکی هەلکەوتووبوو ، وە بروسکەیەکی کارەبابوو کەپڕبوو لەوزە ، چاکەی زۆربوو بەسەر حیزبەکەی (لینین)ەوە ، کچم ئێستا شتێکت لەکتێبەکەی کە (تروتسکی) نوسیبووی لەبابەت خۆیەوە بەناوونیشانی (ژیانم) بۆ وەردەگێرم کەواتیایدا باسی کۆبونەوە کان ، دەکات کە وتارە ئاگرینەکان تیدادە دا کەلەبیناى (سیرکی نوی) داکۆبونەوەکەیان دەکرد ، ئەم وەرگێراوانە تەنها پەخشانێکی وێژەیی ڕەنگین نییە ، بەلکو وێنەیەکە ، ژیانی تێدادیت ، و ئەچێت ، کە گەلێك جۆرو رەنگ لەرۆژانی شۆرشە سەیرەکەی (بتروغراد)ی سالی ١٩١٧ زاینی دێنێتەوە بەرچاومان (تروتسکی) دەڵێت:-

هەواکە پڕە لە هەناسەو ، چاوەروانی ، هاوار ، و بانگەوازە بەسۆزەکانە هەناسەی تێدادەدەن کە بەتایبەکاری هی "سیرکی نوییە" لەسەرووەمەوە زنجەکان ، وسەر ، و سنگەکان کەبەتەتنیشت یەکەوەبوون دەوریان دەدام ، لەئەشکەوتێکداکە ئاخنرابوو لەلاشەی ئادەمیزاد گفتوگۆم دەکرد ، هەرکە دەستم راکێشایە بەریەکێکیان دەکەوت ، بەرپەرچ دانەوەکە (رد الفعل) ئاسودەییەکی دەخستە دەرونمەوە ، وای لێ دەکردم باکم نەبێت و ، لەسەر وتارەکە بڕۆم ، هەروتار وێژێك چەندماندووبێت ، ناتوانێت خۆی بەرامبەر ئەم سۆزو تەوژمە کارەباییە ، کەلەم هەموو ئادەمیزادە گەرم وگورەوە ، دەدرەوشێتەوە خۆی بگرێت ، کەوا حەزدەکات رێگەی زانین ، وتێگەیشتن ، و رزگاربوون بدۆزیتەوە ، هەندێ جار هەستم بەئارەزوویە کرزۆری شت زانین دەکرد کەزاڵ بووەبەسەر ئەم کۆمەلەدا ، کەلە بوتەیەکدا تواونەتەوە وەبوونەتەیەك جەستە ، لەبەرئەمە هەرچی و شەبەك کە ئامادەم کردبو ، لەبەرامبەر دەسەلاتی قولبی سۆزدا دەکەوتە خوارەوە ودەبووکایەوە ، ئنجاوشە

وبەلکەی نوێی سەرپێیی کەواپێشتر ئامادەم نەکردبوو ، دەهات ، ودەتەقیەوە ، بەڵام خەلکەکە پێویستیان پێیبوو ، بەفەرمانی عەقلی نەدیوم (العقل الباطن) و بەبێهوشیاری ، بەجۆرێکی رێك وجوان ئەو وشانە پەیدادەبوون لەم کاتەدا هەستم دەکرد ، هەر وەکو گوێ لەدەروونی خوروشاوم بگرم وابوو ، هەولم دەدا شوین بیروراکانم کەوم ، وودەش ترسام نەوەك لە شوێنە بەرزەکە بکەومە خوارەوە ، وەکو ئەوانەی کە دووچاری نەخۆشی بە دەم خەوەوە رویشتن بوون ، کە گوێ یان لەدەنگی عەقل دەبێت.

بەم جۆرەبوو (سیرکەتازەکە) بەگەرم وگوری ، وناسکی ، و گرژیەوە ، ساوا نەشمیلەکان ، بەسنگ ، ومەمکی دایکیانەوە کە هاواریان ، بەچاکە ، وەیان بەهەرەشەکردن بوو ، شیریان دەخوارد. کۆمەلەگە تێکرا بەم جۆرە وەکو منداڵێك بەدوو لیوەی گوێ مەمکی شۆرشەکەیگرتبی وابوو ، بەڵام منداڵێك بوو لەشیر برابوەوە ، خێرابوو بوو بەپیاو".

بەم جۆرە بەشەکانی دراماکە لە (بتروغراد) وشارەکانی ترو ، لادێکانی روسیادا خێرا بەدوایەکدا دەهاتن ، ئنجا ساواکە لەشیر برایەوە و خیرا زل بوو ، ئەنجامی جەنگەکەش کە بەرەو خراپ چوون بوو ، لەئابوریدا دەرکەوت ، بەڵام بازرگانە هەلپەرستەکان هەرتەقەلای قازانج کردنیان دەدا لەجەنگەکە.

هێزی بولشەفیکەکان لەناو سوفیت ، و کارگەکاندا هەرلە زیادبووندابوو. (کیرنسکی) لەمە ترسا ، ویستی سەریان پێ شۆرکات هێرشیکی توندی بردە سەریان ، و پەلاماری (لینین)یدا ، بەوە تاوانباری کرد کەوا سەربە ئەلمانیایە ، بۆ نانەوەی خراپە لەروسیادا. ئایا (لینین) لەسویسرەوە بەئەلمانیادا تێنەپەری ، بەیارمەتی حوکومەتی ئەلمانیا؟! بەم جۆرە چینی ناوەراست (لینین)یان خۆش نە دەویست وەبەخاینیان دادەنا. لەپاشدا (کیرنسکی) فەرمانی گرتنی (لینین)ی دەرکرد ـ نەك بە تاوانی بەرپاکردنی شۆرش ، بەلکو بەتاوانی خیانەت کردن ، بۆبەرژەوەندی ئەلمانیا ، (لینین) حەزی دەکرد لەبەردەمی دادگادا بوەستێت ، تائەوتاوانەی دراوەتە پالی بەدروی بخاتەوە ، بەڵام هاورێکانی لەمەدا

بەرهەڵستیان کردو زۆریان لێکرد کە خۆی بشارێتەوە. هەروها (تروتسکی) گیرا ، بەڵام لەئەنجامی هەوڵ و تەقەلای سوفیتدا بەرەلابوو ، گەلێك لەبولشەفیکەکان دەردەست کران ، رۆژنامەکانیان داخران ، ئەوکرێکارانەی کە گومان لێکراوبوون کە گوایا لەسوفیتدان چەك کران لێیان سەندرایەوە ، ئەم کرێکارانە بەرامبەر بەحوکومەتە وەختیەکە ، و هەرەشەکردنی لێیان دڵیان خراپ بوو ئنجا بەگەلێك خۆپیشاندان هەستان ، بۆ دەربرینی بێزاری لەم حالە.

ئیتر ئەمەماوەیەکی ووچانی تێکەوت ، لەکاتێکدا شۆرشێکی ئاوەزوو ، دژبە شۆرشی سوفیت پەیدابوو ، سەرکردەیەك کەناوی (کورنیلوف)بوو بەسەرکردایەتی لەشکرێکی قەیسەرەوە ، بەرەو پایتەخت کشا ، بۆ بلیشانەوەی شۆرشەکە بەتەواوەتی بەحوکومەتە وەختیەکەشەوە ، کە گەیشتە نزیك پایتەخت ، لەشکرەکە توایەوە ، و چوە پال شۆرشەکە.

کارەساتەکان خێرا بەدوای یەکدادە هاتن ، سوفیت و شۆرشەکە نیشتەجێیان (مقر) لەدامەزراوی (مؤسسە) (سمولنی بتروغراد) بوو ئەم کۆشکە قوتابخانە یەکی کچە خانەدانەکان بوو.

(لینین) لەقەراغ شاری (بتروغراد) نزیك بوەوە بولشەفیکەکان بریاریان دا ، کە وەختی هاتوە حوکومرانی لەحوکومەتە وەختیەکە بسینن ، ئنجا جلەوی کاروباری شۆرشەکەیان بە (تروتسکی) سپارد. وەلە سەروردەبابەتی بزوتنەوەکەو ، ئەوشوێنانەی کەدەبێت داگیریکەن ، وە لەسەربریاردانی کات بۆئەمە ریکەوتن ، رۆژی حەوتی نوفەمبەر ، دانرابەکاتی شۆرشەکە ئەمە ئەورۆژەبو کە دانرابوو بۆ کوبوونەوەی کۆنگرەی ئەنجومەنەکانی سوفێتی گشت روسیا ، هەلبژاردنی ئەم رۆژە لەلایەن (لینین)ەوە زۆر سەیربوو ، (لینین) ووتی: رۆژی (٦) شەشی نوفەمبە زۆر زووە چونکە روسیا تێکرا دەبێ پشتمان بگرێت ، ئەندامەکان لەم رۆژەدا ناگەن ، بەڵام رۆژی (٨) هەشتی نوفەمبەر زۆر درەنگە چونکە کۆنگرەکە لەم رۆژەدا کۆبوتەوە ، ئنجا لەبەرئەوەی لێژنەیەکی فرەکە سەزەحمەتە بتوانێت هەنگاوی خێرا ، وبنەبرینێت ، بۆیە پێویستە لە (٧) حەوتی نوفەمبەردا بیینە پێشەوە لەکاتێکدایە کە ئەنجوومەنەکە کۆبۆتەوە ، پێیان دەلێین:- فەرموو دەسەلاتت لەبەردەست دایە چیت دەوی پێی بکەیت؟!

ئەمەیەرێبازی شارەزاو ، پسپۆری شۆرش ، کەزەبینی سافە ، و دەزانێت کە شۆرشەکان گەلێك جار سەرکەوتنیان بەستراوە ، بەهەلکەوتێکی بێبایەخەوە.

کەرۆژی حەوتی نوفەمبەرهات ، سەربازەکانی سوفیت هاتن دایەرەکانی حوکومەیتان داگیرکرد ، بەتایبەتی شوینەگرنگەکان وەکو دایەرەی تەلەفون و تلغراف ، و بانقی حوکومەت ، وە هیچ بەرهەڵستییان نەکرا ، وەکو یەکێك لەرۆژنامەگەرەکانی بەریتانیا دەڵێت: (حوکومەتە وەختییەکە توایەوە).

ئیتر (لینین) بووبەسەرەکی حوکومەتە تازەکە ، و (تروتسکی) بووبە وەزیری دەرەوە ، ئنجا لەئێوارەی ٨ نوفەمبەردا (لینین) لەسمولنیو کۆنگرەکەی سوفیتدا ئامادەبوو ، بەچەپلە رێزان پێشوازی کرا. (رید)ی رۆژنامەگەری ئەمەریکایی کەئەم دیمەنەی دیبوو باسی (لینین) دەکات کەبەرەو میزەکە دەچوو ، دەڵێت:ـ

"پیاوێکی کورتە باڵا ، لەش و لارقایم سەرێکی گەورەی روتاوەی (الأصلع) هەیە ، چاوەکانی بچکۆلە ، لوتی پان ، و دەم زل ، و چەناکە ئەستورە ، ریشی تاشیبوو ، بەڵام مووی ریشی کەلە بیشدانەی دەتاشی (لەدواییدا دوبارە نەتاشییەوە) خەریك بوو دەهاتەوە ، جلیکی کۆنی لەبەردابوو ، بانتولەکەی لەخۆی درێژتربوو.. پێشەوایەکی خۆشەویست و سەیر ، پێشەوایەتیەکەی لەعقلی دابوو ، گاڵتەی پێنە دەکرا ، هیچ رەنگێکی نەبوو ، کەم تەرخەمی ، وەیا تورەیی نەدەزانی ، دیمەن و روخساری بەسام نەبوو ، بەڵام بەتوانابوو ، لەلێکۆڵینەوەی بیرورا قوولەکاندا ، لەگەڵ دەربرینیدا بەجۆرێکی ئاسان وە لە شی کردنەوەی مەسەلەکاندا بەجۆرێکی راست ، و رەوان ، سەرەرای ئەمەش بلیمەتێکی مەزن بوو لەبیروڕادا".

شۆرشی دووەمی ئەم ساڵیش سەرکەوت ، تائێستا ئاشتیانەبوو ، چونکە دەسەڵات وەرگرتن لەم دەستەوە بۆئەوە دەست خوێنی تێدانەرژا. بەڵام لەمانگی مارتدا خوێن زۆررژا ، و کوشتار کرا ، شۆرشەکەی مارت سەرپێی بوو ، کەچی شۆرشی نوفەمبەر ، بەبێ نەخشە ، و رێبازێکی رێك و پێك بوو ، ئەمە یەکەم جارە لەمێژوودا نوێنەری چینە هەرە هەژارەکان

بەتایبەتی کرێکارە پیشەسازەکان ببنە سەرەك دەولەت ، بەلام جیهان وازی لێنەهێنان بەئاسوودەیی دانیشن ، گێژەلووکە دەوری دان ، تاکو رقێکی بێئەندازەیان بەسەردا ببارێنی."

(لینین)و حوکومەتە بولشەفیکەکە ، چیان بەسەرداهات ؟ جەنگ لەگەڵ ئەلمانیادا بەردەوام بوو لەگەڵ ئەوەشدا لەشکری رووسەکان چوارپەلی شکابوو لەسەر بەکوشت دان رۆیشتن بێسوودبوو ، ولاتەکە لەئاژاوەدابوو ، ئەوسەربازانەی بووبوون بەجەردە ، لەگەڵ وێگەڕەکاندا ، هەرچیەکیان بویستایە دەیان کرد ، دیمەنی جەستەی ئابووری (الكيان الأقتصادي) تێك شکابوو ، خواردەمەنی کەم بووبووەوە ، برسیتی پەرەی سەندبوو ، نوێنەراتی رژێمە کۆنەکە ، کە بەهیوابوون شۆرشەکە بیلێشێنتەوە بلاوبووبوونەوە ، حوکومەتە کۆنەکە سەرمایەداری بوو ، فەرمانبەرە کۆنەکانی هاوکاریان لەگەڵ حوکومەتە نوێکەدا نەدەکرد ، بانقەکان پارەیان نەدەدانی ، تەنانەت دایەرەی تلغراف ، بروسکەکانی (برقیات) نەدەنارد ، ئەم هەموورزروف ، و بارەنا هەموارە ترسی دەخستە دڵی هەموو پیاوێکەوە هەر چەندی ئازابێت.

بەلام (لینین)و هاوڕێکانی ، کۆریان دایە خۆیان ، بۆپاڵ پێوەنانی گالیسکەی شۆرش ، و بەرێوەبردنی ، یەکەم ئیشیان بەستنی رێکەوتن نامەیەك بوو لەگەڵ ئەلمانیادا ئنجا گورج لەگەڵیانداریکەوتن ، نوێنەری هەردولا لە (برست لیتوفسك) کۆبوونەوە ئیتر ئەلمانەکان کەزانییان بولشەفیکەکان توانای جەنگیان نەماوە ، بەهەوەسی خۆیان مەرجی قورس ، و ناشیرینیان دادەنا ، ئەم هەلسوێستە وای لەگەڵێك لەبولشەفیکەکان کرد کەپاشگەزببنەوە ، وەئەم رێکەوتنەیان نەوێت لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر حەزیان بەرێکەوتن دەکرد ، بەلام (لینین) سووربوو لەسەررێکەوتن ، هەرچونێك بێت. (تروتسکی) کەیەکێك بوو لەنوێنەرەکانی روسیا لەکۆنگرەی رێکەوتنەکەدا دەڵێت:ـ "بانگ کرا بۆکۆبونەوەیەك بەجلی سموکنەوە (١) سەرسام بوونەی دەزانی ئایا لە

نوێنەرێکی کرێکاران دەوەشێتەوە ئەم جلە بورجوازیانە لەبەربکات ، بروسکە (برقیە) یەکی ناردبو (لینین) ، داوای ئاموژگاری لێکرد لەم رووەوە ،

خیرا (لینین) وەڵامی دایەوە: "ئەگەر ڕێکەوتنەکە بەستراوەبە وەوە کەچار شێوێکی ژنانە ، بەخۆتدا بدەیت لەمەدا دوودڵ مەبە".

لەوکاتەدا کە روسەکان گفتوگۆیان لەسەر مەرجەکانی ڕێکەوتنەکە دەکرد ، ئەلمانەکان بەرەو (بتروغراد) دەکشان ، ئەمە مەرجەکانی لەمەر ڕێکەتنەکەی لەپێشوتر فورس ترکرد ، دوایی سوفیت بەنابە دڵی بەئاموژگاریەکەی (لینین) ، بەرێکەوتن نامەکەی (برست لیتوفسك) لەمانگی مارتی ١٩١٨ دەدا رازیبوون ، بەرێکەوتن نامەکە روسیا بەشێك لەخاکی رۆژئاوای لەکیس چوو. ئەم بەلای (لینین)ەوە زۆر پێویست بوو ، کەوا ووتی: لەشکرریکەوتن نامەکەی بەقاچ ئیمزاکردو ، سە لماند"(٢).

سوفیت لەسەرەتاوە هەوڵی دا کە لەگەڵ هەمو دەولەتەکانی کەبەشداری جەنگە مەزنە کەیان کردبوو ، لەگەلیانداریك کەوێت ، دوای ئەوەی کەدەسەلاتیان وەرگرت بەرۆژیك پەیامێکیان بلاوکردەوە ، لەوپەیامەدا ، داوایان لەهەموو دەولەتەکانی جیهان کرد ، و بەلین یان دا ، کەواز لەو هەموو داخوازیانە دێنن کە ئەنجامی پەیمانە نەهێنیەکانەوە پەیدابوون کەوا حوکومەتی قەیسەر ئیمزای کردبوو ، وەداوایان کرد کە (ئەستدمبول) بە دەست تورکەکانەوە بمێنێتەوە ، ئیتر داوای خاکی تری نوێ ناکەن لەتورکیا بەلام ئەم هاوارو داوایەی سوفیت بۆرێکەوتن ، لای دەولەتە شەرکەرەکان هیچ وەلامێکی نەبوو ، چونکە هەردوو بەرەشەرکەرەکە ، هەریەکەیان دەیەویست سەرکەوێت و تالانی دەست کەوێت بێگومان لەجار دانی ئاشتیدا مەبەس ئەوەبوو کە بەهۆی بروپاغەندەوە کار لەجەماوەرانی میللەتان ، و لەشکرەماندوەکان بکەن ، وەشۆرشی کۆمەلایەتی بەرپابێت لەولاتانی تردا ، بەم جۆرە هەولیان دەدا بۆقەومانی شۆرشێکی جیهان چونکە ئەمە تاکە شێوازێکی بڕوێنە بوو ، لەپێناوی پاراستنی شۆرشەکەی خۆیاندا ، پێشتر باسم بۆکردیت کەپروپاغەندەکەی روسیا گەلێك کاری کردە سەر لەشکرەکانی ئەلمانیا ، و فەرەنسە.

(لینین) ریکەوتن نامەی (برست لیتوفسك)ی بەکارێکی فەوتاوادەدنا ، لەراستیدا دوای نۆ مانگ کەهاوپەیمانەکان (الحلفاء) لەکۆری جەنگی رۆژئاوادا ئەلمانیایان شکاند ، سوفیت ریکەوتن نامەکەی لەغوکردولایبرد. (لینین) لەرێکەوتنەکە مەبەسی ئەوەبوو کەهەلێك برەخسێنێت ، بۆئەوکریکارو

فەلاحانەی کەلە خزمەتی سەربازیدا ماندووبوبون پشوویەك بدەن و ، بگەڕێنەوە بۆخاکی نیشتمان ، وە بەچاوی خۆیان ببیبنن کە شۆڕشەکە لەولاتەکەدا چیپێك هێناوە ، ویستی فەلاحەکان ببینن دەرەبەگ شوێنەواری نەماوە ، وەخۆیان خاوەنی زەویەکانیانن ، هەروها ویستی کرێکارەکان ببینن چەوسینەرەوەکانیش نەماون ، کەئەمانەیان دی ، ئەوسا دەزانن کە شۆڕشەکە چ دەسکەوتێکی هێناوەتەدی ئنجا خۆیانی بۆبەخت دەکەن ، و دەی پارێزن ، ئەوسا دەزانن کێ دوژمنی راستەقینەیانە. بەم جۆرە (لینین) بیری دەکردەوە ، کەبەراستی دەیزانی ، کەوا شەروشۆڕی ناوخو بەم زوانە بەرپادەبێت لەناو ولاتەکانیتردا ، ئەم سەرکەوتنە لەپێناوی ئەوەدایە کەئەم بیرورایە لەدوائیدا ئیسپات کات. ئنجا فەلاحەکان گەرانەوە کیلگەکانی خۆیان هەروها کرێکارەکانیش گەرانەوە بۆکارکانیان ، گەرچی ئەمانە بولشەفیك نەبوون ، بەلام بوون بەگەورەترین ، یارمەت دەر ، و پالپشتی شۆڕشەکە ، کەوا ئەم دەسکەوتانەی بۆهێناونەتە دی ، نیایانەوێت لەکیسیان بچێت.

کەسەرکردە بولشەفیکەکان هەولیان دەدا رێکەوتن نامەکە لەگەل ئەلمانیادا ببەستن لەهەمان کاتدا بەردەوام بوون لەچارەسەرکردنی کاروباری ناوخودا. لەناوەراستی شارە گەورەکاندا ، ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەرە دەرکراوە جەربەزەو چەتوونەکان ، بەتفەنگ و رەشاشەکانیانەوە دەسیان کردبەریگری ، وتالان و کوشتن. هەروها هەندێك لەحیزبە ئاژاوە کەرەکان کەلە بولشەفیکەکان رازی نەبوون ، کیشەی گەورەیان بۆدەنانەوە ، بەلام حوکومەتی سوفیت جەزرەبەی ئەم هەموو جەردانەی دا ، وبلیشاندنیەوە.

حوکومەتی سوفیت دوچاری مەترسیەکی ترهات ، لەکاتێدا کە فەرمانبەرو کارگوزارانی مەدەنی یارمەتی بولشەفیکەکانیان نەدەدا ، وەتەیان دەویست بەئاموژگاریەکانی ئەمان ئیش کەن ، ئنجا (لینین) دروشمی: (ئەوی ئیش نەکات ، ناخوات) ی دانا ، ئیتر کورچ هەموو ئەو فەرمانبەرانەی یارمەتیان نەدەدان ، دەریان کردن. وەکەخاوەن بانقەکان ، قاسەکانیان نەدەکردەوە ئەمان بەدینامیت کردیانەوە ، باشترین . نموونە بۆئەوەی کە (لینین) ئەوپیاوانەی سەردەمی گۆڕکراو ، کەوا یارمەتیان نەدەدا ، لای سوك ، وبێنرخ بوون ، دەرکردنی سەرکردەیەکی بەرزبوو (القائد الأعلى) کەنەی دەویست یارمەتی بدات ئەم بەماوەی تەنها پێنج دەقیقە ، لای برد ،

و گۆڕی بەیەکێك لەئەفسەرەبچوکە بولشەفیکە کان کەناوی (کریلنکو)بوو.

سەرەڕای ئەم هەموو گۆرانکاریەیپێشو ، هێشتا بەشێکی زۆر لەوانەی سەردەمی گۆر کراو هەرمابوونەوە ، چونکە کردنی ولات بەسۆشیالیست بەشەورۆژێك هەروا ئاسان نىیە ، لەوانەیە رێکخستنی رژێمی روسیا ساڵەهای دورو درێژی بوێت ، کە ئەگەر رووداوەکان یارمەتیەکی خێرای بدەن. ئنجا هەرەکو فەلاحەکان دەرەبەگە گەورەکانیان دەرکرد ، کرێکارەکانیش ، کارگەکانیان زەوت کرد ، گەورەکانی پێشوویان لێ دەرکردن کە ئەشکنجیان دەدان ، لەبەرئەوەی باش نەبوو ، کە سوفیت کارگەکان بداتەوە بەخاوەنەکانیان ، ئەم لای خویی هیشتندوە ، کەشەروشوری ناوخو بەرپاوو ، خاوەنی ئەم کارگانە ویستیان ئەم کارگانە تێك دەن ، بەلام حوکومەتی سوفیت دووبارە هاتەوە داگیری کردنەوە تاکوبیان پارێزێت. بەم جۆرە هۆکانی بەرهەم هێنان تەواو خۆ مالیکران (التأمیم) واتە (کارکەکان بوون بەهی دەلەت) گەلێك خێراتر لەوەی کەوا لەبارەئاسییەکاندا چاوەروان دەکرا.

دوای پەیدابوونی دەسەلاتی سوفیت تانۆیەم مانگی یەکەم ژیان لەروسیادا نەگۆررا سوفیت لەورەخنەیە خۆش دەبوو کەئاراستەی دەکرا رۆژنامەی دژ بەبولشەفیکەکان هەر دەر دەچوون ، و بەردەوام بوون ، میللەت تێکرا برسیبوون ، کەچی دەولەمەندەکان بەشی ژیانێکی خۆشیو شادیان هەرمابوو ، رابواردنگای شەوان سیخناخ بۆ لەهامشوکەرانیان هەروها جێگاکانی پێش برکی (السباق)و یاریەکانی تر. چینی بورجووازیە دەولەمەندەکان لەشارە گەورەکاندابوون ، وەنیشانەی کەیفو خۆشیبەچرو چاویانەوە دیاربوو چونکە چاوەروانی کەوتنی حوکومەتی سوفیت یان دەکرد ، ئنجا ئەوکەسانەی کە داوای نیشتمان پەروەریان دەکرد ، وە بەتەنگ بەردەوام بوونی جەنگە کەوەبوون لەگەڵ ئەلمانیادا کەلەخۆشیدا سەمایان دەکرد بۆکشانی لەشکرەکانی ئەلمانیا بەرەو (بتروغراد) بەداگیرکردنی ئەم پایتەختە لەلایەن ئەلمانە کانەوەشاد دەبوون ، ر قیان لە شۆرشە کۆمەلآیەتیەکە گەلێك زیاتربوو ، تالە داگیرکردنی ولاتەکەیان لەلایەن دوژمنەوە ، ئەمەش پێشەو ، پەیرەوی ئەم جۆرەچینانەیە ، ولەسەری دەرۆن.

کەوابو ژیان تارادەیەکی زۆر ، ئاساییانەبوو ، لەراستیدا هیچ تۆقاندنێك لەم ماوەیە دا لەلایەن بولشەفیکەکانەوەنەبوو ، تیپی (بالیە)ی

مۆسکو هەموو رۆژێك لەسەر پێشکەش کردنی هەڵپەرکێ کانی دەرویشت ، لە هۆڵێکداکە جمەی دەهات لەسەیرکەران ، کە (بتروغراد) مەترسی داگیرکردنی لێکرا لەلایەن ئەلمانەکانەوە حوکومەتی سوفیت گواستیەوە بۆ مۆسکو ، مۆسکو بۆ بەپایتەختیان ، باڵیۆزی هاوپەیمانەکان هەرلە روسیادامابونەوە ، لە (بتروغراد) رایان کرد ، ترسان نەوەك بکەوێتەدەست ئەلمانەکان ، لەشوێنێکی ئەمین و سەلامەتدا لە(فولغدا) کە شارێکی بچوکە و دورە لەهەمو چم و جۆلیکەوە ، لەوێ پێکەوە دانیشتن ، لەحالێکی سەغلەتی بەردەوام ، و تورەییدا ، بەهۆی پروپاغەندەی سەیر سەیرە وەکە دەیان گەیشتی ، هەمیشە دەچونەلای (تروتسکی) پرسیاری رادەی راستی ئەم پروپاغەندەیەیان لێ دەکرد ، (تروتسکی) لەتورەیی ، وسەغلەتی ئەم پیاوە دیبلوماسیانە پەست دەبوو ، پێی وتن کە (رەجەتەیەکی دوکتور) پێویستە بۆهێمنی کردنەوەی ئەو جەنابی بەرێزانەی کەلە (فولغدا)دا دانیشتون "ئەم رەجەتەیەش پێی دەڵێن رەجەتەی برومیر کەبۆ هێمن کردنەوە ئەوانەی تووشی هیستریا ، و تورەیی دەبن بەکاردێت.

ژیان ، لەسەرەوە (سطح)دا ئاسایی دیاربوو ، کەچی لەژێر ئەم ئاسایی و هێمنیەوە گەلێك شەپول بەیەکیاندا دەدا ، هیچ کەسێك بەبولشەفیکەکان خۆیشیانەوە بەئومێدی سوفیت نەبوون تائەوکاتە بمێنێتەوە ، ئیتر هەموان کەوتنە دەسیسەرێکخستن و دەغەلی. ئەلمانەکان لە ئوکرانیاو ، خوارووی رووسیادا حوکومەتێکیان دروست کرد بووکە شوشەیەك بۆ بە دەستیانەوە ، سەرەرای رێکەوتن لەگەڵ ئەلمانیادا هەمیشە وا دەردەکەوت کەئەلمانەکان هەرەشە لەسەلامەتیو ئاسایشی حوکومەتی سوفیت دەکەن ، هەرچەندە هاوپەیمانەکان (الطفاء) ، ئەلمانەکانیان خۆش نەدەویست ، کەچی رقیان لەبولشەفیکەکان زۆرتر دەبوەوە تاکو لەئەلمانەکان گەرچی(وێلسون)ی سەرەك جمهوریەتی ولاتەیەگرتوەکانی ئەمەریکا سەلاوێکی ، دۆستانەی نارد بۆکۆنگرەکەی سۆفیت لەسەرەتای سالی ١٩١٨ زاینیدا کەچی وادیاربوو لەمەپەشێمان بوبوەوە لەدواییدا بیروڕای خۆی گۆڕی بەم جۆرە دەولەتە هاوپەیمانەکان بەتایبەکاری دەستی یارمەتیان بۆکەسانی دژ بەشۆڕشەکە درێژدەکرد. مۆسکو جمەی دەهات لەجاسوسە بێگانەکان ، یەکەمین ئاشنای بەکرێگیراو (العمیل) دام و دەزگای نەهێنی بەریتانیا ، کەبەسەرەك

جاسوسانی بەریتانیا بەناوبانگ بوو نێررا بۆئەوی بۆ کێشەنانەوە ، بۆ حوکومەتی سوفیت. ئەرستوکراتی ، و بورجوازیەکانی کەوا پەیتا پەیتا جیاوازیەکانیان (الامتیازات) نەدەما ، بەیارمەتی ، و بەهۆی ئەوبارەیەوە کەهاوپەیمانەکان بۆیان دەناردن ، کرداری دژ بەشۆڕشەکەیان بەرپا دەکرا.

ئیتر وەزع وباربەم جۆرە بووکە نیوەی سالی ۱۹۱۸ زاینی رابورد ، وە حوکومەتی سوفیت کەوتبوە سەرلێواری هەرەسیك.

---

١) بەرگی سموکن:ـ بەرگێکی تایبەتی چین بورجوازی و دەولەمەندەکانە لەرابواردن ، وئاهەنگیاندا لەبەری دەکەن.

ـ وەرگێڕ ـ

٢) مەبەسی ئەوە بوە کە سەربازەکان لە جەنگ بێزاربوبوون ، بۆیە لەکۆڕی جەنگەکەدا هەڵدەهاتن ، وبە پێی خۆیان رایان دەکرد ، چونکە خوا خوای ئاشتیان بوو.

ـ وەرگێڕ ـ

# خەباتی ئێرلاندە لەپێناوی جمهوریەتدا

**٢٨/نیسان/١٩٣٣**

کچم ئێستا تۆزێك بەدورو درێژی باسی کارەساتە نوێیە گرنگەکانی جیهانت بە ئیرلانددە بۆ دەست پێ دەکەم ، هەرچەندە ئەم ولاتە بچکۆلە یەو کەوتۆتە ئەوبەری رۆژ ئاواوە ، هەرچەندە بەشتێکی گرنگ لەمێژووی جیهان و توانای ئێستانای گرێتەوە بەلام ولاتێکی ئازاودلێرە ، بەستەم و دەست درێژی قایل نابێت ، ئیمپراتۆریەتی بەریتانیابەو هەموو گەورەیی ، و دەست رویشتوییەوە ، نەیتوانیوە سەرشۆری کات.

لەنامەی دوایمدا دەربارەی یاسای حوکمی خۆبەخۆیی لە ئیرلاندەدا بڵاوکردیت کە بەرلەمانی بەریتانیا لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەری هێنا ، ئەم یاسایە پێشەوایانی (ألستر)ی بروتسنانت ، و حیزبی نەریت پەروەرەکان (حزب المحافظین)ی لەئینگلتەرە سەغلەت ، ..کرد ئنجا لەپێناوی بەرهەڵستی کردنی ئەم یاسایەدا (ألستر) شۆرشێکی رێك وپێکی ، سازکرد ، ئنجا لەئەنجامی ئەمەدا ئیرلاندەییەکانی خوارووش ، پێشمەرگەی نیشتمانیان رێکخست بۆبەکۆ داچوونی (ألستر) هەرکاتێك پێویست بوایە ، دیاربوو بێگومان شەرێکی خۆبەخۆ پەیدادەبوو کە ئەگەر ، جەنگە گەورکە هەڵنەگیرسایە وە سەرنجی خەڵکی بەلای مەیدانی جەنگەکەدا لە بەلجیکا ، و سەرووی فەرەنسەدا وەرنەگیرایە ، هەرچەندە پێشەوا ئیرلاندە ییەکان لەناوبەرلەمانی بەریتانیادا ، یارمەتی ولاتەکەی خۆیان پێشکەش کردبە جەنگەکە ، بەلام ولاتەکە خۆی لەبارێکی وادانەبوو ، یارمەتی بدات کە راستەوخۆ تێکەڵ بەجەنگەکە ببێت ، کەچی شۆرشگێرەکانی (ألستر) چونکە جێگەی بەرزیان لەناو حوکومەتەکەی بەریتانیادا دەست کەوتبو ، بۆیە میللەت زیاتر رقی لێیان دەبوەوە.

لەئیرلاندەدا هەست کردن بەنارەزایی پەروەردەبوو ، وە خەلکی هەستیان کرد ، هەرگیز لەبەرژەوەندیو ، چاکەی ئیرلاندەدانیـیە ، خۆی بکات بەقوربانی وتێکەڵ بەجەنگەکە ببێت لەپێناوی ئینگلتەرەدا ، هەرکە پێشنیازی سەربازی بەزۆر کردن لەئیرلاندەدا کرا ، هەروەکو لەئینگلتەرەدا روویدا ، ئنجا بێزاری و هەرەشە لەهەموو لایەکەوە پەیدابوو ، ئیرلاندە خۆی ئامادەکرد ، کەبەر هەلستی پرۆژەکە بکات ، بەرەبری جەك ئەگەر پێویست بوو.

لەحەفتەی جەژنی (فصح) دا(1) لەساڵی ١٩١٦ زاینیدا شۆرشێك بەرپابوو جمهوریەکی ئیرلاندیان دامەزراند ، بەلام دوای چەندرۆژێك ، بەریتانیا ئەم جمهوریە تەی فەوتاند ، لاوە دلێرەکانی ئیرلاندە بەپێی فەرمانی عورفی گوللەباران کران و گوژران ، ئەم شۆرشە بەشۆرشی (فصح) ناودەبرێت ، ئەم شۆرشە تەقەلایەکی تەواونەبوو ، بۆ زورانبازی لەگەڵ بەریتانیادا ، بەلکو خۆپیشاندانێکی دلێرانەبوو مەبەس ئەوەبوو ئیرلاندە بۆجیهانی دەرخات ، کەهێشتا خەوبە جمهوریەتەوە ، دەبینێت ، وە بەئارەزووی خۆی نایەوێت مل بۆ دەسەلاتی بەریتانیا کەچ کات بەلام لاوە بەهەلمەتەکان کەئەم شۆرشەیان دەگیراو ، خۆیان بەخت دەکرد دەشیان زانی لەسەرکەوتندا هیوایان کزە ، بەلام دەیان ویست بەجیهان رابگەیەنن ، و گۆی لە دەنگی ئیرلاندەی تێکۆشەر بگرێت ، هەرچەندە لەو باوەرەشدابوون کە شۆرشەکە و ، خۆبەخت کردنیان لەپاشەرۆژدا دێتە بەرەو ئیرلاندە ئازادی خۆیی دەست دەکەوێت.

لەکاتی شۆرشەکە دا ئیرلاندەییەکیان گرت ، هەولی دەدا ، بەدزییەوە لە ئەلمانیاوە ، چەك بۆئیرلاندە بنێرێت ناوی (سیرروجرکیسمنت) بوکە ماوەیەکی دورودرێژ لەدیبلوماسی بەریتانیا ئیشی کردبوو . کەبردیان بۆدادگا لە (لندن) ، و بریاری خنکاندنی بەسەردادرا ، لەقەفەزی تاوانبار کردندا وتارێکی جوانی کاریگەری وا ، کەنیشانەی گیانی نیشتمان پەروەری راستە قینەبوو ، کە ئیرلاندەییەکان هەیانە.

گەرچی شۆرشەکە کوژایەوە ، بەلام کوژانەوەی بەسەرکەوتنێك دەژمێرێت چونکە ئەوە رەقی ، و سەرسەختیـیەی کەبەریتانیایەکان دوای شۆرشەنواندیان لەگەڵ تەقەکردن لەلاوە ئیرلاندەییەکان ، رق و کینەیان لەدڵ و دەروونی

ئیرلاندەییەکاندا پەیداکرد ، هەرچەندە بەسەرزارەکی ئیرلاندە هێمن بووەوە ، بەلام ئاگرەکە لەژێر خۆلەمیشەکەوە هەردەکرا ، تاکو کەلێنێکی دۆزییەوە لەبزتنەوەکەی (سن فن) دا کەزۆر بەخیرایی پەرەی سەند ، لەنامەکەی پێشوومدا دەربارەی ئەم بزوتنەوەیە ئاگادارم کردیت ، گەرچی لەسەرەتاوە سەرکەوتنی تێدانەبوو ، بەلام لەدواییدا بڵێسەی سەندو ، کلپەی بەتین بوو.

دوای جەنگە گەورەکە ، لەهەمو لایەکی بەریتانیادا ، هەڵبژاردن دەستی پێکرد ، بۆ دانانی ئەندامانی بەرلەمان کەلە (لندن) داکۆدەبوەوە تاقمەکەی (سن فن) هەمو کورسیەکانی کە بۆئیرلاندە تەرخان کرابو ، رامالیان کردو ، وەریان گرت ، بەمە چوونە جێی نیشتمانیەکانی کەداوای توزێك یارمەت دانیان دەکرد لەگەل بەریتانیادا ، مەبەسی ئەمان لەهەلبژاردنەکە ئەوە نەبوو کە بچنە بارلەمانەکەی (لندن)ەوە ، چونکە ئەمان بروایان بە یارمەتی دان نەبوو لەگەل بەریتانیادا ، بەلکو لێك دابربوونیان (المقاطعة) دەویست ئیتر ئەم ئەندامانە نەچوون بۆ (لندن) ئنجا ئەنجومەنێکی جمهوریان لەشاری (دبلن) لە ساڵی ١٩١٩ زاینیدا دانا ، وە جاریان ، بۆ جمهوریەتی ئیرلاندەیی دا ، و ئەنجومەنەکەی خۆیانیان ناونا (ئەنجومەنی ئیرلاندەیی) دەبوایە ئەم ئەنجومەنە ، بەشی ناوچەی (ألستر) بشیتێدا بوایە ، کەچی خەلکی (ألستر) نەهاتنە ناوی وبەشداریان نەکرد چونکە حەزیان بەئیرلاندەی کاثولیکی پەیرەونەدەکرد. ئیتر (ئەنجومەنی ئیرلاندی) (دیفالیرا)یان هەڵبژارد بەسەرەك جمهوریەوە (جریفیت) بەجێگری سەرەك ، تائەوکاتەش هەردوو کیان لەبەندیخانەکانی بەریتانیادا بوون!

لەدوای ئەمە کوشتاریك رووىدا لەهەموو کوشتارەکان سەیرتربو کە لە نێوان ئینگلتەرە ، و ئیرلاندەدا رووی دابو: تاقێمك لەلاوانی کچ و کور فولبی هەستی نیشتمان پەروەری پالی پێوەنان کەبچن بەکژ ئیمپراتوریەتی بەریتانیادا کەخاوەنی لەشکرێکی رێك و پێکە ، وە بەچەند جار لەوان گەلێك بەهێزترە. بزوتنەوەی (سن فن) بریتیبوو لەهەرەمەبەك لە پەرت و ، بلاوی ، و زورە ملی ، لایەنگرانی ئەم بزوتنەوەیە رایان گەیاند کە کەس بەلای دامەزراوەکانی بەریتانیادا نەچێت ، وە دامەزراوی تایبەکاری خۆیانیا ن هەبێت وەکو لیژنەی بریاردان (التحکم) ، تاکو جێی

دادگارەسمیەکانی بەریتانیا بگرێتەوە ، لەلادێکاندا شەڕی جەتەگەری دەستی پێکرد و هێرشیان دەبردە سەربنکە دوورەکانی پۆلیس ، بەلام ئەوانەی کەسەر بە(سن فن) بوون ، و لەبەندیخاکاندا بوون ، و گیرابوون ، بەمان۔ گرتن لەنان خواردن حوکومەتیان هەراسان کرد ، لەهەموو مان گرتنەکان بەناوبانگ تر ، ئەو مان گرتنەبوو کە سەرەك شارەوانی (کورك) کەناوی (بترنی مکسوینی)بوو پێی هەڵساو هەموو ئیرلاندەی تێکرا هێنایە لەرزە ، کەئەم کابرایەیان بردە بەندیخانە ووتی:۔ لەبەندیخانە بەزیندویی ، یان بەمردوویی دێتە دەرەوە ، ئیتر وازی لەنان خواردن هێنا ، دوای (٧٥) حەفتاو پێنج رۆژ لاشەکەیان لەبەندیخاکەوە برد بۆگۆڕستان.

بەناوبانگ ترین ئەوانەی شۆرشی (سن فن)یان رێکخست (میشیل کولنز)بووسەبارەت بە بەرهەڵستی کردن حوکومەتی بەریتانیا ئیفلیج بوو ، لە جوولە کەوت وای لێهات شوێنەواری تەنانەت لەناوچەکانیشدا نەمابوو ، بیانو بەیەك گرتن ، و زۆرەملی لەلایەن هەردوو لاوە بەهێزبوو ، بەریتانیا هێزێکی تایبەتی بەریتانیایی‌لەسەرسەخت‌وسەر جل لەوانە کەوا لەم دواییەدا لە لەشکری جەنگەکە بەرەلابووبوون دروست کرد ، بەمانە پارەیەکی باشی دەدانی ، و کردنی‌بە سەرباز ، ئەم هێزە بە(رەش و قاویی) دەناسرا ، چونکە ئەم دوو رەنگە ، رەنگی جلە سەربازیەکانیان بوو ، ئەم هێزە بەگەلێك کرداری کوشتن و جەزرەبە هەستا ، گەلێك جار خەلکیان لەناوجێی نوستندا دەکوشت ، وایان دەزانی بەمە ئەندامانی (سن فن) خۆیان دەدەن بەدەستەوە ، بەلام ئەمانە خۆیان نەدایە دەستەوە ، لەسەرشەری جەتەکەری رۆیشتن ، هینری (رەش و قاوەیی) بەگەلێك کرداری تولەسەندن هەستان ، وەئاگریان لەچەندێیەك بەتەواوەتی ، بەشێك لەشارەکان بەردا ، ئیتر ئیرلاندە بووبە کۆڕی جەنگ ، هەردوولا ، لە کرداری کوشتن ، و یرانکاریدا پێشبرکیان دەکرد ، ئنجا لایەك لەم لایانە هێزو توانای ئیمپراتوریەتێکی رێك وپێکی لەپشتەوە بوو ، بەلام لاکەی تریش هێزێکی ، بروای پۆلایینی هەبوو.

جەنگەکەی نێوان ئینگلیز ، و ئیرلاندەییەکان ماوەی دووساڵ بەردەوام بوو لە ساڵی ١٩١٩ ز تاکو ئۆکتۆبەری ١٩٢١ ز ئنجا بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٠ زخێرا یاسای حوکمی خۆ بەخۆیی (حوکمی ذاتی) دانا ، بەلام

یاساکەی پێشوتر کەوا لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا دانرا ، کەوا ئەوەندەی نەمابوو لە (ألستر)دا شۆرشی لەسەر بەرپابێت ، ئەو یاسایە لەغوکراولابرا. یاساتازەکەئیرلاندەی کردبەدووبەشەوە بەشەی یەکەم بریتی بوو لە (ألستر) وەیا(ئیرلاندەی سەروو) ، دووەمیان بریتی بو لەبەشەکانی تری ئیرلاندە ، هەریەکەلەم دووبەشەبارلەمانی تایبەتی خۆیی بەپێی یاساکە هەبوو ، لەبەرئەوەی کە ئیرلاندە دوورگەیەکی بچووکە ، بەش کردنی مانای دروست کردنی دووپارچەی زۆر بچکۆلەتیایدا ، لەسەرەوودا بەرلەمانی (ألستر) پێك هات ، کەچی خەڵکی ئیرلاندەی خواروو ، ئاوریان بەلای ئەم کارەدا نەدایەوە ، و روویان کردە شۆرشی (سن فن).

لەئوکتوبەری ١٩٢١ زاینیدا (لویدجورج)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا بەوانەی کە سەربە(سن فن)ن رایگەیاند ، بەشەروەستاندن قایل ببن ، وە لەدواییدا گفتوگۆ بۆ جێ بەجێ کردنی ناکوکیەکە دەست پێ دەکات ، ئەم راگەیاندن ، و داخوازیە قوبول کرا ، هەرچەندە بەریتانیا لەدواییدا دەیتوانی ، ئەوانەی سەربە (سن فن)ن بیان فەوتێنێ ، وە ئیرلاندە بکات بە بیابانێکی کرك ، بەلأم سیاسەتەکەی لەئیرلاندەدا ئەمەریکاو ، ولاتانی تر پێیان خۆش نەبوو وەرقیان لێ دەبووەوە ، وەپارە ، وباربوویی لەئیرلاندەییەکانەوە کە کۆچیان کردبو ، بۆ ئەمەریکا ، تەنانەت لەکۆمەڵەی گەلانی سەربە بەریتانیاوە ، دەرژایە سەر ئیرلاندە دا بۆ بەردەوام بوون لەتێکۆشاندا ، بەلأم ئەوانەی کەسەر بە(سن فن)بوون دووچاری ئەشکنجێکی بێئەندازەبوون لەئەنجامی زۆرانباریە مەزنەکەدا کەوا پێ هەلسان.

نوێنەرەکانی ئینگلیزو ئیرلاندەییەکان لە(لندن)دا ، دوو مانگ کۆبوونەوە ، لە دیسەمبەری ١٩٢١ زاینیدا بەمۆرکردنی رێککەوتنێکی سەرەتایی کۆتایی هات هەرچەندەئەم رێکەوتنە دانی نەنا بەجمهوریەتی ئیرلاندەدا ، بەلأم تەنها لەدووشت دانەبێ ئازادییەکی دا بەئیرلاندە لەکاروباری نیشتمانیدا ، زیاتر لەئازادی ولاتەکانی تری دومنیون سەرەرای ئەمە نوێنەرەکانی ئیرلاندە بەم رێکەوتنە رازی نەبوون مەگەر ترسی ئەوەی نەوەك بەریتانیا بکەوێتە جەنگەوە لەگەلیاندا.

لەئیرلاندەدا دەربارەی پەیمان نامەکە خروشانێکی گەورە بەرپابوو ، تاقمێك پشتیان گرت ، وەتا قمێکی تر زۆربەتین بەرهەڵسنیان کرد ، ئەمە

بوو بەهۆی ئەوە کە ئەوانەی سەربە (سن فن)ن ببن بەدووبەشەوە ، ئـنـجـا لەدواییدا ئەنجومەنی ئیرلاندە بریاری لەسەر پەیمان نامەکـە دا ، ئـیـتـر (دەولەتی ئیرلاندەی ئازاد) پەیدابوو ، بـەڵام لـەنـاو ئـەوانـەدا کـەسـەر بەبزوتنەوەی (سن فن) بوون بوو بەشەرو شۆڕێکی نـاوخـو. لـەکـاتـێـکـدا (دیڤالیرا)ی سەرەك ئەنجومەنی ئیرلاندە ، بەرهەڵستی پەیمان نامەکەی کـە لەگەل ئینگلتەرەدا کرابوو دەکرد ، کەچی (جریفیت ، و میشیل کولیـنـز) وەی ترپشتی پەیمان نامەکەیان دەگرت. چەندمانگێك ئـاگـری شـەرو شـۆری ناوخو لەناو ولاتەکەدا هەڵگیرسا. دیارە بەریتانیا یارمەتـی لایـەنـگـرانـی پەیمانەکە ، و (دەولەتە ئازادەکە)ی دەدا ، تا بەریتانیا بتوانێت سـەربـە دوژمنەکانی شورکات. ئیتر بەدەستی سەر بە جمهوریەکان (کولینـز) کـوژرا هەروەها گەلێکیش لەپێشەواکانی سەربە جمهوری بەدەستی ئەوانەی کەسـەربـە (دەولەتەئازادە)کەن کـوژران. بـەنـدیـخـانـەکـان پـربـوون لـەجـمـهـوری خوازەکان ، ئەم شەرو شۆری ناوخویە ئەنجامی گۆڕانـکاریە غەمناکـەکـەی لەمە رتێکۆشانە دلیرانەکەی ئیرلاندەیە لەپێنـاوی ئـازادیـدا ، بـەجـۆرە سیاسەتی فێلبازی بەریتانیا سەرکەوت لەشوێنێـکـدا کـەهـێـزو ، چـەکـی سەرنەدەکەوت ، ئیتر ئیرلاندەییەکان لەناوخۆیاندا دەستیان کرد ، بەیەکتری کوشتن ، کەچی بەریتانیا لایەکی لەلاکەی ترهان دەدا ، پشـتـیـنـی لـێ کردەوە ، و بووبە چاودێری کەرێکی ئاسودە بۆ ئەم کوێرەوەرییە.

هەرچەندە شەرو شۆری ناوخۆ وردە وردە هاتەکزی بەڵام جمهوری خـوازەکـان سووربوون لەسەر پەسندنەکردنی "دەولەتە ئـازادەکـە" ، تـەنـانـەت ئـەو جمهوری خوازانەی کەبۆ ئەنجومەنی ئیرلاندە واتە (بۆ بارلەمانی دەولـەتـە ئازادەکە) هەڵبژێررابوون لەکۆبوونەوەکانیدا ئامادە نەدەبوون ، تاسوێنـدی دڵسوزی بۆ پادشای بەریتانیا نەخۆن. (دیڤالیر)و پیـاوەکـان بـە دووری مانەوە لەئەنجومەنـەکـەوە ، کـەچـی حـیـزبـی (دەولـەتـە ئـازادە)کـە بەسەرکردایەتی (کوسجریف)ی سەرەکی دەولەتە ئازادەکە ، هەوڵـیـان دەدا ئەوانەی کە جمهوری خوازن بەهەموو جۆرێك بیان پلێشیننەوە.

لەدروست بوونی دەولەتی ئازادی ئیرلاندەوە ئەنجامێکی دوور لەسیاسەتی ئیمبراتوریەتی بەریتانیا دابەیدابوو ، پەیمان نامەکە بەشـێـکـی تـەواوی لەسەربەخۆیی لەرووی دەستووریەوە ، دابە ئیرلاندە ، زیاتر لـەهـەمـوو ،

ولاتەکانی تر ، لە دەولەتەکانی ناو دومنیون ، هەرکە ئیرلاندە ئەمەی وەرگرت ، دەولەتەکانی تریش وەریان گرت ، ئەمە بووبە هۆی دوروست بوونی بیروڕایەك لەوەزع و باری قانونی دەولەتەکانی دومنیون دا بەلای بەریتانیاوە. دوا ،دوای؛ ئەمە گەلێك گۆرانکاری تر لەوەزع و باری دەولەتەکانی دومنیون دا رووی‌دا ، لەئەنجامی کۆنگرەکانی ئیمپراتوری‌یەوە کە لەنێوان بەریتانیا ، و دەولەتەکانی دومنیون دا دەبەسترا. ئیرلاندە (هەربە خواستە جمهوریەکەیەوە) مایەوە ، هەمیشەرووی دەکردە سەر بەخۆیی تەواو. هەروەکو ئەفەریقای خواروو کەزۆربەیان (بویر) بوون ، بەم پێیە بارو ، وەزعی دومنیون دەگۆری ، و بەرەو چاك بوون دەچن ، تاکودە بنە دەولەتێکی هاوشانی بەریتانیا لەناو کۆمەڵی دەولەتەکانی سەر بە بەریتانیادا. ئەمە شتێکی باشە ، بێگومان هەنگاوێکی پێشکەوتنخوزانەیە ، کەبەرەو یەکسانی سیاسی دەچن ، گەرچی ئەم یەکسانی‌یە هەربە ناوە زیاتر نەك بە کردەوە ، چونکە دەولەتەکانی دومنیون لەرووی ئابووری‌یە ، بەستراون بەبەریتانیاو ، سەرمایەی بەریتانیاوە ، کەبە هۆی ئەمەوە بەریتانیا دەتوانێت دەست داگرێت ، وە بەگەلێك جۆر تینی شمشێری ئابووریان بخاتە سەر ، لەهەمان کاتدا ، پێ گەیشتن و نەش و نمای دەولەتەکانی دومنیون دەبێتە هۆی لەیەك کەوتن ، و پێك دادانی بەرژەوەندیەکانی ئەم دەولەتانەو، بەریتانیا ، وە دەبێتە لاوازبوونی ئیمپراتوریەتەکە بەشێنەیی. ئەم ترسە لەتێك قۆپانی ئیمپراتوریەتەکە بوو بەهۆی ئەوەی کە بەریتانیا کەمتر دەست داگرێت ، و گرانباری سوکترکات وە یەکسانی سیاسی بدات بەدەولەتەکانی دومنیون بەم ژیری‌یە بەریتانیا گەلێك لەبەرژەوەندیەکانی خۆیی پاراست. بەڵام ئەمە زۆردەوام ناکات ، چونکە ئەو هۆیانەی کەدەولەتەکانی دومنیون لەبەریتانیا جیادەکاتەوە ، رۆژ بەرۆژ پەرەدەسینی ، وەزۆر بەیان ئابورین ، و هەمیشە لەکاردان بۆ هەڵوەشانی ئیمپراتوریەتەکە ، سەرەرای ئەم هۆیەش ئینگلتەرە بەرەولاواز بوون دەچێت ، بۆیە لەسەر بووکانەوەی ئیمپراتوریەتی بەریتانیام نووسی ، خۆئەگەر بەستنەوەی دەولەتەکانی دومنیون بە بەریتانیاوە کارێکی نەنگ و ستەم بێت - سەرەرای پەیوەندایەتیەکانی نەریت (تقالید)و رۆشنبیری ، و رەگەز - ئیتر دەبێ چەند ستەم‌بێت کە هیندستانی هەرپێوە ببەسترێتەوە.

بەرژەوەندیە ئابوریەکانی هیندستانی راستەو خۆ لەگەل بەرژەوندیەکانی بەریتانیادا لێك دەدەن ، ئنجا بێگومان لایەکیان دەبێت بولاکەی تر سەرشۆرکات ، لەبەرئەوەی هیندستانی ئازاد مل بە مەیان نادات ، بۆیە نایەوێت ئابوری ، و بەرژەوەندیەکانی سەرشۆری بەریتانیابن.

کۆمەڵی گەلانی سەربە بەریتانیا (واتە دەولەتە ئازادەکانی دومنیون) لەگەڵ هیندسانی دەولەمەندی پاشکۆی بەریتانیا ، مانای دەولەتە سەربەستە سیاسیەکان دەگەیەنێت ، کەچی لەواقیعدا هەریەکە لەم گەلانە لەرووی ئابووریەوە مل کەچی ئیمپراتوریەتی بەریتانیان ، ئیتر پەیمان نامەکەی بەریتانیاو ئیرلاندە مانای بەردەوام بوونی چەوساندنەوەی ئیرلاندەیە ، لەلایەن سەرمایەی بەریتانیاوە ، ئەمە هۆی بنەرەتی بوو بۆ بەردەوام بوونی تێکوشان لەپێناوی دەستکەوتنی جمهوریەتدا ، ئنجا (دەفالیرا)و جمهوری خوازەکان نوێنەری فەلاحە هەژارەکان ، و چینی ناوەراستی هەژارو ، رۆشنبیرە هەژارەکان بوون ، کەچی (کوبحریف) و (دەولەتە ئازادە)کە نوێنەری چینی ناوەراست و فەلاحە دەولەمەندەکان بوون ، ئەم دووچینەی دوایی لەگەڵ بەریتانیادا بەرژەوەندی ئالوگۆری بازرگانیان هەبوو.

ئنجا (دیفالیرا) بریاری دا شێوازی خۆی لەتێکوشاندا بگۆریت ، خۆی و پیاوانی سەربە حیزبەکەی ، چوونە کۆنگرەکەی ئیرلاندەوە ، و سوێندی دڵسوزی خوارد ، بەڵام وتی بۆیە ئەمە دەکات لەپێناوی پەیرەوکردنی دەستورە روالەتیەکانە ، ئەگینە ئەم هەرکە زۆر بەیەتی لەئەنجومەنەکەدا مسۆگەر کرد ، ئیتر ئەو سوێندە لادەبات. لە هەڵبژاردنەکانی ئایندەدا ساڵی ١٩٣٢ زاینی (دیفالیرا) زۆر بەیەتی بەرلەمانی دەولە تەئازادەکەدا دەست کەوت ، گورج کەوتەکار بۆجێ بەجێ کردنی پرۆغرامەکە ، و بەرنامەکەی هەروها دەبوو تێکۆشان بەردەوام بوایە ، بۆگەیشتن بەجمهوریەت ، بەڵام شیوازی تێکۆشان دەستکاری کرا. (دیفالیرا) پێشنیازی لابردنی سوێندە دەستوریەکەی کرد ، وەبە حوکومەتی بەریتانیای راگەیاند کەوا قیستەکانی ساڵانەی قەرزی زەوی زارەکان ناداتەوە ـ وابزانم کچم باسی ئەم قیستانەم بۆکردویت ـ لەکاتێکدا ، زەوی ، و زاری ئیرلاندە زەوت کران ، وەلە دەرەبەگە گەورەکان سەندرایەوە کەخاوەنەکانیان ئینگلیزبوون قیستی ساڵانە پارەیەکی باشیان بدرێتی لەبەرهەمی زەویەکە ، و لەو فەلاحانەی کەوا

زەویەکانیان بەسەر دا دابەش کراوە ، ئەم پارەدانەوەی سالانەیە ماوەیەك پشت (جیل) بێ وەستان بەردەوام بوو ، تاکو (دیفالیرا) وەستاندیی.

لەسەرئەم کارە لەئینگلتەرەدا هاوار هەلسا ، وە بووبە هۆی بەکـزدا چوونی حوکومەتی بەریتانیا. حوکومەتی بەریتانیاش لەپێشدا بێزاری دەربری کە: لابردنی سوێندە دەستوریەکە سەر پێچیە لەپەیمان نامەکەی سالی ١٩٢١ ئنجا (دیفالیرا) وەلامی دایەوە ، وتی: ئەگەر ئینگلتەرە ، و ئیرلاندە هاوشانی یەکترین وەکو بەریتانیا دەلێت کە گوایا دەولەنەکانی دومینون هاوشانی بەریتانیا ، وە مافی ئەوەیان هەیە دەستورەکانیان بگۆرن کە واتە ئیرلاندەش مافی ئەوەی هەیە کەسوێندە کە بگۆرێت ، وە یان لایبەرێت لەدەستورەکەیدا ئیر پێویست ناکات پەیمان نامەی ١٩٢٢ بێتەکایەوە ، خۆ ئەگەر ئیرلاندە ئەم مافەی نەبێت ئەمە وادەگەیەنێت کە ئیرلاندە موستەعمەرە ، و ژێردەستەی بەریتانیایە.

دووبارە بەریتانیا توندتر بێزاری دەربری سەبارەت بەوەستاندنی قیستی زەویەکان ، وە ووتی:ـ کە ئەمە سەرپێچیەکی ئاشکرایە لەهەموو بریار ، و بەلێنەکان. بەلام (دیفالیرا) ئەم بەهانەیەی پەسند نەکرد ، ئیتر مشتومرێکی یاساییانە بەرپابوو کە پێویست ناکات لێرەدا بە دورو درێژی باسی بکەین ، کە کاتی قیست دانەوەکەهات ، ئیرلاندەنەی دا بە بەریتانیا ، ئنجا بەریتانیا جەنگێکی ئابوریانەی لەگەل کرد ، گەلێك باجی لەسەر بەروبوومی (الحاصلات) ئیرلاندە دانا ، کە دەنێررا بۆ ئینگلتەرە بەمە بەتەی نابووت کردنی ئیرلاندە ، و ناچارکردنی حوکومەتی ئیرلاندە کە مەرجەکانی بەریتانیا قوبول بکات ، ئەمە رەفتاری بەریتانیا کەوا هێز بەکار دێنی بۆسەر شۆرکردنی ئەوانەی کە بەرهەلستی دەکەن ، هەرچەندە ئەم شێوازە هیچ کەلکی نییە. ئنجا حوکومەتی ئیرلاندەش باجێکی زۆری خستە سەرگەل ، و پەلەکانی بەریتانیا ، کە دەنێررا بۆ ئیرلاندە ، ئەم جەنگە ئابووریە زیانێکی زۆری لەفەلاح ، و پیشەسازەکانی هەردوو ولاتەکەدا ، بەلام کەشوفشی نەتەوایەتیەکی توخ نەی دەهێشت سنورێك بۆ ئەمە دابنێن.

لە سالی ١٩٣٣ زاینیدا هەلبژاردنێکی نوێ لەئیرلاندەدا کرا (دیفالیرا) زۆربەیەتیەکی گەلێك زیاتری وەرگرت لەزۆر بەیەتیەکەی پێشووی

ئەمەکوتەکێکی بەتین بوو لەبەریتانیا درا ، وە پیشانی داکە سیاسەتەکەی لەبەرپاکردنی جەنگێکی ئابوریانەدا بەکەڵکی نەهات ، ئەوی سەیرە لەم کارەدا ، بەریتانیا کەپەلاماری ئیرلاندە دەدات ، وە تاوانباری دەکات بەوەکە قەرزەکانی ناداتەوە ، کەچی خۆی قەرزەکانی ئەمەریکا ناداتەوە!

(دیڤالیرا) ئەمرو سەرەکی حوکومەتی ئیرلاندەیە ، هەنگاو بەهەنگاو ولاتەکەی بەرەو جمهوریەت دەبات. سوێنەی دڵسوز یەکە نەما ، هەروەها ئیرلاندە قیستی ساڵانەکەی وەستاند. وە (حاکمی گشتی) تانیایی لاچوو (دیڤالیرا) لەشوێنی ئەو پیاوێکی خۆیی دانا ، هێشتا تێکۆشی لەپێناوی جمهوریدا هەر هەیە ، گەرچی وێنەیەکی ئابووریشی هەبێت.

لەوانەیە زۆر بەم زووانە ئیرلاندە رژێمی جمهوری دەستکەوێت گەرچی کوسپێکی گەورەش لەرێبازیدا هەبێت ، (دیڤالیرا)و حیزبەکەی بەجوت ئیرلاندەیەکی یەکگر تویان دەوێت کەیەك جمهوریەت بێت ، ویەك حوکومەتی مەرکەزی هەبێت و بریتی بێت لەهەموو دووکەکە بە (ألستر)یشەوە ، کێشەی بنەرەتی لای (دیڤالیرا) ئەوەیە بە (ألستر) بسەلمێنی کەتێکەڵ بە بەشەکانی تری ئیرلاندەببێت ، چونکە ئەمە بەرێبازی بەکار هێنانی نابێت ، دەولەتە ئازادەکەی ئیرلاندە ، ناتوانێت وەیان حەزناکات هێز بەکار بهێنێت. (دیڤالیرا) هیوای وایە کە (ألستر) بەهەستێکی خۆشەویستی یەوە بیهێنێتە لای خۆی ، تاکو ببخاتە یەکیەتیەکەی ئیرلاندەوە. وادیارە (دیڤالیرا) زیاد لەپێویستی دڵی خۆشە چونکە خەلکی (ألستر) پروتستانتن و ، هێشتا لە نیازی ئیرلاندەی کاتولیك بەگومانن.

دوا بەدوا:

هەردوو حوکومەتەکە ساڵی ۱۹۳۸ زایینی رێکەوتن لەسەرکۆتایی هێنان بە جەنگی ئابووری کەچەند ساڵێك لەنێوانیاندا بەرپابوبو ، ئیتر ئەو رێکدوتن نامەیەکە کێشەی قیستەکانی زەوی ، و بەڵێنەکانی تری پارە ، و دارایی جێ بەجێ کرد گەلێك سوودی بۆ ئیرلاندەی ئازاد هەبوو ، (دیڤالیرا) گدلێك هەنگاوی بەرەو جمهوریەت نا ، وەگەلێك لەو پەیوەندانەی کەوا ئیرلاندەی دەبەستەوە بەحوکومەتی بەریتانیا ، و تاجی

بەریتانیاوە پچراندی. ئێستە بەئیرلاندە دەوترێت (ئیرە). تاکە کێشەیەك کەوا یەکگرتنی ئیرلاندە تووشی دێت ، ئەوەیە (ئلستر) بخاتە سەرخۆی ، بەڵام هێشتا (ئلستر) ئەمەی ناوێت.

---

(١) جەژنی فصح: جەژنێکی مەسیحیە کانە لەمانگی نیساندایە ـ وەرگێر ـ مدرج نیە.

# سۆڤیێتیەکان دواکایە دەبەنەوە

**١١/نیسان/١٩٣٣**

لە مانگی یولیوی ساڵی ١٩١٨ ز ، دا رووسیا چەند گۆڕانکاریەکی بەسەر داهات ، ئەو داوەی کەبو ، بو لشەفیکەکان نرابوەوە ، خەریك بوو دەیگرتن ، ئەلمانەکان لەخواروو دا ، لە (ئوکرانیا)وە هەرەشەیان لێ دەکردن بونی ژمارەیەکی زۆر لەیەخسیری چیکۆسلوفاکیاییە کان لەروسیادا ، هاو پەیمانەکانی هان دا کە بەرەو (موسکو) بچن ، هەروها درێژایی مەیدانی رۆژئاوا لەفەرەنسەدا ، جەنگەکەش بەردەوام بوو.

ئەوی سەیرە دەبینین ، هەر یەکە لەهێزدکانی هاوپەیمانەکان و ئەلمانەکان پێکەوە لەروسیادا یارمەتی یەکتریان دەدابۆبیشنەوەی بولشەفیك بەم جۆرە دووبارە بەچاکی هێزی دوژمنایەتی نێوچینەکانمان بۆ دەردەکەوێت کەوا بەهێزترە لەهێزی دوژمنایەتی تێۆنەتەوەکان ، هەرچەندە ئەمەی دواییان ، بەشی خۆی پرە لەژەهر ، و زەقنە بوت ، گەرچی ئەم دەولەتانە بە جۆرێکی رەسمی ئیعلانی جەنگیان نەکردبو ، دژی روسیا ، بەڵام گەلێك رێبازیان دۆزیەوە بۆ ئاشوب نانەوە دژی سوفیەت ، بەتایبەتی بە یارمەت دانی سەرکردەکانی دژبە شۆڕش بەپارە ، و بەچەك ئنجا ژمارەیەك لەسەرکردە کۆنەکانی قەیسەر هاتنە مەیدانی جەنگ دژی سوفیت.

ئەوکاتە قەیسەر ، و خێزانەکەی ، نزیك چیاکانی (ئورال) لەرۆژهەلاتی رووسیادا ، دەست بەسەربوون ، لەژێر چاودێری پاسەوانەکانی سوفیتی ئەویدا ، ئنجا چوونە پیشەوەی هێزەکانی چیکو سلوفاکیا لەم ناو چەیەدا ، سوفیتی ئەم مەلبەندەی هێنایە لەرزین ، ترسان لەوەی کەبە دەستی.

# ژاپۆن شەڕ بە چین دەفرۆشێت

**١٤/نیسان/١٩٣٣**

لەکاتی جەنگە جیهانیەکەدا گەلێك کارەساتی سەرنج راکیش لەرۆژ هەڵاتی دوردا رووی دا ، کەوابو ، بابروین بۆ (چین) ، لەنامەکەی پێشوەدا باسی دروست بووٹی جمهوریەتی (چین)و ئەو کێشانەی کەهاتنەری بۆ کردیت. گەلێك تەقەلادرا بۆهێنانەوەی ئیمپراتوریەت ، بۆ (چین) بەڵام سەری نەگرت ، لەگەڵ ئەمەشدا جمهوریەتیش سەرنەکەوت لەپەرەپێدانی دەسەلاتیدا بەسەر هەموو ناوچەکاتی (چین)دا ، وەیان حوکومەتێکی بەتوانا بۆ ئەم مەبەسە پەیدانەبوو ، لەو وەختەوە حوکومەتێك پەیدانەبوو کەبلێت حوکومرانی (چین) بکات بێگیروگرفت. ولاتەکە هەروها ماوەیەك مایەوە بەدەست دوو حوکومەتی سەرەکییەوە ، یەکێکیان لەسەروو ئەوی تریان لەخوارووەدا ، خواروو بەدەست دکتور (صن یات صن)ەوە بو کە پێشەوای حیزبە نیشتمانیەکەبوو کە بە (کومنتانج) دەناسرا. وەسەر وویش بەدەست (یوان شبەکای)ە وەبوو ، لەدوای ئەم گەلیك جەنرال و ، پیاوانی سوپا هاتن کەوا پێیان دەوترا (توشون) ئەمانە لەم سالانەی دواییدا بوون بەبەلا بەسەر (چین)ەوە.

سەبارەت بەئاژاوەی بەردەوام ، وشەڕی خۆ بەخۆ وەکە دوویات دەبوەوە لەنێوان سەروو ، و خوارووەدا بەهەمیشەیی ، وەیان لەناو پیاوە کانیسوپا دا خۆ بەخوێ یەکتری ، (چین) لەبارێکدا بوو خوزگەی پێ نەدەخوازرا. ئەمە بووبە پاوانێکی بەپیت بۆ دەولەتە ئیستیعماریەکان ، بۆ بلاوکردنەوەی دەسیسە ، و سوود وەرگرتن لەم ناکۆکی ناو خۆیە ، بە پالپشتی ، پیاوانی سوپا ، وەیان بەیارمەتی کابرایەکی تر. لەوانەیە لەبیرت مابێت ئینگلیزەکانیش ئەم شێوازەیان بەکار هێنا بۆ چەسپاندنی جێ پێی خۆیان لەهیندستاندا ئیستیعمار کەران ئەم هەڵە زێڕینەیان لەکیس

حۆبان نەدا دەستیان کرد بەهاندانی پیاوانی سوپا لـەیـەکـتـری ، بـەڵام کێشەی ئیستیعمار کەران لەرۆژهەڵاتی دووردا ، جەنگە جیهانیەکە یەکی جم و جۆڵی خستن.

بەڵام ژابون دووربوو لەکیشەکانی جەنگەکەوە ، هەستی کرد کەتەواو ، وەزع باشە تاکو جم و جوولەکانی کونی لە (چین)دا دەست پێ بکاتـەوە ، لەراستیدا ئەم بارە لەهەمو کاتێك زیاتـر یـارمـەتـی ژابـونـیدا ، کـە هەرچیەکی دەیەوێت زیاتر لەجاران بیکات ، سەبارەت بەوەی کە دەولـەتـە ئیستیعماریەکان ، لەگەڵێك لاوە خەریك بوون و نەیان دەتوانی دەستـکـاری بکەن ، ژابون لەگەل ئەلمانیا جەنگـی بـەرپـا کـرد ، تـەنـهـا لـەبـەر ئەوجیاوازی ، و ئیمتیازاتانەی کە ئەلمانیا لە (کیاوشو) لە(جین) هەیبوو تاکو دەست خۆی کەوێت ، ئنجا وردە ، وردە بەرەو ناوەوە دەچوو.

لەم بیست ساڵەی دواییدا سیاسەتی ژابون لە(جین)دا زۆر چـەسـپـابـوو ژابون هەرکە لەشکرێکی نوێی پێکەوەنا لەپێشەسازیدا پێشکەوت ، بریـاری دا کە (چین) داگیر بکات ، ویستی رێیەك بدۆزێتەوە ، دەسەلاتی تـێـدا فراوان ، و پیشەسازیەکەیی بێ هێز بکات. بینی کۆریاو (چین) نزیکـن ، و هەروەکو بانگی بکەن ، و داگیریان بکات ، و بیان چەوسێنێتەوە وابـو ، یەکەم تەقەلای ژابون ئەوەبو کە بەکز (چین)دا بچێت لـەسـالـی ١٨٩٤ـ ١٨٩٥ زاینی دا ، ئەم تەقەلایە سەری نەگرت ، وەژاپۆن بەئامانجـی خـۆی نەگەیشت ، چونکە هەندێ لەدەولەتە ئەوروپاییەکان بەرهەڵستیان دەکرد ، لەپاشدا ژابون توشی جەنگێکی سەخت هات لەگەڵ روسیادا لە سـالـی ١٩٠٤ زاینیدا ، بەسەر رووسیادا سەرکەوت و جێ پێی خۆیـی قـایـم کـرد لـە (کوریا ، و منشوریا)دا ، وەکوریای خستە سەر ئمپراتوریەتی ژابون.

بەڵام (منشوریا) هەربەبەشێك لەچین مایەوە بە (سێپارچەکانی رۆژهەلاتی چین) ناودەبرا ، ژاپۆنیەکان ئەو ئیمتیازاتانەی کە روسەکان لەویدا هەیـان بوو بەهێڵی شەمەندەفەرەکەوە کەپێیان دەوت هێڵی ئاسینـیـی رۆژهـەلاتـی (چین) بۆخۆیاشیان برد ، ژابون پاش جەنگی گیرکرد لە (منشوریا) ، هیلی ئاسێنی شەمەندەفەر زۆری لەناوچەقەلە بالغەکانی (چین)ەوە کوچ پێ کـرد و رژانە (منشوریا)وە بەتایبەتی فەلاحەکان بەم جۆرە لـەکـاتـێـکـدا کـە ژابونەکان هەوڵیان دە دا کەزاڵ بن بەسەردام و دەزگای پیشەسـازیـدا لـە

(منشوریا) و لەسەرووودا ، کەچی خەڵکی (چین) لەخواروووەوە دەروانە سەروو لەخاکی ولاتەکەدا ، بەم جۆرە میللەتی (مانشو) لەشەپۆلی رەوکردوەوکانی خەڵکی (چین)و هی تردا نوقوم بوون ، وەبوون بە (چین)ی لەرووی رۆشنبیری ، و هەستەوە.

ژاپۆنیەکان بەچاوی رەزامەندی تەماشای پەیدابوونی جمهوریەتی (چین)یان نەدەکرد چونکە هەرشتێك (چین)ی بەهێز بکردایە ، ئەوان حەزیان پێ نەدەکرد ، لەپێش هەموو شتیکدا مەبەسی سیاسەتی ژاپون لە (چین) دا بەرهەلستی یەکگرتنی (چین) بوو لەبوونی یەك حکومەتی بەهێزدا ، بۆیە یارمەتی یەکێك لەسوپاییەکانی دەدا دژی ئەوی‌تر ، تاکو ئاژاوە هەر لە ولاتەکەدا بمێنێتەوە.

جەماوەری تازە پێگەلیشتووی (چین) توشی گەلێك کێشە هاتن ، ئیتر ئەرکیان هەر بریتی نەبوو ، لەوە کەوا دەسەلاتی سیاسی زەوت کەن لەحوکومە تە ئیمپراتوریەتە پەرپوتەکە چونکە دەسەلاتێکی وای نەبوو ، چونکە حوکومەتێکی مەرکەزی تەواوی نەبوو ، کەوابوو ، دەبوایە ئەم حوکومەتە مەرکەزیە پێك بهێنرایە ، (چین)ە کۆنەکە هەر ئیمپراتوریەت بوو لە راستیدا ژمارەیەك بوو لەناوچە سەربەخوکان ،پەیوەندایەتیەکی قرچوکیان هەبوو ، ناوچە کانی نیمچە سەربەخوبوون هەروها شارەکان ، و دێهاتەکانیش هەرچەندە دەسەلاتی حوکومەتی مەرکەزی وەیان ئیمپراتور باوەر پێکراوبوون بەلام دەستیان نەدەخستە کاروباری ناوخووە ، ئیتر "یەك" حوکومەت نەبو کەخاوەن دەسەلاتێك ، وەیا حوکومەتێکی مەرکەزی لەپایتەختدا ، وەیان یەك رژێم لەناو حوکومەتە ناوخۆییە جۆربە جۆرەکاندا هەبوبێت ، بۆیە ئەم ئیمپراتوریەتە پینەکراوە بەهۆی تینی پیشەسازی رۆژئاواو ، جلیسو چاوچنۆکی ئیستیعمارە وە روخا ، ئنجا دەرکەوت کە (چین) ناتوانێت بژی کە ئەگەر حوکومەتێکی مەرکەزی ، وەیا حوکومەتیکی یەکگرتووی تێدا نەبێت ، ئەمە بو بەتەقەلای جمهوریەتە نوێ کە ، ئەمەش بیروڕایەکی تازەبو بۆیە بۆ جمهوریەتە نوێکە کێشەیەکی مەزن دروست بوو ، لەهەمووی سەخت تر: کەمی ڕێگەو بانی باش وەکو شەمەندەفەر ، کەوا ئێستاش کوسپێکە لەرێبازی یەکیەتی سیاسیدا. خەلکی (چین) لەرابوردوو دا زۆرگوێیان نەدەدایە دەسەلاتی سیاسی ، چونکە مەدەنیە تە مەزنەکەیان

بەتەواوەتی بەروشنبیرییەوە بەندبوو ، ئەم مەدەنیەتە خەلکی فێری هونەری ژیان دەکرد ، بەجۆرێك کە هیچ میللەتیکی ترنەی دیبو ئیتر (چین)یەکان مانەوە لەسەر ئەم روشنبیریە کۆنەیان ، تاکو ، بون و گیانی سیاسی ، و ئابوریان روخا هەرچەندە ژابون ، پیشەسازی رۆژئاوایی ، و شێوازی رۆژئاواییانەی بەدیمەنی، روالەت وەرگرت ، بەلام بەدڵ بەدەرەبەگێتی مایەوە ، هەرچەندە (چین) دەرەبەگایەتی تێدا نەبوو بەلکو شیوازی عەقل ، و گیانی زانیاری تێادا حوکوم فەرمابوون ، ئنجا زۆر بەگەرمی چاوەروانی پێشکەوتنی زانستەکان ، وپیشەسازی دەکرد ، بەلام وەکو ژابون بەهەلمەت بۆپێشەوە نەچوو ، ئەو کوسپانەی کە دەهاتنە رێی (چین) ، نەدەهاتنەرێی ژابون ، لەهەر هەنگاوێکدا کە جیای بکردایەوە لەروشنبیریە کۆنەکەی ، وبی خستایە گومان ، و دوو د لی یەوە لی ێ. (چین) رەفتارێکی فەیلەسوفانەی هەبوو فەیلەسوفەکانیش بەرەوشت هێمن ولەسەرخۆن. ئەوساش ، وئێستایش (چین) هەر خەریکە ، چونکە کێشەکانی هەر سیاسی رووت نەبوون بەلکو دیسانەوە ئابوری ، و کۆمەلایەتی ، و رۆشنبیری ، و پەروەردەیی بوون.

سەرەرای ئەم کێشانە (چین) پان و بەرینە وەك (هیندستان) هەردوو ولاتەکە لە قارەیەك دەچن ، گوران وپێشکەوتنی قارەیەك خێرا روونادات ، ئەم قارەیە لە قەبارەی دا لەفیل دەچێت ، ئەگەر بکەوێت ماوەیەکی دووری دەویت تاکو دووبارە هەلدەستێتەوە سەرپێ ، بەپێچەوانەی پیشلە ، وسەگەوە.

کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپابوو ، خێرا ژابون چووە پال هاوپەیمانەکان (طفاء) دژی ئەلمانیا ئیعلانی جەنگی کرد ، (کیاوشو)ی داگیرکرد ، وە بو ناوەوە بەرەو ناوچەی (شانتونج) چووکە (کیاوشو)ی تیدایە ، ئەمە مانای وایە ژابون (چین) داگیردەکات ، ئەمە واناگەیەنێت کەبەکز ئەلمانیا دەجیت و دژی ئەوە ، جونکە ئەلمانیا بەیوەندیکی بەم ناوچەیەو بە (چین)ەوە نەبوو زۆر بەشێنەیی داوای لەژابون کرد لەم ناوچەیە بچێتە دەرەوە ، ژابون ئەمەی بەناشیرین زانی لەلایەن (چین)ەوە ئنجا هات بیست و یەك داخوازی بەتوسین پێشکەش یە (چین) کرد.

ئەم بیست و یەك داخوازیە بوو بەشتێكی بەناو بانگ. كەرچی لەم نامەیەدا بەدورو درێژی باسی ئەم داخوازیانە ناكەم بەڵكو دەڵێم ژابون لەمە ، مەبەسی ئەوەبوە كە هەموو جۆرە جیاوازیەكان وەمافەكان ، بەتایبەتی لە (منشوریا) و (منغولیا)و و ناوچەی (شانتونج) دابدرێت بەژابون خۆی ، خۆ ئەگەر ئەم داخوزیانە قوبول بكرایە (چین ددبود موستەعمەرەیەكی رووتی ژابون. حوكوتە بێ هێزەكەی سەرووی (چین) بەرهەڵستی ئەم داخوزیانەی كرد ، بەڵام توانای ئەم ، لەچاو توانای لەشكری ژابوندا هیچ نەبوو ، وەمیللەت پشتگیری ئەم حوكومەتەی سەرووی نەدەكرد سەرەرای ئەمەش ئیشێكی باشی كرد كە ئەم داخوازیانەی ژابونی بڵاوكردەوە ، ئیتر ئەم داخوازیانەی ژابون بو بەهۆی بەرپا بوونی مشتومرێكی زڵ لە (چین)دا ، كەوا سەرنجی دەولەتە گەورەكانی راكێشا ، كەرچی بە جەنگە كەشەوە زۆر خەریك بوون ، ئەمەریكا لەهەمویان زیاتر بەربەرەكانی داخوازیەكانی دەكرد ، بو بەهۆی ئەوەی ژابون واز لەهەندێكیان بێنێت ، وە دەستكاری هەندێكی تریان بكات ، بەڵام ئەو داخوریانەی مابونەوە توانی لەساڵی ١٩١٥ ز ، بێ سەپێنی بەسەر (چین)دا ، بەم كردە وەیەخەڵكی (چین) رقیان لەژابون هەستا.

لەپاش سێ ساڵ واتە لەساڵی ١٩١٧ ز (چین) چوەپاڵ هاوپەیمانەكان ، ئیعلانی جەنگی كرد دژی ئەلمانیا ، ئەمە ئیشێكی بێمانابو چونكە (چین) هێزێكی وای نییە هەرەشەی پێلە ئەلمانیا بكات ، بەڵام تاكە مەبەسی (چین) ئەوەبوو خۆی بخاتە ناو رێزی دەولەتە هاو پەیمانەكانەوە ، وە خاكی (چین) بپارێزیت لەداگیركردن لەلایەن ژابوونەوە.

شۆرشی بو لشەفیكەكان ساڵی ١٩١٧ بەرپابوو لەهەمولایەكی سەرووی ئاسیا دا ئاژاوە بەرپابوو ، سیبریا بو وبەكۆری كوشتار لەنێوان هێزەكانی سوفیەت ، و دوژمنەكانی دا (كولتشاك)ی سەركردەی روسیەكان سەركردەیی بزوتنەوەیەكی بەرهەلستی و دژبە سوفیتی دەكرد لەسیبریاوە. سەركەوتنی سوفیەت ژابونەكانی ترساند ، لەشكرێكی گەورەیان نار دبۆسیبریا ، هەروها بەریتانیاو ئەمەریكاش بەهەمان كردەوە هەستان ، دەسەلاتی رووس لەسیبریا ، و ئاسیای ناوەراستدا نەما بەریتانیا ویستی كۆتایی بەدەسەلاتو ناوبانگی روسیا بێنیت لەم ناوچانەدا لە (قشغر) لە جەقی ئاسیای

ناوەراستدا ئیستکە یەکی رادیوی دانا ، پروباغەندەی دژ بەبولشەفیکی بڵاودەکردەوە.

هەروها (منغولیا)ش بوبوە مەیدانێك بۆ زۆرانبازی‌یەکی سەخت ، کەوا لەنێوان میللەتانی بەرەی سوفیەت ، و دوژمنەکانیدا رووی دەدا ، (منغولیا) لەساڵی ١٩١٥ ز ، بە یارمەتی رژێمی قەیسەری روسیا سەرکەوت و توانی بەشێکی زۆری دەسەلاتی لەحوکومەتی (چین) بسینی ، کەرچی (چین)یش بەناو بەسەردارمایەوە ، ئنجا رووسیا دەربارەی کاروباری دەرەوەی (منغولیا) هەندی دەسەلاتی پەیداکرد ، ئەمە بارێکی سەیربو ، لەدوای شورشی سوفیەت جەنگێکی ناوخو ، لە (منغولیا)دا بەرپابوو ، سەربە سوفیەتەکانی ناوخو ، پاش سێ سال وەیازیاتر لەزۆرانبازی ئنجا سەرکەوت.

باسی کۆنگرەی رێکەوتن نامەکەم بۆنەکردیت ، کەلە دوای جەنگە جیهانیەکەوە رووی‌دا لە نامەیەکی تردا باسیت بۆ دەکەم ، لێرەدا ئەمە دەردەخەم ، کە دەولەتە گەورەکان لەم کۆنگرەیەدا ـ مەبەسم فەرەنسە ، و ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکایە ـ ویستیان ناوچەی (شلنتوبخ) ی (چین) بدەن بەژابون ، ئا بەم جۆرە پاداشی (چین)ی هاوپەیمانیان لەکاتی جەنگە کەدا دایەوە بەداگیرکردنی بەشێك لەخاکەکەی ، ئەمەش سەبارەت بەو پەیمان نامە تەهێنی‌یەیەبۆ ، کەلە نێوان فەرەنسە ، و بەریتانیا ، و ژابوندا هەبوو ، ئیتر هۆی ئەم کردارە هەرچیەك بووبێت. بەراستی میللەتی (چین) لەم فیلەسووکە زۆر پەست بوو ، هەرەشەی لەحوکومەتی (پکین) کرد بەشۆرش کە ئەگەر سەر بۆ ئەم کارە شۆرکات ، حوکومەتە کە بریاری دا بەتوندی کەوا گەل و پەلی ژابونی نەگرن ، خۆپیشاندان دژی ژابون پەیدابوو ، حوکومەتی (چین) واتە (حوکومەتەکەی سەرووی (چین) کەلە (پکین)دابوو کە ئەمەحوکومەتە سەرەکی‌یەکەبو) رێکەوتن نامەکەی ئیمزا نەکرد.

دوای ئەمە بەدوو ساڵ لە (واشنطن) لەئەمەریکا کۆنگرەیەك بەسترا ، یەکێك لەوئیشانەی خرایە بەردەمی ئەم کۆنگرەیە مەسەلەکەی (شانتوبخ)بو ئەو دەولەتانەی کەبەشداربوون لەم کۆنگرەیەدا ئەو دەولەتانە بوون کە بەرژەوەندیان هەبوو ، لە رۆژهەلاتی دووردا ، کەوا هاتبوون تابزانن رادەی

توانای لەشکرە دەریاییەکانیان چۆنە ، بەبەستنی ئەم کۆنگرەیە کەلە (واشنطن)داگیرا سالی ١٩٢٢ زچەند ئەنجامێکی بەنیسبەت (چین) و ژاپۆن هەبوو ، ژابون قایل بوو ، کەواز لە (شانتوبخ) بهێنێ ، بەمە بەشتێکی زۆری مەترسی خەلکی (چین) نەما وە دەولەتەکانیش دووریکەوتن نامەیان بەست:

یەکەمین یان پێی دەوترا "پەیمان نامەی چواردەو لەتەکان ، کەبریتیبوون لەبەریتانیا و ئەمەریکا ، و ژاپۆن ، و فەرەنسە ، هەریەکەیان بەڵێنیان دا کە ریزی مومتەلەکاتی دەولەتەکانی تربگرێت لەدەریای باسفیکیدا ، واتە دەست درێژی نەکەنە سەرمولکی یەکتر ، وە پەیمان نامەی دووەم (پەیمانی نو دەولەتەکان) بو بۆشداربون لەکۆنگرەکەدا کە بریتیبوو لەولاتەیەککگرتوە کانی ئەمەریکا ، و بەلجیکا ، و بەریتانیا و فەرنسە ، و ئیتالیا ، و ژاپون ، و هولاندە ، و پورتەغال ، و چین. بەندی یەکەمی پەیمان نامەکە بریتیبوو لەرێزگرتنی دەسەلاتی (چین)و سەربەخویی ، و چالاکی ئیداری ، و ناوچەیی لەمەر (چین).

مەبەسی دوو پەیمان نامەکە ، وەکو ئاشکرا دیاربوو کە پاراستنی (چین) بوو لە دەست درێژی کردن بۆسەری لەگەل دانانی سنورێك بۆتەماع و چاو چنۆکی دەولەتە کۆنەکان بۆ دەستکەوتنی جیاوازیو ، ئیمتیازات ، وە داگیرکردنی بەشەکانی ئەم ولاتە لەبەر ئەوەی دەولە تە گەورەکان دوای جەنگەکە ئەوەندە کێشەیان هەبو ، وازیان لە (چین) هێنا بۆیە ئەم پەیمانە یان دایە خۆیان ، ژاپۆن یەکێك بوو لەم دەولەتانە هەرچەندە ئەمە لەگەڵ ئەو سیاسەتەدا نە دەگونجا کەچەند سالێك بۆ پەیرەوی دەکرد ، بەلام تێپەربوونی چەند سالێکی کەم راستی نیەتەکانی ژاپونی دەرخست کەچۆن هێشتا هەر گورراوە ، ئیتر ژاپون گوێی نەدایە پەیمان ، و بەلێنەکان ، پەلاماری (چین)ی داکە داگیری بکات بەمە نموونەیەکی فرو فێل ، و درو ، و دەلەسەی نێودەولەتانی پێشکەش کرد ، با بگەرێینەوە بۆ کۆنگرەکەی (واشنطن) تا تێ بگەین لەو گۆرانکاریە کەلە دوای ئەم ماوەیە پەیدابوو.

لەکاتی پێك هاتنی کۆنگرەی (واشنطن)دا هێزەکانی بێگانە لەسیبریا هاتنەدەرەوە کەچی ژاپۆنیەکان دووای هەمویان هاتنە دەرەوە ، وە سوفیەتەکانی ناوخو چونە پال روسیای سوفیەت.

جمهوریەتی روسیای سۆڤیتی لەسەرەتای سەردەمی بەیدابوونیدا ، بەحوکومەتی (چین)ی راگەیاند کەوا ، وازدێنی لەو بەرژەوەندی ، وئیمتیازە تایبەتیانەی کەلە زەمانی حوکومەتی قەیسەردا هەیبوە لەگەل دەولەتە ئیستعماریەکانی تر لە (چین)دا چونکە ئیستعمار ، و شیوعیتی رێك ناکەون ، هەروها سوڤیەت مەبەسیان بوو ، بەرامبەر دەولەتە رۆژهەلاتیەکان ، کە گەلێك چەوسانەوە ، و جەزرەبەیان ماوەیەکی زوربە دەست دەولەتە ئیستیعماریەکانەوە دیوە ، سیاسەتیکی لی بوردنانە ، و کراوەیان هەبێت ، ئەم سیاسەتە سەرەرای ئەوەی دەستکەوتێکی مەعنەویە ، گەلێك عەقل و ژیری تیدایە ، چونکە لەرۆژهەلاتدا گەلێك دۆستی بۆ روسیا پەیداکرد ، ئیتر واز هێنانەکەی روس لە ئیمتیازات ، و بەرژەوەندیەکانی نەبەسترابووبە مەرجێکەوە کە (چین) دەبێت پێوەی بەند بێت ، بەلکو لە خۆرایی بوو. لەگەل ئەمەشدا (چین) دەسلەمیەوە لەوەی کەئەگەر لەگەل سۆڤیەتدا رەفتار بکات دەولەتە ئەوروپاییەکانی لێ زویر بێبێت ، لەدواییدا نوێنەرەکانی روس و (چین) لە سالی ١٩٢٤ زدا کۆبونەوە وەلە سەر چەند مەرجێك پێك هاتن ، کە حوکومەتی فەرەنسە ، و ئەمەریکا ، و ژاپون بەمەیان زانی ، زۆر پەست بوون ، بێزاری دەر برینێکیان دایە حوکومەتی (پکین) کەوا تەواو ترسی لێنیشت ، وە ئینکاری لەوە کرد کە گوایا نوێنەرەکانی مافی مۆرکردنی رێکەوتن نامەیان هەبێت ، چەند ناشیرینە حوکومەتێك هەلوێستەکەی حوکومەتی (پکین)ی هەبێت ! بۆ وەلام دانەوەی ئەم توندبوونە ، ئنجا نوێنەرەکەی روس کوتومت رێکەوتن نامەکەی بلاوکردەوە ، کە دەنگێکی گەورەی دایە وە ، چونکە یەکەمین جارە کە (چین) لەبە ندایەتیەکانی نێودە ولەتەگەورە کاندا کرداریێکی پاك ، ومەردانەی لەگەلدا بکرێت ، وەئەمەیەکەم پەیمان نامەبوو کەوا (چین) چۆن یەك ، ویەکسانی هەلوێستی وکردەوەی لەگەلدا کرابێت. خەلکی (چین) بەیمان نامەکەیان لاباش بوو ، داوایان لەحوکومەتی (پکین) کرد کە ئیمزای بکات ، بەلام دەولەتە ئیستیعماریەکان بۆیە رقیان لەپەیمان نامەکە دەبوەوە چونکە ختنیە بارێکی سەغلەتو ناهەموارەوە ، چونکە دەیان ویست ، واز لەبەرژەوەندی ، و ئیمتیازاتە کۆنەکانیان نەهێنن ، کەچی روسیا زۆر بەپاکی ، و مەردانە وازی لەبەرژەوەندی و ئیمتیازاتەکانی خۆی هێنا.

هەروها حوکومەتی سۆڤیەت پەیوەندی بەحوکومەتی دکتور (صن یات سن)ەوە کرد ، کەلە (کانتون)دابو ، وە گەیشتە رێکەوتنامەیەك لەگەلیدا ئەوسا لەنێوان سەروو وە خوارووداجەنگێکی ناو خو هەبوو هەروها لەنێوان پیاوە سوپاییەکانیشدا کە ناکوك‌بوون‌لەسەرووداا ، ئەم پیاوە سوپاییە (گەورانە) وەکو بەخویانیان دەوت ، نە دەجەنگان لەپێناوی بیروباوەر ، و بەرنامەیەکی دیاردی دا ، بەڵکو لەپێناوی دەستکەوتنی دەسەلاتدا بۆ خۆیان ، هەمو رۆژێك لەگەل یەکتردا گفتوگۆیان دەکرد ، دووبارە دەگەرانەوە لەگەڵ بەرەی دژدا دۆستایەتیان دەکرد ، بەم جۆرە میللەت لەم جەوا شەبوو ، ئەم پیاوە سوپاییانە ، لەشکری تایبەتیان هەبوو ، باجی تایبەتیان دەسەند ، جەنگی تایبەتیان دەکرد ، وە گرانباریەکەش هەمووی دەکەوتە سەرشانی میللەت ، دەلێن زۆربەی ئەم پیاوە سوپاییانە ، بووکە شووشەبوون بەدەست دەولەتە بێگانەکانەوە ، بەتایبەتی ژاپۆن ، هەروها یارمەتی ، و پارەیان لەبانقە گەورەکانی بێگانەوە بۆ دەهات کە لە (شنغهای) دابوون.

ئەو ساڵە (چین) دا هیچ لایەك نەبو کە چاوەروانی چاکەی لی بکرێت جگە لە خواروو کە لەژێر دەسەلاتی دکتور (صن یات سن) دابوو کەوا بیروباوەرو سیاسەتێکی تایبەتی هەبوو ، چونکە تەنها جەنگاوەرێك نەبوو کەمە بەسی راو ، روت بیت هەر وەکو حوکومەتە سوپاییەکانی سەروو. لە ساڵی ١٩٢٤ ز یەکەم کۆنگرەی حیزبی (کومنتانخ) (حیزبی میللەت) بەسترا ، دوکتور (صن یات سن) بەرنامەکەیی پێشکەش کرد کە بریتی‌بوو لەو بیروباوەرانەی کەدەبێت میللەتی (چین) لەسەری بروات تا ئێستاش ئەم بیروباوەرانەو بەرنامانە هەرهی حیزبی (کومنتانخ) ە ، دەگونجێت ئیستاش هەرنەورێبازەبێت کەوا ئەو حوکومەتەی کەبە خۆی دەلێت (حوکومەتی نیشتمانی) لەسەری دەروات.

دوکتور (صن یات سن) لە ساڵی ١٩٢٥ زمرد ، کە هەموو ژیانی خۆیی لەتێکۆشاندا بۆ خزمەت کردنی (چین) بردەسەر ، بەهۆی ئەم تێکۆشانەیەوە میللەتی (چین) دەی پەرست {[illegible]}

ئەمانە قەیسەر رزگاری ببێت ، وەببێتە تەمتەمەیەك (محور) بوجم وجوولی بەرهەلست کردنی شۆرشەکە ، لەبەر ئەمە یاسایان دایە دەست خۆیان

وخیزانەکەیان سەرجەم کوشت وادیاربوو لێژنەی مەرکەزی سۆڤیت ئاگاداری ئەم کارەنەبوون ، وە (لینین) بەرهەڵستی کوشتنی خێزانی قەیسەری دەکرد لەبەر هەندێ هۆی مرۆڤایەتی ، بەڵام دوای ئەوەی کارلەکار ترازا ، حوکومەتە مەرکەزی یەکە ناچار بوو ، بیانو ، و باساوایك بۆ ئەم کارە بدۆزیتەوە ، لەوانەیە ئەمە بووبێت بەهۆی زیادبوونی رق هەڵسانی دەولەتە هاوپەیمانەکان (الحلفاء)و بەلب گرتنیان.

لەمانگی ئابدا بارزیاتر خراپتربوو ، دووشت رووی دا ، تورەیی بێزاریو ترس لەگەل خۆیدا هێنایە کەمیان تەقەلای کوشتنی (لینین)بوو ئەوی تریان دابەزینی هێزەکانی هاوپەیمانەکان بوو لەمینای (ئارك ئەنجیل) لەسەرووی روسیادا ، ئیتر (موسکو) وروژا وە خەلکی وایان دەزانی کەسوفێت کوتایی‌نزیك بۆتەوە، هێزی‌دوژمنەکان لەئەلمان و جیکی‌یەکان وەناحەزانی شۆرشەکە ، ئابلوقەی موسکویان دا ، وەك چۆن بازنك دەوری مەچەك دەدات ، ئەوناوچانەی کەلە دەوروبەری (موسکو) بوون یەکێکێان بەدەست سوفیتەوە نەبوون ، ئنجا دابەزینی لەشکری هاوپەیمانەکان ، بووبە توقلانەیەکی خراپ بۆ فەوتانی سوفیت ، چونکە سوفیت سوپایەکی وایان نەبوو گەپشتی پی‌ببەسترێت ، چونکە هێشتا پێنج مانگ بەسەر رێکەوتن نامەی (بریست لیتوفسك)دا تێنەپەریبو، تەنانەت پیاوەکۆنەکانی سوپا بەرەلا کرابوون و چوبوونەوە بۆزەوی ، و زارەکانیان موسکو لەدەسیسەو موئامەرەدا جمەی دەهات‌هەروەها بورجوازیەکان بەئاشکرا کە یفیان هەبوو بۆنزیك بوونەوەی لەناوچوونی سوفیت.

ئەمە ئەو تەنگ و چەلەمەیەبوو ، کە جمهوریەتی سوفیتی تێکەوت کەوا تەنها نومانگ بە سەردروست بوونیدا تێپەربووبوو ترس ، و نائومێدی سەرودلی سوفیتی گرتبوو. بەڵام بریاریان دا بەتێکۆشانەوە بمرن ، مادام هیج چاریان نی‌یە مردن نەبێت ، ئنجا خۆیان دا بەدوژمنەکانیاندا وەکو درندەیەکی تێك شکێن کەبەداوە وەدەبێت ، هەروەکو چۆن ، پێش سەدو بیست و پێنج ساڵ شورشە ساواکەی فەرەنسە چی‌کرد ، ئیتر ری‌ی بەزەیی و لێبوردن نەما ، حوکمی عورفی لەسەرانسەری ولاتەکەتدا بلاوکرایەوە ، لیژنەی مەرکەزی سوفیت ئیعلانی توقاندنی سووری کرد واتە: (مردن بۆهەموو دەغەل و غایەنە کان ، و هارین ، و تێك شکاندنی داگیرکەرە

بێگانەکان) سوفیتیەکان بریاریان دا کەتا دواهەناسە بجەنگن لەگەل دوژمنی دەرەوە ، و ناوەوەدا ، دوای ئەوەی کەهەموو دەولەتەکانی جیـهـان ، و هەموو کونەپەرستەکانی روس دژیان وەستانەوە ، ئیتر ئەوماوەیەی کە پێی دەوترین (شیوعیتی سوپایی) دەستی پیکرد ، وە ولاتەکە وەکو بارەگایەکی سوپای ئابلوقەدراوی لێهات ، وە سوفیت ئەوپەری تەقەلایان دا کەسوپای سوور بەهێزکەن ئەم کارەیان بەتروتسکی سپارد.

ئەمە لەدەورو ، بەری مانگی سەبتەمبەر ، و ئوکتوبەری سالی ١٩١٨ زدابوو ، لە کاتێکدا ، دام ، و دەزگای جەنگی ئەلمانیا ، لـەرۆژئـاوادا دەروخاو بیرلەوە دەکرایەوە کە جەنگ بوەستێنرێت ، وە سەرەك (ویلسـون) چواردە بەندەکەیی دانا ، کە ئامانجەکانی هاو پەیمانەکانی دەست نیشان دەکرد ، و دەر دەبری ، وە لەم بەندانەی کەشایانی باس کردنە لێرەدا ، ئەو بەندەیان بوو کە دەلێت دەبێت لەهەمو خاکی روسیا بکشێنەوە ، وە رێبدرێت بە روسیا کەخۆی پێ بگەیەنێت بەیارمەتی دەولەتـەکـانـیـتـر ، بەلام وادیاربوو مەبەسی راستەقینەی ئەم بیروباوەر وبەندە بـریـتـی بـوو لەدەست خستنە ناوکاروباری روسیاوە لەلایەن هاوپەیـمـانـەکـانـەوە ، وە دامەزینی هێزەکانیان بوو ، بو بەکژدا چوونی ، ئـنـجـا حـوکـومـەتـی بولشەفیك یادداشتێکی دا بەسەرەك (ویلسون) نارەزایی دەربری لەو چواردە بەندەی ئەو ، لەیاد داشتەکەدا دەلیت:ـ "ئێوە داوای سەربە خـۆیـی بـۆ پولندە ، و صرب (البانیا) ، بەلجیکا دەکەن ، وە داوای ئازادی بۆخەلکی نەمسا ، و هەنگاریا دەکەن ، کەچی سەیر ئەوەیە ناوی ئازادی بۆئیرلاندە و میسر ، و هیندستان ، و تەنانەت ناوی دورگەکانی (فـلـیـبـیـن)یـش ناهێنن".

رێکەوتن نامە ئیمزاکرا ، و جەنگ وەستێنرا لەنوفەمبەری سالی ١٩١٨ ز ، لەنیوان هاوپەیمانەکان ، و ئەلمانیادا ، رێکەوتن ـەواوبـو ، بـەلام لەروسیادا ، شەری ناوخو هەربەردەوام بوو ، لە سـالـی ١٩١٩ وە تـاکـو ١٩٢٠ ز سوفیت بەتەنها خۆیان بەرامبەر لەشکرە زۆرەکانی دوژمن وەسـتـان تەنانەت سوپای سور لە (١٧) لاوە گەمارویان دا شتێکی سەیر نییە ، کـە ئینگلتەرە ، و فەرەنسە ، و ئەمەریکا ، و ژاپۆن ، و ئیتالیا ، و و(صرب) ـ البانیا ، و چیکو سلوفاکیا ، رومانیاو ، دەولەتەکانی دەریای

بەلطیق ، و پۆلندە ، و گەلێك لەسەرکردە رووسەکانی دژبە شۆرشەکە ئەمانە هەموو دوژمنی سوفیت بوون ، مەیدانی شەرو کۆشتار ، لەرۆژهەلاتی سیبریاوە تاکو دەریای بەلطیق ، و دورگەی (قرم) درێژبوبوەوە ، گەلێك جار کۆتایی سوفیەت لەئاسووە ، دەردەکەوت ، هەرەشە لە (موسکو) کرا ، بتروغراد ئەوەندەی نەمابو بکەوێتە دەست دوژمن ، بەلام بەرامبەربەم تەنگانەیە سوفیت خۆی گرت ، و سەرکەوتن ، و بەخودا راپەرموون زیاتر بەهێزی کرد.

لەو ئەفسەرانەی کە دژبە شۆرش بوون ئەمیرال (کولتشاك) کەوا خۆی کرد بەحوکوم فەرمای هەموو روسیا ، وە هاوپەیمانەکان بروایان پێکرد ، و یارمەتیەکی زۆریان دا ، لەنووسیتی یەکێك لەدوستەکانی کە (جنرال جریفز) ە کەسەرکردەی لەشکری ئەمەریکاو پالپشتی (کولتشاك) بوو ، دەتوانین شارەزای کردەوەی ئەم کابرایە ببین لەسیبریادا ئەم جەنرالە ئەمەریکاییە دەلێت:ـ (کرداری ترسناك دەکرا ، وە ئەم کردارا نەوەکو (جیهان دەی زانیت) لە بولشەفیکەکانەوە نەبو ، بەپێچەوانەی راستیەوەنییە ئەگەر بلێم ، لەرۆژهەلاتی سیبریادا ، بەرامبەر بەهەر زەلامێك بولشەفیك کوشتبێتی دوژمنانی بولشەفیك بەلای کەمەوە سەدیان کوشتوە..)

رەنگە کچم بەلاتەوە گرنگ بێت ، ئەو بنچینانە بزانیت کەپیاوە سیاسیە ، بەناوبانگەکان ، لەکاروباری میللەتە مەزنەکاندا پەیرەو ، رەفتاری پێدەکەن ، وەیا چۆن جەنگ و رێکەوتن نامە ئیعلان دەکەن. بۆنموونە (لویدجورج) کەسەرەك وەزیرانی بەریتانیابوو ، ئەوسا رەنگە بەتواناترین پیاو بووبێت لەئەوروپادا ، رۆژێك لەئەنجومەنی گشتیدا باسی رووسیا دەکات ، و دەست نیشانی (کولتشاك)و سەرکردە رووسەکانیتر دەکات ، دەیسانەوە دەست نیشانی یەکێك دەکات ، کەپێی دەوت (جنرال خرکوق) ئەوی شایانی پێکەنینە لێرەدا ئەوەیە کە: (خرکوق) نەجەنرالە تەنانەت زەلامیش نییە ، بەلکو پایتەختی ئوکرانیایە! بەلام ئەم نەشارەزاییە ئاشکرایە لەسەرەتای جوغرافیای نێو دەولەتاندا ری لەم پیاوە سیاسیانە ناگریت تائەوروپا ، و میلەتەکانی شەق و پەق نەکەن ، وەیا نەخشەکەی نەگۆڕن.

هاوپەیمانەکان بەتوندی ئابلوقەی رووسیایان دا بەدرێژایی ساڵــی ١٩١٩ ز ، نەی توانی لەدەرەوەی خاکەکەیدا نەبگرێت نەبفرۆشیت ، سەرەرای ئەم زەحمەتیەزلەو ، دوژمنە بەهێزە زۆرەکان ، رووسیای سوفیتی خۆی راگرت ، و سەرکەوت ، ئەمە راپەرینێکی گەورەبوو لەمێژوو داوینەی نەبو. سوفیەت ئەم سەرکەوتنەیان چۆن دەست کەوت ؟، گومانی تێدانــیــە کــە ئــەگــەر هاوپەیمانەکان ، یەك گفت ، و یەکیەتیان ببوایە بوبلیشا ندنەوەی سوفیت هەر لە یەکەم رۆژەوە دەیان توانی ، ئنجا کە ئەلمانیایــان فــەوتــانــد ، هێزێکی زۆریان بەدەستەوە بوو ، تاکو بەکاری بینن لەجەنگی رووسیــادا ، بەلام بەکار هێنانی ئەم هێزە لە هەرلایەکدا بێت ؟ بەتــایــبــەکــاری دژی سوفیت ئەوەندە ئاسان نەبوو ، چونکە ئەم لە شکــرانــە مــانــدو ، و لاواز بوون ، قایل نەدەبوون بنیررین بوولاتە بێگانەکان بــۆشــەرو کــوشــتــار ، دیسانەوە هەستێکی زۆری سۆزو بەزەیی لەنێوان چینەکانی کــرێــکــارانــدا هەبوو بەرامبەر بەرووسیا ، ئەم هۆیانە حوکومەتی هاوپــەیــمــانــەکــانــی (حلفاء) ترساند کە ئەکەر بەئاشکرا ئیعلانی جەنك بکەن دزی رووسیا رقی میللەتەکانیانی پێ‌هەڵسیت ، ئەوروپا وادەردەکەوت کەپێی ناوە تەشورشەوە دیسانەوە لەمەدا هۆیەکی تریش هەبوو ، ئەویش بریتی‌بوو لەبەربەرەکانــی لەنێوان هاوپەیمانەکاندا کەوا ناکۆکیان تێ‌کەوت کە کاتی بەستنی رێکەوتن نامە لەگەڵ ئەلمانیادا نزیك بوەوە ، ئیتر لەبەر ئــەم هــۆیــانــە ، ئــەم دەولەتانە لەلایەن خۆیانەوە ، بەدڵ هەولیان نــەدەدا کــە بــولــشــەفــیــك بفەوتینن. بەلکو هەوڵیان دا لابەبەلایکەنە ئەم ئامانجە: کەبــریــتــی بــو لەبەکارهێنانی خەلکی‌تر ، بۆشەر کردن لەجــیــاتــی خــۆیــان ، وەئــەمــان یارمەتیان بدەن بەپارە ، و چەك ، و راوێژی فەنی ، بــەخــەیــالــیــانــدا نەدەهات کە سوفیت لەمەیدانی جەنگدا ، پێیان دادەکوتن ، و دەچەسپێنن.

گومانی تێدانی‌یە ، کە ئەم زروفە یارمەتی سوفیتی‌دا ، و هەلێکی بۆ رەخساندن کە خۆیان بەهێزکەن دەبێ بەویژدان بین وابەزانین کەسەرکەوتنــی سوفیت سەبارەت بەهۆکانی دەرەوەبوە چونکە ئەوسەرکەوتنەی دەستیان کەوت لەبنەرەتدا سەرکەوتنی بەخودا راپەرموون ، وبــروا ، و لــەخــوبــوردن ، و بریاربووە کەمیللەتی روس هەیبو ، بەلام ئەوی سەرسام هێنەرە لەم کارەدا چونکە میللەتی روس لەهەموولایەکدا بەناو بانگن بەتەمەلی ، دواکەوتویــی

وەك كەچی ، كەرچی ئەم وتانە راستیشی تێدایە ، هەروەك ئازادی خوبەك بێت لەخووەكانی ئادەمیزاد كە ئەگەر ماوەیەك لێی زەوت بكرێت زۆرجار لەبیری دەچێتەوە ، فەلاح و ەیا كرێكاری روسی نەخوێندەواریو هەدولی ئەوەیان نەبووە كەئەم خووڕەوشتە بەكاربهێنن ، بەلام پێشەواكانی رووسیا لەم مەینەتیەدا ، ئەوەندە گەورەبون ، توانیان ئەم توبەلە ئادەمیزادە هەزارانە بكەن بەمیللەتێكی بەهێزی رێك و پێكی وا ، كە بروای بەپەیامەكەی خۆی ببێ ، وەبە خوێدا راپەرمویت . بەلام (كولتشاك)و ئەوانەی وەكو ئەمن ، نەبەزین هەرلەبەر هێزی پولیشەفیك ، و توانایان ، بەلكو فەلاحە رووسەكان لێیان داخ لەدڵ بون ، چونكە ئەوان دەیان ویست رژێمە گۆركراوەكە ، بگەرێتەوە ، وە فەلاح لەوزەوی ، و ئیمتیازاتەی كەدەستی كەوتبوو لەم دواییەدا روت كرێنەوە بۆیە فەلاحەكان بەخوین سوفیت یان دەپاراست.

(لینین) دلێرانە وەستا ، لەدەسەلاتی بێئەندازەیدا هیچ كەسێك شانی لەشانی نەدەدا. میللەتی روس دەیان پەرست ، جێی باوەرو هیوایان بو ، ئەوپیاو ماقول و كارزانەبو ، كەهیچ كێشەیەكی لاگران نەبوو ، و هیچ مەینەتیەك پشتی ساردنەدەكردەوە ، دوای ئەم لەجێو شوین دا (تروتسكی) وتار ویژی ، رەوان كو ، و نوسەركەدەستی كرد بەپێكەوەنانی لەشكرێكی بەهێز ، لەكاتی جەنگی ناوخو ، و ئابلوقەدانەكە دا ، گەرچی پێشتر شارەزاییەكی سوپاییانەی نەبوو بەلام ئازاو دلێربوو ، گەلێك جار ژیانی خۆیی لەكوری جەنگدا خستبوە مەترسیەوە ، بەزەیی نەدەهاتەوە بەهیچ كەسیكدا ، ترس ، و سەرپێچی پەیرەوی لەبیینیایە. لەجەنگی ناوخو ، و لەە كاتێكی ناسكدا ، ئەم فەرمانەی بلاوكردەوە :ـ

"ئاگادارتان دەكەم ئەگەر بەلێك (وحدە) لەبەلەكانی سوپا ، بێئەوە فەرمانی كشانەوەی بدریتی ، بگەریتە دواوە ، یەكەم كەس بەكولە بكوژریت ، قومیسەر ، ئنجا قوماندانەكەیە ، وە لەجیاتی ئەم دوانە دووسەربازی ئازا دەچنە جێیان ، ئیتر ترسنوك ، و خوێری ، و خایەنەكان لەكوشتن رزگارنابن ، بەلێنێكی تەواوتان بەمە دەدەمی بەرامبەر سوپای سورتێكرا". وەبەلێنەكەی خۆی بەجێ گەیاند.

هەروها (تروتسکی) فەرمانێکی سوپـایـی تـری لـەسـاڵـی ١٩١٩ زدا بڵاوکردەوە ، بەڵام جۆرێکی سەیربوو ، ئەم فەرمانە بۆمان دەردەخـات کـە بولشەفیك هەمیـشـە ، تـاج رادەیـەك مـیـلـلـەتـان ، و حـوکـومـەتـە سەرمایەدارەکانیان لیك جیاکردوتەوە ، وەگوێیان نەداوەتە ، هاشەو هوشەی نەتەوایەتی فەرمانەکە دەڵێت:ـ "گەرچی ئیمە لەگەڵ (یودنتش)دا کە کلکـی ئینگلتەرەین دەجەنگین ، داواتان لێ دەکەم کەلە بیرتان نـەچـیـت ، لـە ئینگلتەرەدا دووبەرە هەیە ، ئینگلتەرەی هەلمەتەکا سەبـو قـازانـج و دڵ رەقی ، و بەرتیل ، تێنوی خوێن رێژی ، وە ئینگلتـەرەی کـرێـکـاران و هێزەکیانبەکان ، و بیروباوەرە بەرزەکان و پشتکیری کردنی نیو جیهـان ، هەیە ، ئەوی بەکرماندا دیت ئینکلتەرەی سووکایەتـیـو ، بـێشـەرفـیـیـە کەبریتی‌یە لەدەلال ، و جامبازەکانی بـازاری بـارە (الـبـورصـە) بـەلام ئینگلتەرەی میللەت ئەمان لەگەلماندان.

کەتەماشای ئەم فەرمانەی ئەنجومەنی بەرگریە دەکەین ، و یـنـەبـەك لەخوبەخت کردن ، و خۆبە کوشتدانی سوپای سوری تیدادەبینین فەرمانەکـە دەڵیت:ـ (تادوا تنۆکی خوێنمان بەرگری لەبتروغراد دەکەین ؛ بـسـتـێـك بەجێ ناهێلین جادە بەجادە شەر دەکەین).

(مکسیم غورکی) نوسەری مەزنی روس دەڵێت (لینین) جارێکیان لەبابەت تروتسکی‌یەوە وتوویەتی!

(پیاویکی ترم پیشان بدەن وەکو تروتسکی بتوانێت لەساڵێکدا سوپایـەك رێك خات ، بێهاوتا بێت ، و جێی رێزی شارەزاو پسبورە سوپایـیـەکـان بێت ئەم پیاوەمان هەبێت ، هەمو شتێکمان هەیە ، وە هەمیشە کـاروبـاری مەزن دەهێنێنە دی).

سوپای سور خێرا پێگەیشت لە دیسمـبـەری سـالـی ١٩١٧ زدا ، دوای ئەوەی بولشەفیك دەسەلاتیان وەرگرت بەماوەیەکی کەم لەشکری سوور (٤٣٥) هەزار سەرباز بوو ، بێگومان ئەم ژمارەیە زۆربەیان دوای پەیمان نـامـەی (برست لیتوفسك) بەرەلا کران ، ناچار سەر لەنوێ دەبوایە سـوپـا دورسـت بکرایەوە ، کەشەش مانـگ تـێـپـەری بـەسـەر سـالـی ١٩١٩ زداژمـارەی سوپاکەیشتە ملیون ، و نیویك سەرباز ، دوای ساڵێك گەیشتە ژمارەیـەکـی زۆر ، واتە پێنج ملیون و سێ صەد هەزار کەس.

لەکۆتایی ساڵی ۱۹۱۹ زدا سوفیت گەلێک باڵاتربوون بەسەر دوژمنەکانیاندا لە جەنگی ناوخودا ، بەڵام جەنگەکە ساڵێکی تری خایاند ، چەند ماوەیەکی ناخوشیو تەنگانەی تێ دەکەوت لەساڵی ۱۹۲۰ زدا ، ناکۆکی کەوتە نێوان روسیا ، و دەولەتی پولندەوە (کەوا دوای شکاندنی ئەلمانیا دوروست بوو) لەنێوان ئەم دوانەدا شەرهەلگیرسا ، ئنجا لەکوتایی ساڵی ۱۹۲۰ زدا شەرەکە کۆتایی هات دووبارە ئاشتی گەرایەوە بۆناو ولات.

بەڵام تەنگو چەلەمەکانی ناوخو لەزیاد بو ندابوو ، جەنگ ، و ئابلوقەدات ، و نەخوشی ، وبرسێتی کاری کردبووە ولاتەکە ، پری کردبوو لەکوێرەوەری ، بەرهەم وداهات زۆر کەمیان کردبوو ، چونکە نەفەلاح دەیتوانی زەویەکەی بکێلێت ، وەنە کریکاریش دەیتوانی لەکارکەیدا ئیش بکات ، چونکە لەشکرەکانی بێگانە ، هەمیشە بەسەر خاکی رووسیادا دەهات ، و دەچوو ، هەرچەندە جەنگی شیوعیتی ولاتەکەی رزگارکرد ، لەگەل ئەمەشدا هەموو کەسێك لەمیللەت دەبوایە بەدە سنگە (تقشف) گوزەرانی بکردایە ، وەگرانباریەکەیی بنوشیایە ، فەلاحەکان لەبەرهەم هێنانێکی زۆردا کەمتەرخەمیان دەکرد ، چونکە دەیان زانی کەشیوعیتی سوپایی هەموو زیادەی بەرهەمەکانیان دەبات ، وەزع و بار ترسناك ، و ناخۆش بوبو ، تەنانەت لە (کرونستاد) نزیك بتروغراد ، هەرا لەنێوان سەربازەکاندا بەرپابوو ، هەر وها گەلێك مان گرتن لەبتروغراد وەیا (لینینغراد) خۆیدا رووی‌دا.

(لینین) بەبلیمەتیەکەی خۆیەوە ، کەوا بنەرەتی بیروباوەر دەگونجێنیت لەگەل بارو ، وەزعیکدا کەهەیە ، هەستا بەچارەسەرکردنی بارو ، وەزعەکە: شیوعیتی سوپایی کوتایی پێهێنا ، وە سیاسەتێکی ئابووری نوێی دانا ، کەوا ئازادی دابە فەلاخ لەدەستکاری کردنی بەرهەم و فرۆشتنی بەروبوومەکانی ، رێی دابە بازرگانی تایبەتی ، گەرچی ئەم سیاسەتە لادانێك بوو لەبیروباوەری شیوعیتی ، بەڵام (لینین) بەهانەی بۆئەمە ئەوەبوو کە ئەم سیاسەتە کارێکی وەختیە ، گومانی تێدانیە ئەم سیاسەتە خیروبیری بۆمیللەت هەبوو ، بەڵام خیرانەگبەنیەکی نوێی تربەیدابوو ، ئەویش کەمی بەرو بوومی کشتوکال بوو ، لەخوارووی رۆژهەلاتی ئاسیادا لەئەنجامی سەرباز گرتنێکی زۆر لەولاتەکەدا ئەم

نەبوونی ، و برسێتیە تەنگ ترین شت بوو کەمێژوو دیبووی چونکە ملیونەهای کوشت ، ئەم کارەساتە ئەیتوانی کە پشتی حوکومەتەکە بشکێنی چونکە راستە ، و خۆ لەدوای جەنگی جیهانی ، و جەنگی ناو خووە هات ، ئابلوقەدان بەردەوام بوو ، ئابوری بەرەو خراپی دەچوو ، سوفیت نەیدەتوانی کوششی خۆی تەرخان کات بۆبزوتنەوەی ئاشتیانە ، بەلام سوفیت لەم کارەساتەش خۆیان رزگارکرد هەروەکو چۆن لەکارەساتەکانی تردا کردیان. نوێنەری دەولەتە ئەوروپاییەکان کۆنگرەیەکیان بەست ، تاکو باسی ئەوباربووە بکەن کەپێش کەشی ئەوانەی کەن کەدووچاری برسیتیەکە بوون ، کۆنگرەکە بریاری دا هیچ یارمەتیەك پێشکەش نەکەن ، تاکو قەرزەکانی قەیسەر ، کەسوفیت نای سەلمینیو نایداتەوە ، بەلێنیان بداتی کەبی داتەوە. سووخورەکان دلیان دانەجلەکی ، و گەلێك رەق نر بوو لەوەی کەخیرو چاکەیان لێ بوەشیتەوە بۆ دایکە رووسیەکان ، کەبرسیتی کالەی بەمندالەکانیان دەکرد ، و دەی کوشتن. بەلام ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، بۆ یارمەتی ، و باربووکردن هیچ مەرجێکی دانەنا ، بەخۆرایی پێشکەشی کرد.

هەرچەندە ئینگلتەرە ، و هەندێ لەدەولەتەکانی تر یارمەتی مروڤانەیان لەروسیا قەدەغە کرد بەلام بازرگانیان لەگەلدا کردن. لەسالی ۱۹۲۱ زدا پەیمان نامەیەکی بازرگانی لەنێوان ئینگلتەرە و روسیادا بەسترا ، وە دەولەتەکانی تریش لەمەدا ، بەرێو شوێنی بەریتانیادا رویشتن.

سوفیت لەگەل دەولەتەکانی رۆژهەلاتدا وەکو تورکیا ، و چین ، و ئێران ، و ئەفغانستان دا سیاسەتێکی بەدەست و دل ، و مەردانە هەبوو ، چونکە وازی ، لەوبەرژەوەندی ، و ئیمتیازاتانە هێنا کە لەزەمانی قەیسەردا رووسیا دەستی کەوتبوو ، وە هەولی دا کەپەیوەندایەتیەکی باشی لەگەلیاندا هەبیت ، هەرچەندە ئەمە دەگونجێت لەگەل بیروباوەری شیوعیتیدا ، کە داوای ئازادی دەکات بۆهەمو میللەتێك کەدووچاری زۆرداریو چەوساندنەوە بوە ، لەهەمان کاندا شێوازیکیش بوو ، بۆپێتەو کردنی جێو شوینی روسیا ، ئەم سەخاوەت ، و مەردایەتیە ڕووناکیەکی خستە سەر نیازی دەولەتە ئیستیعماریەکانی وەکو ئینگلتەرە ، و ئەوانی ترو ، ئاشکرای کردن ، وە بووبە هۆی ئەوەی دەولەتە رۆژهەلانیەکان

بەراوردێك بكەن لە نێوان هەردوو سەربازگەكەدا ، وە لەئەنجامدا بیروباوەڕێكی خراپ دەربارەی دەولەتە ئیستیعماریەكان پەیداكەن.

لەڕووداوەكانی ساڵی ١٩١٩ ز كەدەمەوێت سەرنجتی بەلادا رابكێشم بەستنی كۆنگرەی سێەمی جیهانییە كەلە مۆسكۆ لەژێرچاودێری حیزبی شیوعیدا بەسترا ، باسی كۆنگرەی یەكەمی جیهانیشم كرد ، كەكارل ماركس بەستبووی ، كۆنگرەی دووەم كە بەووتاری ئاگرین كرایەوە ، سەر نەكەوت لەئەنجامی ئیعلانی جەنگی یەكەمی جیهانیدا لەساڵی ١٩١٤ زدا ، بولشەفیكەكان لەوباوەڕەدا بوون كەكرێكارە پێشینەكان ، وحیزبە سۆشیالیستەكان كە كۆنگرەی دووەمیان بەست بەراستی خیانەت و دەغەلیان لە چینی كرێكاران كردووە ، بۆیە هەستان بەدروست كردنی ، ئەم كۆنگرەی سێەمی جیهانی یە ، و لەبەر مەبەسێكی شۆڕشگێڕیانە ، ئەم كۆنگرەیەیان بەست ، ئەویش بۆ بەگژدا چوونی سەرمایەداری و ئیستیعمار و هەلپەرستەكانە ، لەو سۆشیالیستیانەی كەوا ڕێبازێكی مام ناوەندیان كرد بەبەرنامە بۆیان. ئەم كۆنگرە جیهانییە پێی دەوترێ (كومنترن) واتە شیوعیتی جیهانی ، بەراستی دەورێكی مەزنی بینی لەپروپاغەندە كردندا لەناو گەلێك ولاتاندا ، هەروەكو بەناوەكەیدا دیارە رێكخراوێكی جیهانی بوو ، ئەوئەندامانەی كەتیایدابوون ، حیزبە شیوعیەكان لەچەند ولاتێكدا هەلیان دەبژاردن ، لەبەر ئەوەی شیوعیتی لەڕووسیادا زیاترگەشەی كرد ، ئەندامە روسەكان دەسەلاتداربوون بەسەر كۆنگرەكەدا ، دیارە (كومنترن) جیاوازە لەحوكومەتی سۆڤیت ، گەرچی هەندی كەس لەهەردو ولایاندا ، پێكەوە جێو شوینی گەورەیان هەیە ، لەبەر ئەوەی (كومنترن) ئامانجی بڵاوكردنەوەی پروپاغەندەی شۆڕشگێڕانەیە ، ولاتە سەرمابەدارەكان زۆر رقیان لێیان بوو ، وە تینیان بۆئەوانە دەهێنا كەدوای (كومنترن) كەوتبوون ، لەناو ولاتەكانی خۆیاندا.

بەلام كۆنگرە دووەمە جیهانیەكە (كۆنگرەی كرێكاران ، و سۆشیالیستی جیهانی) لە ئەوروپای رۆژئاوادا دوای جەنگەكە دووبارە بوژێنرایەوە ، هەرچەندە هەردوو كۆنگرەكە نزیكەی یەك مەبەسیان هەبوو ، گەرچی لەڕووی بیروباوەڕیشەوە بێت ، بەلام ئامانجی بالا (المثل العليا)و شێوازی تایبەتی هەرلایەكیان جیاواز بوو لەوی تر ، كۆك نەبوون ، لەنێوان

هەردوو کۆنگرەکەدا دوژمنایەتیەك هەبوو ، زیاتربوو لەدوژمنایەتی کردنیان لەگەڵ دوژمنەکەی هەردوکیان کەسەرمایەداری‌یە ، کۆنگرە دووەمەکە بە ڕێکخراوێکی بەرێزدا ، گەلێك لەئەندامانی بوون بەوە زیرلە حوکومەتەکانی ئەوروپادا ، بەڵام کۆنگرەی سێەم هەربە شۆرشگێری مایەوە ڕێزێکی گەورەی لێنەنراوە.

ماوەی جەنگە ناوخۆکە ، رووسیا بەر بەرەکانیەکی لەمەیدانی زۆرەملی و دڵ رەقیدالەنێوان تۆقاندنی (ارهاب) سور ، و تۆقاندنی سپیدادی ، لەوانەیەئەم تۆقاندنەی دواییان لەوی تریان توندتربو بێت ، هەروەکو لەنوسینەکانی جەنراله ئەمەریکاییەکەوە ، وە نوسینەکانی‌ترەوە دەردەکەوێت ، دەربارەی کرداری زۆرەملی کەوا (کولتشاك) لەسیبریادا کردویەتی. گومانی تێدانی‌یە کەتۆقاندنە سورەکە سەخت بوو ، ژمارەیەك بێتاوان ، بەتاوانی خەڵکی ترەوە تێداچوون ، چونکە بولشەفیکەکان بە دەسیسە ، و جاسوس ، و دەغەل دەورە درابوون ، هەروها لەهەموو لایەکەوە گەمارو دەدران ، و هێرشیان دەبرایە سەر ، لەبەرئەوە بەشوکابوت ، بۆیە سزای هەموو کەسێکیان بەتوندی‌دەدا کە گومانیان لێ بکردایە ، ناوی بولیسە سیاسیەکەیان (شیکا) بەترس بوو ، ئەمە لەبەشی (مباحث جنائی) لێکۆڵینەوەی تاوان دەچێت لەهیندستاندا گەرچی دەسەلاتێکی فراوانتریشی هەیە.

ئەم نامەیە درێژەی کێشا بەڵام پێش ئەوەی کۆتایی پێبێنم ، با زیادە باسێکی (لینین)ت بۆبکەم ، سەرەرای ئەوە کە لەئابی ١٩١٨ ز.دا هەوڵی کوشتنی درا ، پشووی بەخۆی ئەوا ، دەستی‌کرد بەکاروفرمانێکی سەختی ماندووکەر ، تاکو لەمایسی ١٩٢٢ ز.دا کەوت ، و بورایەوە ، کەمێك ووچانی گرت ، دیسانەوە خۆی ماندوو کردەوە ئنجا لەساڵی ١٩٢٣ ز.دا تووشی نەخوشی‌یەکی ترهات ، لە (مۆسکۆ)دا لەمانگی ینایری ساڵی ١٩٢٤ ز. دا مرد.

لاشەی (لینین) تەحنیت کرا ، چەند رۆژێك لە(مۆسکۆ)دا ، دانرا ، ئەمە لە وەرزی زستاندابوو ، نوێنەرانی میللەت ، و فەلاح ، و کرێکارەکان لەهەموو ناوچەکانی روسیاوە ، ژن ، و پیاو ، و منداڵ هاتن بۆزیارەتی لاشەکەی ، وە ستایشی بیرەوەری هاوریێ خۆشەویستەکەیانیان

دەکرد ، کەوا لەناخی تاریکی دەری هێنان ، وەری زیانێکی چاکی بۆ رووناك کردنەوە ، وە نزرکەیەکیان (ضریح) بۆدروست کرد لەمەیدانی سووردا لە(مۆسکۆ) ، لاشەکەیان خستە ناو سندوقێکی شوشەوە ، خەڵکی بەرێز ، و مل کەچی یەوە هەموو ئێوارانێك بەرێزێك کەکۆتایی نایەت بەلایداتێ دەپەرن ، تائێستا کەش لاشەکە هەرلەوێدایە ، گەرچی ماوەیەکی زۆر تێنەپەریوە بەسەر مردنی (لینین)دا بەلام بوە بەچیرۆك وسەرگورشتەیەك لەسەرگو رشتەکان نەك هەر لەرووسیادا ، بەڵکو تێکرا لەهەموو جیهان دا. هەرچەندە ساڵ ، وزەمان بەسەریدا تێپەرێت ، گەورەیی و مەزنی ئەم پیاوە زیاددەکات وەدە چیتەرێزی نەمرانەوە ، (بتروغراد) ناونرا (لینیغراد) لەهەمو ماڵێك ، قوژبنێك ناوی (لینین)ە وەیا دیوارەکەی بەوێنەی ئەم رازاوەتەوە ، بەلام (لینین) بەوێنە ، و پەیکەری یادییەوە نازی ، بەڵکو بەو کردەوانەی کەپێی هەڵساوە ، لەدڵی ملیونەها لەکرێکاراندایە کەوا ئەمرو بەجێی پەیام سرووش (وحی)و هیواو ، باوەری دادەنێن بۆرۆژانێکی؟ بە ختیاترو چاکتر.

کچم وانەزانیت کەوا (لینین) هەرئامێرێکی رووت بوە ، هەست و سۆزی ئادەمیزادانەی نەبووە ، و هەربیری لەئیش کردن کردوتەوە ، بەڵی هەرچەندە زیانی خۆیی بۆئیشەکەی ، و پەیامەکەی لەژیاندا تەرخان کردبوو بەلام تەنها هەربۆخۆی نەژیاوە ، بووبووە پارچەیەك بیروباوەر ، ودیمەنی ئادەمیزادێتی پیوە دیاربوو ، بەتایبەتی توانای لەپێکەنین دا لە ناخی دڵیەوە ، وەکیلی حوکومەتی بەریتانیا لە (مۆسکو)دا لەیەکەمین رۆژە سەغلەتیەکانی سۆڤیت دا ، دەڵێت: (لینین) هەرچەندێك کێشەی تووش بهاتایە گیانی گاڵتە ، و کەپی هەر دەما ، "لەرەوشت و خوودا لەوانەی کەدیبوومن لەهەموویان باشتربوو" سادە ، و راست ، ورەوان بوو لەگفتار ، و کرداردا ، حەزیبە ووتەی پروپووچ نەدەکرد ، زۆرحەزی لەمۆسیقابوو ، تارادەیەك دەترسا نەوەك ناسکیو کەمتەرخەمی تێدا پەیدابکات.

یەکێك لەهاورێکانی کە (لۆناشارسکی) کەقومیساری (وەزیر) فێرکردن (التعلیم)بوو باسی (لینین)ی کرد ، لەکاتێکدا کەبەراوردی نێوان جەزرەبەی سەرمایەدارەکانی ، کردلە لایەن (لینین) ەوە ، لەگەڵ دەرکردنی سووخورەکان لە (هیکل) لەلایەن (مسیح) ەوە ووتی: "خۆ ئەگەر مەسیح

ئەمرۆ زیندوو بوایە ، دەبووبە بولشەفیك" ئەم بەراوردە سەیـرد لـەلاسەی کەسانێکەوە کەباوەڕیان بەئاین نیيە.

جارێکیان (لینین) دەربارەی ئافرەت ووتی: "میللەتێـك ئـازاد نـیيـە کەنیوەیان لەچێشتخانەدا بەندەبن" ، (مکسیم غورکی) هاوڕێی دێـرینـی (لینین) وتی جارێکیان (لینین) دەستی هێنا ، بەسەری چەند منداڵێـکـدا ووتی: "ئەمانە ژیانیان لەهی ئێمە باشتر دەبێت ، تووشی ئەوەمەینـەتـیـە نابن کە ئێمەمانان تیایدا ژیاوین ، وە ژیانیشیان پڕنابێت لەوناخۆشیيەی کەژیانی ئێمەمانان پربوە لێی" هیوام وایە ئەمەوابێت.

ئەم نامەیە بەوشەکانی ئەوسرودە کۆتایی دێنم کەتازە دانراوە تامیللەت تێکرا یی‌بڵێت ، ئەوانەی بیستویانە دەڵێن ئاوازەکەی پڕەلە بـزوتـنـەوە ، وبڕیار ، وە گیانی شۆڕشی جەماوەر دەردەخات ، ئێمە شتێك لەم ئـاواز ، و موسیقایە لەووشە ئینگلیزیەکانیدا کە لێرەدا باسی دەکەم بۆت ، هەستی پێدەکەیت. سرودەکەش ناوی (ئوکتوبەرە) واتە شۆڕشی بولشەفیکیتی کەلـە نوفەمبەری ساڵی ١٩١٧ ز.دا رووی‌دا ، چونکە رۆژە ئەژمـێـری رووسـی ، ئەوکاتە سیانزە رۆژ کەمتربوو ، لەرۆژە ئەژمێری رۆژئاوا سەبارەت بـەمـە شۆڕشی مارت بەپێی ئەم رۆژەژمێرەیە دەکەوێتە مانگی شـوبـاتـەوە ، وە شۆڕشی بولشەفیکەکانیش لەنوفەمبەردا دەکەوێتە مانگی (ئوکتوبەر) ە وە ، بۆیە شۆڕشەکە ناونرا شۆڕشی (ئوکتوبەر) گەرچی روسیا ئێـسـتـاکـە رۆژە ئەژمێری رۆژ ئاوایی وەرگرتووە ، بەڵام ناوەکونەکانیش ماونەوە هەربەکـار دەهێنرێن.

ئەمەش سرودەکەیە:

رۆیشتین داوای ئیش وداوای نان دەکەین

دەروونمان پڕە لەماندوویەتیو کوێرەوەری

دووکەڵ کیشەکان وەکو دەستەلاوازەکان بەرەو ئاسمان بەرزبوونەوە

کەوانا توانێت هیچ شتێك بکرێت

دەنگی غەضباریو ئازارمان خامۆشی گەردوونی دڕی

کەوا لە دەنگی توبەکان بەرزتربوو

ئەی (لینین) هیوای دەستە بەتینەکان

تێگەیشتین کەهیچ ئومێدێکمان نیيە ، تێکۆشان نەبێت ، تـێـکـۆشـان..

ئەی (لینین) کرێکارانت سەرخست ،
ئیترکەس ئەم سەرکەوتنەمان لێناسینێ ، یان نەزانین بگێرێتەوە
هیچ کەس نیبە.. هیچ کەس نییە هەرگیز.
دەبا هەمووکە سێك لەئێمە تەمەنی توانا ، و لاوی لەتێکۆشانەوە بێت.
ناوی سەرکەوتنەکەمان (ئۆکتۆبەرە)
ئۆکتۆبەر.. ئۆکتۆبەر
ئۆکتۆبەر پەیام هێنی رۆژ درەو شاوەکەیە.
ئۆکتۆبەر ئارەزووی نەوە شۆڕشگیرەکانە
ئۆکتۆبەر ئیشە ، خۆشیە ، سروودە..
ئۆکتۆبەر بەختێکی باشە بۆعەقل بۆ کارگە
ئەمەیە ئاڵای نەوەی تازە پێکەیشتو ، وئاڵای (لینین).

# مستەفا کەمال تۆزی ڕابوردوو دەتەکێنێت

## ٨/مایس/١٩٣٣

لەگەڵ تورکیادا هاتین ، لەرۆژانی شکست ، و ڕەشیدا ، ئنجا لەرۆژانی سەرکەوتنیدا ، وە ئەو هەنگاوانەمان دی کەهاوپەیمانەکان بەتایبەتی بەریتانیا نابووی ، بۆسەرشۆرکردنی تورکیا ، وبێ هێزکردنی کەوا چۆن هەڵگەڕایەوە ، و بووبە هۆی بەهێزکردنی نیشتمان پەروەرەکان وەهێزی پۆلایین دەرخستن بۆ بەرەنگارو بەرگریکردن ، ئنجا تەقەلای هاوپەیمانەکان (الطفاء) بۆبارچە پارچەکردنی تورکیا لەگەڵ ناردنی هێزەکانی یۆنان بۆئەزمیر ، و ئەوکودەتایە (انقلاب) کەبەریتانیا سازیکرد لەکاتێکدا کەپیشەوا نیشتمان پەروەرەکان گیران ، و نیررانە دەرەوەی ولات لەگەڵ یارمەتدانی خەلیفە لەلایەن بەریتانیاوە - کەوابوو کەشووشەیەك بووبە دەستیانەوە - بۆ بەرهەڵستی کردنی نیشتمان پەروەرەکان.. ئەمانە هەمووی گڕی لەغیرت ، و پەروشی تورکەکان بەردا ، و ڕقیانی هەڵساند ، ئەمە هەمیشە ڕوودەدات ، کە هەوڵ بدریت دەست بخرێتە بینی میللەتێکی نەبەردو ئازاوە.

مستەفاکەمال و هاورێکانی ، دوا بەدوای سەرکەوتنەکەی کە دەستیان کەوت چیان کرد ؟ مستەفاکەمال لەو باوەڕەدانەبوو ، کە هەربە کونە پەرپووتەکەوە ببەسترێتەوە ، بەڵکو ویستی شوێنەواری تورکیا بگورێت ، سەرەڕای ئەوەی کەلەناو خەڵکدا ناوبانگی زۆرباش بوو ، بەلام دەبوایە بەرەو ئەم ئامانجە زۆربە هوشیاری بەرەوپێشەوەبچوایە ، چونکە هەڵکەندنی ڕەگ و ریشەی کۆن کەلە زەوییەکی ڕەق لەنەربت (تقالید) ، و ئایندا ڕەگی داکوتا بێت کارێکی گران و ترسناکە. ، بروا بەلابردنی پادشایەتی ، و خەلافەت هەبوو کەچی زۆری هاوڕێکانی بەرهەڵستی ئەمەیان دەکرد ، لەوانەبوو میللەت خۆیشی حەزی بەمە نەکردایە ، هەرچەندە

ـیللەت خۆی نەی دەویست سولتان (وحیدالدین) بمێنێــتــەوە کــە بــووکــە شوشەیەك بەدەست بێگانەکانەوە ، وەبەخایەنیکیان دادەنا کە هەوڵــی داوە وڵاتەکە بفرۆشێت ، بەڵام خەڵکێکی زۆریش دەیــان ویــســت خــەلافــەت ، و سەلتەنەتێکی دەستوری هەبێت وە هێزی راستەقینە بەدەست ئەنــجــومــەنــی نیشتمانیەوە بۆهەڵێك لەپێناوی هێنانەدی ئامانجەکانیدا.

بەریتانیا هەروەکو پیشەیەتی ئەم هەڵەی رەخسانــد ، لــەکــاتــێــکــدا کاروباری بەستنی کۆنگرەی رێکەوتن لەفەرسای سازدەکرا ، حــوکــومــەتــی بەریتانیا ، بانگیشتنی سولتانی کرد کەلە کۆنگرەکــەی (ئــەســتــانــە)دا ئامادەبێت بۆباس کردنی مەرجەکانی رێکەوتن لەگەل تورکیــادا ، وە داوای لێکرد کە ئەم کارە بەحوکومەتی (ئەنقەرە) بڵێت ، وە ئەم کردەوەیە چاو پۆشیەکی ئەنقەستانە بوو ، لەلایەن بەریتانیاوە لەحوکومەتی (ئەنقەرە) . بۆیەبەرزکردنەوەی نرخی سولتان ، کەوا بوو کەشوشەیــەك بــوو ــ ئــەمــە بوو بەهۆی ، وروژاندنی میللەتی تورك ، و رق هەڵساندنی ، وە کارێکــی وای کرد کە بکەوێتە گومانەوە ، لەبوونی دەسیسەیەکی نوێ لــەبــەیــنــی سولتانی خایەن و دەغەل و حوکومەتی بەریتانیادا . (مستەفاکــەمــال) ئــەم هەستەی بەکارهێنا بۆ قایل کردنی ئەنجومەنی نیشتــمــانــی بــەلابــردنــی سەلتەنەت لەنوفەمبەری ساڵی ١٩٢٢ ز.دا ، بەڵام خەلافــەت هــەروەك خــۆی مایەوە ، وە بڵاوکراوە کەلە بەرەی (عوسمان)دا ــ وەیا (عوسمانلی)یەکاندا ماوەتەوە ، دوای ئەمە بە کەمێك سولتان (وحیدالــدیــن) هــاتــەخــوارەوەو تاوانبارکرا بەخیانەت ، ئەمیش هەڵاتنی بەچاك زانی ، نەوەك بەئاشــکــرا موحاکەمە بکرێت ، ئنجا بەدزییەوە چووە ئوتوموبیلێکــی ئــیــســعــافــی ئینگلیزەوە ، ئەمیش گەیاندیە ، کەشتیەکی جەنگی بەریتانیا ، ئــیــتــر ئەنجومەنەکە (عبدالمجیدافندي) خزمی کرد بەخەلــیــفــە ، واتــە بــەنــاو سەرەکێکی ئاینی بێت ، بێئەوەی هیچ دەسەلاتێکی سیاسی هەبێت.

لەساڵی ئایندەدا واتە لەساڵی ١٩٢٣ ز.دا بەرەسمی جاری جمهوریــەتــی درا ، و (ئەنقەرە) بووبە پایتەختی ، و (مستەفاکەمــال) هــەلــبــژێــررا بەسەرەك جمهوری ، هەمو دەسەلاتی گرتە دەستی خۆی ، بەراستی بــووبــە دیکتاتوریك بەئارەزووی خۆی حوکومرانی بەسەر ئەنجومەنی نیشــتــمــانــی دادەکرد ، ئنجا هێرشی دەبردە سەرگەلێك لەنەریتە (تقالید) ە کانیــتــر ،

زۆر گوێی نەدەدایە ئاین ، زۆرکەس لەم کردەوانەی (مستەفاکەمال) و دیکتاتوریەتەکەی پەست و تورە بوون ، وە دەوری خەلیفەبان گرت کەزۆر هێمن بو بەلام ویست خواز لاواز (ضعيف الأرادة) بوو. (مستەفاکەمال) ئەمەی بەدڵ نەبوو ، رەفتاری لەگەل خەلیفەدا خراپ بوو چاوەروانی هەلێکی‌تری دەکرد کە هەلکەوێت.

خێرا هەلەکە هەلکەوت ، ئەم جارەیان بەجۆرێکی سەیر: ئاغاخان ، و ئەمیرعلی (کەقازیەکی) پێشووی هیندستان بوو) لە (لندن)ەوە نامەیەکیان نارد بۆ (مستەفاکەمال) ئەم دوانەوتیان گوایا بەناوی ملیونە هاموسلمانەوە قسەدەکەن ، و بێزاری دەر دەبرن بەرامبەر بەو رەفتارەی کە لەگەل خەلیفەدا دەکرێت ، وە بۆئەمە داوادەکەن ، کردەوەیەکی باش لەگەل خەلیفەدا بکرێت ، وەریزی پێویستی لێ بنرێت. ئنجا روونوسێکیان لەنامەکە نارد بۆ یەکێك لەرۆژنامەکانی (ئەستانە) کە لەپێش ئەوەدا بگاتەدەست (مستەفاکەمال) لەئەنقەرە ، ئەم نامەیە لە(ئەستانە) بلاوکرایەوە. هەرچەندە نامەکە زۆر توندو تیژنەبوو بەلام (مستەفا کەمال) بەکاری هێناو ، کردی‌بە هەرا لەسەری ، و نەی‌ویست ئەم هەلەی لەدەست بچێت. ئنجا بلاوی کردەوە کەهەستانی ئاغاخان و هاورێکەی بەم کردەوەیە بریتی‌یە لەدەسیسەیەکی نوێی بەریتانیا ، دیسانەوە دەوترا گوایا ئاغاخانیش نۆکەرێکی تایبەتی بەریتانیایە ، چونکە بەتایبەتی لەئینگلتەرەدا دەژیا ، وەبەپێش برکێ ، رمبازی ئەسپەوە (سباق الخيول) خەریك بوو ، سەرەرای ئەمەش نەموسلمان بوو ، و نەسونی بوو ، بەلکو پێشەوای بەرەیەکی تایبەتی بوو ، دیسانەوە بلاوی‌کردەوە کە بەریتانیا لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئاغاخانی بەکارهێناوە لەجیاتی سولتان وەیا خەلیفە لەرۆژهەلاتدا ، وەبەریتانیا یەکان جێ ، و شوێنی ئەویان ، بەپروپاغەندە ، و شتی تر پتەو کردبوو ، و هەولیان دابوو بی‌کەن بەپیشەوای هەموو موسلمانەکان لەهیندستان و ببیتە بووکە شووشەیەك بەدەستیانەوە یاری پێبکەن. . خۆ ئەگەر ئاغاخان لەم بەرگرییەی دا لەخەلیفە دلسوز بوایە بۆچی لەرۆژانی جەنگەکەدا پشتی خەلیفەی نەدەگرت لەکاتێکدا ئیعلانی غەزای کرد دژی بەریتانیا؟! بۆچی ئەو کاتە لەگەل بەریتانیادا دۆستایەتی بەست دژی خەلیفە؟!

بەم جۆرە (مستەفا کەمال) گێژەلوکەیەکی دەربارەی ئەم نامەیە بەرپاکرد کەوا هەردوو دۆستەکەی بەریتانیا لە(لندن)ەوە ناردبوویان ، وە هەردووکیان نەیان دەزانی ئەنجام چی دەبێت ، ئاغاخانیش کەوتبوە بارو وەزعێکەوە خۆزگەی پێ نەدەبرا ، ئنجا ئەو رۆژنامەگەرانەی کەنامەکەیان بڵاوکردبوەوە بەخیانەت تاوانبار کران وە سزایەکی توند دران ، لەکاتێکدا کەهەستی میللەت لەوبەری بەرز بوونەوە دابوو (مستەفا کەمال) پرۆژەی یاسای لابردنی خەلافەتی پێشکەش ئەنجومەنی نیشتمانی کرد ، ئەنجومەنەکە لەهەمان رۆژ لەمانگی مارتی ١٩٢٤ ز.دا برباری لەسەردا ، بەم جۆرە لەسەر شانوی نوێ رژێمێکی کون لاچوو ، دوای ئەوەی کە لەمێژوودا دەورێکی مەزنی بینی ، بەلای کەمەوە تورکیا سەردارێتی موسلمانانی نەما ، وە بوو بەدەولەتێکی وەختی ، وزەمەنی.

ماوەیەك پێش ئەمە هیندستان دووچاری سەغلەتێەك بوو ، سەبارەت بەوەی کەبەریتانیا هەرەشەی لەخەلافەت دەکرد ، لێژنەکانی سەربەخەلافەت لەپانتایی ولاتەکەدا بڵاوبووبوونەوە ، گەلێك لەهیندوسەکان چوبوونە ناو بزوتنەوە کەوە چونکە وایان دەزانی کەبەریتانیا هەوڵ دەدا ، زیان بەئیسلام بگەیەنێت ، کەچی ئێستا تورکەکان خۆیان کۆتاییان بە خەلافەت هێنا ، و ئیسلام بەبێ خەلافەت مایەوە. (مستەفا کەمال) باوەرێکی بتەوی هەبوو ، کەدەبێت تورکیا دوور کەویتەوە لەکێشە ئاینیەکان ، کەوا تورکیابە ولاتە عەرەبیەکان ، و هیندستانەوە دەبەستێت ، بۆیە نەخۆی ، و نە ولاتەکەی پێشەوایەتی ئیسلامیان نەکرد ، هەروها داخوازی هەندی لەهیندیەکانی ، و میسریەکانی پەسند نەکرد کە ببێ بەخەلیفەی موسلمانەکان ، ئنجا رووی کردە رۆژئاوا ، ویستی تورکیا بکات بەدەولەتێکی رۆژئاوایی بەزووترین کات ، بەتەواوەتی بەرهەڵستی یەکیتی ئیسلامی دەکرد ، ئنجا بیرورای تورانێتی زاڵ بوو ، چونکە تورکەکان تۆرانین ، بەم جۆرە (مستەفا کەمال) بیرورای نەتەوایەتی جیاکردەوە لەبیروباوەری لاستیکی ئیسلامیتی نێو جیهان.

پێشتر پێم وتیت کە تورکیا بوو بەدەولەتێکی نیشتمانی یەك گرتوو ، ئەو بێگانانەی کە تیایدا بوون کەم بوونەوە. بەڵام رۆژهەڵاتی تورکیادا

بەدرێژایی سنووری تورکیا ، و ئێران میللەتێك هەبوون ، تورك نەبوون ئەمانە کوردە کۆنەکانن کە زمانیان فارسی[1] بوو ولاتەکەیان لەنێوان تورکیا ، و ئێران ، و عێراق ، و ناوچەی (موصل)دا ، دابەش کرابوو ژمارەی کوردەکان هاتبوە کەمی ، لە سێ ملیونەوە بو بو بە ملیون و نیوێك ، نیوەی ئەمانە لەناو سنوری تورکیادا بوون ، دوای شۆرشەکەی تورکیا سالی ١٩٠٨ز. ئەمانە بزوتنەوەی نەتەوایەتیان بەرپاکرد ، وە نوێنەری کوردەکان ، لەکۆنگرەی رێکەوتن لە (فەرسای) داوایان کرد کەسەربەستی نەتەوایەتیان بدرێتی.

لەسالی ١٩٢٥ ز.دا شۆرشێکی گەورە لەبەشی کوردی تورکیادا بەرپا بوو ئەمەش لەو کاتەدابوو ، کە ناکۆکی لەنێوان تورکیا ، و بەریتانیادا لەسەر ناوچەی (موصل) پەیدابوو ، کەبەشێك بوو ، لەناوچەی کوردی تورکیا کەوا شۆرشەکەی تیدا بەرپا بوو بوو تورکەکان گەیشتبونە ئەو ئەنجامە ، کەپەنجەی بەریتانیا ئەوانەی خستۆتە جم و جوول کە توخ ئاین پەروەرن ، وە دژی ئیصلاحاتی (مستەفا کەمال) ن ، هەرچەندە زۆر زەحمەتە بریار بدرێت کەبەریتانیاییەکان هاندەرنن ، بەلام بەریتانیا شۆرشی کوردەکانی لەتورکیادا پێخوش بوو ، دیسانەوە دیار بوو کە خواستی ئاین پەروەری دەستی لەم بزوتنەوەیەدا هەبوو ، بەلام نەتەوایەتی کوردی ، یاکوردایەتی بشکێکی تێ یدابوو لەوانەیە بشکە زۆرەکەش بووبێت.

ئیتر (مستەفا) رایگەیاندو بلاویکردەوە کەبەریتانیایە کوردەکان دەجوولێنێت ئنجا ئەنجومەنە نیشتمانیەکەش یاسایەکیدانا: کەهەر کەسێك ئاین بکات بەشێوازێك بو وروژاندنی هەستی میللەت چ بەوتن ، وەیا بەنوسین خیانەتێکی گەورەیە ، و ئەوپەری سزا دەدرێت ، (مستەفا کەمال) خوێندن و فێرکردنی سەرەتای بیروباوەرە ئاینیەکانی ، کە پێچەوانەی دلسوزین بو رژێمی جمهوری لەمزگەوتەکاندا قەدەغەی کرد ، ئیتر دوای ئەمە (کەمال پاشا) بەبێ بەزەیی کوردەکانی فەوتاند. دادگایانی (سەربەستی) تایبەکاری دانا بۆ موحاکە مەکردنیان بەهەزاران هەروها هەردوو پێشەوا کوردەکە (شیخ سەعید ، و دکتۆر فوئاد) و هێتری خنکاند و ، کوشتن کەوا ئاواتی سەربەستی کوردستانیان هەر لەدلدابوو.

بەم جۆرە دەبینین ئەو تورکانەی ، کە جەنگان لەپێناوی ئازادیاندا ، کوردەکانیان بلیشاندەوە چونکە داوای ئازادی خۆیانیان دەکرد ، چەند سەیرە ، کەنەتەوایەتی لەبەرگری ، وپاراستنی نیشتمانەوە روو دەکاتە هێرش بردنە سەر هیتر بو زەوت کردنی ئازادیان ، لەساڵی ١٩٢٩ز. دا دووبارە کوردەکان هەستانەوە ، بەلامشۆڕشەکەیانبلیشینرایە وەکەرچی بۆماوەیەکیش بێت ، چونکە شۆڕشی میللەتیك کە تێبکوش لەپێناوی ئازادیاندا ، وە ئامادەبن بۆ ئەوەی نرخەکەی بدەن هەرگیز ناکوژێتەوە.

ئنجا (کەمال پاشا) دوای ئەمە رووی‌کردە ئەوانەی بەرهەڵستی سیاسەتەکەی دەکەن لەناو ئەنجومەنە نیشتمانیەکە ، و دەرەوەیدا ، چونکە حەزو خواستی دیکتاتور بۆ دەسەلات هەمیشە لەزیادبووندا دەبێت ، تێربوونی بۆنیە ، و رێکەوتن نازانێت لەگەل بەرهەڵست کەرانیدا. (مستەفا کەمال) لەبەرهەڵست کەرانی خۆش نەدەبوو ، سەرنەگرتنی کوشتنەکە یەلە لایەن یەکێك لەدڵ گەرمەکانەوە (المتطرفین) بە هەلێك زانی بەکاری هێنا بۆ ئەوە کارەکان بخاتەوە جێی خۆی ، دادگاکانی (سەربەستی) لەپانتایی وڵاتدا بلاوکردەوە بۆ موحاکەمەکردنی هەموو کەسێك کەبەرهەڵستی سیاسەتەکەی بکات ، وە بەتوندی سزای بدات ، لەمەنە پێشەوایانی ئەنجومەنە گشتیەکە ، نەهاوریێ نەتەوە پەروەرەکانی ئەگەر بەهەرڵستیان بکردایە رزگاریان نە دەبوو ، بەلام (رۆف بەگ) کە حوکومەتی بەریتانیا ئاوارەی کردبوو ، بۆ دورگەی (مالطە) کەوا لە دواییدا بووبوو بەسەرەك وەزیرانی تورکیا ، نەبەدی ، و پاشمله (غیابیا) حوکمی بەسەردادرا ، وە گەلێکیش لەئەفسەرو سوپاییان کەوا شان بەشان و لەگەل (غازی)دا ، لەجەنگی (سەربەستی)دا جەنگی بوون ، رسواکران ، تامردن سزادران. بە تاوانی ئەوەی ئەمانە لەگەل کوردەکاندا دەستیان تێکەلاو ، و دەغەلی ، و موئامەرەیان کردوە بەهاوکاری بەریتانیای دوژمنی سەرسەخت ، دژی ساغ و سەلامەتی دەولەتەکە.

دوای ئەوەی (مستەفە کەمال) هەموو ناحەزەکانی خۆیی لەسەر شانو بال پێوەنا ، ولای‌بردن وە دیکتاتوریەتێکی سەرومری دەست گیر بوو (عصمت اینونو) بوو بەدەستە راستی ، ئیتر دەستی کرد جێبەجی‌کردنی ئەو بیرورایانەی کەلە مێشکی دابوو ، دەستی دایە کارێك هەرچەندە

لەسەرەتاوە بچووك دیارە ، بەڵام نیشانەیەکی گەورەی هەیە ، هێرشی بردە سەر فیست کە دروشمی تورك ، و تا رادەیەك هی موسڵمانەکان بوو لەپێشەوە لەسوپای قەدەغە کرد ، ئنجا لەناکاو خۆی لەگەڵێك شوێنی گشتیدا بەشەپقەوە دەرکەوت ، خەڵکی سەرسام بوون لەدواییدا لەسەرکردنی فیستی کرد بەسەر پێچییەك کەبەر سزای یاسا بکەوێت. رەنگە ئەم کارە وا دیار بێت کەشتێکی بێمانا بێت چونکە ئەوە گرنکە کەلە ناو سەردایە نەك لەسەر سەردا بێت ، بەڵام هەندێك جار شتی ئاسان و سوك دەبێتە نیشانەیەك بۆ کاروباری مەزن وَ پیرۆز ، چونکە (مستەفا کەمال) لەهێرش بردنە سەر فیستدا ، مەبەسی هێرش بردنە سەرکردەوە ، و نەریتی ، و کۆنەپەرستی دێرین بوو ، ئەمە بوو بە هۆی گەلێك پشێوی ، بەڵام سەرکوت دەکرا ، وە جەزایەکی زۆر لەسەرپێچی کەران دەسێنرا.

ئنجا (مستەفا کەمال) لەئیصلاحاتەکەیدا هاتە قۆناغی دووەم هەموو تەکیە ، کون ، و قوژبنی موفی ، و دەرویێشی داخست ، و مولکەکانیا نی بۆ بەرژەوەندی و سوودی دەولەت داگیرکرد ، وەنەهێشت دەروێشەکان بەرگە تایبەتیەکانیان، لەبەرکەن ، وە پێی راگەیاندن کە لەفرمانی خۆیان نان بخۆن.

لەپێش ئەمەدا قوتابخانە ئاینیەکان هەڵ گیرابوون لەجیاتی ئەمان قوتابخانەی مەدەنی کرابوەوە ، بەڵام قوتابخانەو ، کۆلیجەکانی بێگانە کە لەتورکیا دابڵاوبووبوونەوە ، پێیان راگەیاندرا دەرسی ئاینی نەڵێنەوە ، یان دەرگاکانیان داخەن.

یاسایش گۆرانێکی تەواوی بەسەرداهات ، یاسا جاران بریتی بوو لەقورئان یان شەریعەت بەڵام ئیستا یاسای مەدەنی سویسری ، وەیاسای سزای ئیتالی ، وەیاسای بازرگانی ئەلمانی هاتنەکایەوە ، دوابە دوای ئەمە گۆرانێك لەیاسای ئەحوالی شەخسی کەپەیوەندی هەیە بەژن هێنان ، و شوکردن ، و میراتەوە هاتەکایەوە ، پەیرەوەی هێنانیچەند ژنێك نەما.

لەو گۆرانکاریانەی ، کە نەریت و رەوشتی کۆنی بەدەربوو ، وێنە کێشان ، و وێنەگرتن ، هەلکۆلێن بو و ، لەوێنەی ئادەمیزاددا ، هەرچەندە ئەمە لەئیسلامیەتدا حەرامە بەڵام (مستەفا کەمال) قوتابخانەی بۆکردەوە ، دیسانەوە رێیدا بەئافرەت کەوا فێری هونەرەکان ببێت.

بەڵام ئافرەتی تورك دەورێكی گرنگی بینی لەتێكۆشانی توركیا لەپێناوی ئازادیدا ، (مستەفا كەمال) هەوڵیدا ئافرەت لەهەموو كۆتێك ئازاد كات ، یەكەم شت پەچە بوو كەهێرشی برایەسەر ، خێرا لابرا ئافرەتان چاوەروانی هەڵێكیان دەكرد بۆ لابردنی ، (مستەفا كەمال) ئەم هەڵەی بۆ رەخساندن ، خێرا لایان برد ، هەروها (غازی) گەڵێك هەڵپەركێی ئەوروپاییانەی بەدڵ بو ، خۆی زۆر حەزی لێدەكرد ، لەو باوەرەدا بوو ، ئافرەت ئازاد ، دەكات ، وەدەهێتە هاتنی شارستانێتی (الحضارە) ئەوروپا ، ئیتر شەبقە ، و هەڵپەركی بە جووت بوو بوونە نیشانەی پێشكەوتن و شارستانێتی ، گەرچی ئەم دوو نموونەیە زۆر شایانی شان و شەرف نییە رۆژئاواییەكان ، بەڵام بەدیمەن ئەنجامێكیان هەبوو ، ئەم دوانە بون بەهۆی ئەوەی توركەكان ، كڵاوی سەریان ، وجل و بەرگیان ، شێوەی گوزەرانیان بگۆرن. بەم جورە نەوەیەك لەئافرەت لەچەند سالیكدا لەژیانی دورە بەریزیەوە ، بازیان دابۆ ژیانی پیشەكانی وەكو: پاریزەری ، و پزیشكی ، و ئەندازیاری ، و حاكمێتی... ، پولیسی ئافرەت لە جادەكانی (ئەستانە)دا پەیدابوون ، سەیر ئەوەیە كەدەبینین هەنگاوێك چەند هەنگاوێكی تر بەدوای خۆیدا دێنێت ، لەبەكارهێنانی ئەلف و بێی لاتینییە وە ئامێری نووسین (تایب رایتەر) زۆر بوو ، ئەمەش رێی ئیش كردنی بۆ ئافرەتانی تورك كردەوە ، و زۆر كرد.

(مستەفا كەمال) یارمەتی منداڵانی داكە خۆیان پەروەردەبكەن ، وبە خۆیاندا رابپەرموون وە واز لەشێوازە كۆنەكان بێنن كەقوتابخانە ئاپنیەكان لەسەری دەرۆیشتن ، لەبابەت دەرخ كردن و لەبەركردنی وانە ، و دەرسەوە. دەڵین توركیا لەساڵێكدا هەفتەیەكی بۆ منداڵان تەرخان كرد ، كەوا هەمووكا ربەدەستێكی لێپرسراو لەدەولەندا بە(ناو) وازی لەجێگەكەی دەهێنا بۆ منداڵێك ، بۆ بەرێوەبردنی كاروبار ، ئەو هەفتەیە دەولەت منداڵ دەی برد بەرێوە ، من نازانم دەولەتەكە لەو هەفتەیەدا چەندە سەركەوتوو بووە ، بەڵام لەو باوەرەدام ، گەلێك لەمنداڵان هەرچەندە نەفام ، و نەشارەزابن ، لەگەوجی و بێمانایی‌دا ناكەنە گەلێك لەپیاوە سیاسیە مەزنەكان ، و كاربەدەستەكانی كەوا خەلكی دیمەن یانی بەدڵە ، و شارەزای دەروونیان نییە.

لەو دەستکارییەساکارانەی کەوا نیشانەی ئاراستە نوێیەکەیە ، و فەرمان ڕەواکانی تورکیا لە سەری دەرۆیشتن ، ئەوە بو کەخەڵکی وازیـان هـێنـا ...سڵاو)کردن لەیەکتری بەرێبازە کۆنەکەدا ، وەکردیـان بـەتـەوقـەکـردن بەدەست ،.چونکە لەگەڵ گیانی پێشکەوتن و شارستانێتی دا دەگونجێت.

(کەمال پاشا) لەتێکۆشانیدا ئنجا گواستیەوە بۆ سەرزمانی تـورکـی ، وەیان بەپێی بیروڕای خۆی ، ئەو وشانەی کەچونەتە سەرزمانی تورکـی ، چونکە زمانی تورکی بەپیتی عەرەبی دەنوسرا ، بەلای ئەوەوە شـتـێـکـی بێگانەیە ، و زەحمەتە ، سۆڤیت لەئاسیای ناوەراستدا تووشی ئەم کێشەیـە هاتن ، چونکە گەلێك لەتاتارەکان بەو پیتانە دەیان نووسی کە لەعەرەبی و فارسییەوە ، وەرگیرابوون ، ئیتر سۆڤیت لەساڵی ١٩٢٤ ز. دا ، لە باکـو لەم رووەوە کۆنگرەیەکیان بەست بۆ بلاو کـردنـی ، ئـەم کـێـشـەیـە ، کۆنگرەکە بریاریدا پیتی لاتینی وەیا رۆمانی بەکاربهێنرێت ، وەنیشانەی تایبەتیان دانا ، بۆ دەربرین ، وەیا جیا کردنەوەی هەندێ دەنگ ، وەیـا بێت کە لەم زمانانەدا هەیە ، (مستەفا کەمال) ئەم گۆرینەی بەدڵ بوو ، لە پێشەوە خۆیی فێرکرد ، ئنجا بەسەر زمانی تورکیدا بەکاری هێنا ، لەم رووەوە خۆی هەوڵێکی تایبەتیدا ، دوای ئەوەی دوو ساڵ پروپاغەنـدە بـۆ ئەم بیروڕایە ، وەخەڵکی فێرکران بەکاریبێنن پاسایەك دانرا سـنـووری بـۆ ئەو ماوەیە دانا کە دەبێت پیتی عەرەبی تیادا بە کار نەهێنرێت ، ئـنـجـا ئەوانەی کەتەمەنیان لەبەینی شانزە ساڵ و تا چل ساڵدایە زۆریان لـێـکـرد کەپیتی لاتینی لەقوتابخانەدا بخوێنن و فێربن ئەو کاربەدەستانەی کە نەیان دەویست فێربین لەفرمانەکانیان دەردەکران ، بەلام حەبسەکان ، لەبەندیخانە رزگار نەدەبوون کە ئەگەر خوێندن و نوسین بەپیتە نوێ کە فێر نەبونایـە ئەمەیە پیشەو کردەوەی دکیتاتور لەسەپانـدنـی ئـیـصـلاحـاتـدا بـەسـەر میللەتەکەیدا ، بەتایبەتی ئەگەر خۆشەویست بێت ، کەچی حوکومەتەکانـی تر زوربەیان ناتوانن بەم رادەیە برکێشی بکەن ، و دەست بخەنە کاروباری ژیانی میللەتەکانیانەوە.

ئیتر کارلەم سنورەدا رانەوەستا بەڵکو دەرکەوت کە وشە فارسـیـیـەکـان و عەرەبیەکان نوسینیان بەتیپی لاتینی زەحمەتە ، چونـکـە ئـەم وشـە ، و وتانە چەند گۆرین ، و هەلگیرانەوە یەکیان بەسەرادا دێت ، کەچـی وشـە

تورکیەکان بۆئەمە کەمتر لەبارن ، و زۆر سەخت ترن ، وە نووسینیان بەپیتی لاتینی ئاسان ترە لەبەر ئەمە بریار درا وشەی فارسی و عەرەبی لەزمانی تورکی دەربهێنریت ، وەلە جیاتی ئەمانە وشەی تورکی رەسەنیان بەکارهێنا ، سەبارەت بەهۆی نەتەوایەتی بۆ ، ئەم گۆرانکارییە رووی‌دا لەوانەیە زمانی تورکی گە پر ، لە وشەی عەرەبی و فارسی ، بۆ ژیانی مەزنی ، و کامەرانی‌یەك کە لە دیوانی (بلاط) پادشاکانی عوسمانییدا هەبوو بگونجێت ، بەڵام بەکەڵکی جمهوریەتی تورکیای نوێ نایەت ، بەم جۆرە وشە نارێکەکان لابران ، ئنجا زانا و مامۆستاکان بەرەو دێهاتەکان دەچوون بۆ دەست کەوتنی وشەی تورکی رەسەن وەتا ئێستەش ئەم کارە هەربەردەوامە ، ئەم جۆرە گۆرانکاریە لای ئێمەمانان مانای وایە کەواز لەزۆر وشە رازاوەکان ، و جوانەکانی زمانی هیندستانی بێنین کەوا ژیانی کۆشك پێکی هێناوە ، وە لەجیاتی ئەمانە وشەی وشکی دێهاتی بەکاربێنین.

دوا بەدوای گۆرینی زمان ناوی شارەکان و زەلامیش دیسانەوە گۆرا: (قسطنطینة)کرا بە (ئەستەمبول) ، و ئەنگۆرا بە (ئەنقەرە)وە (سحیرنە) بە (ئەزمیر) ، زۆربەی ناوەکانیان عەرەبی بون ، وەکو ناوی (مصطفی کمال) ، بەڵام ئاراستی نوێ بەرەو ناو نانی تورکی یەتی دەچێت.

ئەو گۆرانکارییەی کەوا هەرایەکی بەرپاکرد ئەو یاسایە بوو کەوا دەبێت بانگدان و نوێژکردن ، بەزمانی تورکی بێت ، گەرچی نوێژکردن بەعەرەبی دەکرێت وەکو ئێستا چونە لە هیندستاندا ، وایە لەبەر ئەمە (مەولەوی)یەکان(٢) ئەم یاسایەیان بەدروست کراو دادەنا ئەمان بەردەوام بوون لە نوێژکردندا بەعەرەبی ، ئەم کێشەیە گەلێك ئاژاوەی بەرپاکرد ، بەڵام (کەمال پاشا) بەتوندی دەی کوژاندەوە ، وسەرکوتی دەکرد.

ئەم گۆرانکاریە کۆمەلایەتیانە لەم دە ساڵەی دواییەدا ژیانی خەلکی گۆری ئیتر لەولاتەکەدا نەوەیەکی نوێی ئازاد بوو لەهەموو کۆتێکی نەریتەکان (تقالید)و ، کۆنەپەرستی ئاینی هاتە گۆری ، بەڵام سەرەرای گرنگی ئەم گۆرانکاریانە ، کەچی زۆر کاری نەکردە سەر ژیانی ئابوری ولاتەکە ، هەر چەندە کەمێك روخسار گۆر رابوو ، بەڵام ناوەرۆك نەگۆررابو چونکە (کەمال پاشا) ئابوری‌ناس نەبوو ، نەیشی‌دەویست

شۆڕشێکی ئابووری بەرپاکات ، وەکو لە روسیای سۆڤێتیدا رووی‌دا ، گەرچی لەبارەی سیاسی‌یەوە لەگەڵ روسدا بوو ، بەڵام لە بیروباوەری ئابوری شیوعیتی دور دەکەوتەوە ، وا دیار بو کەبیروباوەری کۆمەلایەتی (مستەفا کەمال) لەخوێندنەوەی شۆڕشە گەورەکەی فەرەنسەوە ، وەرگیرا بو.

تا ئێستاش لەتورکیادا چینێکی بەهێزی ناوەراست نی‌یە ، جگە لەکاربەدەستەکان ، ژیانی بازرگانی توشی نوشوستیەك هات لەئەنجامی دەرکردنی یونانیەکان ، و بیکانەکانی تردا ، بەڵام حوکومەتی تورکیا ئەمرو هەزاری لەگەل سەربەستی نەتەوایەتی ، و پێشکەوتنێکی لەسەرخۆی پیشەسازی پەسندە دەکات و بەچاکتری دەزانێت نەوەك سەربەستیە ئابوریەکەی لەدەست بچێت. تورکیا دەترسا کەسەرمایەی بێگانە بەفراوانی روو نەکاتە ولاتەکە ، تاکو سەربەستیە ئابوریەکەی لەکیس نەچێت ، و. ببێتە مەڵبەندی چەوساندنەوە ، لەلایەن بێگانەکانەوە ، بۆیە پر کێشی نەدەکرد کەپارە ، و ماڵی بێگانەکان بێنە ولاتەوە ، وە باجێکی گرانی خستە سەر کەل ، وپەلی بێگانە وەکەلێکی لەپیشەسازیەکان خۆمالی کرد (تأمیم) واتە (دەولەت بەرێوەی‌بەرێت و میللەتیش ببێتە خاوەنی) ، وەهێلی شەمەندەفەری لەولاتەکەدا راکێشا.

(مستەفا) زۆربەی تەقەلای بەرەو رووی کشت وکال کرد بووەوە ، چونکە پاڵپشتی میللەتی تورك و لەشکری تورك بو ، کێلگە نموونەییەکانی دروست کرد ، تراکتۆری هێنا ، وە یارمەتی کۆمەلانی هەرەوەزی فەلاحەکانی‌دا.

تورکیاش وەکو ولاتەکانی تر دووچاری گرانباری بێ بازاری بوو ، کەوا جیهانی گرتبووەوە ، زۆر بەنارەحەتی کاروباری خۆیی دەبرد بەرێوە ، بەڵام زۆر بەهیمەت و رێك و پێکی‌یەوە بەسەرکردایەتی پێشەوای مەزنی دیکتاتورەکەی (مستەفا کەمال) کەوا پێی دەڵێن: (اتاتورك) واتە باوکی تورکەکان ، بەرەو رزگار بوون دەچێت.

---

٢) مەولەوی:ـ بەرەبەکن کەپەیرەوی خواناسی دەکدن بە رێبازی جۆرێك لە تەسەوف دا.
وەرگێری کوردی

١) لەگەل تەواوی ریزمدا بۆ دانەرەو ئەوانەی ئەم دانراودیان کردوه بەعەرەبی ، هەرگیز گەلی کورد زمانی فارسی نەبوه ، چونکە کورد خاوەنی زمانی نەتەوایەتی ، و مەلبەندو نیشتمانی نەتەوایەتی خۆی بوه ، خۆ ئەگەر زمانی کوردی لەهەندی رووه ، وە لەفارسی بچێت ، وەیا فارسی لەکوردی بچێت ئەمە وا ناگەیەنێت کەکوردی فارسی ، وەیا فارسی کوردیه بەلکو ئەوه دەگەیەنێت کە هەردوو زمانەکە دەگەرێنەوه بۆیەك بنەچەی زمان کەئەلێن (هیندو - ئەوروپی) یەکەوا زمانی سەنسکریتی (هیندی کۆن) ، و فارسی ، و کوردی ، وئەفغانی دەچنەوه سەر ئەوبنەچەیە.. بۆ نمومه:- ئەگەر زمانی ئینگلیزی تا رادەیەك لەئەلمانی ، وە یا ئەلمانی لەئینگلیزی بچێت ، ئەمە وانا گەیەنیت کەئینگلیز بەئەلمانی ، وەیا ئەلمان بە ئینگلیزی قسەیان کردوه ، چونکە ئەم دوو زمانەشی لەبنەچەی زماندا دەچنەوه سەر بنەچەی (ئەنکلوسکونی) هەروها بەنیسبەت لەیەك چوونی زمانی میللەتانی (سلاف)و لەیەك چوونی زمانی میللەتە (سامی)یەکانیشەوه.

وەرگێری کوردی

# هیندستان بەرێبازی غاندیدا دەڕوات

## ١١/مایس/١٩٣٣

دەبێ ئێستا باسی کارەساتە نزیکەکانی ئەم سەردەمەی هیندستانت بۆ بکەم دیارە ئێمە بایەخ بەرووداوەکانی ناوولاتەکەمان زیاتر دەدەین ، تا لەو رووداوانەی کە لەدەرەوە روودەدەن ، بەلام من خۆم دەگرم لەسەر وردەبابەتەکانی ناڕۆم ، جگە لەوەی ئێمە بۆخۆ بایەخ دەدەین بەمێژووی هیندستان بەتایبەتی ، گەرچی کێشەی هیندستان لەکێشە گەورەکانی جیهانە ئەمڕۆ ، ئەو کێشانە باشترین و ، ئاشکرا ترین نموونەن ، بۆ بیروباوەری دەسەلاتی ئیستیعمار ، چونکە هیندستان بناغەی پالپشتی ئیستیعماری بەریتانیا بوو ، کە پالی پێوە دابوو ، چونکە سەرکەوتویی ئینگلتەرە لەهیندستان دا دەولەتەکانی تری هان دا کە لەئیستیعمار ، و کۆشش بێناوی دەست کەوت و چەوسانەوەدا ، لاسایی ئنگلتەرە بکەنەوە.

لەنامەکەی دوایمدا باسی ئەو گۆڕانکاریانەم بۆ کردیت کەبەسەر ولاتەکەدا هات لە کاتی جەنگە جیهانیەکەدا ، لەگەل پەیدابوونی پیشەسازیو چینی سەرمایەداری هیندستانی ، و هەل گەرانەوەی هەلویستی بەریتانیا بەرامبەر بەپیشەسازی هیندستان ، ئینجا ئەو سنورە کە بەریتانیا دای نابوو ، بۆ پیشەسازی ، وبازرگانی ، و سیاسەت لەهیندستاندا زیاتر بەرەو توندو تیژتر دەچوو ، ئیتر سالانی دوای جەنگەکە رۆژهەلات شەپۆلێکی بوژانەوەی بەسەردا هات. لەهیندستاندا سەرەتای جم وجوولێکی شۆڕشگێڕانەوی بەتین دەرکەوت ، میللەت ئاواتی ئازاد بوونی زۆر بوو ، ئەو کارێکی وایکرد کەحوکومەتی بەریتانیا هەست بکات بدێپداویستی رزگاربوون ، لەم ئیشە ، لەبەر ئەمە چەند هەنگاوێکی ئیصلاحی سیاسی نا ، بە چەند لێکۆلینەوەیەك هەستا ، دوابە دوای ئەمە چەند بیسبارێك هات کە مەبەس پێك هێنانی هەندێ راست کردنەوەی

سیاسی بوو بەپێی ڕاپۆرتی (مونتاجو ، و شلمسفوردا) ، وە چەند هەنگاوێکی ئابوریانەش نرا ، بەمە چینی بورجوازی خەریك کرد کە بەپاشماوەی دەستکەوتە کان پیگەیشتبوون ، بەڵام خۆیشی سەنگەری هێزو ، چەوساندنەوەی بۆ خۆی هێشتەوە.

دوای جەنگە کە ماوەیەکی خۆش هات ، بازرگانی کەوتە برەوەوە ، قازانجی زۆر هاتە دی ، بەتایبەتی لەپیشەسازیکردنی کۆش لەبنغال دا ، گەلێك جار قازانج لە صەدا ، صەد بوو ، گەرچی تارادەیەك نرخ بەرزبوەوە کریش کەمێك زیادی کرد ، کرێ لەسەر کرێ گرتەکان زیادکراتا بیدەن بەچینی دەرەبەگەکان ئیتر خیرا بێبازاری کەوتە بازرگانییەوە ژیانی کرێکارە پیشەسازەکان و کرێکارانی کشتوکال لەخراپەوە بەرەو خراپتر دەچوو ، وە بەگورجی بێزاریش زیادی کرد ، ژیان و گوزەرانی نالەباری کرێکارەکان ، بوو بە هۆی مان گرتن لەکارگەکاندا ئنجا باری ناهەمواری ئەوانەی زەویان بەکرێ گرتبو لە(اوض)دا بەپێی پەیرەوێك کە بە(تالوقداری) بەناوبانگ بوو ، بو بەهۆی پەیدابوونی بزوتنەوەی فەلاحەکان ، لەربزەکانی چینی مام ناوەندی خوێندەواریشدا بێئیشی زیادی کرد ، بوو بەهۆی پەیدا بوونی سەغلەتیەکی بەتین.

ئەمە باری ئابوری دوای جەنگە کە بوو ، ئەگەر لەبیرت بمێنێ دەتوانن گۆڕانکار یەکانی کە بەسەر ولاتادێت تێی بگەیت. ئیتر لەولاتدا گیانێکی شەر ئەنگیزی پەیدابوو ، گەلێك دیمەنی هەبوو ، کرێکارە پیشەسازکان نەقاباتیان دروست کرد ، ئنجا کۆنگرەی یەکیەتی کرێکارانی هیندستانیان تێکرا پێك هێنا ، خاوەن مولکە بچوکەکان (الزامندار) ، و فەلاحەکان پەست بوون لەحوکومەت بیریان لەوەکردەوە کەهەنگاوی سیاسیا نەبینن ، تەنانەت کرێگرتە بەسەزمانەکان بیریان لەیاخی بوون دەکردەوە ، بەلام چینی مام ناوەندی بەتایبەتی بێئیشەکانیان ، بەراستی بەرەو سیاسەت چوون ، وەهەندێکی تریان بەرەو کاروباری شۆرشگێرانە. ئەنجامی ئەم بارە ئابوریە ، هیندوس ، وسیخ و موسلمانەکانیشی وەك یەك گرتەوە ، چونکە باری ئابوری ناکۆکی ئاینی نازانێت ، سەرەرای ئەمەش موسلمانەکان بەهۆی جەنگەکەوە دژی تورکیا زۆر وەرس بوون چونکە دەترسان دورگەی عەرەب ، و شارە پیرۆزەکانی وەکو (مکە ، و مدینە ، و قدس) بفەوتێن.

بەم جۆرە هیندستان دوای جەنگەکە ، لەوەزع و باری خۆی وەرس بو بو ئەوەندەی نەما بو ، بێزاربێت ، ئەگەر تروسکە هیوایەك نەبوایە ، ئیتر چەند مانگێکی نەخایاند ، بەروبوومی چاوەڕوان کراو ، لەسیاسەتی بەریتانیا هاتەپێشەوە ، لەوێنەی پێشنیارێکدا بۆ دەرهێنانی چەند یاسایەك ، کەدەستکاری بزوتنەوەی شۆرشگێڕانە بکات ، و بەسەریدا بخورێت ، لە جیاتی پەرەسەندنی ئازادی ، کۆنەکان (القیور) زیادی کرد ، ئەم پەیرەوانە لەراپۆرتی یەکێك لە لیژنەکانەوە وەرگیرابوو کەوا یە(پەیرەوەکانی رولات) دەناسرا ئیتر لەپانتایی ولاتەکەدا بەبەیرەوە رەشەکان بەناوبانگ بوو ، هەموو هیندستانی‌یەك هەرچەندە مام ناوەندی بو بێت پێی ناخۆش بوو ، ئەم پەیرەوانە ئازادی دایە حوکومەت ، و پۆلیس هەموو کەسێك بگرێت کە بەباشی نەزانێت ، وەیا گومانی لێبکات وە بەبێ موحاکەمە حەپسی کات ، ئەم پەیرەوە بەم رستەیە دەردەبررا: "نەوەکیل ، نەدووبارەکردنەوە (استئناف) وەنە بەلکە ، لەم کاتەدا کە هاواری بێزاری بەرزدەبوەوە ، لەئاسۆی سیاسەت لەهیندستاندا هۆیەکی نوێ پەیدابوو ، هەروەکو هەورێکی بچوك کەچۆن تەشەنە دەکات و پەرەدەسێنی هەتا هەموو ئاسمان تێکرا دەگرێتەوە وابوو.

ئەم هۆ نوێیەش (مهندەس کەرەم شەند غاندی) بوو ، کە لەکاتی جەنگەکەدا لە خوارووی ئەفەریقاوە کەوابوەوە هیندستان ، لەئاواییەکەی خۆیدا لە(ئەشرم) لە(سایرماتی) دا جێگیر بوو ، تا ئەم نزیکانەش لەکاروباری نیشتمانی ، و سیاسی‌یەوە دوور بوو ، تەنانەت بۆ حوکومەتی بەریتانیا سەربازی کۆدەکردەوە بۆ بەشدار بوون لەجەنگەکەدا شان بەشانی هاو پەیمانەکان.

بەلام بەسیاسەتەکەیان لەخوارووی ئەفەریقادا دەوت (ساتیاکراها) وەیان بەرهەلستی کردن بەجۆرێکی لابەلا (سلبی). لەسالی ۱۹۱۷ز. دا ، بەسەرکەوتوویی سەرکردەیی تێکۆشانی چینی کرێگرتە هەژارەکانی کرد ، کەوا دەست درێژیان بەدەستی خاوەن کێلگە ئەوروپاییەکانەوە دیبوو ، لەناوچەی (بهار)دا ، دوای ئەمە بەرگری لەفەلاحەکانی (کوجارت) کرد ، ئنجا لەسەرەتای سالی ۱۹۱۹ز دا تووشی نەخۆشی هات ، هەرکە چاك بووەوە ولاتەکە هاتبوە جۆش لەبێزاری دەربرین دا دژی پەیرەوەکانی رولات) ئەمیش دەنگی خۆیی خستە پال دەنگی میللەت.

ئەم دەنگە تازەیە جیاواز بوو لەدەنگەکانی تر ، هێمن و سەنگین بـوو بەڵام دەنگی هەراو هۆریای داپۆشیبوو ، ناسك و خۆش بـوو ، بـەڵام وەك ئاسنی رەق سەخت بوو ، نەرم و دڵ رفین بوو ، بەڵام پر بوو لەهەرەشـەو گورەشە ، هەر وشەیەك لەگفتارەکانی نای بریارێکی مەزنی تـێـدابـوو ، گفتارە ئاشتی ئامێزەکانی هێزێکی وایپێوە هەبوو نیشانەی ئامادەیی بوون بۆ ئیش کردن ، و قایل نەبوون بەستەم ، و رسواکردنی دەسـت درێـژی ، ئەمە ئەو دەنگە بۆ کە لەشوبات ، و مـارتـی ١٩١٩ز. دا لـەنـاکـاو دای بەسەرماندا ، سەرسامی کـردیـن ، بـەڵام ئـەمـرو دوای چـواردە سـاڵ ، راهاتووین لەگەلیدا. دەنگەکە جیاواز بوو لەبەزم و رەزمی سیاسی پێشومـان کەئاخنرا بوو لەنەفرەت ، و وتاری دورو درێژ ، کە بەبریارە خوارییەکـان دوایی دەهات ، بۆ دەربرینی بێزاری کەوا حوکومەت هیچ گوێی نەدەدایـە ئەم دەنگی رەفتار بوو نەك دەنگی گفتار.

مەهاتما غاندی بزوتنەوەیەکی رێکخست ناونرا (ساتیا کراها سبها) بـۆ ئەوانەی کە ئامادەن لەیاسا ستەمناکەکانی بەریتانیا هەڵـگـەرێـنـەوە ، و بچنە بەندیخانە ، و بەرامبەر دادگاکان راوەستن ، ئەو دەمە شێـوازێـکـی تازە بوو ، گەلێکی هان دا بۆ ئیش کردن ئەم شێوازە ئەمرۆ لای ئێمەمانان ئاشکرا ، و ئاسایی ، و کارێکی سروشتییە لەژیانماندا.

شتێکی سەیر نەبو کە غاندی سکاڵایەکی بەرێزانە بنێرێت بۆ جێنشینی پادشای بەریتانیا ، وە ئاگاداری بکات کە ئەگەر حوکومەت لەسـەر یـاسـا ستەمناکە بروات ئەنجام باش نابێت ، غاندی زانی کەوا حوکومەت لـەسـەر بیروراکەی خۆی هەرسورە ، وە گوی لە ، بەرهەلستیکردنی هیندستانیەکان ناگرێت ، داوای کرد لەولاتدا رۆژێك بۆ غەمباری هەبێت کەدەبـێـت لـەو رۆژەدا کارو فرمان بوەستێت ، وە کۆبونەوەکان ساز بـکـرێـن ، ئـنـجـا بریاردرا ئەو رۆژەش ، یەکەم یەکشەمە بێت کـە لـە دوای بـە ئـەنـجـام گەیاندنی رژێم ، و یاساکانەوە دێت. بەمە بزوتنەوەی (سـاتـیـاکـراهـا) گوشاد کرایەوە کەوا رێکەوتی ٦ نیسـانـی سـاڵـی ١٩١٩ز کـرد ، شـارو لادێکانی هیندستان زەماوەندیان تێدا بلاو بوەوە ، یەکەم خۆپیشاندانێـکـی یەکگرتووی هیندستانیانە بوو ، خۆپیشاندانێکی زۆر چاك ، جۆرەها خەلـك

و بەرە ، و تاقم بەشدار بوون تیایدا ، ئێمە خۆمان کەئیشمان تێدادەکرد بۆ سەرکەوتنی/سەرمان سورما لەو سەرکەوتنەی کەبزوتنەوەکە سەرکەوت ، هەرچەندە پەیوەندیمان بەژمارەیەکی کەمی خەلکی شارەکانەوە کرد بو ، کەچی گیانی کەلایەتی (الروح الشعبیە) بلێسەی سەند هەروەك ئاگر لەپووش بەربو بێت. بانگەوازەکە گەیشتە ئەوپەری دێهاتەکان ، خەلکی شارو ، لادێ یەکەم جار بوو لەژیانیاندا لە خۆپیشاندانێکی سیاسی ، و شەعبیدا بەجارێك بەش داربن.

خەلکی شاری (دلهی) بەهەلەدا چوو بوون لەبابەت کاتی دانراوەوە بۆ خۆپیشاندانەکە ، وایان زانی کە ٣١ مارتی ١٩١٩ز. یە ، واتە پێش کاتی خۆی بەهەفتەیەك ، لەو رۆژەدا گیانێکی خۆشەویستی سیر کەوتە نێوان هیندوس و موسلمانەکانەوە ، پیشەوای بەناوبانگی شاری "سوامی شراد هانند" لەمزگەوتەکەی (دلهی)دا لەناو جەماوەرێکی قەلەبالغدا وەستاو وتاری دەدا ، سوپاو پولیس ویستیان قەلەبالغەکە ، لەشەقامەکاندا بلاوە پێبکەن ، و تەقەیان لەجەماوەروکە کرد وە هەندێکیان کوشت ، (سوامی شراهانند) بەبالا بەرزەکەیەوە پێشوازی شەری پۆلیس بەسنگی رووتی کرد بەلام نەکوژرا ، ئەم کارەساتە غیرەتی میللەتی جولاند ، بەلام ئەوی جێی داخە ئەم پێشەوایە یەکێك لەموسلمانە دڵ گەرمەکان دوای هەشت ساڵ کەمتر ئەم پێشەوایەی کوشت کەوا لەسەر جێگا کەوتبو ، وە لەمردندا بوو.

دوای ٦ نیسان کارەساتەکان خێرا بەدوای یەکدا دەهاتن لە ١٠ نیساندا لە (امرتسار)دا وەزع و بار خووش بوو ، لەکاتێکدا کەسوپا تەقەی لەجەماوەرێکی بێچەکی سەر قوتی کرد ، کەوا کۆبووبوونەوە بۆ دەربرینی بێزاری سەبارەت بەگرتنی هەردو پێشەوا کەیان دوکتۆر (کینشلو ، و ساتیابال) وە کوشتنی ژمارەیەك لەجەماوەران. ئنجا جەماوەر و روژا ، پێنج شەشێکیان لەئینگلیزە بێتاوانەکان کوشت ، بەزۆر خۆیان کرد بەژورەکانیاندا خانوەکانیان سوتاندن ، دوای ئەمە بەردە بەسەر (بنجاب)دا دادرایەوە سەبارەت بەچاو دێری کردنێکی زۆر توندەوە کەدەنگ و باس گەیاندن ، و هاتوچۆکردن بۆ ئەوی قەدەغە کرابو

لەهیندستان جیاکرایەوە ، ئنجا حوکمی عورفی ئیعلان کرا ، هەزاریو

پەرێشانی چەند مانگێك پەرەی سەند لەدواییدا پەردە هەڵدرایەوە شتی راستەقینەی سامناك ئاشكرا بوو.

باسی كارە نەنگ و ستەمەكانی سەردەمی عورفیت بۆناكەم لە(بنجاب)دا چونكە هەموو جیهان هەواڵی كوشتارەكەی كە لە (امرتسار)دا رووی‌دا دەزانێت كەبە هەزاران كوژراو ، و بریندار كەوتنە دا وەكەی كە بۆ كوشتنیان نرابووەوە ، ئیتر لەوكاتەوە وشەی (امرتسار) كوشتارەكە دینێتەوە یاد ، كردەوەی ناشیرین هەربەم كوشتارەوە نەوەستا ، بەڵكو لەمەزیاتریش لەناوچەی (بنجاب)دا رووی‌دا.

هەرچەندە خۆش بوون زۆر زەحمەتە لەم كردەوە ترسناكە درندانەیە ، سەرەرای ئەوەی كەساڵەها دورو درێژی بەسەردا تێپەریوە ، بەڵام دەتوانین ئەو هۆیانە بدۆزینەوە كە حوكومەتی بەریتانیا هان دا بۆ كردنی ئەم كارەساتە. چونكە بەریتانیاییەكان لەهیندستاندا دەسەلاتداربوون ، وایان دەزانی كە لەسەر ئاگرن ، وەیان لەسەردەمی بورگانێك دانیشتوون ، بۆیە هەولیان نەدا لەبیروورای هیندستانیەكان ، و هەستیان تێبكەن ، لەبەر ئەوە لەهیندستاندا بەتاقی تەنیا ، و جیاواز ژیان ، وە پشتیان بەرژێمە ناقولا و فراوانەكەیان و بەهێز بەست ، ئنجا لەدوای ئەم بەخودا راپەرموونە دەستكردە وەترسیكی زۆر هەبوو ، لەشتێكی نەناسراو ، ئیتر جگە لەوەی لەسەدەو نیوێك لەهیندستاندا حوكمرانی یان كرد بەڵام هێشتا هیندستان لای ئەوان نەناسراو بوو. تا ئێستەش بیرەوەری ساڵی ١٨٥٧ز. هەر لەمێشكیان دا یە هەمیشە بیری لێ دەكەنەوە كە لە ولاتێكی بێگانەی دوژمن دا دەژین ئەوەندە نابات كەلێیات هەڵدە گەرێنەوە ، شرو ، وریان دەكەن ، ئەمە بیروورایان بوو ، كەبەسەر مێشكیاندا زاڵ بو بو ، هەركە بزوتنەوەیەكی نیشتمانیان لەولاتەكەدا چاو پێبكەوتایە ، ئنجا كە هەواڵی بزوتنەوە خوێنیتەكەی (امرتسار)لە(١٠نیسان)دا گەیشتە كاربەدەستە گەورەكان لە (بنجاب) لە( لاهوار)و رەیان بەردا ، ورخان ، وایان زانی كە لەوی لافاوی شۆرشێكی گەورە هەیە وەكو شۆرشی ساڵی ١٨٥٧ ، و ژیانی بەریتانیاییەكان لەمەترسی دایە ، ئیتر شێتگیر بوون وەكو كایەك كە رەنگی سوور و روژاندییتی ، بۆیە كوشتار كراو ، حوكمی عورفی دانرا لەئەنجامی ئەم جۆرە بیركردنەوە ترس ئامێزەی ئینگلیزە وە بوو.

ئەگەر لەمەی پێشەوە تێ بگەین ، گەرچی هەر ئەمە نابێتە بیانوویەك ئنجا ئەوەی کە هیندستانی زیاتر وروژاند ، ئەو بیانووە بو کە جەنەرال (دەیەر) باش چەند مانگێك هێنابو یەوە ، بەجورێکی ناشیرین بوئەدم کردەوە درەندەییانەیە لەگەل چاوبوشینی لەتاوانی حوکومەت وە لەهێرش بردنەسەر هەزارەها کەس لەمیللەتی بەسەزمان، جەنرال (دەیەر) لێپرساوەد لە تەقەکردن لەناو (امرتسار)دا. دوای ئەم کارە وتی: "ئاگام لەمەنییە". هەندی کەس چ لەناو حوکومەت ، وچ لەئینگلتەرەدا سووکە رەخنەیەکیان لەجەنرال گرت ، بەلام ئەو گفت و گۆیەی کە لەئەنجومەتی لوردەکاندا کرا بەلگەیەکی روونە بوناپاکی بەریتانیا ، چونکە ئەنجومەنەکە جەنرال (دەیەر)ی هەلێکشا ، و ستایشی دەکرد.

ئەمە بلێسەی بەئاگری رق و کینەی هیندستان سەند ، مەینەتییەکەی (بنخاب) رق ، و دلتەنگی لەدەرونی میللەتدا پەیداکرد ، حوکومەت ، و کۆنگرەکە(١) گەلێك لیژنەیان پێك هێنا بۆ پشکنین لەراستی رووداوەکە ، وەمیللەتیش بەپەرۆشەوە چاوەروانی راپۆرتەکانیانی بۆ پشکنین لەراستی رووداوەکە ، وەمیللەتیش بەپەرۆشەوە چاوەروانی راپۆرتەکانیانی دەکرد.

ئیتر رۆژی ١٣ نیسان لەو رۆژەوە بوو بەچەژنێکی نەتەوایەتی لەهیندستاندا ، وە هەفتەی نێوان ٦ تا ١٣ نیسان کرا بەجەژنێکی نیشتمانی ، .وە (جالیانوالاباغ) لە(امرتسار)دا بوو بەکابەی حەج کردنی سیاسی لەولاتدا وە بو بەبەهەشتێکی خۆش دوای ئەوەی شوێنەواری ترسی تێدا نەما ، گەرچی یادیشی هێشتا هەرماوە.

سەیر ئەوەبو وارێکەوت کە ئەنجومەنی کۆنگرەکە لەسالی ١٩١٩ز. دا لەخودی (امرتسار)دا بەسترا. هەرچەندە کۆنگرەکە هیچ ئەنجامێکی وای نەبوو سەبارەت بەوەی کەچاوەروانی راپۆرتی لێژنەکەیان دەکرد ، کە دانرابو ، بۆ لێکۆلینەوە ، بەلام گۆرانێکی ئاشکرا لەکۆنگرەکەدا بەدی کرا ، یەکیەتیەکی نوێ ، و گیانێکی نوێی پێوە دیار بوو ، ئەندامە کۆنەکانی کۆنگرەکەی پەست کردبوو ، (تلاك)ی سەرکردەی دلێر پەیدابو ، دوامین جار بۆ لەژیانیدا کە ئامادە بو لە کۆبوونەوەی کۆنگرەکەدا (چونکە پێش ئەوەی کەکۆنگرەکە بۆ دوەم جار کۆببێتەوە ئەم مرد). هەروەها غاندی هەبو کەجەماوەر دەیان پەرست ، سەرکردایەتی خۆیی بەسەر

کۆنگرەکەو ، ژیانی سیاسی هیندستان دا جێگیر کرد بو ، دیسانەوە گەلێك لەپێشەواکان کە لە بەندیخانەکاندا هاتبونە دەرەوە ، وە بەتاوانی دەسیسەو موئامەرە لەکاتی حوکمی عورفیدا گیران ، و بۆ ماوەیەکی دورو درێژ حوکوم دران ، هەر کە بەخشران ، هاتنە دەرەوە لەبەندیخانە گورج لەکۆنگرەکەدا ئامادەبوون ، هەروەها جووتە برا (علی) کەبەناوبانگ بوون ، کەماوەی خۆیانیان لەبەندیخانەدا تەواوکرد ، ئەم دوانەش لەکۆنگرەکەدا ئامادەبوون.

لەساڵی ئایندە لەکۆبوونەوەی کۆنگرەکەدا ، بریاردرا کەبەرنامەکەی غاندی بەکاربهێنریت کەبریتیبو ، لەیارمەت نەدان ، و کۆمەك نەکردن بەحوکومەت ، کەلەپێشدا یەکەم جار لە دانیشتنێکی کە لە(کلکتا) پێك هات پێشنیار کرا بوو ئنجا لەکۆبوونەوەی ساڵانەدا لە(ناغبور) بەستـرا بریاری لەسەردرا.

شێوازی تێکۆشان تەواو ئاستیانە بوو ، هیچ زۆرەملی تێدا نەبوو ، مەبەس تیایدا یارمەت نەدانی حوکومەتەکە بوو لەبەرێوەبردن ، و چەوساندنەوەی هیندستاندا ، یەکەم هەنگاو لابردنی نازناوەکان بوو (الألقاب) کەحوکومەتی بێگانەی بەخشی ، ونەویستنی فرمان و جێگەی رەسمی ، و خوتێ نەگەیاندن (مقاطعة) لەپارێزەرەکان (محامی) وەمودەعی دادگاکان و قوتابخانەو کۆلیجەکانی سەر بەحوکومەت ، و ئەنجومەنە نوێکانی کە لەئەنجامی ئیصلاحاتی (مونتاجو شلمسفورد)ەوە دروست بو بون. هەنگاوی ئایندەش نەچونە ناو خزمەت گوزاری شارستانی ، نەکردنی سەربازی ، و باج نەدان یوو، لەهەنگاو باشەکانیش بایەخ دان بەتەشیو خەرەك ، وە لەجیاتی دادگاکان پەنا ببرێتە بەر بریاردانی پیاو ماقول (التحكيم الاهلی) وە لەهەمو هەنگاوەکان بەئەنجامتر یەکێتی نێوان هیندوس ـ و موسلمانەکان ، نەمانی باری ئاقەروزکراوەکان یوو.

دیسانەوە کۆنگرەکە دستورەکەی خۆیی گۆری تاکو بۆ کاروباری بەکەلك رێ بدرێت بەجەماوەر بچنە ناو کۆ نگرکەوە.

کۆنگرە نوێکە ، جیاواز بوو لەکۆنگرەکەی پێشوو ، لە واقیعدا ئەم گۆرانگار یەشتێکی تازەی داهێنراوبوو بزوتنەوەی (ساتیاکراها) لەخوارووی ئەفەریقادا لەچوار چیوەیەکی تەسك دابوو ، ئەم تێکۆشانە زۆرکەوت لەسەر

خەلك بەتايبەتی پارێزەرەکان (محامی) کەداوایان لێ کرا ئیش نەکەن ، وە قوتابیەکان ، قوتابخانە ، و کۆلیجەکان بەجێبێلن ، زۆر زەحمەت بوو کە بریار بەسەر حیاوازیو ، چاکەی ئەم بزوتنەوەیەدا بدرێت ، چونکە ئەم جۆرە بزوتنەوەیە بەراورد نەدەکرا ، چونکە کەم چەشنە بزوتنەوەیە پێشتر هیچ نەبو بو ، بۆیە شتێکی سەیر نەبو کەدەبینین پێشەوا کۆنەکانی کۆنگرەکە دەترسان ، و دوو دڵ دەبوون.

(تلاك) مرد ، ئیتر لەپێشەوایانی کۆنگرەکە کەس بە(غاندی)یەوە نەما لەرۆژانی سەرەتای تێکۆشانیدا تەنیا (موتیلال نەهرو) نەبێت ، بەلام هەلوێستی کابرایەکی سادەی کۆنگرەکە وەزەلامێکی شەقامەکان ، و رۆلەی گەلەکە ، هیچ دوو دلی ، و رارایی تێدا نەبو ، چونکە (غاندی) بەبیرو باوەری یارمەت نەدان ، و کۆمەك نەکردنی ئاشتی ئامێزانە شەیدای کرد بوون ، وە کردبوویان بەئینجیلی خۆیان ، موسلمانەکانیش لەوانی کەسوورتر بوون. لەواقیعدا لیژنەی خەلافەت کەوا (علی) جووتە برا سەرکردەیان دەکرد ، بڕیاریان لەسەر بەرنامەکەی (غاندی)دا پێش ئەوەی کۆنگرەکە خۆی بریاری لەسەر بدات ، ئیتر خێرا سەرکەوتنی بزوتنەوەکە لەگەل ئەوپەری گەرم و گوری جەماوەر ، و بەپەرۆش بوون بوێ پالی نابە پێشەوا کۆنەکانەوە کەبچنە پاڵ بزوتنەوەکە.

لەم نامانەدا ناتوانم چاکیو خراپی ئەم بزوتنەوە تازەیە شێکەمەوە چونکە ئەمە ئیشێکی گرانە لەوانەیە بەلای هەموو کەسێکەوە زەحمەت بێت ، مەگەر تەنها لای خاوەن بزوتنەوەکە ، کە (مهاتما غاندی)ە زحمەت نەبێت لێرەدا هەر ئەوەندمان بەسە کەبەچاوی کابرایەکی بێگانەو ، دوور لێیەوە سەیری بکەین ، تا هەوڵ بدەین لەهۆی خێراتەشەنەکردنیکردن بکۆڵینەوە.

باسی نەبوونی ، و تەنگانەی ئابوریم بۆ کردیت کەپالی کێشا بەسەر جەماوەردا لەگەل خراپ بوونی ، وەزع و بار کە لەچەوساندنەوەوە ، لەلایەن بێگانەوە پەیدا بو بو ، لەگەل بەرزبوونەوەی راژەی بێئیشی لەنێوان چینە مام ناوەندیەکاندا. چارەسەری ئەم هۆیە چیە؟ پەرەسەندنی هوشیاری ، بیرورای نەتەوایەتی چاوی خەلکی کردەوە ، بۆ پێداویستنی گەیشتن بەئازادی سیاسی. چونکە بەئازادی شادبوون ، بەتەنیا هەست بەریسوا بوون کردن ، و پشت بەستن بەبێگانە ، بەندایەتی کردنی ، نایەتە

دی ، دیسانەوە هەرنەك لەبەر ئەوەی کەمافێکی سروشتی خەلکەکە پێویستە بسەندرێت وەکو (تلاك) و تی بەلاَم سەبارەت بەوەی کەشێوازو ، رێبازێکـە بۆ سوك کردنی گرانباری هەژاری کە بەئەستوی میللەتەوەیە کەوابـو چۆن بەئازادی شاد دەبـین؟ دیارە ئازادی بەمل کەچی ، و ئـاوات خـواسـتـن نایەتەدی ، ئنجا بە تەواوەتی روون بوەوە کەرێبازی کۆنگرە کۆنەکـەکـە بریتیبو لەبێزاری‌دەربرین ، و پارانەوە کەهیچ دادێك نادات ، دیسانـەوە جێی شان و شەرەفیش نییە بۆ میللەت ، و لەبەندایەتی رزگاری ناکـات ، ئەم رێبازانە پێش ئەمرۆ سەرنەکەوتن لەدەستکەوتـنـی ئـازادیـدا ، وەیـا بەقایل کردنی ، و بێسەلماندنی چینە فەرمان رەواکان کەواز لەدەسەلاتیـان بێنن! بەرلستی مێژوو فێری‌کردوین کەمیللەتان ، و چینی بەندەکان ئازادی خۆیانیان دەست نەکەوتوە بەشۆڕشی توندو تیژو ، یاخی بوون نەبێت.

ئیتر یاخی بوونی چەکدارانە لەگەل باری هیندستاندا ناگونجـێـت ، چونکە میللەتە کە بێچەك بوو ، و نەی دەزانی چەك بەکـاربـێـنـێـت ؛ سەرەرای ئەمەش ئەوسا بەچەك بەکژدا چوونی بەریتانیا سەرکەوتن مسۆگـەر ناکات بۆ هیندستان ، یاخی بوونی چەکدارانە بۆ سوپاکان باشە نـەك بـۆ میللەتی بێچەکی راوەستاو بەرامبەر هێزە پر چەکەکاندا ، بەلاَم کوشتنـی چەند کەسێك ، وەیا ئەفسەران ، و بۆمبا هاویشتن ، و دەمانجە تەقـانـدن ئەمانە رێبازێکی بەرەو نابووت بوونە ، ئیتر میللەت روو بـکـاتـە ئـەم کردارانە شتێکی بێمانـایـەو سوك و رسـوای دەکـات ، چـونـکـە کـار لەحوکومەتێکی بەهێزی رێك و پێك ناکات ، گەرچی تەنها هەندێ کەس. دەترسێنێ ، هەروەکو لەپێشدا پێم وتیت لەم جۆرە تۆقـانـدنـە تـاکـیـە (الأرهاب الفردی) شۆڕشگێرەکانی روس وازیان لێهێنابوو.

ئنجا چ رێبازێك بگرێتەبەر؟ کەشۆڕشی روسیا سەرکەوت لەدروست کـردنـی حوکومەتێکی کرێکارانەدا ، پشتی بەتێکۆشانی میللەت بـەسـت کـەسـوپـا پالپیشتی بوو ، بەلاَم سۆڤیت لە روسیادا سەرکەوتن لەکاتێـکـدا ولات ، و حوکومەتە کۆنەکە شرورببو بون لەئەنجامی جەنگەکەدا ، هێزێـکـی زلـیـان لەبەردەمدا نەبوو ، سەرەرای ئەمەش لەهیندستاندا کەس نەبوو لـەبـابـەت روسیای مارکسیەوە هیچ بزانێت ، وەیان وەکو روسیا بیربکاتـەوە چـەنـد کەسانێکی کەم نەبن.

بەم جۆرە رێی دەربازبوون نەبو ، لەبار ، و وەزعەکەی کەلەمۆزەدا نەبوو لەگەل بەندایەتیە سەختەکەدا ، ئیتر ئەوی هەستێکی ناسکی بیوایە بێزار دەبوو ، تاکو (غاندی) پەیدابوو ، وەبەرنامە ئاشتی ئامێزیانەکەی خوین پێشکەش کرد ، وە ئەو دەرسەی ئیرلاندە فێری بوبو ، فێری ئیمە مانانیش گرد ، لەبابەت پشت بەخۆبەستن و ، خۆ بەهێزکردنەوە ، وە بەتەواوەتی رادەی کاریکەری ئەمە لەتین هینان بو سەرحوکومەتەکە دیار بو چونکە حوکومەتەکە بەزۆر ، یان بەخوا هیشت تارادەیەکی زۆر پشتی بەیارمەتی ، و کۆمەکی هیندیەکان قایم بوو ، ئەگەرئەم یارمەتی و کۆمەکەی لێبیرێت ، لەوانەیە حوکمەتەکە بروخێت یا تێکۆشانیش نەگەیشتبێتە ئەو سنورە دورە. بێگومان جێی چەندو چوون نیە کوتەکێکی بەکار بوو بۆتین خستنە سەر حوکومەتەکەو ، زیادبوونی هێزی میللەت ، تێکۆشانە کەئاشتی ئامێز بوو ، بەلام بێکەلك و بێئەنجام نەبوو. ئەگەر بزوتنەوەی (ساتیاکراها) زۆرەملی تێدا نەبووبێت بەلام بەرامبەر بەدەست درێژی بەتوندی دەوەستێتەوە ، ئەگەر ناوەروکەی ئاشیتانە بوبێت ، بەلام لەهەموو جەنگەکان شارستانیتر ، و ئەنجامێکی دوری هەبوە لەشلوق کردنی بناغەی دەولەتەکەدا ، هۆیەکی بەکار بوو لەوروژاندنی گەلدا ، لە پێناوی ئیش کردن و تێکۆشاندا ، بەتەواوەتی لەگەل سروشتی بلیمەتی هیندی دادەگونجا. باشترین چاکەمانی دەردەخست ، وەکراسی تاوانی لەبەردوژمنمان دەکرد ، لەو ترسەی کەتوشمان هاتبو رزگاری کردین ، دەنگی دلێرکردین کە گفتوکو لەگەل خەلکدا وەکو هاوشانێك بکەین ، ئەوی لەدلماندایە نەی شارینەوە ، بیرکردنەوە ، و مێشکیساق کردین ، رێزگرتنی ئازادی بەگفتار ، بەرەفتار تێدا پەروەردە دەکردین لەگەل بەخودا رابەرموون ، و ئازایەتیدا. تێکۆشانی ئاشتیانە ، ئنجا لەخرایەی پەیدابوونی ناکۆکی شەخسی و قینەبەرایەتی نەتەوایەتی کەبەم جۆرە تێکۆشانانەوە هەیە پاراستینی وەبەئاسانی گەیاندینیە دوا رێکەوتن.

لەکاتی ئەم تێکۆشانەدا حوکومدتەکە چەند ئەنجومەن و لیژنەیەکی نوێی پێك هێنا بەپێی نەخشەی (مونتاچوشلمسفورد)ی ئیصلاحی. مام ناوەندیەکان کەبەخۆیانیان دەوت ئازاد بوەکان بەئەندامێتی ئەم ئەنجومەنانە

قایل بوون ، ئیتر بوون بەوەزیر ، و فەرمانبەری گەورە ، و تێکەڵ بەحوکومەتەکە بوون بۆئەوەی کەمیللەت پشتگیریان بکات ، بەڵام ئەندامانی کۆنگرەکە نەچوونە ناو ئەم ئەنجومەنانەوە ؛ رۆڵەکانی گەل زۆر روویان تێنەکرد ، بەڵکو روویان کردە تێکوشان لەدەرەوەی ئەم ئەنجومەنانە ، لەناو شارەکان و لادێکاندا . یەکەم جار ئیشکەرانی ناو کۆنگرەکە دەستیان کرد بەگەڕان بەناو دێهاکاندا ، وە دامەزراندنی گەلێك لێژنە لەوێدا بۆ وشیار کردنەوەی لادێییەکان.

ئیش و کار بەم جۆرە دەرۆیشت ، تاکو لەدیسەمبەری ۱۹۲۱ز. دا بەگژداچونێك رووی دا لەئەنجامی هاتنی جێنشینی پادشادی بەریتانیا بۆ هیندستان ، ئەوانەی سەر بەکۆنگرەکە بوون نەچوون بەبیرییەوە ، ئنجا حوکومەتیش دەستی کردبەگرتنی خەلکێکی زۆر ، بەندیخانەکان پڕ بوون لەگیراوی (سیاسی). ئەمە بەلای زۆربەمانەوە سەرەتای تاقیکردنەوە ، و شارەزابوونی ژیانی بەندیخانەکان بو ، لەبەر ئەوەی سەرۆکی کۆنگرەکە گیرابو ، ئەندامێکیتر (حکیم اجمل خان) جێی ئەوی گرتەوە ، سەرۆکایەتی دانیشتنەکەی شاری (احمد آباد)ی کرد. بەلام (غاندی) نەگیرا . بزوتنەوەکە بەجۆرێك پەرەی سەند ، تەنانەت ئەوانەی کەخۆیانیان پێشکەش کرد بو ، بۆگرتن زیاتر بوو لە ژمارەی ئەوانەی کەبەراستی گیرابوون!

لەئەنجامی گرتنی پێشەواکان ، و سەرکردەو ئەوانەی ئیشکەرن و لەرووی سیاسییەوە بە ناوبانگن ، گەلێك کەسی تریش گیران کەشارەزاییان نەبو ، و ئاگاداری هیچ نەبوون ، وە ناوبانگیان باش نەبوو (تیایاندا بو جاسوس و پەیوەندی بەپۆلیس نەهێنی یەوە هەبوو) لەناو بزوتنەوەکەدا ، ئەمە بوو بە هۆی ئاژاوە ، و زۆرەملی. لەسەرەتای ساڵی ۱۹۲۲ز. دا لە (شەری شورا)دا نزیك (جوراخبور) لەنێوان تاقمێك لەفەلاحەکان و پولیس دا شەرێك رووی‌دا ، فەلاحەکان پولیسخانەکەیان سوتاند کەهەندی سەربازیشی تێدابوو ، (غاندی) لەم کارەساتە ، و کارەساتی تری جیا جیا تورە بو ، ترسا کەوا ئاژاوە ، و زۆرەملی بچێتە ناو بزوتنەوەکەوە ، پێشنیاری بۆ لێژنەی راپەراندنی کۆنگرەکە کرد ، ئەوە بەشەلاببرێت ، کەداوای

سەرپێچی کردنی یاساکان دەکات کۆنگرەکە لەمەی جێبەجێ کرد. (غاندی) لەمارتی ١٩٢٢ز. داگیرا ، و نێررا بۆ دادگا ، شەش ساڵ حوکمیان دا.

بەمە قۆناغی یەکەم ، لەقۆناغەکانی تێکۆشانی ئاشتیانە کۆتایی هات.

---

١) (کۆنگرەکە): وەیا (مؤتمر) ئەو حیزبەیە کە (غانـــدی) دوای ئـەوەی لەخوارووی ئەفەریقا گەرایەوە بۆ هیندستان دروستیکـرد ، تـــائـێــســتـــاش لەهیندستاندا دەوری نیشتمان پەروەری دەبینێت. وەرگێر

# شۆڕشە ئاشتیانە کە لە هیندستاندا

## ١٧/مایس/١٩٣٣

زیاد لەهەمو ولاتێکی تر لەبابەت هیندستان ، و رابوردوویەوە گەلێک نامەم بۆ نوسیت بەڵام رابوردوو ئاوێتەی ئەمرو دەبێتەوە ، هیوام وایە ئەم نامەیەمان بگەیەنێتە چیرۆ کی هیندستان کەئێستە دەی بینین. هەندێ کارەساتی ئەم نزیکانەت بۆ باس دەکەم کە هێشتا لەمێشکماندایە ، و نەمردووە ، لەراستیدا کاتی نوسینی ئەم کارەساتانە نەهاتووە چونکە هێشتا تەواو نەبوون بەئەنجام نەگەیشتوون ، و کۆتاییەکانی شار راوەن گەرچی چیرۆکی مێژوو دوایی نایەت.

لەدەور ، و بەری کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ز. دا ، حوکومەتی بەریتانیا بڵاوی کردەوە کە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە بۆ هیندستان دەنێرریت ، تاکو پێشنیازی پێویست دانێت بۆ ئیصلاحاتەکانی ئایندە ، لەگەل گۆرانکاریەکان لەدام ودەزگای حوکومەتدا ، فەرمان ڕەوا دیبلوماسیەکان لەهیندستاندا لەم بڵاوکردنەوەیە بوون ، و نەفرەتیان لێکرد ، دیسانەوە کۆنگرەکەش بەرهەڵستی کرد ، چونکە ناو بەناو هێنانە پێشەوەی بیروڕای یێك هێنانی لێکۆڵینەوەکان بۆ زانین: کە ئایا هیندستان ئامادەیە بۆ حوکومرانی کردنی خۆ بە خو (الحکم الذاتی) یا نەی هەمیسان کۆنگرەکەش ئەمەی بە دڵ نەبوو ، بەریتانیا ئەم شێوازەی کرد بو ، بە بەهانەیەك تاکو زۆرترین ماوە بتوانێت لەهیندستاندا بمێنێتەوە ، زۆر لەمێژە کۆنگرەکە داوای چارەنووسی بۆ هیندستان دەکرد ، وەبەمافێکی هیندستانی دادەنا ، هەروها هاوپەیمانەکانیش لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمەوە ، بەمافێکیان دادەنا بۆی. وەدان یان بەمافی بەرلەمانی بەریتانیادا نەدەنا ، کە

بەئارەزووی خۆی لەهیندستاندا حوکومرانی بکات.، وەیان مافی چارەنووسی ئەوی هەبێت. بۆیە کۆنگرەکە بەرهەڵستی ناردنی ئەم لیژنە بەرلەمانییەی کرد ، بەڵام مام ناوەندییەکان کەبەرهەرڵستی لێژنەکەیان دەکرد سەبارەت بەچەند هۆیەکی تر بو وگرنکەکەیان ئەوە بو لیژنەکە ئەندامی لەهیندیەکان تێدانەبوو ، بەلکو هەر تەنیا بەریتانیا بییەکان بوون ، بەم جۆرە سەرەڕای هۆی جیاوازییەکاتی کەوا هەیئەتەکان بەرهەرڵستی لیژنەکەیان پـێدەکـرد ، راستیە گرنگەکە ئەوەیە کەهەموو دانیشـتـوانـی هـیـنـدسـتـان بـەمـام ناوەندیەکانیشەوە ، هەرەشەیان لەلیژنەکە کرد ، و داوایان کرد ، کەخـۆی تێنەگەیەنن.

لەدیسەمبەر ١٩٢٧ز. دا کۆنگرەکـە ، لـە (مـداس)دا کـوبـوەوە ، و بریاریدا ئەو ئامانجەی کە لەپێناویدا تێدەکوشیت ، هیناتەدی سەربەخۆیی هیندستانە ، ئەمە یەکەم جارە کە ئەم مەبەسە بڵاودەکاتەوە ، لەدوای دوو ساڵ ئەم مەبەسە بوو بەئامانجی گەورەی کۆنگرە نیشتمایـتـەکـەی کـەلـە (لاهور)دا بەسترا ، ئنجا کۆنگرەو کۆبوونەوە یەکیان پێك هێنا ، هەمـوو حیزبەکانی تێدا بوو ، ماوەیەکی کورت ژیا بەڵام پر بو لەچالاکی.

لێژنەکەی بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٨ز.دا کەوتە کار بـەڵام کـەس گـوێی نەدایە ، وە بۆ هەر لایەك دەچوو ، بەخوپیشاندان (المظاهرە) بەپیرییەوە دەهاتن لیژنەکەش ناوی (لیژنەی سیمون) بەناوی سەرۆکەکەیەوە ، میللـەت بەبانگەوازی (سیمون بکەربرەوە) پێشوازیان کرد ، گەلـێـك جـار پـۆلیس خۆپیشاندا نەکانی بڵاوەبیدەکرد تەنانەت (لالالاجیـت ری) لـە (لاهـور)دا لێیادا ، ئنجا دوای چەند مانگێك کەمرد پزیشکەکان لەو باوەرەدا بون کـە لەلێدانی پولیسەوە مردوە ، ئەما نە هەموو رقی خەلکیولاتەکەیان هەلساند.

لەم کاتەدا کۆنگرەکە نوێنەری هەموو حیزبەکان بوو ، تەقەلای دا کـە دەستورێك بۆ هەموو ولاتەکە دانێت ، وەکێشەی تاییفەگەری جـێبـەجـێ کات راپۆرتێکیان نوسی بریتی بو لەپیشنیارەکان بو دەستورەکە و کێشـەی تایەفەگەری ، بەم راپورتە دەوترا راپۆرتەکەی نهرو ، بەناوی بـانـدیـت موتیلال نهرو ە،کە سەرەکی ئەو لیژنەیە بو کە راپۆرتەکەی نوسیبو.

لەکارەساتە گرنگەکانی تر لـەم سـاڵـەدا ، هـێـرشـە زانـە کـە بـوو کەفەلاحەکان لە (باردلو) لە (کوجارت)دا پێی هەلسان ، دژی ئەوباجەی کە

حوکومەتە کەبریاری دابوو ، وەسەپاند بووی بەسەریاندا ، لە(کوجارت)دا هیچ دەرەبەگێکی گەورە نەبوو ، وەکو لەناو چەیەکگرتوەکاندا هەبوو ، بەڵکو فەلاحی ساویلکە هەبوون ، ئەم فەلاحانە کەوا (سارداربانل) پێشەوابی دەکردن ، ئازایەتیەکی بێئەندازەیان نواند ، و سەرکەوتنێکی گەورەشیان دەستکەوت.

کۆنگرەکەی کە ساڵی ١٩٢٨ ز.دا لە(کلکتا)دا بەسترا بریاری لەسەر راپۆرتەکەی (نهرو)دا ، کەپیشنبازی کرد بوو ، بۆ دانانی دەستورێکی ، وەکو دەستوری دەولەتەکانی (دومنیون) واتە (یەکیتی گەلانی سەر بەبەریتانیا) یەکەم جار بریار لەسەر ئەمەدرا ، کۆنگرەکە ماوەی ساڵێك مولەتی حوکومەتی بەریتانیایدا ، تاکو دانیپێدابنیت ، وپیسەلمێنێت ، ئنجا ئەگەر بەریتانیانەی سەلماند ، ئەوسا کۆنگرەکە سەربەخۆیی ئیعلان دەکات ، ئەمە وای گەیاند کەکۆنگرەکە ، و ولاتەکە بەجووت بەرەو تەنگ و چەلەمە دەچن.

بەلام کرێکارەکان وەرسیگرتنی ، و وروژان چونکە هەوڵ درا کرێ کەم کرێتەوە ، کرێکارەکانی (بومبای) زیك و پیك بوون ، بۆیە گەلێك مان گرتن پەیدابوو ، سەد هەزار کریکار زیاتر بەشداری تێدا دەکرد ، بیرورای سۆشیالیستی ، (وەتارادەیەك شیوعیتی) لەناویاندا بلاو بوبوەوە حوکومەت لەم گۆرانکاریە شۆرشگیرانەیە ، لەناو کرێکارەکاندا ترسا ، لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٩ ز.دا (٣٢) سیودو لەسەرکردەی کرێکارەکانی گرت ، وەبەدەسیسە ، و موئامەرەکردن لەدەولەت ، تاوانباری کردن ، ئەم موئامەرەیە لەهەموو لایەکی جیهاندا بەموئامەرەکەی (میروت) بەناوبانگ بوو.

دوای تەواوبوونی موحاکەمەکە ، کە چوار ساڵی خایاند حوکوم درا بەسەر هەمو تاوانبارەکارەکاندا بەگرتن بو ماوەیەکی دورو دریژ. سەیر ئەوەیە لەم موحاکەمەیەدا ، تاوانبارەکان ، تاوانی هەستان بەکردەوەی شۆرشگیرانە و شێواندنی ئاسایش ، و باوەرگردن بەبیرورای تایبەتی ، وتەقەلادان بۆ بلاوکردنەوەی درایە پالیان ، لەدوای دوبارەکردنەوە (الاستئناف) ئەم حوکمانە زۆر کەم کرانەوە.

لەو جۆرە چالاکیو کردەوانەی کە هەندێ کەس لەژێرەوە پێی هەڵدەستان وەجاروبار بەئاشکرا دەردەکەوت ، بروایان بەپێداویستی پەیدا بوونی شۆرش بەزۆر هەبوو. وەزۆربەی ئەمە لە بنغال داپەیدا بوو ، ودتا رادەیەك لە(بنجاب) ، وە کەمێکیش لەناوچە یەکگرتوەکاندا. حوکومەتی بەریتانیا بەگەلێك جۆر هەوڵی دا ئەم چالاکی ، و کردەوانە بفەوتێنێت ، و نەیهێڵێت ، بۆیە گەلێکی بەتاوانی موئامەرەکردن دا بەدادگا ، هەروەها یاسایەکی تایبەتی دانا بە(پەیرەوی بنغال) دەناسرا بەپێی ئەم یاسایە حوکومەت بۆی هەبوو کە ئەگەر بیەوێت هەر کەسێك بگریت ، و بیخانە بەندیخانەوە بەبێ موحاکمەکردنی ، بەپێی ئەم پەیرەوە بەصەدان لە رۆڵەکانی بنغالی گرت وەلەبەندیخانەی توندکردن وەپێیان دەوتن (دەست بەسەر) ، ئیتر دەست بەسەرکردنەکەیان ماوەیەکی تایبەتی نەبوو ، ئەوی شایانی باسە ئەم پەیرەوە لەسەردەمی حوکومەتێکی کرێکارانە لەبەریتانیادا دانرا.

ئەم شۆرشگێرانە بەچەند کردەوەیەکی تۆقاندن هەستان بەتایبەتی لەبنغالدا گرنگ ترینی ئەم کردەوانە سێانن: یەکەمیان کوشتنی ئەفسەرێکی پۆلیسی بەریتانیایی بوو لە (لاهور) داهونکە وایان دەزانی کە(لالالاجیت ری) دابو لەکاتی خۆپیشاندانەکەی دژی لێژنەکەی (سیمون)دا ، دوەمیان بۆمبایەکیان دا بەپێنای ئەنجومەنەکە دا لە (دلهی) زیانێکی وای نەدا ، مەبەسیش لەمە نانەوەی هەرایەکی گەورەو ، وروژاندنی ولاتە کە بوو. سێیەمیان رووداوێك بوو کەلە (شیتاغونغ) سالی ۱۹۳۰ ز.دا قەوما لەکاتی یاخی بوونە شارستانیانەکەدا (العصیان المدني) ، کەوا هێرشێکی بەتین برایە سەرجبەخانە ، و هەندێك سەرکەوتن دەست کەوت. حوکومەت چەندی توانی هەوڵی دا ئەم بزوتنەوەیە سەرکوت کات جاسوس و گزیری (مبلغ) بڵاوکردەوە تادەنك و باسی بۆبهێنن ، ئنجا هەستا بەگرتنی خەلك و موحاکمەکردن بەتاوانی موئامەرە (تەنانەت ئەوانەی لەدادگاکاندا بێتاوان بوون ، بەپێی پەیرەوە تایبەتیەکە گیرانەوە) هەندێك لەمەلبەندەکانی رۆژهەلاتی بنغال بەسوپا داگیرکران هاتوچو ، وسواربوونی پایسکل ، و لەبەرکردنی جل و بەرگ بەئارەزوو قەدەغەکران ، باجێکی زۆر خرایە سەر

شار ، و دێهاتەکان بەتێکرایی سەبارەت بەوەی کەوەکو پێویست ئاگاداری پولیسیان نەکردوه.

لە(لاهور)دا لەکێشەیەك لەکێشەکانی موئامەرەدا لەساڵی ۱۹۲۹ ز.دا یەکێك لەگیراوەکان کەناوی (جانندرانات داس) بوو سەبارەت بەرەفتاری خراپی بەندیخانە کەلە خواردن توراو مانیگرت ، شەصت و یەك رۆژ ئەم لاوە هیچی نەخوارد تاکو مرد. هیندستان بەمە زۆر غەمبار بوو ، کاری لەهەستی میللەت کرد هەروەها خنکاندنی (باغات سنخ) لە سەرەتای ساڵی ۱۹۳۱ ز.دا هەر هەمان ئەنجامی هەبو.

با بگەرێینەوە سەرەو کاری سیاسەتی کۆنگرەکە ، ئەو ساڵە تێپەری کەوا کۆنگرەکەی کە لە(کلکتا) بەسترا بوو ، دایبوو بو حوکومەتی بەریتانیا. لەکۆتایی ساڵی ۱۹۲۹ ز.دا حوکومەتی بەریتانیا هەوڵیدا ، ئەو ئەنجامە سامنەکە نەهێلیت کە لە ئاسووە دەردەکەوت ، ئیتر گفتێکی بێ سەرو ، پێی درکاند دەربارەی چارەسەرکردنی بار ، و وەزعەکان ، سەرەرای ئەمە کۆنگرەکە ئامادەیی خۆیی ، بۆ یارمەت دان و کۆمەك کردن دەربری ، بەچەند مەرجێکی دیاردی ، کە حوکومەتەکە ئەم مەرجانەی بەدل نەبوو ، ئنجا کۆنگرەکەی کە لە(لاهور)دا لەدیسەمبەری ۱۹۲۹ز. دا بەسترا بۆ هیچ جاری نەما بریاری داوکردنی سەربەخۆیی بدات ، وەپێناویدا تێبکۆشیت.

بەم جۆرە بەهاتنی ساڵی ۱۹۳۰ز. تارمایی کارەساتەکانی ئایندە ، و ئامادەبوون بۆ یاخی بوونیشارستانیانە هاتەپێشەوە ، ئیتر هەبێئەت ، و ئەنجومەنەکانی یاسادانان کەس خۆیی تێنەگەیاندن وەموقاتەعەکران ، ئەندامانی کۆنگرەکە وازیان لێهێنان و لێیهاتنە. دەرەوە ، لە۲٦ ینایردا میللەت پەیمانیدا کەسەربەستی وەرگریت ، بۆ بڵاوکردنەوەی ئەمە لەشار و لادیکاندا کەلیك کوبوونەوە کرا ، ئیتر روزی ۲٦ ینایر کرا بەرۆژی سەربەستی لەمانگی مارتدا (غاندی) دەستی کرد بەکشانە بەناوبانگەکەی بەرەو (داندی) لەکەناری دەریا ، بۆ سەرپیچیکردن لەیاسای خۆی تیایدا ، (غاندی) باجی خۆی هەڵبژاردو کردی بەسەرەتای هێرش بردنەکەی چونکە گرانباری ئەم باجە زۆرکەوت لەسەر هەژارەکان ، بۆیە بوبوە خرابترین باج کەلەمیللەت سەندرا ت.

لەناوەراستی مانگی نیسانی ١٩٣٠ز. دا هێرشی یاخی بوونەشارستانیەکە (العصیان المدني) گەیشتە ئەوبەری ، ئیتر یاخی بوونەکە ، لەهەموو لایەکدا هەر بەسەرپێچیکردنی یاسای خۆی کەوە ، نەوەستا ، بەڵکو یاساکانی تریشی گرتەوە ، یاخیبوونە شارستانیەکە سەرجەم هەمو ولاتەکەی گرتەوە. دیسانەوە بەریتانیا یاسای تایبەکاری دادەنرا بۆ سەرکوت کردنی بەڵام ئەم یاسانەش دوچاری یاخیبوونە شارستانیانەکە دەبوون ، ئیتر حوکومەت دەستی بەگرتنیکی فراوان ، و موحاکەمە و تەقەکردن لەخەلکی بێدەرەتان کرد ، وەدەستی بۆ لیژنەکانی کۆنگرەکەش درێژ کرد ، وەدەنگی رۆژنامەی خەفەکرد ، جاودیریەکی توندی دانا لەکەل لیدان و کرتن دابو ماوەیەکی زۆر. هەرکە یاسایەکی تازە دادەنرا بەربەرەکانی و بەرهەلستی دەکرد ، دیسانەوە میللەتیش قوماش و گەل وبەلی بەریتانیایان نەدەکری ، ژمارەی گیراوەکان گەیشتە صەد هەزار کەس ، ئیتر شۆرشە ئاشتیانەکە شوێنێکی ئاشکرای هەبوو لەبیروباوەرو دەرونی جیهانیدا.

لێرەدا سێ نوختە هەیە دەمەوی بۆت ئاشکرا کەم ، یەکەمیان ئەو وشیاریە سیاسیە بەرزە بوو لەناوچە سنوریەکانی سەروو رۆژئاوادا هەبو ، لەسەرەتای تێکۆشانەکە دالەمانگی نیسانی ١٩٣٠ز. لە(بشاور)دا تەقەلە خەلکی بێدەرەتان کرا ، هاونیشتمانیانمان لەسەر سنورەکان بەدرێژایی سالەها ، نەبەردو ئازایانە شانیان دایە بەر جۆرەها کرداری زۆر درندانە شایانی سەرسامبوونێکی دوو سەرەیە ، کەخەلکی سەر سنورەکان بەپێی سروشتیان کاروباری ئاشتیانەیان نەدەزانی ، و لێیەوە دوربون و بەشتێکی بجووك هەلدەچون کەچی سەرەرای ئەمە خۆیان راگرت ئاشتیان پاراست ، ئەمە شایانی بایەخ پێدان و سوپاسە بۆ میللەتێك تازە دەستی دابێتە سیاسەت ، لەگەل ئەمەشدا هاتنە ریزی پێشەوە ، و ئازیەتیەکی بێ ئەندازەیان نواند.

نوختەی دوەم لەکارە ساتە سامناکەکانی ئەم ساڵە ، دەرکەوتن و پەیدابوونی وشیاری ئافرەتانی هیندستان بوو ، لەوانەیە مروڤ بروانەکات کە بەصەد هەزاران ئافەرەت مالەکانی خۆیانیان بەجێهێشت و ، بەجەیان لابرد ، و هاتنە شەقام و بازارەکان شان بەشانی پیاوان تێکەکوشان ، وەگەلێك جار ئەم ئافرەتانە بەسەر زۆربەی پیاواندا سەردەکەوتن.

بوحنەی سیدمیش لەپەیدابوونی هۆ ئابوریەکانەوە بۆ بەلای فەلاحەکانەوە لەکاتی پێشکەوتنی بزوتنەوەکەدا ، چونکە سالی ١٩٣٠ز. سالی ، و نەهاتی بوو لەجیهاندا ، بەروبومەکانی کشتوکان نرخەکانیان زۆر کەمی کرد ، ئنجا فەلاحەکان تووشی فات قری بوون چونکە دەرامەتیان لەسەر فرۆشتنی کشتوکالیانە ، بۆیە نەدانی باج بۆ ئەمان کارێکی باش بوو ، وەبەرهەلستی کردنەکەش تەنها مەبەسێکی سیاسی روتی دووری نەبوو بەلکو لایەنە ئابوری‌یەکەی راستەوخو بزوتنەوەکەی لەفەلاحەکان نزیك کردەوە ، دەرەنگ و روخسارێکی چینایەتی دا بەبزوتنەوەکە ، چونکە ناکۆکی خستە نێوان چینی خاوەن مولك و فەلاحەکانەوە بەتایبەتی لەناوچە یەکگرتوەکان ، و هیندستان ، و هیندستانی رۆژئاوادا.

لەکاتێکدا کەیاخی بوونە شارستانیەکە ، لەهیندستاندا ئەوپەری هێزی هەبوو ، حەکومەتی بەریتانیا لە(لندن)دا کۆنگرەی مێزی بازنەیی (المائدە المستدبرە) پێك هێنا ، بەدیمەنی مەزنی ، دەوری‌دا ، و پروباغەندە ، کێ زۆری بۆکرد ، بەلام کۆنگرەکەی هیندستان (واتەحیزبی کۆنگرەکەی هیندستانی ـ وەرگیر) .هیچ پەیوەندیکی بەم کۆنگرە (لندن)یەوە نەبو ، چونکە ئەو هیندبانەی کە لەوێ ئامادە بو بون ، حوکومەتی بەریتانیا هەلی‌بژارد بوون ، بەراستی ئەم زەلامانە بۆیە چوو بوون بۆ ئەوی تاکو لەسەر شانوی (لندن) دەورێکی ساختە ببینن، چونکە زورچاك دەیان زانی کەئیش وکاری بەکەلك لەهیندستان حویدا روودەدات ، ئنجا حوکومەتی بەریتانیا کێشەی تایەفەکەری‌و ، دووبەرەکی کرد بەپێشەنکی گفتوگوکردنەکە ، تا ئاشکرای بکات لەخەلکی بگەیەنیت کەهیندیەکان لاوازن ،وەبو ئەمە لەهەمو هیندیەکان بۆتایەفەگەری خوین ، گەرمترو کۆنەپەرستی هەلبژارد بۆ کۆنگرەکەی (لندن) تاکو هەرگیز نەگەنە هیچ رێکەوتن و ئەنجامیك لە کۆنگرەکەی (لندن)دا.

لەمارتی ١٩٣١ز.دا هودنەیەك ، وەیا رێکەوتنێکی سەرەتایی لەنێوان کۆنگرەی هیندی، و حوکومەتدا بلاوکرایەوە ، وەك پێشەکی‌یەك بۆ گفتوگۆکردن لەنێوانیاندا. ئەم هودنەیە بەناوی (غاندی ـ ایرون)ەوە ناو دەبرا ، ئیتر یاخی‌بوونی شارستانیانە وەستێنرا.
بەهەزاران گیراو بەردران ، هەروها پەیرەود تایبەنیەکانیش هەلگیران.

لەساڵی ١٩٣٠ ز.دا (غاندی) لەکۆنگرەی دوەمی میزی بازنەییدا (المائدە المستدیرة) ئامادەبوو ، توێنەری کۆنگرە هیندستانیە کەبوو. لەهیندستاندا سێ کیشەی گرنك هەبوو. یەکەمیان لەبنغال دا کەوا حوکومەت هێرشیکی توندی برد بوسەر ئەوانەی کەدەم لەسیاسەتەوە دەدەن ، بەبیانووی نەهێشتی توقاندنەوە (الأرهاب) ؛ ئنجا پەیرەوێك دانرا زۆر لەوانی پێشو توندو تیژتر بوو ، سەرەرای پەیمان نامەکەی کەلە(دلهی)دا ئیمزاو تەواوکرا بنغال هەر ئاسایشی بەخۆیەوەنەدی.

کێشەی دووەم لەناوچەی سەر سنور پەیدابوو ، وشیاری سیاسی میللەتی هان دا بۆئیش کردن ، لێرەدا رێکخراویکی ئاشتی ئامیزی مەزن پەیدابوو بەسەرکردایەتی (خان عبدالغفلاخان) جاروبار پێیان دەوترا "کراس سورەکان" بێئەوەی هیچ پەیوەندییەکیان بەسوشیالیستەکان وە یا شیوعیەکانەوە هەبێت ، بۆیە وایان پێدەوتن چونکە جلی سووریان لەبەردەکرد حوکومەت رقی لەم بزوتنەوەیە هەڵسا ، بەگەورەی دەزانی چونکە ئەمانە لەشەردا ئازاو جەنگاوەربوون.

کێشەی سێیەم لەناوچە یەکگرتوەکاندا بوو ، چونکە کرێگرتە هەژارەکان تارادەیەکی زۆر لەبێبازاری جیهان ، و کەم بوونەوەی نرخەکان پەرێشان بو بون نەیان دەتوانی کرێ کانی لەسەریانە بیدەن ، گەرچی کرێش کەم کرابوەوە ، بەڵام ئەمە کێشەکەی بەتەواوی نەفەوتاند ، کۆنگرەکە هەوڵیدا ، ببێتە هۆی جێبەجێکردنی ئەم ئیشە بەلام زۆر سەرکەوتوو نەبوو ، لە نوفمبەزی ساڵی ١٩٣١ ز.دا کە کاتی گری تەسلیم کردن هات ، بارو ، وەزع تیك چو ، کۆنگرەکە لە (اللتە آباد)ەوە دەستیپێکرد ، داوای لەخاوەن مولکەکان و گرێگرتەکان بەجووت کرد بۆ ماوەیەك لەکرێدان ، و کری وەرگرتن بوەستن ، تاکو مەسەلەی کەم کردنەوە جێبەجێ دەکرێت حوکومەت پەبەیرەویکی توندو تیژی خراپ کەلەناوچە یەکگرتوەکاندا ئەم پەیرەوە دەرچوو بۆ ،. بەرەنگاری ئەم کارە بوو ، چونکە دەسەلاتی بەحاکمی لیواکان واتە (محافظە)کان دابو کە هەموو بزوتنەوە ، و چالاکییەکی فەردی سەرکوت کەن ، دوابەدوای ئەمەش دوو پەیرەو (مرسوم) بۆ ناوچەکانی سنور دانران ، ئنجا لەئەندامانی کۆنگرە هیندستانیەکەو سەربەوان لەناوچە یەکگرتوەکاندا ، خەلکێکی زۆر گیران.

ئەمە تووشی (غاندی) هات کەلەکۆنگرە سەرنەکەوتووەکەی (لەندن) گەرایەوە لەدوا حەفتەی ئەو ساڵەدا ، (غاندی) سێناوچەی دی حوکمێکی جیاوازی (الأحکام الأستثنائیە) تێدایە ، گەلێک لەهاوڕێکانی ، لەبەندیخانەکاندان ، لەماوەی حەفتەیەکدا دووبارە کۆنگرەکە ، جاری دەست پێ کردنی یاخیبونی شارستانیانەی دا(العصیان المدنی) ، وە بڵاویکردەوە خوکومەتیش لە لایەن خۆیەوە دەستیکرد بەراونانی هەزاران لەئەندامانی لیژنەکانی کۆنگرەکەو رێکخراوە کانی کە سەربەون.

ئەم تێکۆشانە زۆر سەخت تر بوو ، لە تێکوشانی سالی ۱۹۳۰ ز ، حوکومتیش زیاتر خۆی ئامادەکرد ، وە لەتەجروبە ، و تاقیکردنەوەکانی پێشووی سودی وەرگرت ، حوکومەت روو پۆشی ، یاساو دیمەنە یاساییەکانی لابرد ، وازی لەگەڵێك لەیاسا جیاوازە تایبە کاربەکان (القوانین الأستثنائیة) هینا ، ئنجا ولاتەکەی خستە ژێر حوکمێکی عورفی لەژێر چاودیری حاکمە مەدەنیەکاندا ، ئیتر هێزی درندانەی حوکومەتەکە بەئاشکرا دەرکەوت ، ئەمە شتێکی سروشتیە چونکە هەرچەندە هێزی نەتەوایەتی زیاد بکات ئەوەندە هەرەشە لەحوکومەتە بیگانەکە دەکات ، ئەویش ئەوەندە زیاتر بەرەنگاری ئەم بزوتنەوەیە دەبێت ، وای لیدێت وار لە وشە ئاساییەکانی وەکو ئاموژگاری (وصایە)و (نیاز چاکی) دێنێت ، ئنجا وەك تەنیا پالپشتیك دەست دەداتە کوتەك ، و شەر ، ئنجا ، بەهانە و بەنابردنە بەر یاسا هەر بەجێنشینی پادشاوە نەوەستا ، بەلکو هەمو ئەفسەرێکی بچوکیشی گرتەوە ، دەیتوانی هەرچیەکی بیەویت بیکات لەپێناوی پاراستنی سەرۆکەکانیدا ، توری پولیسی نەهێنی تەشەنەی کرد ، بەشی لێکۆلینەوەی تاوان (التحقیق الجنائي) لەهەمو لایەکدا بەهێز بوو ، هەروەکو پێش ئەمە لەروسیای قەیسەریدا روویدا. هیچ جلەوگیریەك نەبو ، بۆسەر کێشی دەسەلاتیان ، وە بۆ ئارەزووی دەست رویشتنیان ، ئەگەر حوکومەت ، لەحوکمرانی ولاتەکەدا بەنابەریتەبەر رێبازی دام و دەزگای نەهێنی ، وە ولاتەکە مل کەچی ئەم دام و دەزگایە کات ، بێگومان ئەو حوکومەتە بەرەو کوتایی دەچیت ، چونکە سازمانی نەهینی لەمەلبەندی دەسیسە ، و جاسوسی ، و درو ، و توقاندن بیانووگرتن ، تومەتی درو ، و هەرەشە ، و شتی لەم بابەتەی پێخوشە ، لەم جۆرە شتانەوە پەروەردە

دەبێت و گەشە دەکات ، لەم سێ ساڵەی دواییدا خراپەی دەسەلاتی جیاواز (السلطات الأستثنائية) زلفی سەند کەوا درابوو بەڵی برسراوە بچوکەکان ، و پولیس ، و سازمانی لێکۆڵینەوە (المباحث) بوو بەهۆی روودانی شتی درندانە ، و سوکایەتی لەم سازمانەدا ، چونکە ئەو ئامانجەی ئەم سازمانە مەبەسیتی بریتی یە لەتوقاندن (الأرهاب).

لەدریژەدان بەم بابەتە دور ناروم ، بەلاَم لێرەدا دەست نیشانی دیمەنێکی گرنك لەسیاسەتی حوکومەت لەم سەردەمەدا دەکەم ئەویش بریتی‌یە لەداگیرکردنێکی فراوان لەلایەن حوکومەتەوە بۆ مولك ، و ماڵ و خانوو ، ئوتوموبیل ، و بارەی بانقەکان و لەم بابەتە کەوا هێنی چەند کەسانێك ، و رێکخراون کان بوو. مەبەسیش لەمەتی سرەواندنی چینی ناوەراست بوو کەلە کلاَنگرەکە دابوون ، وە لەو دیمەنانە دیسانەوە ، بوونی بەندێکی تایبەتی بوو کەبریتی بە لەسزادانی باوك ، و ئاموژگاری کاران (الأوصياء) کە ئەگەر رولەکان وەیا منداڵەکانیان کارێکی خراپ بکەن.

ئیتر پروپاغەندەی بەریتانیا لەم دەمەدا هیندستانی بەجوریکی گەشەدار دەردەخست هیچ رۆژنامەیەکی هیندستانیش نەی‌دەوێرا راستی بلاَوکاتەوە لەبەر سزادان ، چونکە تەنها بلاَوکردنەوەی ناوی گیراوەکان ، تاوانێك بوو ، رۆژنامەکەی لەسەر سزادەدرا.

بەلاَم گەورەترین دیمەنەکانی سیاسەتی بەریتانیا لەهیندستاندا ، تەقەدانی ، دوستایەتی بەستن بو لەگەڵ کۆنەپەرستەکاندا لەناو ، ولاتەکەدا .

ئیمپراتوریەتی بەریتانیا ئەمرو تەنها پشت بەهیزە کۆنەپەرستەکان و دەرەبەگایەتی دەبەستیت لەهەول دانیدا بۆ فەوتاندنی نەتەوایەتی پێشکەوتنخواز ، بەریتانیا هەوڵیدا ئەوانەی کەپیان دەوترا خاوەن (مافە دەستکەوتوەکان) کەپێیان هینیتە لای خۆی ، وەوایان تێبگەیەنێت کە ئەم مافانەیان نامێنی کە ئەکە ئیصلاحی کۆمەلایەتی بێتەدی ، وە ئینگلیز لەولاتەکە وهیندستان بچێتە دەرەوە ، یەکەم سەنگەری حوکومەت ئەمیرە دەرەبەگەکان ، دوای ئەمان چینە خاوەن مولکەکان بوون ، حوکومەت ئەوپەری زیرەکی ، و کارزانی بەکارهێنا تاکو پال بە تایەفەگەریخوازە

توندو تیژەکانەوە بنێت بچنە ڕیزی پێشەوە ، ئنجا مافی کەمایەتـیـەکـان ببێتە کوسپ لەرێی ئازادبووتی هیندستاندا ، ئەم زرنگی و لیهاتوویـبـە لەم دواییەدا دەرکەوت کە حوکومەتی بەریتانیا بەئاشکـرا درکـانـدی کـە بەتەواوەتی لایەنگری پێشەوا ئاینیە کۆنەپەرستە هیندوکیەکانە لەمەسەلـەی چوونە پەرستکەکانەوە ، بەم جۆرە بەریتانیا هەمـیـشـە پـەنـا دەبـاتـە بەرکۆنەپەرستەکان ئەو هەڵپەرست و خودپەسندەکان.

ئیتر تیکۆشانی میللی جیاوازی ، و چاکەیەکی مەزنی هەیە ، چونکـە لەهەموو شیوازەکان خیراتر وشـاری سیاسی زیندوو ، دەکاتەوە ، گەرچـی لەوانەیە لەزۆربەشیان بەئەشکنج تربێت. میللەت پێویستی بەتەجروبـە ، و تاقیکردنەوە هەیە لەکارەساتە گەورەکانەوە گەلێك جار چالاکـی سـیـاسـی ئاساییانە لەرۆژانی ئاشتی ، و هەڵبژاردنی دیموکراتیانەدا ، کاپرایـەکـی سادە دور دەخاتەوە لە تێگەیشتنی شتی راستەقینە ، چونکە سەرکردە ، و پێشەواکان لەسەر وتارەکانیان دەرون ، و هەموو بـالـیـوراویـك (مـرشـح) پەیمانی خۆرایی دەدات ، ئنجا هەڵبژێرەری بەسەرزمان (الـنـاخـب) وەکـو فەلاحو ، کرێکار ، و پێشەوەر سەریان لێدەشیوێ ، ئەو ستورە نادۆزنـەوە کەسیاسەتی تاقمێك لەهی ئەوی تر جیا دەکاتەوە ، بەڵام لەتێـکـۆشـانـی میللیدا ، وە لەرۆژانی شۆرشگێریدا ، وەزع و باری سیاسـی بـەرامـبـەر بروسکەی شۆرشەکە روون دەبێتەوە ئیتر چەند کەسانێك ، ودەستە ، و تاقم و چینەکان کەوا هەستی راستی خۆیان دەشـارنـەوە لـەم جـۆرە تـەنـگ و چەڵەمانەدا هیچیان بۆ ناکرێت ، ئیتر شۆرشەکە هەر تەنها رەوشتی خەلکی لەرووی ئازایەتی ، و خوراگری ، و مەردایە تیەوە دەرناخات بەلکو شۆرش هەمان دەستور ناکۆکی راستەقینە لـەنـێـوان دەسـتـەو تـاقـم و چـیـنـە جۆربەجۆرەکانیشدا دەردەخات ، ورسوادەکات ، کەوا ماوەیەکـی دورو درێـژ بەزەبری زمانی لوس ، و گفتاری رێك وپێك و دروست کراو شار درایوەوە.

یاخیبوونی شارستانیانە لەهیندستاندا تیکۆشانێکی نەتەوایەتی بـوو ، هەرگیز تێکۆشانێکی چینایەتی نەبوو ، کۆلەگەی ئەم تێکوشانـە چـیـنـی ناوەراست بوو ، وە بازوویشی فەلاحەکان بوون ، بۆیـە تـێـکـۆشـانـەکـە چینەکانی لێك جیانە دەکردەوە ، وەکو تێکۆشانی چینایـەتـی دەیکـات ، گەرچی هەندێك لەچینەکان توزیك یەکـیـان گـرت ، چـیـنـی ئـەمـیـرە

دەرەبەگەکان وە(تالقدار)ەکان و ، (زامندار)ەکان بەتەواوەتی چوونە پاڵ حوکومەت ، بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانیان پەسند کرد بەسەر بەرژەوەندی نەتەوایەتیدا.

بەسەرکردایەتی کۆنگرەکە بزوتنەوەی نیشتمانی پەرەی‌سەند ، بۆیە هۆی ئەوەی کە جەماوەری فەلاحەکان پەیوەندی پێوەبکەن ، و بێنە ناو کۆنگرەکەوە ، وە بەچاوی رزگارکەر لەگرانباریەکانیاث سەیری بکەن ، ئەمە کۆنگرەگەی زۆر بەهێزکرد ، وەرەنگ و روخسارێکی سەر یەمیللەتی پێدا هەرچەندە پێشەوایەتی کۆنگرەکە هەربەدەست چینی ناوەراستەوە بوو بەڵام لەخوارەوە زۆری بۆهات ، تاکو کێشەکانی کشتوکاڵ و کۆمەلایەتی بەشێکی زۆریان لەچالاکی کۆنگرەکە گرتەوە.

لەساڵی ١٩٣١ زدا کەکۆنگرەکە لە(کراجی) بەسترابوو ، جەند بریارێکی گرنکی دەربارەی مافە سەرەکیەکان ، و بەرنامە ئابوریەکان دا ، لەم کاتەدا ئارەزووی بەرەو سوشیالیستی پەیدابوو ، ئەوی‌لەم بریارەدا هەبوو ، کەدەبێت دەستورەکە بەندێکی تێدابێت کەمافە دیموکراتیە سەرەکیەکان ، و ئازادیەکان ، لەگەل مافەکانی کەمایەتیەکان زامن و مسۆگەر بکات ، هەروها داوای‌کرد دەولەت دەسەلاتی هەبێت بەسەر پیشەسازیە سەرەکیەکاندا بەم جۆرە تێکۆشان لەپێناوی سەربەستیدا لەئازادی سیاسی رووتی تێپەری‌و گەیشتە دەستکەوتنی رژمێکی کۆمەلایەتی سوشیالیستی ، ئنجا بنچینەی بابەتە کەبووبە نەهێشتنی چەوساندنەوەی جەماوەر ، و هەژاری بەلام سەربەستی بریتی‌یە لەهۆیەك ، بۆ هینانەدی ئەمانە.

لەکاتی بەرپابوونی یاخی بوونە شارستانیانەکە لەهیندستاندا ، وەگرتنی سیاسیەکان بەبول ، ولەبەندیخانە توندکردنیان ، حوکومەتی بەریتانیا پیشنیارەکانی خۆیی بۆ چاك کردنی دەستور لەهیندستاندا پێشکەش کرد کەدەبێ دەسەلاتێکی سنوردار بدرێت بەناوچەکان ، لەگەل پێك هاتنی یەکیتی‌یەك ، کەئەمیرە دەرەبەگەکان تیایدا دەنگیان دلێربێت ، حوکومەتەکە هەرچی شێوازێك کە بەبیری ئادەمیزاد دابێت بەکاری‌هێنا ، نەك هەر بەرژەوەندیەکانی خۆی بپارێزێت ، بەلکو بۆ ئەوەی داگیرکردنە سڵانەکەی هیندستان لەلایەن بەریتانیاوە هەر بمێنیتەوە ؛ کە بریتی بوو لە داگیرکردنی سوپایی ، وشارستانی ، و ئابوری ، وە.(مافی دەست

کەوتود) بەتەواوی بیارێزیت ، وە لەبەرژەوەندیەکاندا ، تەنها بدرزدودەدی (٣٥٠) سێصەدو پەنجا ملیون هیندی خرایە پشت گوی! ئیتر شتێکی سەیر نەبوو ، کە ئەم پیشنیارانە بەتوندی بەرهەڵستی بکرێت.

کچم بۆئەوەی (بورما)م لەبیر نەچێت شتێکت بۆ باس دەکەم لەنێو لەساڵی ١٩٣٠وە ١٩٣٢دا خەلکی - (بورما) هاوبەشی یاخیبووند شارستانیانەکەیان نەکرد ، بەڵام فەلاحەکان لەسەرووی (بورما)دا بەهۆی تەنگانەی ئابووریەوە کەتوشیان هاتبو شۆڕشێکی گەورەیان بەرپاکرد. حوکومەتی بەریتانیا ئەم شۆڕشەی زۆر بەدڕندانە دلڕەقی گوژاندەوە ، ئیستا تەقەلا دەدرێت لەرووی سیاسیەوە بورما لە هیندستان جیاکرێتەوە ، ئنجا ئەگەر هیندستان سەربەستیش وەرگرێت بورما هەر بەناوچەیەکی چاوساندنەوە لەلایەن ئیستیعماری بەریتانیاوە دەمێنێتەوە. (بورما) زۆر گرنگە چونکە سامانێکی نەوتین ، ودار ، و تەختە ، و گەلێك مەعدەنی تێدایە.

تێبینیەك (ئۆکتۆبەری ١٩٣٨)

دوای نوسینی ئەم نامەیە لەبەندیخانەوە پێش پێنج ساڵ و نیو گەلێك گۆڕانی گرنك بەسەر هیندستاندا هات ، لەوکاتەدا بزوتنەوەی یاخیبوونی شارستانیانە بەردەوام بوو گەرچی بەشێوەیەکی سووکیش بوو. گەلێك لەپیاوانی کۆنگرەکە لەبەندیخانەدا بوون ، ئنجا بڵاوکرایەوە کەوا کۆنگرەکەو ، ئەندامانی هەزارەها لەلێژنەکانی لقی کۆنگرەکە ، لەگەل رێکخراوەکانی سەر بەئەو لەیاسا چونەنە دەرەوە ، لە ساڵی ١٩٣٤ز کۆنگرەکە یاخیبوونە شارستانیانەکەی راوەستاند ، وە حوکومەتیش ئەو قەدەغەکردنەی کە خستبویە سەر کۆنگرەکە لای‌برد ، کۆنگرەکەش سیاسەتی موقاتەعەکردنی ئەنجومەنەکانی یاسادانانی گۆڕی ، پیاوانی کۆنگرەکە چوونە هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنی مەرکەزی بەوپەری گەرم گوریەوە.

لەساڵی ١٩٣٤ ز.دا بەرلەمانی بەریتانیا دوای مشتومڕێکی دورو درێژ یاسای حوکومەتی هیندستانی سەلماند کەوا بەپێی ئەمە دەستورێکی نوێ بۆ هیندستان دانرا. لەم دەستورەدا ناوچەکان بەشێکیان لەدەسەلاتی ناوخو درایە لەگەل هەندێك ئاموژکاریدا (تحفظات) ، بەپێی دەستورەکە ، یەکێتیەك لەنێوان ناوچەکان ، وەپارێزگاکانی (الولایە) هیندستاندا

پەیدابوو. یاساکە سەرومر بەرهەڵستی کرا ، وەکۆنگرەکەش پەسندی نەکرد هەروها ئاموژگاریەکان (التحفظات) لەگەل (دەسەلاتە تایبەتیەکە) کەوا درابو بەحاکمەکان و جێنشینی پاشای بەریتانیا ئەمانە هەموو کۆنگرەکە پەسندی نەکرد چونکە لەگەل ناوەرۆك و جەوهەوی دەسەلات لەناوچەکاندا ناکونجێت ئیتر بەجۆرێکی توندتر بیرورای یەکگرتنەکەی پەسند نەکرد کەوا حوکمی ئوتوکراتیانەی لەویلایەتەکاندا بەهێز دەکرد ، و یەکێتی‌یەکی دروستکراوی سەیری لەنێوان رژێمی دەرەبەگایەتی ، و ئوتوکراتیەت و لەنێوان ناوچە نیمچە دیموکراتیەکاندا دروست دەکرد. یاسا تازەکە بەراستی رژێمێکی تایەفەگەری ، و دووبەرەکی دروست کرد ، وەولاتەکەی بەش کرد بەچەند مەڵبەندێکی جوی ، جوی هەڵبژاردنەوە ، هەرچەندە ئەم کردەوەیە بەئارەزووی هەندێ لەکەمایەتیەکان بوو چونکە سودیان لێوەردەگرت بەلام دیسانەوە پەسند نەکرا ، چونکە بەپێچەوانەی دیموکراتیەت و پێشکەوتنەوەیە.

لەسەرەتای ساڵی ۱۹۳۷ ز.دا ، ئەوبەشە یاسایەی کەدەسەلات دەدابە ناوچەکات خرایە کارەوە ، بەپێی ئەمە هەڵبژاردنی گشتی لەهەمولایەکی هیندستاندا دەست پێکرا ، هەرچەندە کۆنگرەکە بریاری پەسند نەکردنی ئەم یاسایەی دابو ، بەلام بریاریشی دا کە هاوکاری لەم هەڵبژاردنانەدا بکات ، ئنجا هەڵسا بەهێرشێکی فراوانی هەڵبژاردنەکان زۆر بەتوندی لەهەمو لایەکی ولاتەکەدا کۆنگرەکە سەرکەوتنێکی چاکی لەزۆربەی ناوچەکاندا دەست کەوت ، پیاوانی کۆنگرەکە لەناو گەلێك لەئەنجومەنە نوێکانی ناوچەکاندا زۆربەیەکی حیزبیان پێك هێنا ، ئیتر دەربارەی ، گونجان و قایل بوون بەمەنسەبی وەزیرایەتی کردن لەحوکومەتی ناوچەکاندا مشتومرێکی توند پەیدا بو ، لەدواییدا کۆنگرەکە بریاری لەسەر گونجانیدا دوای ئەوەی روونی کردەوە کەمەبەسە کۆنەکە ، کەوا تێکوشانە لەپێناوی سەربەستی ، و سیاسەتە کۆنەکەدا بەرنادات ، و هەر لەسەری دەروات ، ئنجا قایل بوون بەمەنسەب هەر لەپێناوی لەسەر رۆیشتنی ئەم سیاسەتە ، و بەهێزکردنی ولاتدایە لەتێکۆشانیدا لەپێناوی سەربەستیدا. سەرەرای ئەمەش داواکرا کەحاکمەکانی ناوچەکان دەسەلاتی جیاواز (السلطات الأستثنائیة) یان نەبێت و ، وازی لێبێنن..

لەئەنجامی ئەمەدا لەئەندامانی کۆنگرەکە ، وەزارەت لەحەوت نـاوچـەدا لەمان پێك هات ناوچەکانیش ئەمـانـەن. بـۆمـبـای ، مـدراس ، نـاوچـە یەکگرتوەکان ، بهار ، ناوچەکانی ناوەند ، ئورسا ، و ناوچەکانی سنوری سەرووی رۆژئاوا. دوایی ئەمە کۆنگرەکە لە ناوچەی (اسام)دا وەزارەتێـکـی هەرەمەی یەککگرتوی (ائتلافیە) دروست کرد ، وە ئەو دوو ناوچە گرنگانەی کەوەزارەتەکەیان لەئەندامانی کۆنگرەکە نەبوون بنغال ، وبنجاب بوو.

سەربارەت بەدروست بوونی وەزارەتەکان لەئەندامانی کۆنگرەکە پێشـەوا سیاسیەکان بەرەلاکران ، وە ئەو سنورەی کەبو ئازادیە مەدەنیەکان دانرابوو لەو ناوچانەدا هەلگیران جەماوەر ئەم گۆرانەیان پێخوش بـوو ، خـەلـکـی بەئومید بوو کە زووبارو ، وەزعیان ، بەرەو چاکی بچێت. لەناو میللەتـدا خێرا هوشیاری سیاسی زیادی کرد ، بزوتنەوەی کشتوکالی ، و کرێکاریانە دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی هێزەکانی خۆیـان ، مـان گـرتـن زۆر بـوو ، وەزارەتە کانیش دەستیان کرد بەدانانی یاسای کشتوکال بۆ سـوك کـردنـی گرانباری لەسەرشانی فەلاحەکان ، وەبـۆ چـاك کـردنـی وەزع ، و بـاری کرێکارانی پێشەسازیەکان ، گەرچی هەندێ ئیصلاحات جێبەجێ بوو ، بـەلام ئەو زروفانەی کەدەوری دابوو ، لەگەل ئەو سنورانەی کە یاسا دای نابوون ئەمانە سنورێکان بۆ ئەم ئیصلاحاتە کۆمەلایەتیە دانا.

چەند جارێك وەزیرەکانی کەسەر بەکۆنگرەکە بوون لەگەل حاکمەکـانـدا بەکژیەکدا دەچوون بو بەهۆی ئەوەی وەزیرەکان وازهـێـنـان (استـقـال) لەوەزارەت پێشکەش بکەن. خۆ ئەگەر ئەم ئیستیقالانە قوبول بکرایە لەوانە بو ببوایە بەکژدا چوونێکی توند ، ئنجا لـەبـەر ئـەوەی حـوکـومـەتـی بەریتانیانەی دەویست ئەمە رووبدات ، بۆیە بیروڕای وەزیرەکان سەردەکەت بەلام وەزع ، و بار تێکرایی بەشلوقی مایەوە ، وە بەکژدا چوونیش ناچار رووی دەدا ، کۆنگرەکەش ئەمەی دادەنا کە تەنها قوناغێکە تێ دەپەری ؛ و نامێنێت لەپێناوی گەیشتن بەئامانجی تەواوەتـی کـە بـریـتـیـە لـە سەربەستی.

ئەگەر حوکومەتی بەریتانیا هەولی بدایە ئەو یەکێـتـیـەی کـەخـۆی دەیەوێت بەزۆر بیسەپێنی ، ناچار بەکژدا چوونێکی تـونـد رووی دەدا ، بەلام ئەمەی نەکرد لەبەر توندو تیژی بەرهەلستی کردنی. ئەمرۆ کۆنگرەکە

لەهەمو کاتێکی تری بەهێز ترە بۆیە حوکومەت ناتوانی بەهیچی نەزانێت لەبەر ئەمە کۆنگرەکەش سوورە لەسەر قو بول نەکردنی بەکگرتنەکە ، وە داواکردن بۆ دروست بوونی ئەنجومەنێکی دروست کەر (مجلس تأسیسی) کە هەڵبژێررا بێ لەرێی دەنگ دانی هیندیە بالغەکانەوە ، وەئیش و کاری دانانی دەستورێك بێت بۆ هیندستانی ئازاد.

دووبارە کێشەی تایەفەگەری ، و دوبەرەگی پەیدابوەوە ، وە بو بەهۆی بەکۆداچوونێکی نوێ ، بەڵام ئاراستێك هەبوو کەبریتی بوو لەپێشخستنی مەسەلە کۆمەڵایەتی ، و ئابووریەکان وەبایەخ پێدانیان زیاتر لەجیاوازیەکانی تایەفەگەری ئاینی ، و دووبەرەکی.

هوشیار بوونەوەی میللی لەهیندستاندا پەرەی سەند گەیشتبوە ویلایەتە هیندیەکانیش ، وە داواکردن بەدروست بوونی حوکومەتێکی لێپرسراو تیایاندا بەهێز بو بو ، بەتایبەتی لە (میسور ، کشمیرو ترافنکور)و لەناوچە گەورەکاندا ، ئەم بزوتنەوانە بەتایبەتی لە (ترافنکور) دا بە جورێکی درندانە لەلایەن حوکومەتی ویلایەتەکاندوە بەرهەڵستی کرا ، چونکە بەرێوەبردنی زۆربەی ئەم ویلایەتانە نیمچە دەرەبەگایەتی بوون (وەکو کشمیر) کەبەدەست لێپرسراوی بەریتانیاییەکانەوە بوو.

لەم چەند ساڵانەی دواییدا هیندستان خەریکە لەکاروباری جیهانی نزیك دەبێتەوە ، وە هەول دەدا کەکێشەی خۆی بەکێشەی جیهانیەوە ببەستێت ، چونکە کارەساتەکانی (حەبەشە ، ئەسپانیا ، جیکو سلوفاکیا ، چین ، و فەلەستین) بەراستی میللەتی هیندستانی جوڵاند ، وەکارێکی وایکرد کە (کۆنگرەکە) سیاسەتێکی دەرەوەی هەبێت کەبریتیە لە سیاسەتی پشت گرتنی ئاشتی ، و دیمکراتیەت ، و دژایەتیکردنی ئیستیعمار ، و فاشستیەت چوون یەك.

(بورما) لەهیندستان جیاکرایەوە لەساڵی ١٩٣٧ز.دا ، ئەنجومەنێکی یاسادانانی درایە وەکو ئەنجومەنەکانی کەدرا وە بەناوچەکانی هیندستان.

# تێكۆشانی میسر لەپێناوی ئازادیدا

### ٢٠/مایس/١٩٣٣

ئێستا بابگەرێینەوە بۆ میسر ، لەوێوە چاودێری ئەو هەرایە كە نێوان نەتەوایەتیەكی تازە پێگەیشتوو ، وە دەولەتێكی ئیستیعماری دایە بكەین ئەو دەولەتە ئیستیعماری‌یەی كە لەوی‌یە ، هەر هەمان دەولەتە كە لە هیندستاندایە ، ئەم دەولەتە بەریتانیایە ، میسر لە گەلێك رووەوە جیایە لەهیندستان ، گەرچی تارادەیەك ، وەماوەیەكی كەم نەبێت بە دەست ئینگلیزەكانەوە نەمایەوە ، بەلام لەزۆرشتدا .هەردوو ولاتەكەتیایدا هاوبەشن. هەرچەندە بزوتنەوە نیشتمانیەكان لە هەردوو ولاتەكەدا ، هەر یەكەیان شێوازێكی جیاوازی گرتبو ، لەهی ئەوی‌تر ، بەلام هۆ سەرەكیەكان لەپێناوی ئازادیدا یەكێك بوون ، وەهەمان دەستور شێوازەكانی كە ئیستیعمار گرتبووی بۆ سەرپێ شۆركردن بەم بزوتنەوانەش لەبەرئەمە هەریەكە لە ئێمە دەتوانێت لە تەجروبەكانی ئەوی‌كەوە فێرببیت. ئێمەمانان لە هیندستاندا دەتوانین دەرسێك لە میسرەوە فێرببین ، وەتەماشا بكەین كامەیە ئەو (ئازادی) یەی كە بەریتانیا دەی‌دات.

ئەگەر تەماشای دەولەتە عەرەبیەكان بكەین (سعود ، عیراق ، سوریا و فەلەستین) دەبینین میسر لە هەمویان پێشكەوتوترە ، پردێكە رۆژهەلات ، ورۆژئاوا بەیەك دەگەیەنێت ، لەو كاتەوە كە نۆكەندی سویس كراوەتەوە ، وە بۆتە رێگەی كە شێتەكان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ، كە نۆكەندی سویس كراوەتەوە ، وە بۆتە رێگەی كە شێتەكان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ، پەیوەندایەتی ئەم لەگەڵ ئەوروپادا بەهێزترین پەیوەندبووە كە ئەوروپای بەستبێتەوە لەگەل هەرولاتێكدا لەرۆژئاوای ئاسیادا. میسر یەكێتی‌یەكی جیاوازە ، هەرچەندە پەیوەندێكی بەتینی رۆشنبیری لەگەل دەولەتە

عەرەبیەکانی تردا هەیە ، هەموویان یەك زمان ویەك ئاینـن ، وەنـەریـت (التقالید) ورەوشتیان یەکە ، رۆژنامەکان کە هەمو رۆژێـك لـە (قـاهـرة) دەردەچن لە هەموولایەکی نیشتمانی عەرەبدا بڵاودەکریتەوە ، ودەسەلاتێکـی مەزنیان لەوولاتانەدا هەیە. یەکەم جار لە میسردا بزوتنەوەی نیشتـمـانـی پەیدابوو ، ئنجا دیارە ، شتێکی سروشتیە ئەم بزوتنەوانەکە ببـێـتـە نموونەیەك دەولەتە عەرەبیەکان لەسەری برون.

لە نامەیەکی پێشودا باسی میسر وبزوتنەوە نیشتمانیەکانیم بۆ کردیـت کەوا لە نێوان ساڵی ١٨٨١ و ١٨٨٢ز. وەتیایدا پەیدابوو بەسەرکردایـەتـی (عرابیپاشا) وەچۆن بەریتانیا ئەم بزوتنەوە یـەیفـەوتـانـد ، هـەروهـا دەربارەی چاکخوازەکانی یەکەمـین جار ، وەکو(جمال الدین افغـانـی) و ، دەربارەی بیرورا رۆژئاواییەکان ، وئەنجامی بەسەر ئیسلامدا باسم بۆکردیت ئەم چاکخوازانە (المصلحون) هەوڵیان دا کە ئیسلامیەت ، وبیرورانویکان لە بابەت پێشکەوتن ، وبەرزبونەوەوە پێکەوە بگونجێنن ، ئەمە بەبەرنەدانـی بیرورا سەرەکیەکانی لە مەر ئاین ، ئنجا ئەوگـوریـن و ، لادانـانـە کـە بەتێپەربوونی صەدەها ساڵ بەسەریداهاتوە ، لای بەرن ونەیهێڵـن ئـەوسـا هەنگاوی دووەم بەلای پێشکەتنخوازەکانەوە بریتی بو لە جیاکردنەوەی ئاین لەدەولەت ، چونکە ئاینەکۆنەکان هەوڵ دەدەت رەوشت و کردەوەمان لە هەمو کەل وقوژبنێکی ژیاندا بۆمان رێکخەت و ئاراست کەن ، بەم جۆرە هـەردوو ئاینەکە چ هیندوکی و چ ئیسلام جگە لەجیاوازی باوەریان| بەجوت یاسا ، و پەیرەویان بو ژن هێنان و کەلەپور(میـراث) و یـاسـایمـەدەنـی تـاوان ، (جنائی) ورێکخستنی سیاسی ، واتە بۆ هەمـو شـتـێـك دانـاوە ، وەیـا بەواتەیەکیتر نەخشەیەکی تەواویان بۆ گوزەرانی میـلـلـەت کـێـشـاوە ، وهەردوکیان دەیان ویست ئەمە هەر بمێنێتەوە ، لەبەرئەمە بە بۆیەی ئاین رەنگیان کردوە ، تەنانەت ئاینی هیندوکی لەم رووەوە زۆر دەستیداگرتـوە سەبارەت بە چەسپاندنی رژێمێکی سەحتی چینایەتیەوە لەواقیعدا مـانـەوەی ئەم رژێمانە گەلێك کۆسپ دێنێتە بەردەمی هەمو کۆششیك بۆ گۆران و چاك کردن. کچم لەبەرئەمە تۆ دەبینیت لە میسردا هەروەکو لە ولاتـانـی تـردا دەبینیت ، خەلکی پێشکەوتنخواز هەوڵ دەدەت ئاین لە دەولەت جیاکەنـەوە وە بەهانەشیان لەمەدائەوەیە: یاساکۆنەکان کەوا ئاینە جۆربەجۆرەکان دایان

ناون ، سەپاندویانن لەگەل نەریتەکاندا ، ئەمانە بۆ ئەو کەسانە بوون کە لەرابوردو ، ودیریندا ژیاون ، ئیتر کەوا بۆئەمانە هەرگیز بەکەلکی ئەوکەسانە نایەت کە ئەمرو هەن ودەژین ، بەتایبەتی دوای ئەم هەموو گۆرانکاری‌یەی کە بەسەرباری جیهانداهاتوە ، ئەگەر توزێك عەقل بخەیتەکارەوە ، دەبینین: کەرژێمێك بۆ کالیسکەیەك دانرابێت ، کە کارای‌کیشیت هەرگیز ئەو رژێمە بەکەلکی ئەوەنایەت کە بەسەر ئوتوموبیل وشەمەندەفەردا بەکاربیت.

ئەمە ئەوری‌یەیە کە چاکخوازو پێشکەوتنخوازەکان دەی‌گرن ، وەئەم رێبازەشەکە دەبێتە هوّی ئەوەی کەوا دەولەت گەلێك لە پەیرەو ، ورژێمەکانی لەئاین جیاکانەوە ئەمە بە جۆرێکی ئاشکرا لەتورکیادا دەرکەوت لەوێ سەرەك جمهوریەت سوێندی دلسوزی‌بە ناوی خواناخوات ، بەلکو بەشەرەفی خۆی سوێند دەخوات ، بەلام میسر نەگەیشتوّتە ئەم رادەیە گەرچی تەوژمی بیروباوەرەکە لەوێدا ، ولەدەولەتە ئیسلامیەکانی‌تردا بەرەو ئەم ئاراستە دەچێت لەوانەیە موسولمانەکانی هیندستان بەرهەلستی ئەم ئاراستە بکەن زیاتر لەموسلمانەکانی‌تر لەبەر ئەوەی کە پارێزەرن (محافظ) بیرورایەکی ئاینی وایان هەیە کەلای هاورێکانیان لە دەولەتە ئیسلامیەکانی‌تردا بەم جۆرەبەهێزنی‌یە ، ئەمە سەیرە ، وگرنگە چونکە نەتەوایەتیە نوی‌کە بەگۆران و پێشکەوتنی چینە بورجوازیەکان پێش دەکەوێت کە بریتی‌یەلە چینە مام ناوەندیەکان لەرژێمی سەرمایەداریدا ، کەچی‌موسلمانەکان لە پێشخستن و گوزانی بورجوازیەتدا دواکەوتن لەبەر ئەمە کۆسپیان هێنایەری‌ی نەتەوایەتیان ، لەوانەیە بوونیان لە هیندستاندا وەکو کەمایەتیەك ، هەستیان بەترس زیاتردەکرد ، ئەمە زیاتر کوی‌کردنەوە ، وئارەزووی پاراستنی نەریتەکۆنەکانی لاخوشەویست کردن لەبەرئەمە لە هەموو بیرورایەکی نوێ دەکەوتنە گومانەوە. لەوباوەرەدام هۆی‌دەروونیان (الأسباب النفسية) ئەمەبووە کەوای‌لە هیندیەکان کردوە لەقاوغەکانی خۆیان نەیەنە دەرەوە ، وەدەماری تایەفەگەریان لەلازیاتر بەتین تربێت ، لەوکاتەوە کەموسلمانەکان هاتونەتە هیندستانەوە پێش هەزار سال لەمەوبەر.

لەگەل گەشەکردن ، وپەرەسەندنی بازرگانیدا چینی مام ناوەندیش پی‌گەیشت لەسەرەتای دوامین چواریەك لە سەدەی نۆزدەهەم دا. لەچینی

فەلاحەکان کابرایەك پەیدابوو ناوی (سعد زغلول) بو ، (سعد) لەسەرەتـــای لاوێداکە (عرابی پاشا) هەڵسا ، وسەرپێچی ئینگلیزەکانی کرد ساڵی.

١٨٨١ و ١٨٨٢ ز هەروها لەگەڵیدا هاوبەشی شەڕیکرد ، لەوکاتەوە تامردنی لەساڵی ١٩٢٧ ز.دا واتەماوەی چل وپینج ساڵ (سعد) لەپـێـنـاوی ئـازادی میسردا ئیشیکردوە. بەمەبوو بەسەرکردەی بـزوتـنـەوەی سـەربـەسـتـی ، لەراستیدا بێچەندوچون سەرکردەی میسربوو ، لای فەلاحەکان خۆشەویست بـو واتە ئەوچینەی کەخۆیی‌لێوە هاتبوو ە خوارەوە ، وەچینی مام ناوەنـدیـش دەیان پەرست ، ئەو چینەی کە خۆی لەوان بوو بەلام چینی ئەرستوکراتی ، وچینی دەرەبەگەکان لێ‌رازی نەبوون ، وخۆشیان نەدەویـسـت ، بـەڵام ئـەم دەرەبەگان بەرزبوونەوەی چینی مام ناوەندیان پێ‌خوش نەبوو ، چونکە ئـەم چینە خەریك بوو دەرەبەگەکان لەجێ وشیوێنی خۆیان هەل کەنن ، (سـعـد) وەکو چقڵی‌چاویان وابوو چونکە نوێنەری ئەم چینە مام ناوەندیە بوو ئنجـا ئینگلیز لە هیندستاندا چیان کرد لە میسریشدا هەرهەمان کردەوەیان نوانـد هەوڵیان دا ئاشنا ودوست لەناوئەم دەرەبەگانەدا بـۆخـۆیـان بـدۆزنـەوە ، کەواله بنەچەدا ئەمانە تورك بوون نەك میسری وەنوێنەری چینـە حـوکـوم فەرماکۆنەکەبوون.

لێرەدا ئینگلیزەکان بەرێبازە ئیستیعماریە پەربووتـەکـەی خـۆیـانـدا هەوڵیان دا پەیوەندایەتیان بەتین کەن لەگەڵ هەندی هەیئاتی سـیـاسـی ، وکۆمەلایەتیدا کەلەمیسردابوو بۆ ئەوەی تەگەرە لەهەمـوگـۆرانـکـاریـەکـی نیشتمانیبدەن ، وەبۆلێ دانی‌بەرەیەك بەبـەرەیـەکـی‌تـر ، وحـیـزبـێـك بەحیزبێکی‌تر ، هەروەك لە هیندستانداکردیان. ئینگلیزەکان ویستـیـان لـە میسرداکێشەی کەمایەتیە (قطبی)یەکان بکەن بەتەنگوچەلەمەیـەکـی گـەورە بەلام ئەم تەقەلایانەیان سەری‌نەگرت. ئـیـتـر هـەمـوو هـەول وتـەقـەلای ئینگلیزەکان هەمان رێبازی دەگرت: وتەی جەوروشیرین ، خـۆپـیـشـانـدان کەگوایا ئەمەی دەیکەن لەبەربەرژەوەندی تاقمەکەیتره ، بەرگی کابرایەکی (ئاموزکارکەر) یان بۆ (ملیونەهاکەسی‌سابیر) وکەساس لەبەردەکردو ، دەیان ووت: ئەگەر ئیشەکە (گـیـرەشـیـویـن) وئـاژاوەکـەر ، وئەوانەی کـە پەیوەندیەکیان بەکێشەکەوەنی‌یە تیـایـدانـەبـن ، هـەمـوو کـێـشـەکـان

جێبەجێدەبن. با بەم بۆنەیەوە لەیادمان نەچێت ، کەئەم جۆرەداوا کاری ، ووتانەیان گەلێك جاربشکاوەتەوە بەتەقەکردن لەجەماوەر ، وکوشتنیان ؛ رەنگە بەهانەیان بۆ ئەم کردەوەیە ئەوەبێت: بۆیە وادەکەن ، تاکو زووکۆتایی بەکویرەوەری ئەوخەلکەبینن ، وەبیان نێرن بۆجیهانەکەیتر ، چونکەلەوی نەمری ، وئاسودەیی هەیە..!

میسربە درێژایی جەنگەکە ، تاکۆتایی هاتنی بەچەند سالێك هەرلە ژێرحوکمیعورفیدامایەوە لەماوەی جەنگەکەدا دوویاسادانران ، یەکێکیان بۆ دامالینی چەك ، ئەویتریان بۆگرتنی سەربازبەزور ، بەریتانیا هەرلەسەرەتای جەنگەجیهانیەکەوە هێرشیبردبوە سەرمیسر ، وەبری کرد بو لە هێزەکانی خۆی.

هێشتا جەنگەکە تەواونەبوو لەسالی ١٩١٨ ز.دا نیشتمانی پەروەرەمیسریەکان چالاکی ، وبزوتنەوەی خۆیان دەست پێکردەوە لەداواکردنی سەربەستیدا ، کێشەکەی خۆیان ، پێشکەش حوکومەتی بەریتانیا و ، کۆنگرەیریکەوتن لە(پاریس) داکرد ، ئەوکاتە لەمیسردا بەمانای راستەقینە حیزبەکان نەبوون ، جگە لەحیزبینیشتمانی نەبێت کەوائەندامانی کەم بوون لەبەرئەمە یێشنیاریان کردکە نیرراوێك بەسەرکردایەکی (سعد زغلول) بنێرن بۆ(لندن وباریس) بوبەرگری لەکێشەی سەربەستیەکە ، بۆئەوەی کەنێرراوەکە نوێنەریهەمولایەك بێت وەبتوانێت بەناوی میللەتەوەبێتە گفتار دەست کرا بەرێکخستنی بزوتنەوەیەکی فراوان ئەمەبنچینە ، وبناغەی دروست بوونی حیزبی (وفد)ە لە میسردا ، بەلام حوکومەتی بەریتانیا رێی ئەو نیرراوەی نەدا کە بچێت بۆ (لندن) سەرەرای ئەمەش (سعد) و چەند سەرکردەیەکی تری لەمارتی ١٩١٩ ز.دا کرت.

لەمەوە کردارێکی شۆرشگێرانەی خوێنین رووی‌دا گەلێك ئینگلیزی تێدا کوژران ، لێژنە شۆرشگێرەکان دەسەلاتیان بەسەر (قاهرة) و چەند شارێکی تردا هەبوو ،وە لەزۆر شوێنیشدا چەند هەیئەتێك دروست بوو ، بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتی ، قوتابیانی زانکۆ لەم شۆرشەدا بەشداریان کرد ، سەرەرای هەندێ سەرکەوتن لەرووی بیروراوە ، ئینگلیزەکان توانیان سەر بەشۆرشەکە شۆرکەن کەچی نەیان توانی بزوتنەوە نیشتمانیەکە بفەوتینن کەوا شێوازی

خۆیی لەتێکۆشاندا گۆڕی ، وەبەنای بردەبەر بەرەنگار بوون بەجۆرێکی سەلبیانە ، ئەم بەرەنگار بوونە ئەوەندە بەتین بوو ، حوکومەتی بەریتانیا ناچار بوو کەهەندێ داخوازی میسریەکان بێنیتە دی ، لیژنەیەکی بەسەرکردایەتی لورد (ملنر) نارد بۆ میسر ، بەلام نیشتمان پەروەرانی میسر بریاریان دا بەلای ئەم لیژنەیەدا نەچن و موقاتەعەی بکەن ، بەراستی ئەمە زۆرباش سەرکەوت. وەقوتابیان دەورێکی باشیان لەم رێبازەدا بینی ، ئنجا کە لیژنەکە هێزی بەرەنگاربونەکەی کەی دی ، هەستیکرد، کەچار نیە دەبێت میسریەکان هەندێك مافیان بدرێتی وەئاموژگاریەکانی لەسەر ئەم بنچینەیە دانا ، بەلام حوکومەتی بەریتانیا گوێی نەدایە ئەمە ، میسریەکانیش دەستیان کردەوە بەتێکۆشان ، ئەمە سێ سالٚ دەوامی کرد لەسالی ١٩١٩ ز. وە تاکو سالی ١٩٢٢ ز ، داخوازیشیان لەسەربەستی تەواو کەمتر نەبوو.

بەلام*(سعد زغلول) دوای گرتنی لەسالی ١٩١٩ ز.دا ئنجا بەرەلاکرا ، و دووبارە لە دیسەمبەری سالی ١٩٢٢ز.دا گیرایەوە ، و نێررا بۆ ئاوارکە بەلام ئەمە یارمەتی چاك بوونی بارو ، وەزعی میسری نەبدا بەلای بەریتانیاییەکانەوە ، ئیتر ناچاربوون بەهەندێ کردەوەی تر هەلسن و بەکاربێنن بۆ ساردکردنەوەی توندو تیژی میسریەکان ، وە هەرچی تەقەلایەك درا بەمەبەسی ئەنجام مام ناوەندی بێسود بو ، جگە لەوەی کە(سعد زغلول) خۆی ئەوەندە توخ (متطرف) نەبو کەوا جێبەجێکردنی مام ناوەندیانەی نەویێت ، نیشانە و بەلگەی ئەمە ئەو تەقەلایە بوو کەدرا بو کوشتنی لەلایەن کەسانێکەوە کەوایان دەزانی ئەم خیانەتی لەگەل ولاتەکەیدا کردوە ، چونکە هەولیداوە بگاتە ئەنجامێکی مام ناوەندی پەرپوت ، هەر چەندە ئەو هۆراستەقینانەی کە رێکەوتنی لەگەل بەریتانیا یەکاندا کردە کارێکی نەشیاو (مستحیل) زۆر لەمە قوول تر بوو ، هەرهەمان هۆبون کە نەی هێشت لە هیندستانیشدا جێبەجێکردنێکی مام ناوەندیانە رووبدات. نیشتمان پەروەرانی میسر هەرگیز نەیان دەویست بەرژەوەند یەکانی بەریتانیا لەمیسردا بخەنەپشت گوێ ، بەلکو بەپێچەوانەی ئەمەوە ، ئامادەبوون کە

هەندێ ئیمتیازات وجیاوازی بدەن بەبەریتانیا ، بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ، وریگەی هاتوچۆی بەلام سووربوون لەسەر ئەوەی کە دەبێت باسی ئەم کێشانە دوای وەرگرتنی سەربەستی تەواو بکرێت. لەلایەکی ترەوە ، بەریتانیاش لەو باوەڕەدا بوو کەمافی هەبە لەدانانی ئەو میقدارە ئازادیەدا کە دەیبەخشێت ، وەدەبێت ئەم ئازادیە بەپێی بەرژەوەندی بەریتانیا بێت ئەو بەرژەوەندییەی کەدەبێت لەپێش هەموشتێکدا بپارێزرێت!

لەبەر ئەمە هیچ زەمینەیەکی هاوبەش نەبوو لەنێوانیاندا بۆرێکەوتن ، بەلام حوکومەتی بەریتانیا هەستیکرد کەدەبێت خێرا شتێك بکات ، گەرچی لەسەر ریکەوتنیش نەبێت. لەبەر ئەمە لە٢٨ مانگی شوباتی ١٩٢٢ز. دا بەریتانیا درکاندی کە لەپاشەرۆژدا دان بەمیسردا دەنێت (وەکو دەولەتێکی سەربەستیئازاد) بەلام - ئەم (بەلام)ە گەورەیە - چوارشت هەیەکەپێویستە بمێنێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی فراوان ئەویش:

١- مسۆگەرکردنی رێگەی هاتووچۆی ئیمپراتوریەتی بەریتانیا لەمیسردا.

٢- پاراستنی میسر لەهەموو دەست درێژکردنێك ، وەیان دەست خستنەکاروباریەوە لەلایەن بێگانەوە ، ئیتر ئەم دەست درێژی ، و دەست خستنە کاروبارەوە راستەوخو بێت یان لابەلا.

٣- پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بێگانە لەمیسردا لەگەل پاراستنی کەمایەتیەکان.

٤- پاشدرۆژی سودان.

ئەم ئاموژگاریانە هەر لەئامۆژگاریەکانی لەمەر هیندستان دەچێت لێرە دابیێی دەلێن (زامن کردن) دیارە میسریەکان ئەم ئاموژگاریانەیان قوبول نەکرد گەرچی سادە ، و ئاسان دیارن چونکە مانا راستیەکەی ئەوەیە کەلەمیسردا سەربەستی بەمانای راست و رەوانی نیە چ لەکاروباری ناوخو وەیان دەرەوەدا ، بۆیە درکاندنەکەی ٢٨ شوباتی ١٩٢٢ تەنها لەلایەکەوە بوو ، یەك لانە بوو ، واتە لەلایەن حوکومەتی بەریتانیاوە بوو ، وەمیسریش دانی پێدا نەنا ، ئنجا لەسالانی ئایندەدا بایەخی سەربەستیە یەند بووەکەی بەم ئاموژگاریەو ، زامن کردنانەوە دەرکەوت.

سەرەرای ئەم (سەربەستیە) حوکمی عورفی ساڵ و نیو یێکیتری خایاندو لەژێر چاودێری ئەفسەرە بەریتانیایەکاندابوو ، ئەم حوکمە عورفیە کۆتایی نەهات تاکو حوکومەتی میسر یاسای لێ بوردنی گشتی (قانون العفو العام) دانا ، بەپێی ئەم یاسایە ، هەمو کاربەدەستەکان لە لێپرسینەوەی ئەو کردەوانەی کردویانە لەکاتی حوکمە عورفیەکەدا بەخشران ، و عەفوکران.

لەپاشاندا میسرە (سەربەستەکە) دەستورێکی بێبەخشرا ، هیچ دەستورێکی تر لە کۆنەپەرستیدانەی دەگەیشتی ، دەسەلاتی زۆرفراوان درابە (ملك فؤاد) کەبەزۆر سەپێنرابوو بەسەر میسریەکاندا (فۆئاد) زۆرچاك یارمەتی ئنگلیزەکانیدەدا ، هەردوو کیان نیشتمان پەروەرەکانیان خۆش نەدەویشت ، هەردووکیان بیروڕای ئازادی دان بەمیللەت پەسندیان نەدکرد ، وەیان تەنانەت حوکومەتێکی بەرلەمانیش بدەنی (فؤاد) خۆیبە حوکومەت دادەنا ، وە بەئارەزووی خۆی ئیشی دەکرد ، بەر لە مانی هەلوەشاندەوە ، حوکمێکی دیکتاتورانەی لەوڵاتەکەدا دەکرد ، پشتیبە سونکی ئینگلیزەکان قایم بوو کەوا ئامادەبوون فریایکەون.

یەکەم ئیشێك حوکومەتی بەریتانیا کردیدوای ئەوەی سەربەستیدا بەمیسر داوای پارەیەکی زۆر زۆریکرد ، کە وەکو زیان بژاردنەوە (تعویض) بدرێتەوە بەوکاربەدەستانەی کەکەنارکراون (احیلوا علی التقاعد) لەسایەی حوکومەتە نوێکەدا. (ملك) سەبارەت بەوەی کەخۆی حوکومەتی میسربو ، هەرچیەکیان داواکردبوو سەلماندی ، ومواففەتی لەسەرکرد ، شەش ملیون ، وپێنج صەد هەزار جونەیهی دایەکاربەدەستەگەورەکان ، یەکێ هەشت هەزار وپینج صەد جونەیهان بەرکەوت سەیر ئەوەیە هەندێ لەم کاربەدەستانە کە ئەم بەخشیشە زۆرەیان وەرگرتبوو بەپێی رێکەوتنامەی تازە ، دووبارە گەرانە وەسەر فرمانەکانیان. دەبێ بزانین میسر وڵاتێکی بچوکە ژمارەی دانیشتوانی کەمترە لە سێیەکی ژمارەی دانیشتوانی ناوچەیەکگرتوەکان لە هیندستاندا.

دەستوری میسر بەئاشکرا دەلێت (هەمو دەسەلاتەکان لەمیللەتەوەیە) کەچی بەرلەمانی میسر لەوروژە وەیکەهەلبژێرراوە نەی توانیوە بەئازادی ئیش بکات ، وەکو لەبیرم بێت تائیستا ری بەبەرلەمانی میسرنەدراوە ماوەکەی خۆی بەپێی یاسانەواوکات ، هەمو جارێك (فؤآد) بەرلەمانەکەی

هەلوەشاندوتەوە ، كەوا لەكۆتابيدا دەستورەكەيشى پەك خست ، وەبە جۆرێكى ئوتوكراتى وڵاتەكەى بەرێوەدەبرد.

يەكەم هەڵبژاردن بۆ يەكەم بەرلەمان لەساڵى ١٩٢٣ ز.دا كرا (سعد زغلول) وحيزبەكەى كەپێى دەوترا حيزبى (وفد) زۆربەيەكى زۆريان وەرگرت لە ٩٠٪ ى دەنگەكانى وەرگرت لە ٢١٤ كورسى لەبەرلەماندا ١٧٧ كورسيان دەست كەوت ، حوكومەتە نوێكەبە سەركردايەتى (سعد زغلول) ويستى لەگەل بەريتانيادا رێك بكەويت بۆئەم مەبەسەجو بو (لندن) بەلام نەگەيشتە هيچ رێكەوتنێك ، وەگفتوگۆ وەستينرا لەئەنجامى ئەوەدا كەگەلێك كوسپى هاتەبەر وەكوكيشەكەى سودان ، بەسودانەدا روبارى (نيل)تێپەردەبێت لەووەختەوە كەمێژوو نوسراوەتەوە ، واتە پێش حەوت وەياهەشت هەزارساڵ لەمەوبەر ئەم روبارە شادەمارى ژيانى ميسربوە ، كشتوكاڵى ميسر بەمەوە بەندە بەهەرد و تەنيشت و كەنارى روبارەكەدا ، ژيان ، و زيندەگى پێدادیت و دەچێت ، لەئەنجامى ئەو لافاوەوەكە لەشوێنەبەرزەكانى وڵاتى (حبشە)ەوە دێتە خو وەوە ، وە لەگەل خويدا كليكى بەپيت دێنێت ، ئەم روبارە بيابانەكەى كردوەبە بەرزەويەكى بەپيت. لورد (ملنر)ى (سەرەك ليژنەكەى كەموقاتە عەكرا) ، لەبابەت (نيل)ەوە نوسيويەتىو دەڵێت:

"شتێكى ناخۆشەكەوا رێبازە هەميشەييەكەى ، كە ئەم روبارەى پێدادێت بەلاى ميسرەوە ، هەرمەسەلەيەكى كامەرانى ، و بوژانەوە نييە بەلكو مەسەلەيەكى ژيان و مردنەكە ئەگەر ئەم رێبازە دووچارى هەندى مەترسى ببێت ، چونكە سەرچاوەكانى روبارى (نيل) بەدەست ميسريەكانەوە نييە".

ئەم سەرچاوانەى روبارى (نيل) لەسودان دايە ، بۆيە گرنكى سودان ئاشكرايە لاى ميسر لەدێرينەوە ميسرو بەريتانيا ، پێكەوە بەهاوكارى يەكترى سودان يان بەرێوە دەبرد ، بۆيە پێى دەوترا: سودانى ميسرى ئينگليزى ، سەبارەت بەوەى كەبەريتانيا لەواقيعدا حوكمرانى ميسريشى دەكرد ئيتر رێى ناكۆكى نەبو لەسەر بەرژەوەنديەكان لەنێوان هەردولادا بەراستى ميسريەكان زۆر هاوكاريان لەگەڵنێك پرۆژودا كرد لەناو سودان دا ، لورد (كيرزون) لەساڵى١٩٢٤ز. دا لە بەرلەمانى بەريتانيا ووتى: كە ئەگەر

پارەی میسریەکان نەبوایە لەسوداندا بکار بهێنریت دەمێك بو سودان نابوت دەبوو ، کەمەسەلەی سەربەستی میسر هاتەکایەوە ، بەریتانیابیەکان ویستیان سودان بۆخویان بهێلنەوە ، هەروها میسریەکانیش هەستیان بەوەکرد کەتەنانەت بوونیان بەندە بە دەسەلاتیانەوە بەسەر سەرچاوەکانی (نیل)ی سەرروودا کەلە سوداندایە. لەبەر ئەمە ناکۆکی کەوتە نێوان بەرژەوەندیەکانی هەردولاوە.

لەسالی ١٩٢٤ز. دا کەمەسەلەکەی سودان باس دەکرا لەنێوان میسرو حوکومەتی بەریتانیادا سودانیەکان لەگەلێك موناسبەتدا خۆشەیستیو دلسوزی خۆیانیان بەرامبەر میسر دەردەبری ، ئینگلیزەکان پاداشی ئەمەیان بەوەدانەوە کەسزایەکی توندیان دان ، ئینگلیزەکان لەخۆیانەوە ، کەوتنە کار ، بۆئەوەی روایژ لەگەل حوکومەتی میسردا بکەن ، وەیان پرسی پێبکەن ، سەرەرای مافی ئاشکرای میسر لە هاوبەشی کردن ، لە بەرێوەبردندا ، بەتایبەتی میسر لەبەرێوەبردندا بەشێکی ئەرکەکانی دەدا و کەوتبوە سەرشانی.

ئنجا ئاموژگاریەکەی ترکە بەریتانیا دەیویست ، وە ناوی نابوو: ئیعلانی سەربەستی میسر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بیگانەکان بوو ، ئەم بەرژەوەندیان چین؟ لەنامەیەکی پێشوترا باسیم بو کردیت ، لەکاتێکدا ئیمپراتوریەتی تورکیا کزو لاوازبوو ، دەولەتە گەورەکان کردیان بەپێویستی بەسەر تورکیاوە کەهاوونیشتمانیانی دەولەتە گەورەکان کەلە تورکیادان رەفتارێکی تایبەتیان لەگەلدا بکرێت ، ئەمەوا دەگەیەنێت کەدەولەتە ئەو روپابیە بێگانەکان مل کەچی باساکانی تورکیا ، وەیا دادگاکاتی تورکیا نابن ئیتر تاوانەکە هەرچیەك بێت کە کردویانە بەلکو لای بالیۆزەکانی ، و بەرامبەر نوێنەرە دیبلوماسیەکانی خۆیان ، وەیان لەبەردەمی دادگا تایبەتیەکانی خۆیاندا کە حاکمەکانی لە بێگانە کانن موحاکەمە دەکرێن ، هەروها بێگانەکانجیاوازیو "ئیمتیازاتێکی" تایبەتیان هەبوو ، وەکو بەخشین و عەفوکردنیان لەهەموو جۆرە باجێك

لەبەرئەوەی حوکومەتی تورکیا ئەم ئیمتیازا تانەو جیاوازیانەی قوبول کردبوو ، دەبوایە ئەو ولاتانەی کە لەژێردەستی تورکیادان هەرهەمان ئیمتیازات و جیاوازی بۆبێگانەکان قوبول بکەن ، هەرچەندە هیشر

ژێردەستەی بەریتانیابوو ، هەرگیز پەیوەندی بەتورکیاوە نەبوو بەڵام بەبەشێك دادەنرا لەئمپراتوریەتی تورکیا ، بۆیە جیاوازیو ئیمتیازاتەکانی تیدابە ئەنجام دەگەیشت، بەم بۆنەیەوە لە سایەی ئەم وەزع وبارەریێك وپێکەدا سەرمایەدارەکانی بێگانە زۆربوون ، وەکاروباری خۆیانیان لەشارەکانی میسردا پەرەپێدا شتێکی زۆر سروشتیە کە بەرهەڵستی لابردنی ئەو رژێمە بکەن کە دەڵەمەندی کردون ، بەلکو باجیشیان لێ‌نەناسنی ئەمەیە بەرژەوەندیەکانی بێگانە کەحوکومەتی بەریتانیا بەڵێنی پاراستنی دابوو ، لەبەرئەمە لەتوانایدا نەبو بەم رژێمە رازی بێت ، ئەو رژێمەی کەوا هەربەشێك لەسەربەستییەکەی زەوت ناکات و بەس ، بەلکو پارەو دارایشی داگیر دەکات ، ئیتر لەهەروڵاتێکدا کەدەوڵەمەندترین کەس تیایدا باجی لێ‌نەسێنریت ، مەحالە هیچ چاکەیەك بەشێوەیەکی فراوان لەهیچ ولاتێکدا بکرێت لەراستیدا ئینگلیزەکان بەدرێژایی حوکومرانی راستەوخویان لەمیسردا هەرگیز هەوڵیان نەداوە خوێندن و فێرکردنی سەرەتایی بڵاوکەنەوە وەیان باری تەندروستی میسردا چاك کەن.

رێکەوتی سەیرئەوەیە بیروڕای ئیمتیازات وجیاوازی کەپەیدابوو لەتورکیاوە داکەوت کەچی لەئەنجامی سەرکەوتنی (اتاتورك)دا ئەوان خۆیان لێ رزگارکرد. ئەوی شایانی باسە لەم رووەوە ئێستا (جین) پەریشانە بەدەست ئەم ئیمتیازاتانەو جیاوازیانەوە لەناو ولاتەکەی خۆیدا هەروها ژاپونیش دوچاری ئەم ئیمتیازاتە هاتبو لەسەدەی نۆزدەهەمدا بەلام هەرکە بەهێزبو لای برد.

بەم جۆرە مەسەلەی بەرژەوەندیەکانی بێگانە بووبە کوسپێك لەرێی رێکەوتنندا لەنێوان بەریتانیاو میسردا ، بەراستی بەرژەوەندیەکانی بێگانە هەمیشە کوسپن لەرێی ئازادیدا.

حوکومەتی بەریتانیا بەمە وازی نەهێنا بەڵکو بریاریدا بەپێی مەردایەتیە بەناوبانگە کەی خۆی ، کەوا بەرژەوەندی کەمایەتیەکان بپارێزیت ، ئەمە یەکێك بوو لەو ئاموژگاریانە کەلە سەربەستیەکەی مانگی شوباتی ١٩٢٢ز. دا بڵاوکرایەوە. (قبطی)یەکان کە زۆرترین کەمایەتی بوون لەولاتەکەدا ـ دەڵێن ئەمانە لەمیسریە هەرەکۆنەکانەوە هاتونەتە خوارەوە لەبەرئەمە ئەمانە کۆنترین کەسن لەمیسردا ، ئەمانە نەسرانین (مەسیحین)

هەرلە یەکەم رۆژانی نەسرانیەتەوە ، تەنانەت پێش ئەوەی ئەورووپا ببێت بەنەسرانی ، ئنجا (قیطی)یەکان لەجیاتی ئەوەی سوپاسی حوکومەتی بەریتانیا بکەن چونکە بایەخی دا بەکەمایەتیە کان ، کەچی نارەزاسی خۆیان دەربڕی ، وە داوایان لەبەریتانیا کرد کەدەست نەخاتە کار ، و باریانەوە ، ئنجا کە بەریتانیاییەکان لەشوباتی ١٩٢٢ز. دا سەربەستی میسریان بڵاو کردەوە (قبطی)یەکان کۆبونەوە ، وبریاریان دا: "لەپێناوی یەکێتی نیشتماتی ، و دەستکەوتنی ئاواتی نەتەوایەتیدا ، ئەمان واز لەهەموو داخوزیەکی خۆیان دینن ، لەسەر بنیاتی نوێنەرایەتی کردنیان بەناوی کەمایەتیەکەوە ، و هەروها هیچ پارستنێکیان ناوێت" بەریتانیا سەرزەنشتی ئەم بریارەیان کرد ، و بەبریاریکی کەوچ یان ناوبرد! ئنجا هەرچیەك بوترێت دەربارەی ئەم بریارە ، کەوچ وەیا ئاغرانەبێت ، لەراستیدا سنورێکی بوواتەکانی ئینکلیزەکان دانا لەبابەت پاراستنی (قبطی)یەکانەوە ، ئیترکێشەی کەمایەتیەکان نەکرا بەبابەتی باس کردن ، لەواقعیدا (قبطی)یەکان بەکردەوە بەشداربوون و ترێدەکوشان لەپێناوی ئازادیدا هەندێکیان هاورێیەکی زۆر دڵسوزی (سعد زغلول)و (وفد) بوون.

ئنجا جیاوازی لەئاراستی بیروراد لەگەڵ ناکۆکی بەرژەوەندیەکانی میسر کە (سعد زغلول) نوێنەری بوو ، لەگەڵ بەریتانیادا هۆیەك بۆپچرانی گفتوگوکان لەساڵی ١٩٢٤ز. دا بەریتانیا رقی لەم ئەنجامە هەستا ، چونکە لەپێشدا چیبویستایە لەمیسردا دەی کرد ، بەڵام ئیستا تووستی لاساری بەرلەمانە نویکە ، و لاساری پێشەوایانی (وفد)بوە لەبەر ئەمە بەپێی شێوازە ئیستیعماریانەکەی خۆی ، بریاریدا دەرسێك بدابە (وفد)و حوکومەتی میسر هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە ، ئیتر دوای تێپەربوونی تەنها ماوەیەکی زۆرکەم ئەم هەلە هەڵکەوت. لەنامەیەکی ئایندەدا باسی ئەوەت بۆدەکەم ، کە بەریتانیا چۆن ئەم هەڵەی بۆهەلکەوت ، و چیکرد؟ چونکە ئەم کردەوەیەی بەریتانیا بەجۆرێکی ئاشکرا دەری دەخات کە ئیستعماری نویّ چی دەکات؟!

# سەربەستی لەسایەی بەریتانیاییەکاندا

**٢٢/مایس/١٩٣٣**

کچم لەنامەکەی دوایمدا بۆم نوسیبویت کەچۆن گفت وگوکەی ساڵی ١٩٢٤ز لە نێوان حوکومەتی میسر ، وبەریتانیادا سەری نەگرت ، وەچۆن بەریتانیارقی لەم سەرنەگرتنەهەڵسا ، ئنجا پێش ئەوەی ، بۆپێشەوەبچم لە گێرانەوەی ئەو گۆرانکاری یەی کەلەدوای ئەمەرووی دا ، دەبێت ئاگادارت کەم میسر سەرەرای ئەو (سەربەستی)یەی دەستی کەوتوە بەڵام بەدەست بەریتانیایەکان ، وداگیرکردنی سوپاییانەیانەوە مایەوە ، بەریتانیایەکان هەربەوەوۆەنەوەستان کە لەشکرەکەیان لەوی دانین ، بەلکو لەشکری میسریشیان خستە ژێردەستی خۆیانەوە ، وەئینگلیزیکیان کرد بەسەرۆکی و ناویان نا (سەردار) ، هەروها ئەفسەرەبەرزەکانی پولیسیش ئینگلیزبوون ، حوکومەتی بەریتانیا بەبۆنەی پاراستنی بیگانەکانەوە لەمیسردا دەستیان گرت بەسەر بەرێوەبەرایەتی پارە ، ودارایی(مالیە) ، ودادگا ، وبەرێوە بەرایەتی ناوخو ، واتە هەموو بەرێوەبەرایەتیە گرنکەکانی زەوت کرد ، دیارەلەم کاتەدا میسریەکان تێکرا داوای نەمانی ئەم زەوت کردنانەیان دەکرد ، لەگەل گەرانەوەی مافەکانیاندا.

لە ١٩ نوفەمبەری ساڵی ١٩٢٤ز. دا چەند کەسێك لە میسریەکان سەرداری ئینگلیزی (سیرلی ستاك)یان کوشت جگەلەوەی کە سەرکردایەتی سوپای میسری دەکرد و حاکمی سودانیش بوو ، دیارە لە ئەنجامی کوشتنی ئەم پیاوەدا سەکتەیەکی گەورەیان لێ کەوت چ لەمەسر ، وەچ لەئینگلتەرەشدا ،لەوانەیە ئەم سەکتەیە لای پێشەواکانی(وفد) زلتر ،وبەتین تر بێت ، چونکە دەیان زانی کە ئەمان توش دەبن بەراستی توش بۆنەکەیان گەلێك زووتر لەمەزندەکەی خۆیان هاتەدی ، لورد(لنبی) کە نێرراوی

بەرزی بەریتانیابوو (مندوب السامی) لەمیسردا لە٢٢ نوفەمبەردا ، واتەدوای کارەساتەکە بەسێ رۆژ هەرەشەیەکی (انذار) دابەحوکومەتی میسر ، وداوای ئەمانەی لیکرد:

١ـ مەعزەرەت هێنانەوە.

٢ـ سزادانی تاوانبارەکان.

٣ـ قەدەغەکردنی هەموخۆپیشاندانێکی سیاسی.

٤ـ پێشکەش کردنی ٥٠٠،٠٠٠ پنج صەدهەزار جونەیهی میسری وەکوزیانی بژاردنەوە (تعویض).

٥ـ کشانەوەی هەموسپای میسر لە سوداندا لەماندا لەماوەی ٢٤سەعاتدا.

٦ـ لابردنی هەمو سنورێك لە سەرئاودێری زەویەکانی ناوسودان ، چونکە لە پێشدا بۆبەرژەوەندی میسر دانرابوو.

٧ـ بەرهەلستی نەکردنی ئەوبیروڕایەی کەدەلێت حوکومەتی بەریتانیا بوی هەیە بێگانەکان بپارێزیت لە میسردا. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کەبەریتانیایەکان دەسەلاتیان بەرێوەبەرایەتیەکانی پارە ، ودارایی ، ودادگا ، وبەرێوەبردنی ناوخودا هەربمێنێتەوە.

ئەم حەوت داخوزیەشایانی سەرنج راکێشانە ، هەرچەندە مەسەلەکە بریتی یە لەوەی هەندی (لیستاك)یان کوشت کەچی حوکومەتی بەریتانیا گورج وە بەبێ لێکولینەوەکارێکی وایکرد ،کە حوکومەت، ومیللەتی میسر لێپرسراون (مسؤول) بەرامبەر بەم کوشتنە. سەرەرای ئەمە ویستیان هەندیك پارەیان دەست کەوتێت لەم مەسەلەیەدا ، ئەمەیان بە هەل زانی تاکو بەزۆر هەرچی ئەوکێشانەی لەنێوان ئەوان و حوکومەتی میسردا ماوەتەوە ، وجێبەجێ نەکراوە ، کە پێش چەند مانگێك لە(لندن)دا گفتوگوی لەسەرکرا وسەری نەگرت بۆئەوەی بەبەهانەی ئەمە وەجێبەجێ بکرێت. حوکومەتی بەریتانیا بەمەوەنەوەستا بەلکو هەمو خۆپیشاندانێکی سیاسی قەدغەکرد بەواتەیەکی تر ژیانی سروشتی گشتیان لەولاتەکەدا قەدەغەکرد.

بە راستی ئەوگورانکاری یەی لەدوای کوشتنە کە هات زۆر سەیرە پێویستی بەخەیالێکی بەپیت وفراوان هەیە بیرلێکردنەوەی ، سەیر لەم گورانکاریانەدا ئەوەیە ، دووپیاو(کەبەرەسمی هی حوکومەتی میسرن) ، وەئەم دوانەلێپرسراون ، لەنەقەومانی تاوان ، وپشێوی ، یەکێکیان بەرێوەبەری

پۆلیس قاهره ، وئەوی تریان بەریوەبەری گشتی ، بەریوەبەرایەتی ئەوروپا یيەکان بۆ ئاسایشی گشتی بۆ(المدير العام للادارة الأوربية للأمـن الـعـام) ئەم دوانه هەردوکیان بەریتانیایی بوون کەسیش رووی‌دەمی تـێـنـەکـردن ، وەبەلی پرسراویان دانەنان لە کوشتەکەدا ! بەلام حوکومەتی میسری بەوزمان دابەکسەر دوای کوشتنەکه بی‌ناخوشی وغەمباری خویی دەربری ، کەچی حوکومەتی بەریتانیا بەجۆرێکی ناشیرین داخی خویی بەورشت.

حوکومەتی میسر لەلوتی‌درا ، (زغلول باشـا) نـزیـکـەی بـه هـەمـو مەرجەکانی هەرەشەکەرازی بو ، لەماوەی بیست وچوارسەعاتـدا تـەنـانـەت نیوملیون جونەیهە میسریەکەیشی زیانی‌بژاردنەوە دا ، بەلام حـوکـومـەتـی میسر نەیتوانی وازلەمافەکانی بێنی لەسوداندا ، لورد(لنبی) بەم سەرشوری وبارانەوەی میسرەوە وازی‌نەهێنا ، کەبینی مەرجەکانی کەپەیوەندی (هەیە بەسودانەوە قوبول نەکراون ، بەئەنفەست و بەزەبری‌هێز ، وزۆر بـەنـاوی حوکومەتی بەریتانیاوە دەستی‌کرت بەسەر کومرکـی ئـەسـکـەنـدەریـەدا ، وداهاتەکەی خستەژێردەستی خـۆیـەوە ئـنـجـا لەباش ئـەمـە سەرەرای ئەوبیزاریانەی کە میسر دەری‌بری ، بەریتانیا مەرجەکانی خـۆیـی لەسوداندابە ئەنجام کەیاند ، وکردی بەموستەعمەرەیەکـی‌ئـیـنـکـلـیـز ، وئەوسوپا ولەشکرەی میسر کەلەسودان داهەبوو ، هەلسان ، بەلام بـەوپـەری دلرەقی ، ودرندەبیەوە بەریتانیا سەری پێ‌شورکردن.

کە (زغلول باشا) ئـەیدی ، خۆی ، وحوکومەتـەکـەی لـەسـەر ئـەم کردەوانه ، وازیان هێنا ، (استقاله)یان کرد ، وەلەهەمان کـاتـدا (ملـك فؤاد) بەرلەمانی هەلوەشاندەوە بەم شێوەیە ئینگلیـزەکـان لـەدەرکـردنـی (زغلول ، وحیزبی وفد) لەحوکومەتەکەدا سەرکەوتن ، وەبـەلایـکـەمـەوە ، وتاماوەیەك کۆتاییان بەبەرلەمانەکەهینا ، وسودانیان داگیرکرد ، ئیـتـر ئیگلیزەکان کەوتنە وەزع وبارێکەوە کەدەیان توانی میسر بخنکێنن بەهـۆی دەسەتیانەوە بەسەر ، سەرچاوەکانی رووباری (نیل)دا.

بەرلەمانە کولولەکەی میسر هانای‌بردەبەر (عصبة الامم)(١) کەفـریـای کەویت "دژی بەکارهێنانی رووداوێکی ناخۆش لە پێناوی هێنانەدی ئامانجە ئیستیعماریەکاندا" بەلام ئەم (عصبە)یە وەیائەم تاقمە ئیسپاتیـان کـرد ، کەکەروکوێرن بەتایبەتی ئەگەرشکات و سکالاکەدژی دەولەتێکی گەورەبێت.

لەوکاتەوە لە میسرد لەنێوان (حیزبی وفد) کەنزیك بولەنوێنەرایەتی میللەتی میسرەوە لەلایەنێ، لەلایەکی تریشەوە (ملك فؤاد ، و مەندوبی سامیبەریتانیا) کەوا بەرزەوەندیەکانی بێگانەو چلکاوخور ، و تەوەزەلەکانی سولتان وهیتر پشتیان دەگرتن. (ملك فؤاد) زۆر جاربەجۆرێکی ئوتوکراتیانە و دیکتاتوریانە لەولاتەکەدا حوکمرانی دەکرد ، بەمەسەربیجی لە دەستوریش دەکرد لەکاتیکداکە زۆی دەدابەبەرلەمان کۆببیتەوە ، ئەوسا بۆی دەردەکەوت کەولاتەکە نزیکەی هەمووی پشتی حیزبی (وفد) دەکرێت. بۆیە بەرلەمانەکەی هەلوەشاندەوە. (فؤاد) نەی دەتوانی بەم کردەوانە هەلسیت کە ئەگەر بەریتانیاییەکان ، سوپا و پولیس کەلەژێردەسی خۆیاندابو پشتینەکرن ، لەبەر ئەمە میسری (سەربەست) وەکو ویلایەتێکی هیندستان رەفتاری لەگەلدا دەکرا ، کەبەتەواوەتی لەژێردەستی حاکمەبەریتانیایەکە دابێت.

بەرلەمان لە سالی ١٩٢٤ز. دا هەلوەشێنرایەوە ، وەلە مارتی سالی ١٩٢٥ز. دا بەرلەمانێکی نوێکوبووەوە زۆربەیان (وفد)ی بوون ، هەرکەکوبوەوە (زغلول)پاشایان هەلبژاردەوەبە سەرەکی خۆیان ئەمەبەدلی (ملك فؤاد) و ئینگلیزەکان نەبوو ، هەر ئەوروژەی کەتیایدا کوبوەوە (ملك فؤاد) فەرمانیدا بە هەلوەشاندنەوەی ، دوای ئەوە سالێك تیبەری هیچ بەرلەمانیك تیایداکونەبوەوە ، جگەلەوەی کەئەم بە پێچەوانەی مادەکانی دەستورەوەیە ، (ملك فؤاد) لەم ماوەیە دا ، حوکمرانیەکی دیکتاتورانەیکرد ، وە نێرراوی بەرزی بەریتانیاش (مندوب السامی البریطانی) لە پشت بەردەوە ، دەیجولاند ، ولاتەکە هەمووی لەمەزرقیهەلسا ئنجا (سعد زغلول) توانی هەمو حیزبەکان یەك خات بوبەربەرە کان ئینگلیزو (ملك فؤاد). لەنوفەمبەری سالی ١٩٢٥ز. دا ئەندامانی بەرلەمانەکە بریاریان دا کۆبنەوە ، وسەرپێچی لەبریاری حوکومەت بکەن کەوا کۆبونەوەی لی قەدەغەکردون. کەدیان بینای بەرلەمان هێنری لە شکرداگیریکردوە کوبوونەوەکەیان لە شوینێکی ترداکرد.

ئیتر لەم کاتەوە (فؤاد) هەولیدا هەموو دەستورەکە بگۆرێت بەدەرهێنانی پەیرەوێکی شاهانە ، لەمەدا مەبەسی ئەوەبو کە بەرەوبەرێت پەروەرییەکی توندی بەرێت ، تاکو بتوانێت بەرلەمانەکانی داهاتوو زۆر

بەئاسانی بخاتە ژێردەستی خۆیەوە ، تابۆی بکرێت ، نەهێلێت (وفد)بەکان بێنەناوی ، بەڵام بێزاری دەربرین لە سەرئەم کردوەیە گەیشتە ئەوپەری ئاسمان ، دەرکەوت هەرهەڵبژاردنیك بکرایە لەسایەی یاساتازەکەدا کەس هاوبەشی تێدانەدەکرد ، تێکرابەلایدا نەدەچوون و موقاتەعەیان دەکرد. ئیتر(ملك فؤاد) ناچاربوو کە هەڵبژاردنەکە ، بەپێی یاسا کۆنەکەبکات ، کەئەنجامەکەی سەرکەوتنێکی تەواوبو ، بۆحیزبی (وفد) چونکە ٢٠٠کورسیان دەست کەوت بەرامبەر ١٤کورسی بۆئەوانەی دژی (وفد) بوون! گومانیتیدانەما کە(زغلول) نوێنەری میسر وخواستیخەلکی میسربو. سەرەرای ئەمە نێرراوی بەرزی بەریتانیا (المندوب السامی البریطانی) (لوید) ناو بەرهەڵستی ، کردنی (زغلول) پاشایکرد کە ببێت بەسەرەك وەزیران ، ئیتر (ملك) یەکێکیتری لەجیاتی ئەم دانا. زۆر شتێکیزەحمەت نییە کەبزانین هۆیچیبوو کە ئینگلیزەکان دەست بخەنە ئەم کارەوە ، حوکومەتە نویکە لەزوربەی (وفد) یەکان دروست بوو ، سەرەرایهەموو هەول و تەقەلایەکیش کە دەدراکە تۆزێك لەتوند ، و تیزی کەم کریتەوە بخرێتەسەرباری هەلویستێکی مام ناوەندی ، بەلام زۆرجار ، توشی درندەیی ، وفیززلی ، هەرەشەی هەمیشەیی (لوید) دەبوون کەوا گەشتیە جەنگیەکانی بەکاردێنیت لە لێدانی میسردا.

لەساڵی ١٩٢٧ز.دا تەقەلایەکی تر درا بو ئەوەی لەگەل بەریتانیادا رێکەون ، بەلام ئەمیش سەری نەکرت.لەگەل ئەوەشدا سەرەك وەزیران کە ناسرا بوو زۆر مام ناوەندیە ؛ ئەمیش سەرسام بوو ، لەمەرجەگانی ، تەقەلایە. بەریتانیا دەیەویست میسر ببێتە پاریزرا.یك (محمیە) لەلایەن بەریتانیاوە بەلام لەپشت بەردەی پەیماننامە سەربەستیەکەوە.

لەکاتی ئەم گفتوگۆیەدا پیشەوای مەزنی میسر (سعد زغلول) لە٢٣ ئابی ١٩٢٧ز.دا لەتەمەنی حەفتاساڵیدا مرد ، (زغلول) مرد بەلام یادی ئەو لەمیسرد هەر ێندوە ، و بلیسە بەتوانای میللەت دەسێنیو ، زیاتر بەرەو پێشە وەی دەبات ، تا ئێستاش (صفیە زغلول)ی ژنی جێی رێزی میللەتە ، تەنانەت نازناوی (دایکی میسریەکانە) ماڵەکەی بوە (خانەی میللەت) نیشتمان پەروەان تیایدا کۆدەبنەوە.

(مصطفى النحاس) لەپێشەوایەتی حیزبی (وفد) داجێی (زغلول)ی گرتەوە ، لەئەنجامی ئەمەدا هەوڵیدا سووکە ئیصلاحاتێك بێنێتە ولاتەکەوە دەربارەی ئازادی تایبەتی (الحریة الخاصه) لەگەل ئازادی میللەت لەبوون و هەلگرتنی چەکدا ، دوای ئەوەی کەئینگلیزەکان ئەم ئازادییەیان لابرد لەکاتێکدا کە ئیعلانی حوکمی عورفیان کرد بو ، ئنجا هەرکە بەر حەمان دەستی کرد بە گفتوگۆکردن ، لەسەر ئەم باسە هەرەشە لەئینگلتەرەوە هات کە دەبێت ئەم کارە روو نەدات ، رەنگە وا بەخەیالدا بێت کەشتێکی سەیرە ئینگلتەرە دەست بخاتە ئەم ئەم کاروبارە ناوخۆییە رووتییەوە ، بەلام (لوردلوید) بەبێ پێشە کۆنەکەی هەرەشە یەکی دابە حکومەتی میسر ئاگاداری دەکات لەئەنجامی دەست دانە کردنی ئەم ئیصلاحاتانە وەفەرمانی بەگەشتیە جەنگیەکانی بەریتانیادا کە لە (مالطە)وە بەرەو ئیسکەندەریە بچن (النحاس) نەختێك گەرایە دواوە ، لەپاشاندا بەوە رازی بوو کە لێدوان و سەیرکردنی ئەم کاروبارانە بخاتە دەورە ، و کوبوونەوەی ئایندە دوای چەند مانگێکی تر.

بەلام دەورەی ئایندە پێك نەهات چونکە (ملك) کەنوێنەری کۆنەپەرستی بو ، وە نێرراوی بەرز ( لمندوب سامی) کە نوێنەری ئیستیعمار بوو پێکەوە هاوکاریان کرد و ، بریاریان دا رێی بەپەرلەمان نەدەن "بێشەرمیەکەی خویی تێدابکات" ئەم موئامەرە ، و ناپاکیەبە جۆرێکی سەیر دروست کرا: (النحاس) زۆر بەراست و دوروستی و رەوشتێکی بەرز ناسرابوو ، لەناکاو لەگەل پێشەوایەکی تردا لەپێشەواکانی (قبطی) لە (وفد) یەکان ، تاونبار کران بەخراپەکردن لەسەرتامەیەك کە لەدوایدا ئیسپات بوو ساختەبە ، ئنجا کۆشکی شەهانەو ئینگلیزەکان پروپاغەندەیەکی فراوانیان کرد بۆ ئەم تومەتە درویە ، نەك هەر لەمیسردا بەلکو لەولاتە بێگانەکانیشدا ، بەهۆی وەکالەتی هەواڵ و رۆژنامە بێگانەکانەوە ، سەبارەت بەم تومەتە (ملك فؤاد) داوای لە (النحاس) کرد کە وازبهێنێو (استقاله) بکات بەلام ( لنحاس) ئەمەی نەکرد ، ئنجا (فؤاد) بەدەرکردن دەری کرد ، دوای موئمەرە ، و ناپاکیەکەی (لوید ـ فؤاد) موئامەرویەکی تر کرا: (ملك) دووبارە بەرلەمانی هەلوەشاندەوە ، و دەستکاری دەستوری کرد ، ئەو بەندو مادانەی کەپەیوەند هەبوو بە ئازادی رۆژنامەو ،

ئازادیەکانی ترەوە لای بردن ، و خۆیی‌کرد بەدیکتاتوریك ، رۆژنامەکانی ئینگلیز ئەمەیان پێ‌خوش بوو ، هەروها ئەو ئەوروپا بیانەی کەلەمیسردا جێگیر بو بون.

سەرەرای ئەم هەموو کردارە زۆردارانەیە ئەندامانی بەرلەمان کوبوونەوەو بلاوبان کردەوە کە حوکومەتە نوێکە شەرعی ، و هی د لەت نییە ، بەلام (لویدو فؤاد) گوێیان نەدایە ئەم بریارە ، چونکە هەر ئەوەندەی لە "یاساو رژێم" تێدەگەن کە بریتی بێت لە بەهێزکردنی کۆنە پەرستیو ئیستیعمار نەك بەکژداچوونی ئەم کۆنەپەرستیە.

ئەو دەعوایە سەری نەگرت کە حوکومەتی میسر دژی (النحاس) دابووی بەدادگا ، سەرەرای جۆرە هاتین بۆ هێنان ، و هێز کەوا حوکومەت بەکاری هێنا ، وە دادگا بریاریدا کە تومەتەکە درۆیە ، بەلام حوکومەت (خوا چاکی بۆ بکات کەچەندە مەردە) فەرمانی دا بریارەکە لەرۆژنامەکاندا بلاونەکرێتەوە ، بەلام هە لەکە بلاوبوەوە ، وە خۆشیو شادیش لەگەلیدا بلاوبوەوە.

رژێمی دیکتاتووریەت کەوا (لوید)و هێزەکانی بەریتانیا پشتی دەگرت هەولیدا کە حیزبی (وفد) بیلیشینیتەوە چونکە نوێنەری بزوتنەوەی نیشتمانی بوو لەمیسردا ، لەپێناوی ئەمەدا گەلێك چەکی بەکارهێنا بەتوقاندن (الارهاب)و چاودێری کردنی (مراقبە) رەنگ و باس ، لەگەل ئەمەشدا گەلێك خۆپیشاندانی گەورە بەرپا بوو ، بەتایبەتی ئافرەت بەشداری تێدا کرد ، بۆ ماوەی حەفتەیەك مان گرتنێکی سەرومر دەستی پێکرد پارێزەران (محامی) و هیتریش تیایدا مان یان گرت ، بەلام رۆژنامەکان هیچ باسی ئەم هەوالانەیان نەکرد ، بەهۆی چاودێری (المراقبة) کردنەوەوە.

بەم جۆرە سالی ١٩٢٨ ز. تێپەری کەبشیوی ، و کوبرەوەری بالی بەسەردا کێشابوو ،لەکۆتایی ئەم سالەدا گورانێك لەبار،و وەزعی سیاسیدا رووی دا لەناو ئینگلتەرەدا کەوا ئەنجامێکی راستەوخوی هەبوو لەناو میسریشدا ، لەوی - لەبەریتانیا - حوکومەتێکی کرێکارانە پێك هات ، یەکەم شتێك کە ئەم حوکومەتە کردی (لوید)ی بانگ کردەوە کەوای لێهاتبو کەس حەزی لەچارەی نەدەکرد تەنانەت حوکومەتی بەریتانیا خۆیشی

ئیتر بەرویشتنی (لوید) هاوپەیمانیەکەی نێوان (فۆآدو ئینگلیزەکـان) کـز بوو ، ئیتر (فۆآد) بڕیارمەتی ئینگلیزەکان نەیدەتوانـی لـەدەسیـسـەو ناپاکیەکانیدا بەردەوام بێت ، لەبەر ئەمە لەدیسەمبەری ١٩٢٨ز. دا (ملـك فۆآد) ڕیدا کەهەڵبژاردن بکرێت بۆ بەرلەمانێکی نوێ ، حیزبـی (وفـد) سەرکەوت لەدەستکەتنی نزیکەی هەمو کورسیەکاندا.

حوکومەتە کرێکارانەکەی بەریتانیا ، جارێکـی تـر دەسـتـی کـردەوە بەگفتوکوکردن لەگەل میسردا (النحاس) لەساڵی ١٩٢٩ ز.دا بۆ ئەم مەبەسە چو بو (لندن) حوکومەتە کرێکارانەییەکە گەلێك مام ناوەندی تر بوو لەوی پێشووتری وەبیرورای (النحاس)ی قوبول کرد دەربارەی سێ ئاموژگاریەکە ، بەلام لەبابەت ئاموژگاریەکەی سودانەوە نەگەیشتنە هیچ ڕێکەوتنـێـك بـەم جۆرە گفت وگۆکردن جارێکی تریش سەرینەگرت. بەلام هـەردولا لـەهـەمـو بیروراکانی یەکتری تێگەیشتن و بابەخیان پێدا ئیتر لەیەکتری جیابونەوە وە هەریەکەیان دۆستایەتی ، و پێخوشحالی بەرامبـەر بـەویـتـر دەربـری. ئنجا برباریان دا کەجارێکی تر لەبـاسـەکـە بـدویـن ، ئـەمـە تـێـکـرا بەسەرکەوتنێك دادەنرا بو (النحاس و ، وفد) ئەمە بەدڵی (ملـك فـؤآد)و ئینگلیزەکان و خاوەن فرمان ، و بارە نەبو کەلە میسردا جێگیر بوبـون ، لەبەر ئەمە دوای چەند مانگێك ناخۆشی کەوتە نێوان (ملك و بەرلەمانە)وە لەمانگی یونیو ١٩٣٠دا (النحاس) وازی لەوەزارەت هێنا واستقالەی کرد.

ئیتر لێرەدا (فؤآد) جلەوی حوکمرانی گـرتـە دەسـت ، و خـۆی کـرد بەدیکتاتوریك ئەمە دووەم جارەکە خۆی دەکات بەدیکتاتور ، لەپـاشـانـدا بەرلەمانی هەلوەشاندەوە ، وە رۆژنامەکانی (وفـد)ی داخـسـت ، ئـیـتـر حوکمرانیەکی توندو دڵرەقانەی کرد. ئەندامانی هەردو ئەنجـومـەنـەکـەی بەرلەمان سەرپێچیان لەحوکومەتی کۆشك کرد ، بەرەو چوونە ناو بـیـنـای بەرلەمان کەوتنە ری لە ٢٣ یونیوی ١٩٣٠ز. دا لەوێدا کۆبونەوەیـەکـیـان کرد ، سوێندیان خوارد کە دلسوزی دەستوربـن و ، تـا لـەتـوانـایـانـدا بەبیپارێزن ، ئنجا ولاتەکە گەلێك خۆپیشاندانی قەلەبالغی بەسەردا هات ، پۆلیس و لەشکر کوژاندیانەوە گوژراو ، و بریـنـداری تـێـدا دەکـەوت ، (النحاس) خۆیشی بریندار کرا. بەم شێوەیە هێزی پۆلیس و لەشکـر کـەوا ئەفسەرە بەریتانیاییەکان سەرکردەییان دەکرد ، پشتی دیکتاتوریەتیکـیـان

گرت کە میللەت تێکرا بەربەرەکانی دەکرد ، مشتێك لەئەرستوکرانـــی ، و دەولەمەندەکانی کە دەوری (ملك) یان دابوو ، ئەمانە نەبێت کـەسـی تـر پشتی دیکتاتوریەتەکەی نەدەگرت ، ئنجا ئەوانەی کە کەلە کومەکێـشـیـان دژی ئەم دیکتاتوریە تە دەکرد سەرەرای (وفد) یەکان ، مام ناوەندی ، و ئازادەکانیش کەوا بەرهەڵستی هەمو کردارێکی زۆرە ملیان دەکرد کەمیللـەت پێی هەلدەستیت ئەمانە هەمویان چوونە پال ئەو گەلە کومەکیە.

لەساڵی ١٩٣٠ز. دا (ملك) پەیرەویکی دەرکرد تیایدا دەستورێکی نوێی بلاو کردەوە ، کەوا لەدەسەلاتی بەرلەمانی کەم کردەوە کەچـی دەسـەلاتـی خۆیی زیاد کرد ، ئیتر بەدەرهێنانی تەنها پـەیـرەوێـکـی رووتـی ئـەم کردەوەیە لای (ملك) شتێکی زۆر ئاسان بوو ، چونکە لە واقیعدا پـشـتـی دابوو بەدەولەتێکی ئیستیعماریەوە.

لەبابەت چیرۆکی ئەم نو ساڵەوە لەمبسردا لە ١٩٢٢ تـا ١٩٣٠ بـەدورو دریژی باسم بۆ کردیت چونکە من بەچیرۆکێکی سەیری دەبینم لەبەرئـەوەی ئەم ساڵانە کەوتبوونە سەردەمی (سەربەستیە)کەوە بێبەبێ واتەی بەریتانیا لەشوباتی ١٩٢٢ ز.وە ، و کەسیش گوێی نەدایە خواست و ئارەزووی گەلی میسر ئەمیش ، هەرکە هەلیکی بۆ هەل بکەوتایە ، کە رای خۆیـی تـێـدا دەربریت ، زور بە لە(قبطی) و موسولمـانـە کـان (وفـد) یـەکـانـیـان هەلدەبژارد ، لەبەر ئەوەی میللەت دەیەویست دەسەلاتی بێگـانـەکـان کـەم کاتەوە ، لەچەوساندنەوەی ولاتەکەیدا ، بەتایبەتی بەریتانـیـایـیـەکـان. ئەمانیش هەمیشە و بەگەلێك جۆر بەهێزو زۆرەملی بەساختە ، و ناپاکـی ، و دەسیسە بەرهەڵستیان دەکردن ، بۆیە (ملك) یکیان دانا کەی ویستیـان ، و چۆنیان بویت بێجۆلێنن.

بزوتنەوەکەی (وفد) بزوتنەوەیەکی نیشتمانی بورجوازیانە بوو

لەپێناوی سەربەستیدا هەولی دەدا کەچی دەستی بۆ چاککردن و ئیصلاحاتـی کۆمەلایەتی نەدەبرد ، کە بەرلەمان کۆدەبودووە ، کارو باری بـاشی دەکرد لەکۆری فێرکردن و کۆرەکانی تردا. لەرستیدا لەماوەیەکی کورتدا بارلەمـان سەرەرای ئەوەی کە بە تێکوشانی نیشتمانیەوە خەریـك بـوون ، گـەلـێـك کاروباری وا باشی کردوە کەئینگلیزەکان لەماوەی چل سالە رابـوردوەکـەدا ئەوەندەیان نەکردوە ، خۆش ویستنی (وفد) یەکان لای فەلاحەکان لەکـاتـی

هەلبژاردن ، و خۆپیشاندانە کاندا دەردەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا بزوتنەوەکەی (وفد) کەنوێنەری چینی ناوەراست بوو نەیتوانی ئارەزوو ،، و کەرم و کوڕی جەماوەری گەل بجولێنی تا ئەو رادەیەی بتوانی بزوتنەوەکە بگەیەنیتە ئامانجی ئیصلاحاتیکی فراوانی کۆمەلایەتی.

پێش ئەوەی ئەم نامەیەم کۆتایی بێنم ، دەبێت ئاگادارت کەم لەبزوتنەوەی ئافرەتان لەمیسردا ، ئافرەت لەهەمو ولاتە عەرەبیەکان ، تەنها لەدورگەی عەرەبدا نەبێت خەبەریان بوەوە میسر لەم رووەوە پێش عیراق ، و سوریە ، و فەلەستین کەوتوە ، لەهەمو یاندا بزوتنەوەیەکی رێك و پێکی ئافرەتان هەیە ، بۆ نمونە لەمانگی یولیوی ١٩٣٠ ز.دا کۆنگرەیەکی ئافرەتانی عەرەب لەمیسردا بەسترا. ئەم کۆنگرەیە باسی کێشە کۆمەلایەتی ، و رۆشنبیریەکانی هەرەبی کرد وە بایەخی بەمانە زیاتردا تا بەکێشە سیاسیەکان ، بەلام ئافرەت لەمیسردا حەز دەکات بەشداری بزوتنەوە سیاسیە کان بێت ، بۆیە دەبینین ئافرەت بەشداری لەخۆپیشاندانە سیاسیەکاندا دەکات کە مافەکانی هەڵبژاردنی بدرێتی ، هەروها داوا دەکات کە لەیاسای ژن هێنان و شوکردندا ئیصلاحات بکرێت ، وەداوا دەکات کە لەگەل پیاواندا لەفەرمانبەرێتی گشتیدا چون یەك تەماشا بکرێن ،.. هند ئافرەتە موسلمانەکان هاوکاری تەواو لەگەل ئافرەتە مەسیحیەکاندا دەکەن ، لەهەمووولایەکدا رەوشتی بەجەکرتنەوە لەتەمانەدایە بەتایبەتی لەمیسردا ، راستە بەتەواوەتی لانە چوە وەکولەتورکیادا لاچوە ، بەلام بەرێوەیە نەمێنیت.

تێبینی (ئۆکتوبەر ١٩٣٨):

لەساڵی ١٩٣٠ ز. وە میسر لەژێر حوکمیکی دیکتاتوریدایە کە کۆشکی شاهانە دەسەلاتی بەسەریدایە گوایا (دەولەتێکی ئازاد ، و سەربەستە) بەلام لەواقیعدا لەهەمو شتێك زیاتر لەموستەعمەرەیەکی ئینگلیزیەوە نزیکترە ، وە مولکەی هێزەکانی بەریتانیایە ، ئەم هێزانە لەقاهیرە ، ئەسکەندەریە ، نۆکەندی سویس ، و سودانداپە ، ئەم سالانە سالانی تەنگ و چەلەمە ئابوریە کەیەلەهەمو لایەکی جیهاندا ، و کارێکی زۆری‌کردە میسر چونکە نرخی لوکە هاتە خوارەوە.

سالی ١٩٣٥ ئیتالیای فاشستی پەلاماری حەبەشەیدا ، مەترسیەکی نوێ رووی کردە میسر ، و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەدۆلی (نیل)دا ، بەمە بەریتانیا ناچار بوو کە پەیوەندیەکانی نێوان خوی ، و میسر بگۆریت ، چونکە بو بەریتانیا باش نەبوو میسر رقی لێیهەلسیت و لەبەریتانیا رازی نەبێت. لەهەلبژاردنەکانی بەرلەماندا حیزبی (وفد) سەرکەوت (النحاس) بو بەسەرەك وەزیران ، ئیتر سەربارەت بەداگیرکردنی حەبەشە لەلایەن ئیتالیاوە ، ئاو ، و هەوای نیو دەولەتان گوررا. میسر گەیشتە رێك کەوتنێك لەگەل بەریتانیادا ، لەمانگی ئابی ١٩٣٦ز.دا پەیمان نامەیەکی ئیمزا کرد ، میسر رازی بوو ، کە وازبێنی لەگەلێك لەوشتانەی کەپێشتر سوور بوو لەسەری لەپێناوی ئاشتیدا ، ئنجا بەوەزع و بارێك کە لەسوداندا هەبو قایل بوو ، دانی نا بەمافی ئینگلتەرەدا کە بۆی هەیە نۆکەندی سوێس بپارێزیت و بەرگری لێبکات ، وە سیاسەتی دەرەوەی میسر بەئینگلتەرەوە ببەستێت ، و بەریتانیاش بەلێنیدا کەیارمەتی میسر بدات لە لابردنی دادگا هەرەمەییەکان (المحاکم المختلطة) و جیاوازی و ئیمتیازاتەکانی بیگانەکات ، وەمیسریش بخاتە کۆمەلی میللەتانەوە (عصبة الأمم).

بۆ ئەم بەیماننامەیە خۆشی ، و شادی بلاوبووەوە ، بەلام دەرکەوت کە ئەم خۆشیو شادیە وەختی نەبوو ، جگەلەوەی کە (فؤآد) مرد ، و (فاروق) هات کۆشکی شاهانە هەر بەردەوام بو و لەخۆش نەویستنی (وفد) و دروست کردنی دەسیسە ، و موئامەرەدا ، ئیستیعماری بەریتانیاش لەپشت پەردەوە هەر لەکاردا بوو. بەشێکی زۆر لەزەویەکانی میسر مولکی ژمارەیەکی کەمی چەند کەسێکە ، خێزانی مەلیك (العائلة المالکة) بەشێکی زۆر زۆریان هەیە ، خاوەنی ئەم مولکانە هەمیشە بەتوندی بەرهەلستی هەمو یاسادانانێکی ئیصلاحیو هەمو هێزیکیان بۆ میللەت دەکرد لەبەر ئەمە هەروەکو جاران بەکژداچون بەردەوام بوو ، (ملك) (النحاس)ی دەرکرد لەسەرۆکایەتی وەزارەت ، وە بەرلەمانیشی هەلوەشاندەوە.

ئنجا لەمیسردا حوکومەتێك لەپیاوانی کۆشکی شاهانە (القصر الملکی) پێك هات ، هەلبژاردنی نوێی دەست پێکردەوە ، هەمو خەلکی سەرسام

بوون کەحیزبی (وفد) خراپ نوشوستی هێنا ، لەدواییدا دەرکەوت کەهەڵبژاردنەکە هەمووی ساختەیە ، تا ئێستاس حیزبی (وفد) و (النحاس)ی پێشەوای لەناو میللەتدا زۆر خۆشەویستن ، بەڵام حوکومەتەکەی ئێستا پیاوانی کۆشك (رجال القصر) هەڵی دەسورێنن ، وە ئیستیعماری بەریتانیاش پشتی دەگرێت.

---

(١) (عصبة الأمم) وەیان کۆمەلی میللەتان: هەیئەتیکی نێوە دەولەتان بوو دوای جەنگی جیهانی یەکەم دروست بوو ، بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانی ، و مافی میللەتات ، نیشتەجێیان لە(جنیف) بوو لە(سویسرە) ، لەبەر ئەوەی ئەم کۆمەلە زۆربەی زۆریان لەدەولەتە سەرمایەداریەکان ، و ئیستیعماریەکان بوون ، و سەبارەت بەجم وجولی دەولەتە ئیستیعماریەکانەوە ، و خۆ ئامادەکردنیان بو ، جەنگێکی دوەمی جیهانی ئەم کۆمەلە (عصبة الأمم)ە پەکی کەوت. ئنجا دوای جەنگی دوەمی جیهانی لەساڵی ١٩٣٩ ـ ١٩٤٥ز. هەیئەتی میللە تە یەککگرتوەکان (هیئة الأمم المتحدة) و ئەنجومەنی ئاسایش (مجلس الأمن) دروست بو کە هەردوکیان دەورێکی باش دەبینن لەپاراستنی ئاشتی جیهانیدا.

# وڵاتە عەرەبیەکان-سوریا

## ٢٨/مایس/١٩٣٣

دیمان ئەو بەیوەندایەتیەی کە دەستە ، و تاقم و بەرەکانی خەلك بەیەکە وە دەبەستێت ، کە چۆن نەتەوایەتی ئەم پەیوەندایەتیە بەهێز دەکات لەنێوان ئەو خەلکەی کەوا لەولاتە جیاوازەکاندا دەژین کەوا لەزمان و نەریتەکاندا هاوبەشن ، ئەم نەتەوایەتیەی کە ئەم دەستە ، و تاقم ، و بەرانە بەیەکەوە دەبەستێت هەمان دەستور لەنەتەوەکانی تریشیان جیا دەکاتەوە کە لەولاتەکانیتر دان ، نەتەوایەتی فەرەنسەی کرد بە یەکێتی‌یەکی بەهێزی یەککگرتوو ، کەوا سەیری بەشەکانی تری جیهان بەجورێکی جیاواز دەکات ، دیسانەوە نەتەوایەتی هەمان کاری لەگەلەکانی ئەلمانیا کرد ، وەکردنی بەیەك میللەت بەلام ئەم دوو نەتەوەییە هەردوو ولاتەکەی لەیەك جیاکردەوە ، و پەرژینێکی لەنێوانیاندا دروست کرد.

ئەگەر ئەم نەتەوایەتیە لەولاتێکدا بێت هەمە جیزە (جنسیات مختلفە)ی تێدا بژی ، واتە فرە نەتەوایەتی بێت ، ئیتر ئەم نەتەوایەتیە بەهێز کردنی پەیوەندایەتیەکەی ، کە بەیەکیانەوە دەبەستێت لاوازی دەکات. بۆ نموونە ئیمپراتوریەتی (نەمسایی - ومجری) پێش جەنگی (یەکەمی) جیهانی یەك ولات بوون بەلام چەند رەسەن و نەتەوەیەکی تێدا بوو گرنگەکەیان نەمسایی ، و مجری ، و ئەلمانی بوون ، گەشە نەکردنی نەتەوایەتی تیایدا ولاتەکەی لاوازکرد ، چونکە هەموو نەتەوەیەك لەم نەتەوانە دەیەویست ئازادی خۆیی دەست کەوێت دوای ئەوەی کورێکی نویی تیهاتەوە.. کە جەنگەکە بەرپابوو ، بارو ، وەزع رووە ، و خراپبو ناهەمواری دەچوو ، دوای ئەوەی ولاتەکە دوچاری شکان ، و بەزین هات ، ئنجا بوو بە چەند بەشێکی بچکۆلەوە ، هەر نەتەوە ، و رەسەنێك دەولەتێکی جیاوازی دروست کرد (ئەم دابەش بوونەشتێکی مەعقول ، و کارێکی دروست نەبو ، گەرچی لەم رووە ، وە هیچ باس ناکەین) بەلام

ئێمە دەبینین ئەلمانیا سەرەرای شکان ، وبەزینی ، نەدو وبەچەند بارچەیەکەوە ، بەلکو یەکێتی یەکەی خۆیی پاراست سەبارەت بەهێزی نەتەوایەتیەوە ، کە لە خۆشی ، و ناخۆشیدا باوەری پێی بوو.

ئیمپراتورییەتی تورکی لەپێش جەنگی (یەکەمی) جیهانیدا لەئیمپراتوریەتی (نەمسایی ـ مجری) دەچوو ، واتە چەند نەتەوەیەکی تێدابوو ، وەکو میللەتەکانی بەلقان ، و عەرەب ، و ئەرمەنی وهیتر.. لەبەر ئەمە پەیدابوون ، و گەشەکردنی نەتەوایەتی تێایدا هویەکی کاریگەر بوو لەبوگەن کردن و دارزانی ئیمپراتوریەتی تورکیدا. لەسەرەتای کاردا میللەتانی بەلقان لەسەدەی نۆزدەهەمدا جیابونەوە وەتورکیاش لەگەل ئەم میللەتانەدا دەجەنگی تاکو بیان هێنێتە وە ژێر دەستی خۆی. ئنجا دەولەتە گەورەکان بەتایبەتی روسیای رژێمی قەیسەر لەبوونی ئەم نەتەوانە سودمەندبوو ، دەستی لەگەلدا تێکەلاوکردن ، ئەرمەنیەکانی بەکارهێنا تاکو بەمان لەئیمپراتوریەتی تورکیا بسرەوێنێت. بۆیە دەبینین زۆرانبازی ، و کوشتاری خوێنین لەنێوان ئەمان و تورکیادا بەجورێکی هەمیشەیی هەبوو ، وەدەولەتە گەورەکان بەکاریان هێنان لەکاتی جەنگەکەدا لەپروباغەندەکردندا دژی تورکیا ، بەلام هەرکە جەنگەکە کۆتایی هات ، دەولەتە گەورەکان هیچ ئیشیان پێیان نەماو ، وازیان لێ هێنان کەدوچاری چارەنوسێکی نەزانراو (مجهول) بن ، لەدواییدا لەئەرمینیادا کە لەرۆژهەلاتی تورکیادایە و لەسەر دەریای رەشە جمهوریەتێکی سۆڤیێتی دروست بوو ، جووەپال یەکێتی سۆڤیت.

بەلام ولاتە عەرەبیەکان کەبەشێك بوون لەئیمپراتوریەتی تورکیا کەمێك دردۆنگ خەبەریان بوەوە. گەرچی عەرەبەکانیش تورکەکانیان خۆش نەدەویست لەبەر دوریا بونەوەیان لەسەرەتاوە لەکاروباری رۆشنبیری ، و بوژاندنەوەی زمان و ، پێژەی عەرەبیە وە دەستی پێکرد ، لەهەوەلەوە لەسوریاوە دەستی پێکرد لەسالی ١٨٦٠ز.دا ئنجا ئەم بوژانەوەبە رووی‌کردە مسر ، و ولاتە عەرەبیەکانی‌تر. دوای کودەتاکەی (انقلاب) کدوا کۆمەلی (لاوانی تورکیا) پێی هەلسا لەسالی ١٩٠٨ز.دا وە سولتان (عبدالحمید) کەوت بزوتنەوە سیاسیەکان پەیدابوون ، بیرورای نیشتمان پەروەری لەناو عەرەبەکاندا پەرەی‌سەند بەموسلمان ، و مەسیحیانەوە ، ئنجا بیرورای

ئازادکردنی ولاتە عەرەبیەکان ، و رزگارکردنی لەجنگ حوکمرانی تورکەکان و یەککگرتنیان لەیەك دەولەتدا جوە میێشکی خەلکەوە ، ئەو کاتە میسرو وبارێکی سیاسی تایبەتی هەبوو ، چاوەروان نەددکرا بێتە ناو دەولەتە عەرەبیە یەککگرتوەکەوە ، بەلکو ئەم دەولەتە تەنها بریتی دەبوو لەدورگەی عەرەب و سوریا ، و فەلەستین و عێراق.

هەروها عەرەبەکان ویستیان پێشەوایەتی کردنی ئاینی ئیسلام بێنەوە لای خۆیان ، بە گەراندنەوەی خەلافەت لەسولتانی عوسمانیەکان بۆ لای خۆیان ، ئەم ئیشە بە بەشێك دادەنرا لەبزەتنەوەی نیشتمانی زیاتر لەوەی کە بزوتنەوەیەکی ئاینی بێت چونکە مەسیحیە عەرەبەکانیش بەتەواوەتی پشت گیریان دەکرد.

دوای چونکە جیهانیەکە بەریتانیا لەگەل بزوتنەوە نیشتمانیەکانی عەرەبدا دەستیکرد بەدەسیسە ، و موئامەرە ، کە جەنگەکە بەرپا بوو جۆرەها بەلێنیدا بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی عەرەبی یەککگرتو نەمیر ئەمە (الشریف حسین) دەستی لەگەل ئینگلیزەکاندا تێکەلاو کرد ، وە شۆرشێکی دژی تورکەکان بەرپاکرد ، عەرەبەکانی سوریا بەموسلمان ، و مەسیحیانەوە چۆتە پال شۆرشەکەی (حسین) ژمارەیەکی زۆریان بەدسێدارەوە ژیانی خۆیانیان بەخت کرد لە شەشی مانگی مایسدا لەشاری (دمشق و بیروت) کران بەسێدارەدا ، تائێستاش ئەم رۆژە بۆ یادی شەهیدەکان ئاهەنگی تیادا دەکرێت.

شۆرشی عەرەب بەیارمەتی ئینگلیزەکان سەرکەوت ، بەتایبەتی بەهۆی پیاوێکی بلیمەتی نەناسراوەوە کە لەدایەرەی جاسوسیدا ئیشی دەکرد ناوی (کولونیل لورانس) بوو هێشتا جەنگەکە کۆتایی نەهاتبو کەهەموو ولاتە عەرەبیەکان لەژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکاندابو. بەم جۆرە ئیمپراتوریەتی تورکیا ورد ، و خاش بو ، کچم پێشتر پێم وتبویت کە (مستدفا کەمال) لەتێکۆشانیدا لەپێناوی سەربەستی ولاتەکەیدا مەبەسی ئەوە نەبو (جگەلە لەکوردستان) ولاتە کانی تر کە تورك نین بیان هێنێتە وە ژێر بالی خۆی ئەمە کارێکی چاك بوو کردی.

بەم جۆرە دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە کێشەی بریاردانی چاردنوسی ولاتە عەرەبیەکان پەیدابوو ، ئنجا هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان

(الطفاءالمنتصرون) وەبە تایبەتی ئینگلیزو فە رەنسەیبەکان بەهەمو پـیـاو چاکی ، و نیازپاکیەکەوە بلاویان کردەوە ، کەمەیوسی حوکومەتەکـانـیـان بریتـیـە لە "ئازادکردنی ئەو میللەتانەی کەوا ماوەیـەکـی دورو دریـژ ، لەژێر دەست درێژی تورکەکاندا دەیان نالاند ، ئازادکردنـێـکـی تـەواو ، وەپێك هێنانی حوکومەتی نیشتمانی ، وە بەرێوەبەرایەتیەك بۆیان ، کـەوا دەسەلات لەئارەزوو ، و خواستی میللەتەوە وەردەگرن". وە لەپێنـاوی ئـەم ئامانجە پیرۆزانە دا هەردو حوکومەتە ـ ئینگلیزو فەرەنسە ـ دەستیان کرد بەبەش کردنی ولاتە عەرەبیە کان لەناوخۆیاندا!! رژێمی (انـتـداب) یـان داهێنا ، کەبریتیە لەرژێم و پەیرەوێکی تازەی ئیستیعمار ، کەهەوەل جار دایان هێنا بۆ خستنە ژێردەست و ئیستیعمـارکـردنـی ولاتـانـی نـوێـبـە رەزامەندی کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم). فەرەنسە سـوریـەی وەرگـرت ، ئینگلتەرەش فەلەستین ، و عێراق ، بەلام (حجاز) لەژێر حوکمرانی (شریف حسین) دامایەوە کە وا ئینگلیزەکان دەیـان پـاراسـت. بـەم شـێـوەیـە ، وسەرەرای هەموو ئەو بەلینانەی کەدابوویان بۆ دروست بونی دەولەتـێـکـی عەرەبی یەکگرتو ، کەچی ولاتەکەیان کرد بەچەند بەشێکەوە خستیانە ژێـر رژێمی (انتداب)ەوە ، جگەلە (حجاز) کەبەروالەت سەربەست بـوو کـەچـی لەراستیدا بەدەست حوکمرانی ئینگلیزەکانەوە بوو ، لـەم دابـەش کـردنـە عەرەبەکان تێکـرا توشی نامرادی هاتن ، وە ئەمەیان نەسەلمـانـد وەك دوا ئەنجامێك ، ونەشیان دەزانی کە دەولەتە ئیستیعماریەکان نامرادی تریشیان لەخورجەکەیاندا شاردوتەوە ، چونکە دوای ئەمە ولاتی عەرەبـیـان کـردیـە چەند بەشێکی جیاوازەوە ، ئنجادەستیان کرد بەجێبەجیکردنی ، دابـەش و پارجەکردنی ناوخو وویان بەکارهـێـنـانـی سـیـاسـەتـی "جـوی کـەرەوە سەردەکەویت" (فرق تسد) تابتوانێت حوکمرانی ولاتەکە بـکـات کـە بـۆی نیرراوە ، بێ ئەوەی توشی کێشەیەکی زۆرببێت ، ئنجا زۆر ئاسانە کەهەر ولاتێك لەم ولاتانە بەجیاوازی بخەینە بەرچاو ، وباس بکەین ، یەکەم جار لەپێشەوە باباسی سوریە بکەین.

لەسەرەتای سالی ١٩٢٠ز. دا (امیر فـیـصـل کـوری مـلـك حـسـیـن) حوکومەتێکی عەرەبی لەسوریادا بەیارمەتی ئینگلیزەکان دروست کرد ، کـە ئەنجومەنی نیشتمانی سوریا کۆبوەوە ، دەستورێکی دیموکراتـیـانـەی بـۆ

سوریەی یەککگرتو بریاردا ، بەڵام حوکومەتەکە چەند مانگێکی خـایـانـد ، چونکە فەرەنسە کەوا کۆمەلی میلەتات وەیا(عصبة الامم) نارد بووی بۆ سەر سوریە لەهاوینی ١٩٢٠ز. دا هات (فیصل)ی لـەولاتـەکـە دەرکـردو بـەزۆر داگیری کرد ، دانیشتوانی سوریە لە سێ ملیون زیاتـر نـەبـوون لـەگـەل ئەمەشدا ئیسپاتیان کرد کە جقلیکی سەختن لەچاوی فەرەنسەیـیـەکـانـدا ، چونکە ئەمان بەموسلمان و ، مەسیحیانەوە سوربوون لەسەر ئەوەی کـەدەبـێ سەربەستی وەرگرن ، و ملیان نەدا بەدەسەلاتی دەولەتێکی بێگانە ، ئیتـر پشیوی بلاوبوەوە ، یاخیبوونی شارستانیانە (العصیان المـدنـی) زۆر رووی دا فەرەنسەییەکان ناچار بوون لەشکرێکی بێشومار بیـنـن ، لـەپـاشـانـدا حوکومەتی فەرەنسە سیاسەتە کۆنەکەی کرت بو لاوازکردنی نـەتـەوایـەتـی عەرەبی ، ئنجا بەنای بردە بەردابەش کردنی ولاتەکە بەچەند دەولەتێکـی بچکۆلەوە ، وەزیاتر بایەخیدا بەجیاوازیەکانی ئاینی ، و کەمایەتیەکان ، لەم سیاسەتەدا مەبەسیان دوبەرەکی نانەوە و جیاکردنەوە ، و کەرت کردنی رێزەکانی میللەت بوو بەکورتی بەئەنجام گەیاندنی سیاسەتی (جیاکەرەوە ، سەردەکەویت) (فرق تسد) بوو.

بەم جۆرە سوریا سەرەرای بچوکی پانتایشی ، کرا بە پێنـج دەولەتی بچکولەوە: یەکێکیان لەسەر قەراغی رۆژئاوای دەریـا کـەپـێـی دەوتـرێـت (لبنان) زۆربەی دانیشتوانی لە مەسیحیە مارونیەکانن کەوا فەرەنسەییەکـان گەلێك جیاوازی ، و ئیمتیازاتی تایبەتیان دابوونی تاکو بیان هێنیتـە لای خۆی دژی عەرەبەکانی سوریا ، ئەوی تریان لەسەر رووی (لـبـنـان)دا ، دانیشتوانی لەموسلمان عەلەویەکان بـوون ، وە لـەسـەرووی ئـەمـیـشـەوە دەولەتێکی بچکولە پێیان دەوت (أسکندرونە) بەمە سوریا زۆربەی ناوچە بە پیتەکانی لەکیس چوو ، وە لەدەریا دورکەوتەوە کە هەزارەهـا سـاڵ بـوو لەسەری دەژیا ، وە یەکێك بوو لەدەولەتە مەزنەکانی ؛ کەچـی ئـیـسـتـا کەوتە سەرقەراغی بیابانێکی گرك ، فەرەنسەییەکان هەر بەمەوە نەوەستـان (جبل الدروز) یشیان لەسوریە جیاکردەوە.

سورییەکان هەر لەسەرەتاوە بەم دابەش کردنە قایل نەبوون ، دەستیـان داید تێکۆشانیکی سەخت ، لەگەل گەلێك خۆ پیشاندانی قەلەبالغـدا کـەوا ئافردەتانیش هاوکاریان تێدا کرد فەرەنسە ییەکان ، بەزۆر ویسـتـیـان مـل

کەجیان کەن ، سەربارەی ئەمەش دەستیان کرد بەدروست کردنی کێشەی ئاینی ، و تابەفەگەری ، و دووبەرەکی نانەوە ، ئیتر سەغلەتی ، و ئاژاوە پەرەی سەند ، ئنجا دوای ئەمە فەرەنسەییەکان ـ هەروەکو ئینگلیزەکان پێش ئەمان ـ دەستیان دایە تاساندنی ئازادی شەخسی ، و ئازادی سیاسی ، ولاتەکەیان برکرد لەجاسوس ، و پیاو خراپ فەرمانبەرە گەورەکانی نەسوریەییە (دلسوزەکان) دادەنا کەوا هیچ دەسەلات ، و ناوبانگێکی باشیان لەناو میللەتدا نەبوو ، وە خەلکەکەش بەخایەن ، و ناپاکیان ناو دەبردن ، فەرەنسە بیەکان ئەم کردارانەیان دەکرد ، وەلەهەمان کاتیشدا دەیان وت: "کە ئەمان هاتوون ، رێبازی پێگەیشتنی سیاسی ، و سەربەستی دەست کەوتن فێری سوریەییەکان بکەن ، وپێویستی سەرشانیان لەم رووەوە جێبەجێ بکەن..!" ئەمەش هەر هەمان ووتەیە کە لەهیندستاندا دەوترێتەوە ، و دەهێنریت.

کاروبار بەرەو خراپتر جوو لەتەقینەوە نزیك بووەوە بەتایبەتی لەناو خەلکی (جبل الدروز) دا ، حاکمە فەرەنسەییەکە ، پێشەواکانی (دروز)ی بانگ کرد بۆنان خواردن ، ئنجا کەگەیشتنە ئەوی هەموویانی گرت. وەبەبارمتە لای خۆی کلیدانەوە ئەمە لەهاوینی ١٩٢٥ ز.دا بو کە خەلکەکە ئەمەیان بیست ، تەقینەوە ، و شۆرشێکی مەزنیان لە(جبل الدروز)دا بەرپا کرد ، شۆرشەکە لەهەموو لایەکی ولاتدا تەشەنەی کرد ، بوو بەبزوتنەوەیەکی گشتی کە تێدەکوشا لەپێناوی ئازادی سوریە ، و یەکێتیدا.

ئەم شۆرشە کارەساتیکی بێهاوتا و بێوێنە بوو ، چونکە سوریا کە ولاتێکی زۆر بجکولە بوو ، بەرامبەر بەفەرەنسە کە ئەو کاتە گەورەترین هێزی سوپایی بوو لەجیهاندا بوە ستیتەوە ، دیارە سوریییەکان نەیان دەتوانی دژی فەرەنسەییەکان بەجۆریکی رێك و پێك بجەنگن ، چونکە فەرنسەییەکات لەشکرو جبەخانەیەکی بێشوماریان هەبوو ، لەگەل ئەمەشدا سوریییەکان توانیان مانەوەی فەرەنسە لەدەرەوەی شارەکان بگەنە کارێکی نەشیاو (مستحیل) فەرەنسەییەکان دەسەلاتیان تەنها بەسەر شارەکانی سوریەدا هەبوو کەوا گەلێك جار دووچاری پەلامار دانی شۆرشگیرەکان

دەبوون. ئنجا فەرەنسەییەکان دەستیان کرد بەتوقاندنی خەڵـکـەکـە ، بـە تەقەکردن لەژمارەیەکی زۆریان و سوتاندنی گەلێك دێهات ، تەنانەت شـاری (دمشق)ی بەناوبانگ بەسـاغـی دەرنـەچـوو لـەئـازارو ئـەشـکـنـجـیـان چونکە فەرەنسەییەکان بەفرۆکە هێرشیان بردەسەری ، وەبەشێکـی زۆریـان لەئۆکتوبەری ١٩٢٥ز.دا لەشارەکە وێران کرد ، ئیتر سوریا بووبە لەشـکـر کایەك کە لەسوپاو دەزگای جەنگیدا جمەی دەهات. لەگەل ئەمەشدا شۆرشـە کە ماوەی دوو ساڵ هەرمایەوە ، ئیتر لەشکرە زۆرەکەی فەرەنسە شۆرشەکـەی شکاند ، بەڵام قوربانیەکانی کە سورییەکان پێشکەشبان کرد ، بـەفـیـرۆ نەچوو . چونکە بەمە ئیسپانیان کرد کە مافی ئازادیان هـەیـە ، هـەمـو جیهان زانی کە ئەم سورییە یانە چین و لە کلی کلیچ کلینجانیکن؟!

ئەوی سەیرە ، و شایانی باس کردنە فەرەنسیەکان ویستیان بویە یەکی ئاینیلەشۆرشەکە بدەن ، هەروها هەوڵیان دا مەسیحیەکـان بـکـەن بـەکـز (دورزی)ەکاندا ، بەلام خەلکی سوریا هەمویان خۆیان لەبوسەدا بـوو ، ووە تێیان گەیاندن کەوا لەپێناوی ئازادیدا دەجەنگن نەك لەپێناوی مـەبـەسـە ئاینیەکاندا ، هەرکە ئیعلانی شۆرش کرا حوکومەتێکی وەختی دووروستت بو وە بەمیللەتی راگەیاند کەبێنە ریزی جەنگـاوەرەکـانـەوە "لـەپـێـنـاوی سەربەستی سوریادا بەهەمو بەشەکانی یەوە بو هەڵبژاردنی ئەنجومەنێـکـی یاسادانان و بۆ دانانی دەستورو کشانەوەی لەشکری داگیرکەری بیگـانـە ، وە دروست کردنی لەشکرێکی نیشتمانی ئاسایش بپارێزیت ، وبیرورواکانـی شۆرشەکەی فەرەنسەو مافەکانی ئادەمیزاد جێبـەجـی بـکـات" بـەم جـۆرە دەبینین حوکومەت و لەشکری فەرەنسە بەجووت هەوڵیان دەدا کە سەرشورکەن بەمیللەتەکەی کەوا هەستا بوو بیروکانی شۆرشەکەی فەرەنسەی دەپاراسـت لەگەل ئەو مافانەی کە لەئەنجامی بەرپابوونی ئەو شوورشەوە پەیدابوبون!

لەساڵی ١٩٢٨ز. دا حوکـمـی عـورفـی لـەسـوریـادا لابـرا هـەروهـا چاودێریکردنی رۆژنامەکانیش وە گیراوە سیاسیـەکـانـیـش بـەرەلاکـران ، حوکومەتی فەرەنسە ناچار بو کە وەڵامی داخوازیەکانی نیشتمان پەروەرەکـان بداتەوە ، ئەنجومەتی یاسادانان بۆ دانانی دەستور کوبوەوە بەلام لەهەمـان کاتدا تووی دووبەرەکی لەنێوان بەرە ئاینیە جۆربەجـۆرەکـانـدا چـانـد ، دایەرە ، و مەڵبەندی تایبەتی بۆ موسلـمـانـەکـان ، و کـاثـولـیـکـە

رۆژهەلاتیەکان ، وە ئەرثوذکسە رۆژهەلاتیەکان و جولەکەکان دانا ، زۆریان لەهەمو هەڵبژیرەرێك دەکرد لەو شوینەدا کە مەڵبەندی ئاینەکەیەتی دەنگ بدات ، کێشەیەکی عەنتیکەو هەمان کاندا سەیر لە(دمشق) رووی‌دا ، پێشەوای نیشتمان پەروەرەکان مەسیحی‌و بروتستانتی بوون ، لەبەر ئەمە بۆی نەبوو هەڵبژیررێت لەهەر کامێك لەمەڵبەندە تایبەتیەکاندا بێت ، لەگەل ئەمەشدا لەناو خەلکی (دمشق)دا زۆر خۆشەویست بوون ، لە بەر ئەوەی موسلمانەکان دە کورسیان هەبوو ، پێشنیاریان کردو ، وازیان لەکورسیەك لەو کورسیانە هێنا ، تاکو پێشکەش بەبروتستانتی‌یەکی بکەن ، بەلام حوکومەتی فەرەنسە بەمەرازی نەبوو.

لەگەل ئەم هەموو کۆسپ و تەگەرانەشدا نیشتمانیەکان زۆربەی کورسیەکانی ئەنجومەتی یاسادانانیان وەرگرت ، وە دەستورێکی وایان دانا کە بگونجێت لەگەل دەولەتێکی سەربەست ، و ئازاددا. دەستورەکە دەڵێت: سوریە جمهوریەتە ، دەسەلاتەکانی لەمیللەتەوە وەردە گرێت ، لەم دەستورەدا هیچ ناوێکی فەرەنسەییەکان و (انتداب) هکەیان نەهاتبو ، فەرەنسە ییەکان ، رقیان هەڵسا ، و هەولیان دا لەم بابەتەوە مادەیەك بخەنە سەر دەستورەکە بەلام ئەنجومەنی یاسادانانەکە بەتوندی ئەمەی پەسند نەکرد ، ئەم ناکۆکیە چەند مانگێك لەناویاندا مایەوە. ئنجا نیرراوی بەرزی (مندوب السامی) فەرەنسە لەدوایدا پێشنیاری کرد ، و بەدەستورەکە رازی بوو بەمەرجێك هیچ مادەیەك لەمادەکانی دەستور بەئەنجام نەگەیەنریت کە ئەگەر بە بێچەوانەی ئەرکەکانی سەرشانی فەرەنسەوە بێت ، بەپێی (انتداب) ، مادام ئەم (انتداب)ە هەر هەبێت ، ئەم پێشنیارە شتێکی نەزانراو ، و روون نەبو ، بەلام لەهەمان کاتدا وازهێنانێکی گەورە بوو لەلایەن فەرەنسەییەکانەوە. بەلام دیسانەوە ئەنجومەنی یاسادانانەکە پەسندی نەکرد ، ئنجا لەمایسی ساڵی ١٩٣٠ز. دا کەفەرەنسەییەکان ئەنجومەنە کەیان هەڵوەشاندەوە ، و دەستورێکی تازەیان دانا ، وە ئەوەی پێشیناریان کرد بو تیایدا بوو.

بەم جۆرە سوریە لەبابەت مافەکانی‌یەوە ئەوی ویستی دەستی‌کەوت ، بێ‌ئەوەی لێ‌ی‌کەم کاتەوە. ئیتر دوو کێشەمایەوە: یەکەمیان کۆتایی هێنانی (انتداب) کە بەکۆتایی هاتنی ئەو مادە تازەیەی کەپێشنیار

کرابوو ، وە خرابوە سەر دەستورەکە نامێنیت. دوەمیان: یەکێتی سوریابو ، ئیتر جگە لەمانە دەستورەکە بەپێشکەوتو خوازانە دەژمێرریت ، وە دەگونجیت بۆ دەولەتێکی ئازاد ، و سەربەست ، سوریاییەکان ئازایەتیەکی بێئەندازەیان لەکاتی شۆرشەکەیاندا نوا ند ، دوای ئەوەی کەرازی نەبوون کە یەك تۆز لەئازادی تەواوەتیان کەم کەنەوە.

لەنوفەمبەری ۱۹۳۳ز. دا فەرەنسە بەئەنجومەنی نەوایی راگەیاند کەپەیماننامەیەکی لەگەل دابیەستێت ، هەرچەندە گەلێك لەنائیبەکان مام ناوەندی بوون ، کەچی ئەمەیان نەکرد ، و نەیان ویست ، چونکە فەرەنسە هەرسوو بوو لەسەر ئەوەی کەدەبێت سوریا بکرێت بە بینج دەولەتی بچوکەوە وە لەشکرکا ، و فرۆکەکاکانی ، و هێزەکانی بەئازادی بمێننەوە لەخاکی سوریەدا.

## تێبینی (ئوکتوبەری۱۹۳۸)

سەرکەوتنی نازیەکان لەجیکوسلۆفاکیادا ، لەگەل زیادبوونی دەسەلاتی ئەلمانیا بەسەر ئەوروپادا ، و داواکردنی کەدەبێت موستەعمەرەی هەبێت هۆیەکی گرنك بوون لەگۆرین لاسەنك کردنی تای تەرازووی هێزەکان لەجیهاندا فەرەنسە هاتە پلەی دووەم لەناو دەولەتاندا ، ئیترنەی دەتوانی ئیمپراتوریەتیکی پان و بەرین بپارێزێت ، دیسانەوە ئەوتە نكو چەلەمانەی کەلە فەلەستین دا پەیدابوون ، باوەرێکی واهاتە گۆری کەدەبێت سوریا ، وفەلەستین و رۆژهەلاتی ئوردون (شرقي الاردن) ببن بەیەك ، یەکگرتنیکی فیدرالی. واتە: (بروزەی سوریای گەورە ـ وەرگێری کوردی).

# فەلەستینو ڕۆژهەلاتی ئوردون

## ٢٩/مایس/١٩٣٣

فەلەستین دەکەوێتە خوارووی سوریاوە بەریتانیا حوکمرانی دەکات کەنێرراوە لەلایەن (عصبة الامم)ەوە بۆ ئەوی. فەلەستین وڵاتێکی بچکۆلەیە دانیشتوانی لەملیونێك زیاتر نابن بەڵام زۆر گرنکە سەبارەت بەمێژووی، ئەو شوینەوارانەی کەتیایدایە و لای جولەکە، و مەسیحیو موسلمانەوە پیرۆزن، زۆربەی دانیشتووانی عەرەب و موسلمانن ، داوای ئازادیو یەکێتی دەکەن لەگەل سوریادا.

بەڵام سیاسەتی ئینگلیز لەکەمایەتیە جولەکەکە، کێشەیەکی دروست کرد بۆ بەربەرەکانی، و بەرهەڵستیکردنی داواکاری عەرەبەکان لەترسی ئەوەی کە ئەم عەرەبانە حوکمرانیان نەکەن ئیتر هەریەکە بەلای خۆیدا رای دەکێشا. چار نەبو، دەبوایە ناکۆکی رووی بدایە، عەرەبەکان لەوێدا زۆرن، جولەکەکانیش پارەو دارایەکی ئەستوریان هەیە، وە ئەو ریکخراوانەی کە جولەکە هەیانە لەجیهاندا پشتیان دەگرتن. بەلام بەریتانیا بەعەرەب لەجولەکەی دەدا، وە دەی وت: چار نیە هەردەبێت لێرە بمێنێتەوە بۆ پاراستنی ئاشتی لەناویاندا، ئەمە هەر هەمان رەوشت بو کەلەو، ولاتانەدا دەمان بینی کەوا لەژیر کوتی ئیستیعمار دادەیان نالاند بەلام ئەوی سەیرە لەمەدا هەمیشە دووبارەو دووپات دەبێتەوە.

جولەکە میللەتێکی سەیرن، لەکۆندا هوزێك (قبیلە) وەیا چەند هۆزێك بوون لەفەلەستین دادادەنیشتن، ناویان، و مێژوویان لەسەردەمە دیرینەکاندا، و لەتەوراتدا هاتوە، تا ئێستاش هەروا دەزانن کەخوا هەلی بژاردون، وادەردەکەوێت ئەم بیرکردنەوەو مەزندەیەیان توشی گەلێك سەغلەتی، و ناخۆشی کردون، ویژەی ئینگلیز جوانترین هۆنراوەی تێدایە

كە باسی ئازارو ئەشكنجیان دەكات ، هەروەكو لەتەوراتد هەیە ، بێگومان لەئەسلە عیبریەكەیدا گەلێك جوانترە لەوەرگێرانەكەی ، بۆ نموونەی ئەمە ئەم چەند دێرە لەیەكێك لە(مزامیر)ە كاندا دێنمەوە:

لەوێدا ، لەسەر قەراغی رووبارەكانی بابل دانیشتین.. ئەی (صهیون) كەیادمان كردیتەو تێر گریاین.

بەدردختی بیەكانەوە گۆچانەكانمان هەلواسی ، دوای ئەوەی یەخسیركەرانمان داوایان لێكردي كەگۆرانییەك لەگۆرانیەكانی (صهیون) یان بۆ بلیین.. ئنجا چون گۆرانی خواوەند لەخاكی بێگانەدا بلیین..

لای راستم ئیفلیج بیت ئەگەر لەبیرم بچێتەوە ئەی (ئورشلیم)

زمانم بەگەروومەوە بنوسێت ئەگەر یادت نەكەمەوە ئەی (ئورشلیم)

ئەگەر پەسندت نەكەم و لەهەموو خۆشیە مەزنەكانمت بەچاكتر نەزانم.

لەدواییدا ئەم جولەكانە لەهەموو لایەكی جیهاندا بلاوبوونەوە ، مال و نیشتمانیان نەبوو ، بچونایە هەرلایەك كرداری نامۆیەكی (غریب) نەویستەیان لەگەل دا دەكردن ، ناچار بوون لەشارەكاندا ، جیا لەخەلكی شارەكە ، لەشوێنی تایبەتیدا دادەنیشتن تا خەلكەكە بێس نەكەن ، لەهەندێ جاردا زۆریان لێدەكردن كەبەرگی تایبەتی لەبەركەن تاكو جیاكرینەوە لەخەلكەكەی تر.

سەرشۆركران ، و ئازاردران ، و سەربران ، تەنانەت وشەی (جولەكە) بوو بەهاوشان و مانای رەزیلی ، و سوو ، لەگەل ئەمەشدا ئەم میللەتە سەیرە توانی بژی و پارێزگاری هەمو هۆكانی بوونی بكات و سەركەویت ، وەبیاوی وای بیبیت لەگەورە پیاواتی جیهان بژمێررین ، ئەمرو لەماتە: زانا و پیاوی سیاسی ، و وێژەوان ، پیاواتی ئیش و فرمان ، و دەولەمەندیان هەبێت بەلام زۆربە یان دەولەمەندنین ، كەلیكیان لەشارەكانی رۆژهەلاتی ئەوروپادا كۆدەبوونەوە ، ناو بەناو دوچاری كوشتارد بوون ، ئەو ئادەمیزادانەی كە بێمال و نیشتمان دەژیان هەمیشە خەویان بە (القدس)ەوە دەبینی كەوا گەلێك مەزن تر ، و باشتر دەردەكەوت لەبەر چاویان تاكو لە(القدس)ە راستەقینەكە. یە (القدس) دەلێن (صهیون) وەیان خاكی پەیمان بێدراو ، وە لەمەودیە وشەی زایونیزم كەوا مانای بانگەوازی دێرینە لەپێناوی گەرانەوەدا بۆ (القدس).

ئەم بزوتنەوەی زایۆنیزمیە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەھەمدا شێوازێکی ئیستیعماربانەی گرت ، گەلێك لەجولەکەکان ڕەویان کردو ھاتنە فەلەستین دانیشتن ، دەستیان کرد بەبوژاندنەوەی زمانیعیبری. لەکاتێکدا کەلەشگرەکانی بەریتانیا لەجەنگی (یەکەمی) جیھانیدا فەلەستینیان گرت وچونە (القدس)ەوە ئنجا حوکومەتی بەریتانیا لەنوفەمبەری ١٩١٧ز. دا بەیمانی (بلفور)ی بڵاوکردەوە کە بەڵێنی لەسەردابو. ئەم بەڵێنە بریتی بوو دروست کردنی (نیشتمانێکی نەتەوایەتی بوجەلەکە) لەفەلەستین دا ، حوکومەتی بەریتانیا لەم بەڵێنە مەبەسی ئەوەبو کە جولەکەکانی جیھان بکات بەدۆستی خۆی بەتایبەتی لەرووی مادی ، و دارایییەوە ، بەلام ھیچیان بەلای کێشە گرنکە کەوا ئاوریان نەدایەوە ، کەوا فەلەستین ولاتێکی وشك ، و چول نەبوە بەلکو عەرەبەکاتی خاوەنی تیایدابوون ، لەبەر ئەمە ، ئەم سەخاوەت ، و خواردەیی ئینگلیزە لەسەر حیسابی دانیشتوانی فەلەستین بو کەوا بێزاریان دەربری بەجورێکی ئاشکرا بەعەرەب و غەیرە عەرەب و موسلمان و مەسیحیەکان و ھەمو کەسێك کە جولەکە نەبو بێت ، دژی بەڵێنەکە لەواقیعدا کێشەکە کێشەیەکی ئابوری بو ، چونکە دانیشتوانی فەلەستین ھەستیان کرد ئەم جولەکانە لەھۆی زیان و گوزەراتیاندا بەربەرەکانیان دەکەن ، و ئەمانە سەبارەت بەسامانە زۆرەکەیان لەوانەیە لەداھاتودا ، دەبن بەسەردار ، و گەورەی ولاتەکە بەکورتی دانیشتوەکان ترسان لەوەی کە ئەم جولەکانە باروەکەی ناو دەمی ئەمان دەربینن وەزەوی ، و خاکەکەش لەخاوەنەکانی داگیرکەن.

ئیتر لەو وەختەوە مێژووی فەلەستین بریتی بووە لەناکۆکی لەنێوان عەرەب و جولەکەدا بەلام حوکومەتی بەریتانیا خۆی ، جارێك لەم لاەوە جارێکی تر لەولا بوە ، بەلام تێکرا یارمەتی جولەکەی زۆر تردەدا ، تا عەرەبەکان ولاتەکەی وەکو موستەعمەرەبەك بەرێوە دەبرد ، بۆئەوەی خەلکەکەی نوێنەریان ھەبێت ، عەرەبەکان بوموسلمان و مەسیحیانەوە داوایان کرد ، کەرێیان بدرێت کەچارەنوسی خۆیان بدرێتە دەست خۆیان ، وە ئازادی تەواویان بدرێتی ، وە زۆر بەتوندی بەرھەلستی (انتداب)و سەرپەرشت کردنەکەیان دەکرد ھەروھا بەرھەلستی رێ نەدان بە کۆچ کردن بۆ ناو وولاتەکەش لەبەر ئەوەی کەنایان گرێت و جێیان نابێتەوە تیایدا.

ئنجا هەرچەندە کوچ کردوان بۆ فەلەستین زۆربوبە ئەوەنـدە عـەرەبـەکـان ترسیان لێ‌دەنیشت بۆیە بڵاویان کردەوە کە (زایونیزمی هاوتای ئیستیعماری ئینگلیزیە ، پێشەوا لێپرسراواکانی زایونیزم هەمـیـشـە بـاسـی سـوودی پەیداکردنی نیشتمانێکی نەتەوایەتی بەهێزیان بۆ جـولـەکـە کـردوە کـە ئینگلیزەکان پشتی پێ‌ببەستن بۆپاراستنی رێبازی هیندسـتـاتـیـان وە بـو بەرهەڵست کردنی پەرەسەندنی نەتەوایەتی عەرەبەکان).

ئیتر عەرەبەکان کۆنگرەیەکی نیشتمانیـان گـرت لـەویـدا بـریـاریـان داکەیارمەتی بەریتانیا نەدەن وهاوکاری لەگەل دا نەکـەن ، وەبـەلای ئـەو هەڵبژاردنەدا نەچن ، و موقاتەعەی بکەن کەبو ئەبخومـەنـی یـاسـادانـات دەکرێت کەوا ئینگلیزەکان نیازیان وایە پێکی بهێنـن ، مـوقـاتـەعـە کـە سەرکەوت ئەبخومەنەکە پێك نەهات ، ئنجا یارمەت نـەدان ، و هـاوکـاری نەکردنەکە چەند ساڵێکی خایاند ، لەپاشاندا تـاردەیـەك لاواز بـوو ، وە هەندی لەحیزبەکان کەمێك یارمەتی‌و کۆمەکیان بەئینگلیزەکان دەکرد لەگەل ئەمەشدا ئینگلیزەکانیش نەیان توانی ئەنجومەنێکی یاسادانان پـێـك بـێـن ئیتر نیرراوی بەرز (المندوب السامي) سەرومر خۆی حوکمرانی دەکرد.

حیزبە عەرەبیە جۆربەجۆرەکان یـەکـیـان گـرت لـەسـالـی ١٩٢٨ز. دا داکۆنگرەیەکی نیشتمانیان بەست وە تیایدا داوایان کرد حوکـومـەتـێـکـی بەرلەمانی دیموکراتی درووست بکریت چونکە ئەمە مافێك بوو لە مافەکانـی خەلکی ولاتەکە. ئنجا کۆنگرەکە بریاری‌دا کە (خەلکی فەلەستین هەرگـیـز ناتوانن بەرژیمی حوکومەتە ئیستیعمار بەزۆردارەکەی ئەمرو رازی‌بن). ئەوی شایانی باسە عەرەبەکان لەنیربیەی شەپۆلی ئەم جۆشەیاندا بایەخیان دا بـە مەسەلە ئابوریەکان ، کەئەمە نیشانەی هوشیاریانە بۆ زورفەکانی کێشەکە.

# رۆژ هەڵاتی ئوردون

رۆژهەلاتی ئوردون دەکەوێتە رۆژهەلاتی فەلەستینەوە ، بریتییە لەدەولەتێکی بچکۆلە دوای جەنگەکە بەریتانیا دروستی کرد ، ولاتێکی بچکولەیە بیابان دەوری داوە کەوتۆتە نێوان سوریا ، و دورگەی عەرەبەود ژمارەی دانیشتوانی ۳۰۰ر۰۰۰ سێ صەد هەزار کەسە ، لەدانیشتوانی شارێکی مام ناوەندی زیاتر نین ، بەریتانیا بەئاسانی دەیتوانی بیخاتە سەر فەلەستینن ، بەلاّم سیاسەتی ئیستیعمار هەمیشە جیاکردنەوە پەسند دەکات بەسەر یەکگرتندا ، ئەم دەولەتە دەورێکی گرنك دەبینی لەبارەی رێگەو بانی سەرزەوی‌و ئاسمانی بۆ گەیشتن بەهیندستان ، هەروها بەرزین و نێوانێك پێك دێنی کەبیابان لەزەویە بەپیتەکانی نزیك دەریا جیادەکاتەوە .

گەرچی ئەم دەولەتە بچکولەیە ، بەلاّم بەسەرهاتەکانی لەبەسەرهاتی ولاتە گەورەکان و دەورپشتی دەچێت ، میللەتەکەی داوای بەرلەمانێکی دیموکراتی دەکات بەلام لێپرسراوان رازی‌نین ، سەرەرای ئەمەش چاودێری دەخەنە سەر رۆژنامەکان ، و پێشەوا کانی دەربەدەر ، دەکەن ، و خۆپیشاندانەکان بلاّوە پێدەکەن ، ئینگلیزەکان دەزانن کی‌دەکەن بە حوکم فەرمای ئەم ولاتە (امیر عبدالله)ی کوری (ملك حسين)و برای (فيصل)یان کرد بەحوکم فەرمای رۆژهەلاتی ئوردون ، بەپەنچەی ئەوان هەلدەسورا ، سوودی بۆ ئینگلیزەکان هەبو چونکە هەمو سەرزەنشت کردنێکی ئەوانی دەگرتە خوی ، وەمیللەت رقی لێ‌دەبووەوە . لەراستیدا رۆژهەلاتی ئوردون لەسایەی (عبدالله)دا لەئیمارەت ، و بەکلکێکی بچوکی هیندی لەمەر خۆمان دەچێت .

رۆژهەلاتی ئوردون بەروالەت دەولەتێکی سەربەستە بەلاّم بەستراوە بەئینگلیزە کانەوە بەپەیماننامەیەك کە (عبدالله) لەسالی ۱۹۲۸ز. دا ئیمزای کردوە ، بە پێی ئەم پەیماننامەیە هەرچی ئیمتیازاتێکی سوپایوهی‌تر هەیە دابووی بەئینگلیزەکان ، لەواقیعدا رۆژهەلاتی ئوردون بەشێکە لەئیمپراتوریەتی بەریتانیا ئەمە نموونەیەکی تازەیە ، گەرچی بچوکیش بێت بۆ جۆری ئەو سەربەستی‌یەی کە لە سایەی ئینگلیزەکانەوە

پەیدا دەبێت و دەست دەکەوێت ، خەلکەکەی رۆژهەلاتی ئوردون چ موسلمـان و مەسیحیان بەرهەلستی ئەو پەیماننامەیەیان کرد ، وە ئەو شتانەی کە لـە ولاتەکە دا رووی دەدا پێی رازی نەبوون ، بەلام ئەم بەرهەلستی کـردنـە سەرکوت کرا ، وە هەموو رۆژنامەکان تەنـانـەت ئـەوانـەی لایـەنـگـری حوکومەتیش بوون داخران ئیتر بەرهەلستی کردن بەتین بوو ، کۆنگرەیەکـی نیشتمانی کۆبووەوە ، بریاریان لەسەر بروانامەیەکی (میثاق) نیشتمانیانەدا پەیماننامەکەیان پەسند نەکرد ، وەکە حوکومەت دەسیکرد بەئامادەکـردنـی لیستەی هەلبژاردن زۆربەی میللەت موقاتەعەی کردو ، بەلایـدا نـەچـوو ، لەگەل ئەمەشدا (عبدالله) بەیارمەتی ئینگلیزەکان توانی هەندی لایەنگـران کۆکاتەوە ، وە پێی سەلماندن کەپەیماننامەکە ئیمزا بکەن.

لەسالی ١٩٢٩ز. دا ، لەرۆژهەلاتی ئوردون دا گەلێك خوپیـشـانـدانـی گەورە دژی ئینگلیز ، و بەلێنی (بەلفور) بەرپا بو.

کچم باسی ئەو بەسەرهاتانەت بۆدەکەم کەلەولاتە جوربە جۆرەکانـدا روو دەدات ، ئیتر وادەردەکەوێت ، ئەوی لەولاتێکدا روودەدات ، لەولاتەکانـی تریشدا روودەدەن ، کەمن ئەم هەمو باسانەت بۆ دەکەم ، دەمـەوێـت بـۆت روون کەمەوە ، کە ئێمە دژی ئیستیعمار تێدەکۆشین هەر بەتەنیا بۆ خۆمان تێناکۆشین ، هەروها کێشەی ئێمەش کێشەیەکی بەهاوتاو ، بێ وینە نییە ئنجا نەتەوایەتی کە لەرۆژهەلاتدا لەبەرزبوونە وەدایە ، هەرهەمان شـێـواز دەکرێت لەبەرزبوونەوەیدا ، هەروها ئیستیعماریـش هـەر هـەمـان شـیـواز لەبەرەنگاربوون ، و بەرهەلستیکردنی نەتەوایەتیدا دەکرێـت هـەرچـەنـدە نەتەوایەتی زیاتر گەشەو پێ بکات شیوازەکانی ئیستیعمار ناگۆرێت ، لەم رۆژانە دائیستیعمار هەول دەدات بەروالەت هەندی داواکاری ، و خواسیتـان بداتێ ، وەلەهەمان کاتدا کەوا زۆرانبازی لەگەل ئیستیعـمـار دا لـەزیـاد بوندابێت لەو لاتە جۆربەجۆرەکاندا ، کەچی زۆرانبازیو تێکۆشانێکـی تـر لەنێوان چینە جۆربەجۆرە کانیـشـدا لـەیـەك ولاتـدا پـەیـدا دەبـێـت ، دەرەبەگەکان ، و چەوسینەرەوەکان لایەنی دەولەتە ئیستیعماریەکان دەگرن.

تشرینی (ئوکتوبەری ١٩٣٨)

ناکۆکیە سێ کوچکەکە لەفەلەستیندا لەنێوان عەرەب لەلایەك ، وە زایۆنیزمی جولەکە ، و ئیستیعماری بەریتانیالەلایەکی ترەوە ، و بەرەو خرا پتر چوو ، سەرکەوتنی (نازیتی) لەئەلمانیادا ژمارەیەکی زۆری لەجولەکەکان ناچارکرد بەرەو ناوەراستی ئەو روپا کۆچ بکەن ، و بچن بۆ فەلەستین ، ئەمە مەترسی عەرەبەکانی زیاتر کرد لەوەی کەوا جولەکە کۆچ کردوەکان ولاتەکە پر دەکەن و بەسەر یدازال دەبن ، عەرەبەکان هەستان بەرگری لەخۆیان بکەن ، وە دەستیان دایە کرداری تۆقاندن ، وەزایونیزمیەکانیش بە هەمان کردار بەربەرچیان دەدانەوە.

لەنیسانی ساڵی ١٩٣٦ز. دا عەرەبە فەلەستینیەکان مان گرتنێکی گشیتان دەست پێ کرد شەش مانگ دەوامی کرد ، هەرچەندە حوکومەتی بەریتانیا گەلێك هەوڵیدا کەبەزەبیری هێزی ئەم مان گرتنە بوەستێنێت وبیشکێنیت وە بۆ ئەم ئامانجە گەلێك گرتوخانەی (المعتقلات) فراوانی دروست کرد کە لەگرتوخانەکانی (نازی)یەکان دەچوو ، ئنجا حوکومەت کە لەمەدا سەرنەکەوت لیژنەیەکی مەلیکی دانا بۆ لێکولینەوە ، ئەم لیژنەیەش پیشنیازی کرد کە (انتداب)و سەرپەرشتی کردنی فەلەستین سەرنەکەوتوە ، دەبێت ئەم (انتداب)و سەرپەرشتیکردنە کۆتایی پیبێت وە ولاتەکە بگرێت بەسێ بەشەوە: بەشێکی زۆری بەدەست عەرەبەکانەوە بێت ، بە شێکی بچوکی نزیك دەریایە دەست جولەکەوە بەشی سێیەمیش کە (القدس) ، یەکسەر بەدەست ئینگلیزە کانەوە بێت ، هەمو دانیشتوان عەرەب و جولەکە بەرهەڵستی ئەمەیان کرد ، گەرچی هەندێ لە جولەکەکان ئامادەبوون پێی قابل بن بەلام عەرەبەکان هەرگیز پێی رازی نەبون ، وەکرداری بەرهەڵسیتا نەیان زیاتر کرد ، وە لەماوەی چەند مانگێکی کەمی لەمەوپێشدا ئەم بەرهەڵستی کردنە شێوازیکی نیشتمانیانەی گشتی بەهێزی کرت دژی ئینگلیزەکان ، لەواقیعدا نیشتمانیەکان چەند بەشێکیان لەولاتەکە داگیرکردو بردیان بەرێوە. ئیتر بەریتانیا لەشکری نوێی نارد بۆ داگیرکردنەوەی ئەم بەشانە ، ناکۆکیەکە خراپتر بوو وەپشیوی پەرەیسەند.

ئەوی جێی داخە عەرەب و جولەکەکان بەگەڵێك کرداری تۆقاندن هەڵدەستان بەڵام لە سنورێکی تەسکدا ، کەچی بەریتانیا سیاسەتی وێرانکاریو کوشتنیان بەرکاردەهێنا ، لەمە مەبەسیان ئەوەبو کەتێکۆشانی نیشتمانی بیلیشینەوە ، وەگەڵێك شێوازی توندو تیژو درندەی تریان بەکار دەهێنا ، لەو شێوازانەی خراپتر کەوابو سەر پێشورکردنی شۆرشی ئیرلاندە بەکاریان هێنابو ، کردەوەکانی خوینیان . شوورەیەك لەچاودێری دەنگ و باسەکان ، و رۆژنامەکان دەورە دابو ، تاکو دەنگ و باس نەکاتە دەرەوە جیهان نەزانێت ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو دەنگ و باسانەی دەمان گاتی هەر چەندە کە میشن بەڵام بەسە بۆ بریاردان کەچی لەوێدا دەقەومێت. ماوەیەکی کەم لەمەوپێش خوێندمەوە کەهێزە سوپاییەکانی بەریتانیا چەند (گومان لێکراوێکی) گرتوە هەر (٥٠ تا ٤٠٠) کەسیانی خستۆتە ناو پەرژینێکی ئاسنینەوە ، کەسوکاریان ناچاربون خواردنیان بدەتی ، بەتەواوی هەر وەکو زیندەوەری ناوە قەفەس رەفتاریان لەگەڵدا دەکردن.

بەرامبەر بەم کردەوە درندانە یە کە لەگەل میللەتێکدا دەکرێت کە تێدەکۆشێت لەپێناوی ئازادی ، وسەربەستی خۆیدا ، لەم کاتەدا هەمو نیشتمانی عەرەب ، ورۆژهەلات ، و موسلمان وناموسلمان لەرقدا هەڵسانە سەرپێ. راستە عەرەبەکان هەندێ کرداری تۆقاندنیان کرد بەڵام نابێت لەبیرما نبچێت کەوا ئەمانە دژی هێزەکانی ئیستیعماری نەکریس دەجەنگن و لە پێناوی ئازادی خۆياندا.

بەراستی نەگبەتییە دوو میلەتی چەوساوە بەکژیەکدا بچن! - عەرەب و جولەکە - لە ئەوروپادا مەینەتیان چەشتوە ، وژمارەیەکی زۆریان بێلانە بوون هیچ ولاتێك لەجیهاندا نایان گرێتە خۆی ، بۆیە دەبێت لەبیرورایان تێبگەین کە: دەڵێت فەلەستین بۆ لای خۆییان دێنێت ، جولەکەکانی کە هاتوون پیشەسازیان تێهێنا ، رادەی ژیان و گوزەرانیان بەرزکردەوە ، دیسانەوە لەهەمان کاتدا دەبێ بلیین کەفەلەستین ولاتێکی عرەبیە ، دەبێ هەروابێت ، دەبێ عەرەبەکان لەوێدانەفەوتین ، هەردوو میللەتەکە دەتوانن یارمەتی یەکتری بدەن ، و لەپێناوی دروست کردنی دەولەتێکی پێشکەوتنخواز دا بێئەوەی هیچ کامیان زیان بەبەرژەوەندییەکانی ئەوی تر بگەیەنێت.

بۆبێ بەختی فەلەستین کەوتۆتە سەر ڕێگاکانی دەریایی ، و ئاسمانی کەبۆ هیندستان ، و ڕۆژهەلات دەچێت ، لەبەر ئەمە بەلای ئیستیعمارەوە زۆر گرنکە ، بەریتانیاییەکان عەرەب ، و جولەکەیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکان ، و جێبەجێکردنی مەبەسەکانی خۆیان بەکاریان هێنان. ئێمە ناتوانین بزانین لەپاشەرۆژدا چی دەبێت ، بەلام وەکو ئاشکرایە نەخشەی دا دابەش کردنە کۆنەکە سەرناگرێت ، زۆر لەوانەیە ولاتە عەرەبیەکانی دەوروبەری فەلەستین یەك بگرن ، بارو ، وەزعێکی تایبەتی بدەن بە جولەکە لەناو ولاتەکەی خۆیاندا ، بەلام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە نەتەوایەتی عەرەب لەفەلەستیندا نافەوتێت ، هەروها ولاتەکەش گەشە ناکات ئەگەر لەسەر بناغەیەکی بتەو لەیارمەتدان ، و هاوکاریکردن نەبێت ، لەگەڵ دەرکردنی ئیستیعماردا لەولاتەکە بەتەواوەتی.

# دورگەی عەرەب
# بازدانێك لەڕابوردووەوە

## ٣/یونیو/١٩٣٣

لەبابەت هەندێ لەوڵاتە عەرەبیەکانەوە بوم نوسیت ، بەڵام تائێستە باسی دورگەی عەرەبم بۆ نەکردویت، کە سەرچاوەی زمان ، و رۆشنبیری عەرەبە ، وە لەوێوە ئیسلامیەت پەیدابوە ، هەرچەندە دورگەی عەرەب سەرچاوەی (حضارة) شارستانێتی عەرەب بوە ، کەچی بەدواکەوتوویی مایەوە بەبیروڕای (عقلیة) سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەژی ، دەولەتە عەرەبیەکانی دراوسێی پێشی کەوتون لەبەرەو شارستانێتی چوندا ، وەکو میسر ، و سوریا ، و فەلەستین و عیراق. دورگەی عەرەب ولاتێکی فراوانە پانتاییەکەی نزیکەی لە سێ بەش دوو بەش ، وە یاد ووسیێکی پانتایی هیندستانە ، کەچی دانیشتوانی لەچوار ، وە یاپێنج ملیون کەس زیاتر نابن ، دیارە ئەم ژمارەیە زۆر کەمە ، زۆربەی خاکەکەی بیابانە ، لەبەر ئەمە لەداگیرکردنی داگیرکەران بەسەلامەتی دەرچو ، وە بە دورەپەرێزی ملیەوە لەجیهاندا ، نەشمەندەفەری تێدایە ، نەتەلەفون ، و تەلغراف ، دانیشتوانی بیابان نشین (البدو) و کۆچەرن لەلایەکە وە بۆلایەکیتر دەچن بەسواری حوشترەکانیانە وە کەپێی دەوترێت (کەشتی بیابان) و بەسواری ئەسپە عەرەبیەکانەوە کە لە هەمو جیهاندا ناوبانگیهەیە ، گوزەرانیان خیلەکیە لە هیهەزارەها ساڵ لەمە وپێشەوە زۆر نەگۆڕراوە. بەلام جەنگە جیهانیەکە ئەم ولاتەی گۆڕی ، هەروەك چۆن شتەکانی تریشی گۆڕی.

ئەگەر تەماشای نەخشەبکەین (خریطه) دەبینیت کە دورگەیعەرەب کەوتۆتە نێوان دەریایسور ، وکەنداوی (خلیج)ی عەرەبیەوە ، لەخوارووەوە دەریایعەرەبی ، وەلەسەرووەوە فەلەستین ، ورۆژهەلاتی ئوردون وبیابانی سوریە ، وەلەسەرووی رۆژهەلاتیەوە دولیبەپیتی (الرافدین)ە. بەلام (حجاز) کەلانەی ئیسلامە دەکەوێتە سەر کەناریدەریا لە

رۆژئاوایەوە ، دوو شارەپیرۆزەکەی (مکة) و (مدینة) لە وێدایە ، هەروها میناى (جدە) کەهەزارەها لەحەجاجەکان لە رێبارياندا بو چووتـی (مـكـة) هەموسالێك لەوى دادەبەزن (نجد)یش دەکەوێتە ناوەراستى دورگەی عەرەبەوە لەرۆژئاوای کەنداوى (خلیج) عەرەبیدا. (حجاز ونجد) بەجووت گرنگتـریـن بەشن لە بەشەکانی دورگەعەرەب ، (اليمن) دەکەوێتە خوارووی‌رۆژئاوایە وە پىێی دەوترێت: (یەمەنی‌بەختیار) چونکە لە چاو بەشەکانی‌تری ولآتەبیابانە کرکەکەدا بەپیت وبەرەکەت وخۆشە ، وە زۆرقەلەبالغە ، هەروها لەقوژبنـی خوارووی‌رۆژئاوای‌دورگەکەداشاری (عدن) هەیە کەبەریتانیـادەی پـاریـزیـت (محمیە بریطانیە) کەوا کەشتی لە هاتوچوی رۆژئاوا ، ورۆژهەلاتیدا پىێدا دەروات.

دورگەی‌عەرەب پێش جەنگی (یەکەمی) جیهانی بە دەست تورکەکـانـەوە بوو بەلام کە لە(نجد)دا (ابن سـعـود) پـەیـدابـوو ، وە دەسـتـی‌کـرد بەپتەوکردنی بناغەی حوکمرانیەکەی ، ئنجا ولاتەکەیی بەلای رۆژ هەلآتـدا بەرەو کەنداوی‌عەرەب فراوان کرد. (ابن سعود) سەروکـی پـەیـرەوێـکـی (مذهب) ئاینزا ئیسلامیە کە پىێی‌دەلێن (مذهب) وە یاپـەیـرەوی وەهـابـی کەوا لەسەدەی هەژدەهەمدا (محمد کوری کوری عبدالوەهـاب) دروسـتـی‌کـرد مەبەسی ئەم پەیرە وە (مذهب) چاككردنی ئاینی‌ئیسلام بوو ، ئـنـجـا لـەم رووەوە تارادەیەکی زۆر لەبزوتنەوەی (بیوریتانیە)کان کە لەئاینی‌مەسیحـی دا هەیە دەچێت، وەهابیەکان بەرهەلستی هەندی رەوشت دەکەن کە کولکو ، وشوێنەواری پیاوچاکان (الاولياء) بەپیروز بزانێت کەوا جەماوەری موسلمانان لەم رووەوە ریز لەو شوێنەوارانە دەنێن ، ئیتر پەیرەوی وەهابی ئەم شتانە بەبت پەرستی دادەنێت ، هەروەکو (بیوریتانیە)کان کەبەرهەلسـتـی رومـە کاثولیکەکانیان دەکرد لەریزلی‌کرتن و بەبیروز زانـیـنـی بـیـاو چـاك ، وەلیەکان ، وپەیکەرەکاندا. ئنجا وەهابیەکان لەرووی بیرورای ئایـنـیـەوە جیاوازیان هەیە لەگەل موسلمانەکانی تردا سەرەرای جیـاوازی تـریـش کـە بەهۆی بەربەرەکانی کردنی سیاسیەوە هەیانە.

دورگەی عەرەب لەکاتی جەنگە جیهانیەکەدا بو بوە مـەلـبـەنـدێـکـی موئامەرەی ئینگلیزەکان پارەو مالێکی بێشـومـاریـان تـێـدا بـلاوکـردەوە بەبەرتیل دان بەسەرۆکی خیلە عەرەبەکان ، وە جۆرەها بەلێنیان دەدانی ،

و هانیان دەدان بۆ هەستان دژی تورکیا ، روویدا وە کەسەرۆکی دوو خێڵ ناکوك بون و بەکژ یەکدا چوون ، بەڵام بەجوت بەرتیلیان لەئینگلیزەکان وەردەگرت ، ئنجا ئینگلیزەکان لەقایل کردنی (الشریف حسین)دا ، سەرکەوتن کە ـ ئەم ـ شەریفی (مکة) شۆرش هەلگیرسینی ئەمە زۆر گرنك بوو چونکە (حسین) لەبنەچەدا دەچوو وە سەر (محمد ـص) ی پێغەمبەر ، لەبەر ئەمە موسلمانەکان ریزیان لێدەگرت ، وە ئینگلیزەکانیش بەلێن یان دا یەکە بیکەن بەمەلیکی ولاتە عەرەبە یەکگرتوەکە.

(ابن سعود) ئیسپاتی کرد کەلەە (حسین) زیرەکترە توانی بەئینگلیزەکان بسەلمێنی کەدان بنین بەسەربەستیەکەیدا ، لەهەمان کاتدا مانگی پێنج هەزار (جونەیە) (الجنیە) یارمەتیان لە ئینگلیزەکان وەردەگرت ، تاکو بەبێ لایەنی (الحیاد) بمێنێتەوە ، بەم جۆرە بەزەبری ژیری ئینگلیزەکان جێی خۆیی قایم کرد ، کەچی ئەوانی تر بەشەرو شۆری هەمیشەیپەوە خەریك بوون. بەڵام (الحسین) لەولاتە ئیسلامیەکان ، و هیندستاندا ناوی زرا چونکە دژی سولتانی تورکیا کە خەلیفەی موسلمانەکان بو شۆرشی بەرپا کرد ، (ابن سعود) ئەمەی بەهەڵ زانی خوپێ وا پیشان دا کە ئەم پیاوی ئیسلامە.

ولاتی (الیمن) کەوتۆتە خوارووەوە (الأمام) حوکمرانی دەکات ، بەدرێژایی جەنگەکە بەدلسوزی تورکیا مایەوە ، گەرچی پەیوەندیشی لەگەلیدا پچرابو ، دوای شکانی تورکیا ، ئیعلانی سەربەستی خۆیی کرد تا ئێستاش (الیمن) هەر سەربەستە.

کەجەنگەکە تەواو بو ، ئینگلیزەکان بوون بەدەسەلاتدار بەسەر دورگەی عەرەبدا ویستیان (الحسین) وە(ابن سعود) بەکاربێنن بۆ مەبەسد تایبەتیەکانی خۆیان (ابن سعود) ئەوەندە زیرەك بو لەم کارە خۆی دەربازکردو نەیهێشت بەکاری بێنن ، کەچی خانەوادەی (الحسین) بەهۆی ئینگلیزەکانەوە بوژانەوە (الحسین) بو بەمەلیکی (حجاز) ، وە (فیصل)ی کوری بۆ بەمەلیکی سوریا وە (عبدالله) بوو بە ئەمیر بەسەر رۆژهەلاتی ئوردونەوە . بەلام ئەم بوژانەوەیە تەمەنی درێژ نەبوو ، فەرەنسەییەکان (فیصل) یان لەسوریا دەرکرد ، تەخت و تاجی (الحسین) بەرامبەر (ابن سعود) توایەوە ، و نەما ، کە (فیصل) بەئیش مایەوە ، ئینگلیزەکان هێنایان بۆ عیراق ، تەخت و تاجی عیراقیان دایە ، وەکردیان بەحوکم

فەرمای عێراق.

لەو ماوە کورتە دا کە (الحسین) مەلیکی (حجاز) بوو بەرلەمانی تورکی خەلافەتی لابرد ، و لە غوی کرد لەسالی ١٩٢٤ ز.دا. ئنجا (الحسین) ئەمەی بەهەل زانی خۆیی کرد بەخەلیفە موسلماندکان بەلام (ابن سعود) نەتەوایەتی عەرەب ، و غیرەتی ئیسلامیتی جولاند دژی (الحسین) وە خۆیی بەروالەت بەپالەوانی ئیسلام دەرخست کەوا بەرهەڵستی تەماعی مەلیکێکی داگیر کەر دەکات ، بە هۆی پروپاغەندەیەکی فراوانەوە توانی مەیل و سۆزی (عطف) موسلمانانی وڵاتانی تر بەلای خۆیدا راکێشیت ، لیژنەی خەلافەت لەهیندستاندا پیرۆزبایی ، و ئاواتی خۆیی بۆنارد. ئینگلیزەکان کە دیان کاروانارۆات کەبە ئارەزووی خۆیان بێت ، وە لایەن کرتنی ئەمان بو (الحسین) بریتییە لەبلیت برین لەسەر ئەسبیکی دوراو ، ئنجا لایەنی(الحسین)یان نەگرت ، وە بەئەسپایی خۆیان لێکێشایەوە ، وە یارمەتی و باربووی بارە ، و دارابیان لێبری دوای ئەوەی بەلینیکی جەورو شیرینیان پێدابو ، ئنجا بێئاوەل و بێپشت مایەوە بەرامبەر بەدوژمنێکی بەهێزکە بۆ پێشەوە دەکشێت.

دوای چەند مانگێکی کەم لەئۆکتوبەری ١٩٢٤ ز.دا وەهابیەکان چوونە (مکة)وە ، وە هەندێ کولکو ، و گوریان تێك دا بەپێ بەیرەوەکەیان ، بەم کردەوەیە هەستی گەلێك لەموسلمانانی ولاتانی تریان جولاند ، ئنجا لەساڵی ئایندەدا (ابن سعود) شاری (جدة) و (المدینة) ی داگیرکرد. ئیتر (الحسین) و خاو خێزانی ناچار بوون کە لە (حجاز) بچنە دەرەوە ، لەسەرەتای سالی ١٩٢٦ ز.دا (ابن سعود) ئیعلانی کرد کە خویی کردوە بەمەلیکی (حجاز) ، وە بۆ ئەوەی شوێنە تازەکەی خۆی قایم کات ، وە دلی موسلمانەکان بەلای خویدا راکیشیت ، داوای کرد کە کونکرەیەکی ئیسلامی جیهانی لەیو نیوی سالی ١٩٢٦ ز.دا گیرا نوێنەری لەموسلمانەکانی هەمولایەکی تێدابوو ، وادیار بو (ابن سعود) حەزی بەخەلافەت نەدە کرد ، هەر چونی بێت هەبو ولەمەدا بەربەرەکانی بکات چونکە بەیرەوەکەی (مذهب) وەهابی بوو. (ملك فؤآد) یش لەمیسردا دیسانەو چاوی بریبوە خەلافەت ، هەرچەندە میللەتی میسر بۆ ئەو خەلافەتی نەدەویست ، چونکە ناسرابو بە زۆردارو ناپاك موئامەرە چی دژی

بەرژەوەندیەکانی میللەتەکە ، بەلاّم (الحسين) دوای شکانی وازی لەخەلافەت هێنا.

کۆنگرە ئیسلامیەکە هیچ بریارێکی گرنکی نەدا ، لەوانەیە لەم بریار نەدانەگرنگانەدا مەبەسێکی تێدا بو بێت چونکە (ابن سعود) مەبەسی پتەوکردنی جۆرە شوێنی خۆی بو بەتایبەتی بەرامبەر دەولەتە بێگانەکان ، نوێنەراتی لیژنە هیندستانیەکەی لەمەر خەلافەت ، کەوا بزانم (مولانا محمد علي) یشی تێدابوو ، بەدڵ شکاوی و نامرادی گەرانەوە ، وەرقیان لە (ابن مسعود) هەستا ، ئەم رق هەستانە لە(ابن مسعود) کەم و زۆرکاری تێ نەکرد ، چونکە ئەوی ویستی و مەبەسی بو لەلیژنەی خەلافەتە هیندستانیەکە هاتەدی بۆی ئێستا دەتوانێت هەرچیەکی بوێت بیکات ، بێ یارمەتی ئەوان.

(ابن سعود) بو بەحوکم فەرمایەکی سەرو مری تەواوی دورگەی عەرەب جگە لە (اليمن) کەوابەدەولەتێکی سەربەست مایەوە بەدەست حوکمرانیی (الأمام)ەوە ، ئنجا جگە لەم قوژبنە (ابن مسعود) بۆ بەگەورە ، و سەرداری دورگەی عەرەب ، و نازناوی بوو بەملیکی (حجاز ، و نجد) ، دەولەتە بێگانەکان دان یان نابەسەربەستیەکەیدا وە لەهەمان کاتدا ریی دەولەتە بێگانەکانی نەدا ببرای ببر هیچ جۆرە خواردنەوەیەك وەکو عەرەق و بیرە، و ویسکی... هتد بهێنێنە ولاتەکەیەوە.

دوای ئەوەی (ابن مسعود) وەکو سەربازو جەنگاوەرێك سەرکەوت ، ئیتر هەمو رەنجێکی خویی بۆ ئاوەدات کردنەوەی ولاتەکەی لەسەر شێوەی سەردەمی تازە تەرخان کرد ، لەژیانی خێلەکیەوە ویستی بازی پێدا بۆژیانێکی سەردەمی تازە ، وا دیارە (ابن مسعود) تارادەیەکی زۆر لەم رووە وە سەرکەوتوە بەمە ئیسپاتی کرد کەوا پیاوێکی سیاسی لێهاتو ، و دور ئەندێشە.

یەکەم ئیشێکی سەرکەوتو کە (ابن مسعود) کردی چەسپاندنی ئاسایش بوو لە ناو ولاتەکەدا ، لەماوەیەکی کورت دا کاروانی حاجیەکان زۆر بەئەمینی دەرۆیشتن بۆ ولاتی (حجاز) ئەمە سەرکەوتنێکی مەزن بوو خەلکەکە زۆریان پێخۆش بوو چونکە حاجیەکان لەپێشدا چونیان دا بۆ ئەو ولاتە لەرێ تالان دەکران.

بەلام سەرکەوتنی دوەمی – کە لەیەکەم مەزن تر بو – بریتی بو لە نیشتەجێکردنی بیابان نشینە کۆچەر ەکان (البدو) لەپێش ئەوەدا کە(حجاز) داگیربکات دەستی کرد بەم ئیشە ، ئەمە بناغەی دەولەتێکی نوێی دارشت ئەم کارە هەرگیز ئاسان نییە لەگەل بیابان نشینەکاندا کەژیانیان کۆچ کردنە لەلایەکەوە بۆ لایەکیتر ،وحەز لەئازادی دەکەن،لەگەل ئەمەشدا (ابن مسعود) لەمەدا سەرکەوت ، سەرەرای ئەمەش دام و دەزگای بەرێوەبردنی چاك کرد ، فرۆکە ، و ئوتومبیل و تەلەفون و گەلێکیتر لەدیمەنەکانی شارستانی نوێی هێنایە و لاتەوە. (حجاز) زۆر بەشێنەیی پێش دەکەوێت بەلام بەهەنگاوی چەسپاو ، بەتین ، چونکە لەهەمو شتێك گرانتر ئەوەیە کەباز بەمیللەت بدرێت لەسەدەکانی ناوەراستەوە بۆ سەردەمی نوێ لەبەر ئەوەی ئەمە پێویستی بەگۆرینی بیروا ، و (عقلیە)تی خەلکەکەوە هەیە. ئەم پێشکەوتن و ئامیرە تازانە ، هەندێ کەس بەرهەلستیان دەکرد ، چونکە وایان دەزانی گەشەیان کردە ، و پێیان ناخوش بووئەم پێ ناخۆش بوونە گەیشتە ئەو بەری کە لەسالی ١٩٢٩ز.دا هەرایەکیان بەرپا کرد بەلام (ابن سعود) توانی بەسەریاندا زال بیت ، دوای ئەوە هەندێکیان بەچاکەو دلنەوایی هێنایە لای خۆی ، و هەندێکی تریشیان بەزەبری شمشیر.

(ابن سعود) توشی کێشەیەکی گرانتر هات هەر هەمان کێشە بو توشی جیهانهاتبو ، لە کاتێکدا لەسالی ١٩٣٠ز. دا کە کێشە ئابوریە کە رووی دابوو ، ولاتە عەرەبیەکانی کەپیشەسازیان تێدابوو ، لەوانی کە زیاتر ئەم کێشەیە کاری تێ کردن تا ئێستەش بەدەست ئەم کێشەیەوە دەنالێنن. بەلام دورگەی عەرەب هیچ پەیوەندیەکی بازرگانیِ فراوانی وای نەبوو کە کێشە ئابوریەکە کاری تێ بکات ، لەگەل ئەمەشدا کێشەکە ،کاری تێکردو گرتیەوە ، چونکە گەورەترین کانگای دارایی (ابن مسعود) لەحاجیەکانەوەیە کە دین بۆ زیارەتی (مکە) ، سالی نزیکەی ١٠٠٫٠٠٠کەس لەوتەکانی ترەوە دەهاتن ، بەلام لەسالی ١٩٣٠ز. دا ئەم ژمارەیە هاتە سەر (٤٠٫٠٠٠) کەس وەتا ئێستاش هەر لە کەم بوونەوەدایە ، ئەمە بو بەهۆی ئەوەی باری ئابوری سەرەو ژێرکاتەوە هەزاری ، و مەینەتی نەشەنەی کرد ، رەنج برۆژە ئیصلاحیەکانی (ابن مسعود) تەگەردی دەهاتە پێش ، لەگەل ئەمەشدا نەیدەهێشت هیچ ئمتیازاتێك بدرێت بەبێگانەکان بو

بەكارهێنان و سودوەرگرتن لەكانگانی ولاتەكە لەترسی زیاد بوونی دەسەڵاتیان ، كە سەر ئەنجام دەست دەخەنە كاروباری ناوخووە ، و ئەم مەترسیەشی لەجێی خۆیدا بوە چونكە زۆربە ، بەدكاری كەتوشی موستەعمەرەكان هاتووە بەهۆی دەست خستنە كاروباری ناوەوە ، و چەوساندنەوەوە بوە لەلایەن بێگانەكانی دەرەوەوە ، بوبە (ابن مسعود) هەزاری لەگەڵ ئازادیدا پەسند دەكرد بەسەر دەولەمەندی بێئازادیدا.

كەباری ئابوری لەولاتدا بەرەو خراپی چو (ابن مسعود) ناچار بوو تورێك سیاسەتەكەی دەستكاری بكات ، ئنجا دەستی‌كرد بەپێشكەش كردنی هەندی ئیمتیازات بەبێگانەكان ، وە لەهەمان كاتدا زۆر بە وریایی بۆ ئەم كارەچوو بەوەی كە هەندێ مەرجی دانا كەزامنی پاراستنی سەربەستیەكەی بێت تا ئێستا هیچ ئیمتیازاتێكی نەداوە بەموسلمانەكان نەبێت ، ئیمتیازاتی دروست كردنی رێگای ئاسنینی شەمەندەفەری نێوان (جدە) ، و (مكە)ی داوە بەشەریكەیەكی موسلمانی هیندستانی ، رێگا ئاسنینی شەمەندەفە رلەدورگەی عەرەبدا شتێكی باشە ، بەكۆدەتایەك (انقلاب) دەچێت. سەرەرای ئەوەی كەسوودیشی هەیە هۆبەكە بۆ گواستنەوەی حاجیەكان و هاتوچۆیان ، وە شێوەی شارستانێتی دەدا یەعەرەب.

لەنامەیەكی پێشودا باسی تاكە رێگای ئاسنینم بۆ كردیت كە لەدورگەكەدا هەیە ئەویش رێگای ئاسنینی (حجاز)ە كەشاری (مدینە) بەرێگای ئاسنینی بغداد لە(طب)ەوە دەبەستێت.

لەسەرەتای ئەم نامەیەدا پێم وتیت بەشەكەی خواروو پێی دەڵێن: (یەمەنی بەختیار) (الیمن السعیدة) ، بێگومان ئەم ناوە پانتاییەكی زۆرە لەخوارووی دورگەكەوە تا دەكاتە كەنداوی عەرەب دەگرێتەوە ، بەلام ناوەكە لەگەل ناوەرۆكەكە دا ناگونجێت ، چونكە بیابانی ئەم ناوچانە سامناك و كرك و چۆلە. لەوانە یە ئەمە بەشانە لەرابوردودا نە ناسرابن ، بۆیە لەم ناونانەدا بەهەلە چون ، تەنانەت تا زۆر ئەم نزیكانەش هەر نەناسرا بوو شوێن هەیە لەجیهاندا وەكو ئەوی كەوا نەپیورابێت ، وەیا نەخشەی بۆنەكرا بێت.

# عیراقو سوودی بومباباران

## ٧/یونیو/١٩٣٣

هێشتا دەولەتێکی عەرەبی ماوە باسیم بۆ نەکردویت ، ئەمیش عێراقە ئەو ولاتە بەپیتەیە کە کەوتۆتە نێوان دیجلە ، و فوراتەوە کەوا (بغداد) پایتەختیتی ، وڵاتی (هارون الرشید)و چیرۆکە کانی ئەلف لیلایە ، کەوتۆتە نێوان ئێران ، و بیابانی عەرەبەوە ، (بصره) میناى سەرەکیەتی لەخوارووەوە لەسەر کەندوای عەرەب ، لەسەرووویە بەتورکیاوە نوساوە ، عێراق و تورکیا بەیەك دەگەن لەکوردستاندا ، واتە ئەو ناوچەیەی کەکوردەکانی تێدا دانیشتوە ، زۆربەی ئەم کوردانە لەتورکیادا دەژین ، لەبیرتە کەباسی تێکۆشانیان دژی تورکیا لەپێناوی ئازادیاندا بۆ کردیت هەروها بەشێك لەم کوردانە لەعێراقدان کەمایەتیەکی گرنگ پێك دینن ، (موصل) کەکەوتۆتە لای سەروو لەناوچەی کوردستان لەعێراقدا بو بوە هۆی ناکۆکی لەنێوان ئینگلیزە و تورکیادا ، ئێستە لەژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکاندایە ، نزیك (موصل) شوێنەواری (نەینەوا) هەیە کەپایتەختی ئاشوریەکان بوو.

عێراق یەکێکە لەو ولاتانەی کەوا کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم) بەریتانیای نارد بو بۆ سەرپەرشتیکردنی وەیا ناردنی بۆ سەرپەرشتیکردنی بەرەوشتی کۆمەلەکە ماناى (سپاردەیەکی پیرۆزە) لەئەستۆی دەولەتە نیراوەکەدایە ، کەوا نێرراوە بۆ ئەو ولاتە بۆ ئەوەی بیان خاتە سەرباری مەدەنیەت ، و ڕێشیان بخات ، لەجیاتی کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم). بنچینەی ئەم بڕوایە ئەوەیە کەدانیشتوانی ئەوولاتەی کەسەرپەرشتیکەری بۆ دەچێت ، نەگەیشتونەتە پلەیەکی پێشکەوتنی وا کەبتوانن خۆیان بەرێوەبەرن. لەبەر ئەمە ، کە دەولەتە گەورەکان لەم

ڕێبازەوە یارمەتیان بدەن ، ئەمە تارادەیەك لەوەدەچێت كە پاراستنی ئاسك و كاوكول بەبلنكیكی در بسبیریت.[1] لەناردن بۆ سەرپەرشتی كردن (الانتداب) دادەبێت كاتێك دەولەتە گەورەكان پێ‌هەلسن كە لەسەر داواكردنی میللەكان بێت ، كەچی ئەو ولاتانەی كە لەرۆژئاوای ئاسیادا لەدەسەلاتی توركیا رزگاریان بوو كەوتنە قەمچی بەریتانیاو ، فەرەنساوە. وەكو لەپێشدا پێم وتیت ئەم دوو حوكومە تە بلاویان كردەوە گوایا| ئەوی مەبەسیانە "ئازادكردنی كەلانە ئازادكردنێكی تەواو تی ، وەدامەرراندنی حوكومەتی و بەرێوەبەرایەتی نیشتمانی‌یە ، كەوا دەسەلاتەكانی لەئارەزوو ، و خواستی ئەم كەلانەوە ، وەرگرێت... بەلام جێبەجێكردنی ئەم مەبەسە پیرۆزەمان لەم سالانەی دواییدا لەسوریا ، و فەلەستین ، و رۆژ هەلاتی ئوردونـدادی! لەوێنەی پێشوی ، و یارمەت نەدان و ، بەلادا نەچوون ، وموقاتەعەكردندا. وە ئەم دوو دەولەتە كەنێررابوون بۆ سەربەرستی‌كردن لایەنی "خواستی ئەم میللەتانەیان" دەگرت ، بەتەقەكردن لێیان ، و دەربەدەركردنی پێشەواكانیان ، و داخستنی رۆژنامەكانیان ، وەروخاندنی شارو دێهاتیان ، وە بەئیعلان كردنی حوكمی عورفی تیادا ، ئیتر لەواقیعدا ئەم كردارانە شتێكی تازەی تێدانی‌یە ، چونكە دەولەتە ئیستیعماریەكان لەو ساكەوە كە ئیستیعمار پەیدابووە هەمیشە پەنایان بردوتە بەر شێوازی زۆرەملی ، و تێك دان ، و تۆقاندن ، بەلام ئەوی تازەیە لەمەدا تەقەلادانی ئیستیعمارە بۆ شاردنەوەی توقاندنەكە ، و چەوساندنەوەكەی بەپەردەیەك لەوتەی رێك وپێك وەكو (ئاموژگاری‌كردن "الوصایه" و (حاكەی میللەتان)و (راهێنانی میللەتە دوا كەوتوەكان ، كە حوكمرانی خۆیان بكەن) و شتی‌تری لەم بابەتە ؛ تەقەو دەست درێژی دەكەن ، و دەكوژن ، و وێران دەكەن بۆ چاكەی میللەتەكەیە! رەنگە ئەم درۆ ، و دەلەسانە نیشانەیەك بێت لەنیشانەو دروشمەكانی بەرەو شارستانێتی چونكە درۆ ، دەلەسە بنچینەیەكە لەبنجنەكانی چاكە! چونكە درۆزن حەز ناكات راستی دەركەوێت ، بەلكو هەول دەدات بەواتەی درۆ بیشارێتەوە ، هەرچۆنێك بێت ئەگەر درو بەبەرگ و دیمەنی پیاو چاكی و ، لەخوا ترسی‌یەوە دەركەوێت گەلێك خراپترە لەو راستەی كە هەرچەند ، نەنگ و ناخۆش بێت.

با ئێستا سه یرێکی خواستەکانی دانیشتوانی عێراق بکەین ، کە ئەم ولاتە چۆن بەرێبازی ئازادیدا رویشت لەسایەی سەرپەرشتیکردنی بەریتانیاوە !. ئینگلیزەکان لەماوەی جەنگە جیهانیە کەدا عێراقیان کرد بۆ بەبنکەیەکی جەنگ لەشەرکردنیاندا دژی تورکەکان ، بریان کرد لەسەربازی ئینگلیزو ، هیندستانی ، لەساڵی ١٩١٦ز. دا شکستێکی خراپیان بەسەرداهات لە (کوت العمارة) دا کە (تاونشند) جەنرالی ئینگلیز خۆی دابەدەست تورکەکانەوە ، کرداری سوپایی لەعێراقدا نموونەی بەرێوە بردنێکی خراپ ، و دەست بڵاوی بوو ، لەبەر ئەوەی هێرشەکە لەژێر چاودێری حوکومەتی هیندستاندا بوو ، ئەم حوکومەتە رووبەرووی سەرزەنشتیەکی توند ، هەرچونێك بێت ئینگلیزەکان بەهۆی پارە ، و جبەخانەی زۆریانەوە لەکۆتایدا هەرسەرکەوتن بەسەرتورکەکاندا (بغداد)یان داگیردو ، نزیك (موصل) بونەوە ، کە جەنگەکە تەواو بوو هەمو عێراق تێکرا کەوتە ژێردەسەلاتی ئینگلیزەکانەوە.

کەبەریتانیا کرا بەسەرپەرشتیار بەسەر عێراقەوە لەسەرتای ساڵی ١٩٢٠ز. دا گەلێك کرداری بەرپەرچ دانەوە لەوێ پەیدابوو ، خەلکەکە بەتوندی بێزاریان دەربری ، ئنجا بێزاری دەربرین بوو بە پشێوی ، وەپشێویش کرا بەشۆرش ، وە ئەم شۆرشە خێرا بڵێسەی بڵاوبووەوە تاکو وڵاتەکەی تێکرا گرتەوە. ئەوی سەیرە نێوەی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ز. گەلێك پشێوی وەکو ئەمەی دی ـ نزیکەی لەهەمان کاتدا ـ لەتورکیا ، و لەمیسر و سوریا ، و فەلەستین ، و ئیران دا تەنانەت لە هیندستاندا دانیشتوان خۆیان ئامادە دەکرد کە دەست بدەنە چەکی موقاتەعە ، و بەلادانەچون ، لە دوایدا ئینگلیزەکان بەیارمەتی سەربازە هیندستانیەکان شۆرشەکەی عێراق بفەوتێنن و ، بی بلیشینەوە ، ئیتر ئیستیعماری ئینگلیزی رەوشت و خوی وایە کە گرانباری خراپە کردن بەسەربازە هیندستانیەکان بسپێرێت ، بۆیە خەلکی رۆژهەلاتی ناوەراست قینیان لەهیندستان بوو سەبارەت بە کردەوەی سەربازەکانی کە بە فەرمانی ئینگلیزەکان دەیانکرد.

بەدو رێباز ئینگلیزەکان توانیان بەسەر شۆرشەکەدا زاڵ بن: یەکەم بەزەبری هێز دووەم بە بەڵێن دانی سەربەستی ، ئنجا حوکومەتکیان پێکەوەنا ، هەرچەندە وەزیری هەرەبی تێدابوو بەلام ، بۆ هەموو وزیرێك

راوێژکەرێکی بەریتانیاییان بۆ دانابوو ، کە دەسەڵاتی راستەقینە بەدەست ئەمەوە بوو ،بوو ،بەلام ئەو وەزیرانەی کەئەمان متمانەیان پێدەکردن ، وە لەسەرشۆر کردن بۆ ئەمان ، وە لەیاخی نەبوون لێیان جێی باوەریان بوون رازی نەبوون کەفەرمانی ئینگلیزەکان بە ئەنجام بگەیەنن ، و جێبەجێی بکەن ، ئیتر ئینگلیزەکان لەساڵی ١٩٢١ز. دا هەڵسان بەگرتنی وەزیرەکان و (السید طالب)ی سەرۆکیان لەهەموویان لێهاتوتر بو دەربەدەری کرد بەمە هەنگاوێکی تریان نا لەپێناوی پێدانی سەربەستی ولاتەکەدا! هاوینی ساڵی ١٩٢١ز. دا (فیصل کوری الحسین)یان هێنا ، و کردیان بەمەلیکی عێراق. لەبیرتە کچم (فیصل) ئەو دەمە بێئیش بوو چونکە نەیدەتوانی تەخت و تاجە کەی بپارێزیت لە سوریادا بەهۆی دەست درێژی فەرەنسەییەکانەوە (فیصل) دوستێکی بەوەفای ئینگلیزەکان بوو لەشۆرشی عەرەبەکاندا دژی تورکەکان لەکاتی جەنگە جیهانیەکەدا بەشداری شۆرشەکەی کرد بو لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان بروایان وابوو کە لە وەزیرەکانی پێشو کە باسکران زیاتر گوێ لەمست دەبێت بۆیان ئیتر گەورە پیاوان و چینی مام ناوەندی دەوڵەمەند ، و گەلێك پیاو بەرزەکان رازی بون بە (فیصل) ببێت بەمەلیکی ولاتەکە بەمەرجێك حوکومەتیکی دەستوریو بارلەمانێکی دیموکراتی هەبێت لە واقعیدا کەس گوێی نەدایە ئەم مەرجەیان - ئەوی دەیان ویست بەرلەمانێکی راستەقینە بوو - بەلام کە بۆیان ساغ بوەوە ، بیانەوێت و نەیانەوێت (فیصل) هەردەکرێت بەمەلیکی عێراق بۆیە ئەم مەرجەیان دانا.. وە لەمەسەلەکەشدا پرس بەمیللەت نەکرا ، ئیتر (فیصل) لەئابی ١٩٢١ز. دا بوو بە مەلیك.

بەڵام ئەمە کێشەکەی جێبەجێ نەکرد ، میللەتی عێراق بەتوندی بەرهەڵستی سەرپەرشتیکردن و ، (انتداب)ی بەریتانیای دەکرد ، خۆپیشاندان بەرپا بوو ، خەڵکی وروژان تارادەیەکی زۆرلەئابی ١٩٢٢ز. وە کاروبار بەرەو خراپی جووو لەکاتێکدا دام و دەزگای بەریتانیا خەریك بو دەرسێکی‌تر لەبابەت‌سەربەستی‌یەوە فێری عێراقیەکان بکات ، نێرراوی بەرز وە یا سەرپەرشتیاری بەرزی بەریتانیا (سیربرسی‌کوکس) هەمو دەسەلاتەکانی مەلیك (کە لەوکاتەدا نەخوش بو) پەك خست هەروەها دەسەلاتەکانی وەزارەت و ئەو ئەنجومەنەش کەدانرا بو ، ئیتر خۆی بەدەستی خۆی جلەوی

کاروباری حوکومەتی گرتە دەست بەمە بو بە دیکتاتورێکی سەرومر ، وە توانی ئارەزو ، و خواستی خۆی جێبەجێ بکات ، هەروەها پشێوی ، و ئاژاوە بەیارمەتی هێزەکانی بەریتانیاو بەتایبەتی هێزی فرۆکە بکوژێنێتەوە ، ئنجا هەمان دەستور چیرۆکەکەی دوبارە کردەوە کە لە هەمولایەکدا رووی دەدا ، وەکو لەهیندستان ، و میسر ، وسوریادا ، بەلام لەگەڵ سووکە گۆرانێکدا .. هند رۆژنامە نیشتمانیەکانی داخست حیزبەکانی قەدەغە کرد ، پێشەولکانی دەربەدەرکردن ، ئنجا فرۆکەکانی بەریتانیا ، بەزەبری بۆمباکانی توانی هێزو گەورەیی بەریتانیا ئیسپات بکات.

لەگەڵ ئەم هەموەشدا هێشتا کێشەکە هەر جێبەجێ نەبو ، لەپاش چەند مانگێکی کەم (سیریرسی کوکس) رێی بەمەلیك و ، وەزیرەکانیدا - کە بەروالەت - ئەمان ئیش و کار بەرن بەرێوە ، وەتا جاری کردن کە پەیمانێك لەگەڵ بەریتانیادا ئیمزا بکەن ، و لەم پەیمانەدا ، جارێکی تر بەلێنی سەربەستیی ، و چونە ناو کۆمەڵی میللەتانەوە (عصبة الأمم) بەعێراق درا ، لەپشت ئەم هەمو بەلێنانەوە ، حەقیقەتێکی سامناك خۆی شاردبوەوە کە بریتی بو لەوەی کە حوکومەتی عێراق بەپێی ئەم پەیمانە بریار دەدات کە ولاتەکە بەیارمەتی فەرمانبەرە ئینگلیزەکان و هەتر کە حوکومەتی بەریتانیا پەسندیان بکات دەبات بەرێوە پەیمانامەکە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٢ ز.دا ئیمزا کرا بێ ئەوەی میللەت بی سەلمێنی سەرەرای ئەمەش میللەت لەوباوەرەدا بو کە حوکومەت بوو کە شوشەیەکە بەدەست ئینگلیزەکانەوە ، وە دەسەلاتی راستەقینە بەدەست ئەمانەوەیە ، ئیتر میللەت موقاتەعەی ئەو هەڵبژاردنانەی کردو بەلای دانەچو کەوا گوایا دەکران بۆ پێك هێنانی ئەنجومەنێکی دامەزرێنەر کە دەستور دابنێت ، ئنجا موقاتەعە ، و بەلادا نەچوونەکە سەریگرت و هەڵبژاردن نەکرا ، و ئەنجومەنی دامەزرێنەریش کۆ نەبوەوە ، دوابەدوای ئەمە پشێوی بەرپابوو خەلکی یاجیان نەدا.

ئەم پشێویانە تا کۆتایی ساڵی ١٩٢٣ ز ، بەردەوام بو هەتاکو ئەو کاتەی کە ئینگلیزەکان پەیماننامەکەیان توزێك دەستکاری ، و راست کردەوە ، دوای ئەوەی پێشەواکانی ولاتەکەیان دەربەدەکرد ، ئنجا توندو

تیژی سووك بو ، لەسەرەتایی ساڵی ١٩٢٤ ز.دا دەست کرا بە هەڵبژاردن بو ئەنجومەنی یاسادانان. کە ئەنجومەنەکە کۆبوەوە بەتوندی بەرهەڵستی پەیماننامەکەی بەریتانیای کرد ، بەریتانیاش بە گەلێك جۆر تینی بۆ ئەندامەکانی هێنا کە بیسەلمێنن وئیمزای کەن ، بەڵام لەسێیەکی کەمێك زیاتر ، لەئەندامانی ئەنجومەنەکە سەڵماندیان و رازی بوون زۆربەیان نەهاتبوون بۆ کۆبونەوەکە.

کۆمەل و ئەنجومەنی یاسادانانەکە دەستورێکی نوێی بۆ عێراق دانا ، ئەم دەستورە ـ لەسەر کاغەز ـ پاش بوو چونکە: عێراقی بەدەولەتێکی سەربەست و ئازاد ، و پشتاوپشت مەلیکی و دەستوری وجۆری حوکومەتەکەشی بەبەرلەمانی دادەنا ، بەڵام ئەنجومەنی پیران (مجلس الشیوخ) کە یەکێك بو لە هەردو ئەنجومەنی بەرلەمانەکە لەلایەن مەلیکەوە دادەنران ، بەم پێیە مەلیك دەسەلاتێکی فراوانی هەبو ، هەر وهامەلیك فەرمانبەرایەتیە بەرزەکانی لەشوێنە گرنکەکاندا بەئینگلیزەکان دەسپارد ، ئەم دەستورە لەمارتی ١٩٢٥ز. وە بەکارهێنرا ، چەند ساڵێك پەیرەوی پێکرا ، بەڵام بەرهەڵستی کردنی سەرپەرشتی (الانتداب)و بێزاربوون لێی بەردەوام بوون.

لەومەسەلە گرنکانەی کە سەرنجی رادەکێشا لەم رۆژانەدا بەرپا بوونی ناکۆکی بو لەنێوان ئینگلتەرەو تورکیادا لەسەر (الموصل) هەروها عێراقیش لایەنێك بوو لەم ناکۆکیەدا کە لە دواییدا بە بەستنی پەیماننامەیەك لە یونیوی ١٩٢٦ز. دا لە نێوان ئینگلیزو ، و عێراق و ترکیادا کۆتایی هات بەپێی ئەم پەیماننامەیە (موصل) درابە عێراق ، لەبەر ئەوەی عێراق بەدەست ئیستیعماری ئینگلیزەوە بو ، ئەم پەیماننامەیە پەیوەندیەکانی ئینگلتەرەی مسۆگەر کرد.

لەپاشاندا پەیماننامەیەکی نوێ لەنێوان بەریتانیا ،و عێراقدا لەیونیو ١٩٣٠ بەسترا ، بەپێی ئەم پەیماننامەیە بەریتانیا دانی نا بەسەربەستی عێراقدا بەتەواوەتی چ لە کاروباری ناوخو وەیان دەرەوەدا بەڵام هەندی مەرجی تێدابوو ، کە لەپەیماننامەیەکی سەربەستیەوە کرد بوی بەپەیماننامەیەکی پاراستن (الحمایة) چونکە کەپەیماننامەکەدا هەبوو کەوا لەپێناوی پاراستنی رێگای هیندستاندا دەبێت عێراق هەندێ جێ ، و شوێن

بخاته بەردەستی بەریتانیا ، وەکو فزۆکەکە بەکاری بهێنێ ، هەروەها بەریتانیا بۆی هەیە هێزە سەربازیەکانی لە (موصل)و شوێنانی تردا دانێت کە لە پەیماننامەکەدا هەبو ، دیسانەوە عێراق دەتوانێت و دەبێت تەنها پشت بە شارەزایی ئەفسەرەکانی لەشکری بەریتانیا ببەستێت ، بەڵام چەك و ، جبەخانەکان لەبەریتانیاوە دێن ، ئنجا لەکاتی قەومانی جەنگدا بەریتانیا بۆی هەیە کانگا ، و سەرچاوەکانی ولاتەکە لەکاروباری جەنگیدا دژی دوژمنەکەی بە کاربهێنێت ، هەروەها بەریتانیا بەهۆی هێزەکانیەوە کە لەمەڵبەندە ستراتیجیەکاندا یە لە (موصل) بەئاسانی بسرەوێنێتە تورکیا ، وئێران ، و ئازربایجان کە لەیەکێتی سۆڤێت دایە.

دوای ئەم پەیماننامەیە پەیماننامەیەکی تری دەربارەی دادگا هاتە گۆری بە پێی ئەم پەیماننامەیە عێراق بەڵێن دەدا کە راوێژپێکراوێکی دادگا لە ئینگلیزەکان دانێت هەروەها سەروکێکیش بۆ دادگای دوپات کردنەوە (محكمة الاستئناف) لە ئینگلیزەکان بێت ، دیسانەوە سەرۆکی دادگاکانی (بصرة ، بغداد ، موصل) وو هي تر دەبێت ئینگلیز بن.

سەرەرای ئەمەش هەمو مەنسەب ، و جێ ، و شوێنە بەرزەکان لە ولاتەکەدا بە دەست فەرمانبەرە ئینگلیزەکانەوە بو ، ئەمە وا دەگەیەنێت کە "سەربەستیەکە" مانای پاراستنە (الحماية) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ناوەی پەیماننامە کە بیست و پێنج ساڵ بوو. لەدوای سەڵماندن و مۆرکردنی دەستورەکە لەساڵی ١٩٢٥ز. وە بەرلەمان دەستی کرد بە بەکارهێنانی دەسەلاتەکانی خۆی ، بەڵام میللەت هەرداخي لە دڵدا بو ، هەندی پشێوی لەناوچە دورەکان بە تایبەتی ناوچە کوردەکاندا رووىدا ، ئیتر چەکی ئاسمانی بەریتانیا لەسەر پێشورکردنی ئەم پشێویانەدا بەکارهێنرا ، بە بۆمبا باران ، روخاندن ،و یڕانکردنی دێهاتەکان بە تەواوی ، ئنجا دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە ساڵی ١٩٣٠ز ، کێشەیەکی تر پەیدا بوو ئەوەیش ئەوەبو کە عێراق بخرێتە ناو کۆمەڵی میللەتانەوە (عصبة الامم) لەسەرپێشنیاری بەریتانیا. بەڵام ولاتەکە بە درێژایی ئەم ماوەیە بەردەوام وروژابو ، ئەمە بو ئینگلیزەکان باش نەبوو ، دیسانەوە بو حوکومەتی مەلیك (فیصل)یش باش نەبوو ، چونکە بەردەوام بوونی شۆرش نیشانەی رازی نەبونی میللەتە لەو حوکومەتەی کە بەریتانیایەکان

سەپاندویانە بەسەریدا ، ئنجا بەریتانیاییەکان وایان بە چاك زانی کۆمەڵی میللەتان (عصبة الامم) بەم شۆرشانە نەزانێت ، بریاریان دا کە بەزەبری هێزو تووقاندن بیکوژێننەوە: بۆ ئەم مەبەسە چەکی ئاسمانی بەریتانیایان بەکارهێنا لە ئەنجامی هەول و تەقەلا دانیان دا بۆ چەسپاندنی ئسایش و رژێم (النظام) بەزەبری هێز ، ئیتر ئەو ، وەسفەی کە ئەفسەرێکی ئینگلیز (کولونیل سیرارنولرویسون) کردویەتی لە وتارێکیدا لە کۆمەڵی مەلیکی ئاسیاییدا لە (لندن) لە ٨ یونیوی ١٩٣٢ز. دا باسی کردوە بە تەواوەتی راستە و دەڵێت:

"نیشان گرتنەوە ، و بێگانێکی راست (سەرەرای هەمو شتیك کە لەجنیف دا دە وتریێت) کەوا چەکی ئاسمانی بەریتانیا پێی هەلسا لەبومبا باران کردنی دانیشتوە کوردە کاندا لەماوەی دە ساڵی رابوردوودا وە بەتایبەتی لەم شەش مانگەی دواییدا ، دێهاتی کاول کراو ، و ئازەلی سەربرراو ، و ژن و منداڵی لەش و لارتێك چو ،و سەقەت بەلکەیەکن بەدرو ناخرێنەوە بو نمونەیەکی بێهاوتای مەدەنیەت بەپێی وتەی رۆژنامەی تایمس".

ئنجاکە لادێییەکانیان دی رادەکەن ، و خۆیان دەشارنەوە کە فرۆکەکان لێیان نزیك دەبنەوە ، گیانێکی سپورتیان دەرنەبری لە چاوەروان کردنی بومباکاندا کە بەسەریاندا دەبارێت! ئنجا دەستیان کرد بە بەکارهێنانی جۆرێکی تازە لە بومبا بەوەخت دەتەقێت مەبەسیان لەم فیلە شەیتانیانە ئەوەبو کە لادێییەکان فریو دەن دوای رویشتنی فرۆکەکان بگەرێنەوە ماڵەوە ئەوساکە بۆمباکە پێیاندا بتەقێتەوە ، ئەوانەی کە لەم بۆمبا بارانەدا دەکوژران گەلێك بەختیار تر بوون لەوانەی کە بە یەك کەو تویی دەمانەوە وەیا قاچ و دەستیان دەقرتا وەیا کەنفت دەبوون بە تایبەتی لەو لادێ دورانەدا چونکە چارەسەرکردنی پزیشکی نەبو ئەم بۆمبا بارانانە سەرکەوت ئاسایش و رژێم (النظام) بەر کەمال بون ، حوکومەتی عێراق بە ئاموزگاری بەریتانیا ، خۆیی پیشکەش کۆمەڵی میللەتان دا (عصبة الامم) کردو بو بە ئەندام تیایدا.

ئیتر کە عێراق بو بە ئەندامێك لە کۆمەڵی میللەتاندا (عصبة الامم) ئنجا سەرپەرشتی کردن (الانتداب) لەلایەن بەریتانیاوە کۆتایی هات ، و

کرا پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٠ز. کەوا دەسەڵاتی ئینگلیزە کانی بەسەر دەولەتەکەدا بە تەواوی مسۆگەرکرد.

لەگەل ئەمەشدا میللەت بەتەواوەتی هێمن نەبووەوە ، بەلکو هەر رقی لەبار ، و وەزعی گشتی هەبوو ، چونکە میللەت ئازادی تەواو ، و یەکگرتنی دەویست لەگەل ولاتە عەرەبیەکانی تردا ، کەچی کەم و زۆر بایەخیان نەدا بەئەندامێتیان لەکۆمەڵی میللەتاندا (عصبة الامم) چونکە لەگەل میللەتەکانی تردا لەو باوەڕەدا بون کە کۆمەلی میلەتان (عصبة الامم) کۆتەکی دەستی دەولەتە گەورەکانی ئەوروپایە بۆ جێبەجێکردنی ئارەزوی ئیستیعمار گەرانەیان(آ).

ئێستا گەشتەکەمان لە و لاتە عەرەبیەکاندا کۆتایی هات ، کەچم بێگومان: دێت کە چۆن ئەم ولاتانە ، لەگەل هیندستان ، و ولاتەکانی تری رۆژهەلاتدا شەپۆلی نیشتمان پەروەری دوای جەنگە جیهانیەکە دەی جولاندن ئەمە لە تەوژمی کارەبا دەچێت کە بەتەلێکدادێت و ئەم ولاتانە هەمویان بەیەکەوو دەبەستێت وە ئەم ولاتانەش لەیەکتری دەچن لەشێوازی هەستان و وریا بونەوە یاندا چونکە بەیاخی بون دەست پێدەکەن ، یاخی بونە کە دەبێت بەشۆرشێکی توندو تیژ ، ئنجا وردە ، وردە پشت بەسیاسەتی یارمەت نەدان ، و بەلادانە چون ، و موقاتەعە دەبەستن ، بێگومان شێوازی بەربەرەکانی ، و بەرگریە نوێ کە هیندستان دای هێنا لەساڵی ١٩٢٠ز. دا کە (حیزبی) کۆنگرەی هیندستانی پێشنیارەکانی (غاندی) سەلماند ، ئنجا بیروڕای یارمەت نەدات ، و موقاتەعە ، و بەلادا نەچونی ئەنجومەنەکانی یاسادانان لەهیندستانەوە داکەوت و بڵاوبوەوە لەوێوە بۆ ولاتەکانی تری رۆژهەلات ، ئیتر بو بە شوازێك کە میللەتان لەتێکۆشانیاندا لە پێناوی ئازادی ، و سەربەستیاندا بەکاریان دەهێنا ، و لەسەری دەرویشتن.

کچم ئێستا دەمەوێت کە سەربخت بەلای بەراوردێکی سەیردا لە نێوان شێوازەکانی ئیستیعمارکەری ئینگلیزەکان ، و ئیستیعمارکەری

---

آ) مەلیك (فیصل) لەسەبتەمبەری ساڵی ١٩٣٣ز. دا مرد. (غازي) یەکەمی کوری هاتە جێگەی ئەمیش لەساڵی ١٩٣٩ز. دا لەکارەساتێکی ئوتوموبیلدا مرد ، لەدوای (غازي) کورە کەی کە ناوی (فیصل)ی دووم بو هاتە جێی.

فەرەنسەییەکاندا راکێشم ، ئینگلتەرە لە هەمو ولاتە کانی کە موستەعمەرە و ژێر دەستی بوون هەوڵی داوە هاوپەیمان بێت لەگەل دەرەبەگ و ، نەریت پەروەر (المحافظین)و کۆنەپەرستەکاندا ، هەروەکو لە هیندستان ، و میسر و ولاتانی تردا رویدا. تەخت و تاجی لاوازی لەو موستەعمەرانەدا دروست دەکرد ، وە حوکم فەرمای کۆنەپەرستی بۆ دادەنا ، وە باوەری پێدەکردن کە پشتی بگرن. (فؤاد)یان لەمیسردا کرد بە مەلیك ، (فیصل) لەعێراقدا و (عبدالله) لەرۆژهەلاتی ئوردون ، هەوڵیان دا کە (الحسین) لە (حجاز) دا بکات بەمەلیك ، بەلام فەرەنسە کەوا بە باشترین نمونەی بورجوازیەت دادەنرێت هەولی دەدا کە پالپشتێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە لەناو موستەعمەرەکانیدا لە چینی بورجوازی کە بریتی یە لەچینی مام ناوەندی تازە پێگەیشتو ، وەکو لەسوریادا هەوڵیان دا پشت ببەستن بە چینی ناوەراست لە مەسیحیەکان بەریتانیاو فەرەنسا هەوڵیان دەدا کە یەك سیاسەت لە موستەعمەرەکانیاندا جێبەجێ بکەن کە بریتی بوو لە لاوازکردنی نەتەوایەتی کەوا بەرهەلستی ئەمان دەکات ، وە ئەم نەتەوایەتیە شەق و پەق کەن ،لەگەل دروستکردنی کەمایەتیەکان و کێشەکانی رەگەزپەرستی ،و ئاینی ، سەرەرای ئەمەش دەبینین کە لە رۆژهەلاتدا نەتەوایەتی لەبەرز بوونەوە دایە ، و بەسەر ئەم کوسپانەدا زاڵ دەبێت کە لەرێبازیدا دانراوە ئەمەزیاتر لە ولاتە عەرەبیەکانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا روو دەدات ، چونکە هەراو هوریای ئاینی تیایدا بەرەو کزبوون دەچێت ، رێ چۆل دەکات بۆ هاوبەشی نەتەوایەتی.

کچم لەبابەت کردەوەکانی چەکی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیاوە لەعێراقدا باسم بۆ کردیت سیاسەتی حوکومەتی بەریتانیا وابو کە چەکی ئاسمانی‌یەکەی "بەکرداری پۆلیسیانە" هەڵسێت لەو ولاتەدا کە لەژێر دەستی دایە ، بەتایبەتی ئەو ولاتەی کە تۆزێك ، وەیا جۆرێك لەحوکمرانی خۆبەخۆیی (الحكم الذاتي) هەبێت. ئیتر بەریتانیا ژمارەیەکی زۆری لەسەربازەکانی خۆی لەم ولاتانەدا دا نە دەنا بەلکو زۆر کەمی دەکردنەوە ئاشکرایە ئەمە چەند سودی هەیە ، ئیتر ئەرکی داگیرکردن ، کەمی کرد لەچاو جاراندا ، وە داگیر کردنەکەش ئاشکراو دیار نەبو ، لەهەمان کاتدا فرۆکە ، و بۆمباکان دەتوانن بەتەواوەتی دەست بگرن بەسەربارو ، وەزعدا

بەم جۆرە بۆمبا باران بەردەوام لە ولاتە سەربەستەکاندا لەزیاد بووندا بوو لەوانەیە بەریتانیاییەکان لە هەموو میللەتەکان زیاتر بە کاریان هێنا بێت ئیتر جگە لە عێراق ئەم شێوازەیان لە تێپەڕەواندنی سنوری سەرووی رۆژئاوای هیندستاندا چەند جارێك بەکارهێنا.

ئەم شێوازە لەوانە یە خیراتر ، و هەرزانتر بێت لە ناردنی لەشکرو شێوازە کۆنەکە. بەلام ئەم شێوازە ناشیرین و درندانەیە. لەراستیدا هیچ کردەوەیەك بە بیردا نایەت کە زۆردرندانە تربێت لەفڕێدانی بۆمبا ، بەتایبەتی بۆمبای کاتی (الموقوتة) بەدێهاتەکاندا تێکرا ، وە کاول کردنیان ، و کوشتنی تاوانبارو بێتاوان وەك یەك ئەم شێوەیە ئەرکی داگیرکردنی ولاتانی تر ئاسان دەکات ، ئەمە لە هەندێ نوێنەرانەوە لەناو کۆمەڵی میللەتاندا (عصبة الأمم) هاوار هەڵسا ، وتاری رێك وپێك لە (جنیف)دا بۆ وەستاندنی ئەم کردەوە درندانەیە خوێنرایەوە ،هەمو دەولەتە کان بەولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاشەوە رازی بون کە بۆمباباران قەدەغەکەن ، کەچی بەریتانیا سور بو لەسەر ئەوەی: کە بۆی هەیە فرۆکە بەکاربێنی لە (کرداری پولیسانە)دا موستەعمەرەکاندا ، کەوا تەگەرەی لە هەمو ریکەوتنێك دا چ لە کۆمەڵی میللەتاندا (عصبة الأمم) وە یان لە کۆنگرەی چەك داماڵین دا کە لە ساڵی ١٩٣٣ ز.دا بەسترا.

---

(١) کوردواتەنی: "گۆشت بەپشیلە بسپێرێت"

وەرگێڕی کوردی

# ڕەوشتی سەیری پارە

## ١٦/یونیو/١٩٣٣

کردەوە، و ڕەفتاری سەیری پارە گرنگترین جیاوازییەك بوو کە ماوەی دوای جەنگەکەی جیا دەکردەوە ، چونکە پێش جەنگەکە لە هەر ولاتێکدا پارە نرخێکی نزیکەی نەگۆڕی (ثابتە) هەبوو ، هەر ولاتێك لەم ولاتانە سکەی (عملة) تایبەکاری خۆیی هەبو: روپی لەهیندستاندا جونەیهیش لە ئینگلتەرەدا ، دولار لە ئەمەریکا ، و فرەنگ لە فەرەنسە ، مارك لە ئەلمانیا ، روبل لەروسیا ، و لیرە لە ئیتالیادا... هتد ، هەر سکەیەك لەم سکانە ، بەسکەکانی ترەوە بەسترا بوو ، بە پەیوەندایە تیەکی نەگورەوە، هەروها هەمویشیان بە پەیرەوی زیری نیو جیهانەوە بەسترابون واتە هەر سکەیەك ، و پارەیەك لەم سکانە نرخێکی تایبەتی خۆیی هەبو ، ئەم سکانە لەناو ولاتەکانی خۆیاندا نەك لەدەرەوە بۆ ئالو گۆڕ بەکاردەهاتن ، ئنجا ئەو پەیوەندی یەی کە دوسکەی بەیەکەوە دەبەست بریتی بو لەزێڕ ، بەزێڕپارە وەردەگیرا و دەگوررایەوە ، و حیسابات لەناو دەولەتاندا جێبەجێ دەکرا لەبەر ئەوەی کە سکەکان هەریە کە نرخێکی نەگورراویان لە زیر هەیە بۆیە نرخەکەیشی ناگۆرزیت ، چونکە زێر مەعدەنیکە نرخەکەی خوی دەباریزیت.

زروف ، و باری جەنگەکە وای پێویست کرد کە حوکومەتە شەرکەرەکان واز لە پەیرەوی زێڕ بێنن ، لەبەر ئەمە پارەو ، سکدکەی خۆیی هەرزان کرد ، لە ئەنجامی ئەمەدا پارە زۆر بو ، کەوا یارمەتی ئەم حوکومەتانەیدا ، کە بەردەوام بن لەکردو کۆشی جەنگیدا ؛ بەلام ئەمە پەیوەندایەتیە کانی پارەی نیو دەولەتانی سەرو هەلگیرایەوە. جیهان لەکانی جەنگدکەدا بەشکرا بو بە دوسەربازگەوە: سەربازگەی هاوپەیمانەکان

وه سەربازگەی ئەلمان ، لەناو هەر یەکێك لەم دو سەربازگەیـەدا جـۆرێـك لەرێك و پێکی و یارمەتدان هەبو ، هەمو شتێك لەم دوو سەربازگەیە دا مل کەچ وەیا بۆ کردو کۆشی جەنگی بو ، دوای کۆتایی هاتـی جـەنـگـەکـە گەلێك زەحمەتی پەیدا بوو ، لە ئەنجامی باری ئابوری شلوق ، و نەبوونی متمانەبەیەك کردن لەناو دەولەتەکاندا ، ئنجا پـارە ، و سـکـە جـۆربـە جۆرەکان کردەوەو رەوشتێکی سەیریان گرت ، رژێمی پارەدان ئەمرۆ بریتـیە لەقەرزکردن ، ئنجا قەرزکردن پشت بەمتمانەو باوەریی کردن دەبەستـێـت ، ئەگەر متمانەو باوەر پێکردن نەما ، قەرز کردنیش لەگەڵیدا نامێنێت ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی کەوا ، وای لەرژێمی پارە دان کرد ، کە ئەم کردەوە و رەوشتە سەیرە بکرێت لەساڵانی دوای جەنـگـەکـەوە ، بـاری پـشـێـوی لەئەوروپادا هەمو باوەر ، و متمانەیەکی شلوق کرد ، جیهان ئەمرۆ پـشـت بەیەکتری دەبەستن ، هەمو بەشێکی بەبەشەکەی ترەوە بەندە ، و بەگەلێك چالاکی جۆر بە جۆر هەلدەستن ، ئەمە وادەگەیەنێت کە هەر پـشـیـویـەك لەهەر وڵاتێکدا روو بدات راستەوخۆ کار لەولاتانی‌تر دەکات وەکو: ئـەگـەر مارکی ئەلمانی شکا ، وەیا بانقێکی ئەلمانی نابوت بوو دانیشتوانی (لندن پاریس ، و نیویورك) لەگەلێك لاوەتوشی زیان دێن.

لەبەر ئەم هۆیـانە ، و زۆری تریش ـ نامەوێت درێژە بە باسەکەی بدەم بۆت ـ لەگەلێك شوێنانی جیهاندا تەنگوچەلەمەی پارە پەیدا بوو ، ئیـتـر هەرچەندە ولاتەکە پـێـشـکـەوتـوبـوایـە لـەپـیـشـەسـازیـدا ئـەوەنـدە ئەوتەنگوچەلەمانەکە ئاوقای دەبون گەورە بو ، چونکـە پـێـشـکـەوتـنـی پیشەسازی لەواقیعدا بریتـیە لە قەوارەیەکی زلـیـتـێـك هـەڵـکـێـش لـە پەیوەندایەتیەکانی ئەم دەولەتە لەگەل دەولەتەکانی تر دایەیـدا دەبـێـت. دیارە وڵاتێکی‌دواکەوتو ، ودورە پەرێز لەجیهان وەکو (تیبـت)کـردەوە ، و رەوشتی مارك ، وەیا (جنیە) کاری تێناکات ، بەڵام هەرزان بوونی نرخی (دولار) لەوانەیە ئابوری ژابون سەرەو ژێر هەلگێرێتەوە.

هەروها دەبینین لەولاتە پیشەسازەکاندا ، بەرژەندی دەستەو تاقمە جـۆر بەجۆرەکان ، بەر بەرەکانی یەکتری دەکەن ، ولەگەل یەکدا ناکـونـجـێـن تیایاندایە پارەی زۆرو هەرزانی دەوێت (بە جورێك وازۆر نـەبـێـت وەکـو لەئەلمانیادا رووی‌دا) دیسانەوە لەلایەکی تردا هـەیـە کـە بـەتـەواوەتـی

پەپێچەوانەی ئەمەوەن: هەیە پارەی گـران ، و کـەمـیـان دەوێـت ، واتـە دەیانەوێت پارەکە بەزێر گران بێت ، بۆ نمونە ئەوانـەی پـارە بـەقـەرز دەدەن و خاوەن بانقەکان و ئەوانەی لەم بابەتەن نرخێکی بەرزیان دەوێت لەو نرخەی کەپارەکە هەیەکی چونکـە ئـەمـانـە پـارە بـەقـەرز دەدەن و دەیانەوێت نرخی قەرزەکانیان گران بێت ، کەچی قـەرزدارەکـان ، وەیـان ئەوانەی قەرز دەکەن دیارە پارەیان بەنرخێکیهـەرزان دەوێـت ، هـەروەهـا خاوەن ئیش و خاوەن کارگەکان پارەیەکی هەرزان پەسند دەکـەن چـونـکـە قەرزداری خاوەن بانقەکانن ، چونـکـە ئـەمـانـە بـۆیـان دەکـرێـت کـە بەرهەمەکانیان لە دەرەوە ساغ کەنەوە. خۆ ئەگەر پارەی ئینگلیـز هـەرزان بێت ئەمە مانای وایە نرخی کەل وپەلی ئینگلیزی هـەرزانـتـرە لـە کـەل وپەلی ئەلمانی ، و ئەمەریکی ، وەیا لەهەمو کەل وپەلەکانی تزی بێگانە کە لەبازارەکانی دەرەوە دا هەیە ، لەمەدا خاوەن کارکەکانی ئینـکـلـیـز قازانجیانە ، چونکە کەل وپەلەکانیان زیاتر دەفرۆشرێت ، لـەبـەر ئـەمـە چەند بەرەو تاقمێکی جۆربەجۆر دەبینین هەریـەکـەیـان بـەلایـەکـدا رای دەکێشیت ، و گرنگترینی ئەم بەرەو ، تاقمانە خاوەن بانقەکـان و خـاوەن کارگەکانن ، ئیتر هەول دەدەم کێشەکەت بۆ ئاسان کەم ، چونکە لەواقیعدا هۆیئالۆزی تر هەیە.

پارە زۆربون لەفەرەنساو ، ئیتالیادا رووی‌دا ، نرخی فرەنک ، ولیرەی ئیتالی هاتە خوارەوە. نرخی فرەنک لەپێشدا نزیکەی ٢٥/١ی جـونـەیـهـی ئیسترلینی بو نرخی هاتە خوارەوە تا بو بە ٢٧٥/١ لەجونەیهی ئیسترلینی لەپاشاندا نرخیبە ١٢٠/١ی جونەیهی ئیسترلینی دانرا.

هەروها لەبەریتانیادا ، دوای ئەوەی جەنگەکە کۆتایی هات ئەمەریـکـا یارمەتی دانەکەی لە بەریتانیا بری ئنجا نرخی جونەیهی ئینگلیزی تۆزێك هاتە خوارەوە بەمە بەریتانیا رووبە رووی کێشەیەکی گەورەبوەوە ، ئـایـا بەریتانیا بەم هاتنە خوارە وە سروشتیە لەنرخی جونەیهی ئیسترلینـدارازی دەبێ ونرخەکەی لەو پلەیەدا دەهێلێتەوە کە گەیشتـویـەتـی؟ ئـەم جـۆرە کردەوانە لە داهاتو دا یارمەتی پیشەسازی دەدەن چونکە کەل‌وپـەل هـەرزان دەکەن بەلام لەهەمان کاتـدا زیـان بـە خـاوەن بـانـق و قـەرز دەرەکـان دەگەیەنێت ، لەم و لەوێش گرنگتر ئەوەیە ، ئەم جۆرە کردەوەیە سنورێـك

بۆ پێشەوایەتی (لندن)و جێو شوێنی لەپارە ، و دارایی لەجیهاندا دادەنێت ئیتر شاری (نیۆیۆرك) ئەم پیشەوایەتیە وەردەگرێت ، و ئەم لەجیاتی (لندن) دەبێتە کەعبەی ئەوانەی ، داوای قەرزدەکەن ، ئنجا تاکە چارەسەر ئەوەیە کە جونەیهی ئیسترلینی ناچار بکرێت لەشوێنەکەی یەکەمیدا بمێنێتەوە بەمەجێو شوێنی بتەو دەبێت ، وە لەگەل ئەمەدا ناوبانگی (لندن)یشی لەگەلدا بتەو دەبێت ، وە لەپێشەوایەتی کردنی پارەو دارایدا بەردە وام دەبێت ، هەرچەندە لەئەنجامیدا پیشەسازی کاری لێدەکرێت ، و نوشوستی دێنێت ، ئیتر گەلێك شتی ناخۆشتر روودەدا وەکو بەراستی رووی‌دا.

ئنجا حوکومەتی بەریتانیا رێبازی دوەمی گرت لەسالی ١٩٢٥ز. دا نرخی جونەیهی ئیسترلینی زیاد کردەوە گەیاندیەوە سەردەمی پێشوی بەمە تا رادەیەك کەل ، و پەلەکانی خۆیی کرد بەقوربانی ، لەپێناوی رازی کردنی خاوەن بانقەکاندا. بەلام ئەو مەسەلە گرنگەی کە توشی بەریتانیا هات بریتی بو لەوەی: ئایا ئیمپراتوریەت بەردەوام دەبێت و دەمێنێتەوە یا نە؟! چونکە ئەگەر (لندن) بنکەی سەرکردایەتی لە کاروباری پارە ، و داراییدا لە کیس بچێت ، ئیتر ناوچە جۆر بەجۆرەکانی ئیمپراتۆریەت چاو نابرێتە بەریتانیا ، و داوای یارمەتی ، و راوێژی لێ‌بکات کە بەمە ئیمپراتۆریەتەکە بەشێنەیی دەپوکێتەوە ، بۆیە ئەم مەسەلەیە پەیوەندی هەیە بە سیاسەتی ئیمپراتۆریەتەکەوە ، ئیتر ئەم سیاسەتە ئیستیعماریەش سەری نەگرت کەلەسەر حیسابی پیشەسازی بەریتانیاو ، راستەوخۆ لەسەر حیسابی بەرژەوەندیەکانی ناوخو بو. کچم هەروەکو لەبیرتە ، هەر هەمان رێبازەکەیە کە بەریتانیا گرتبووی لەپێناوی گەلێك مەبەسی ئیستیعماریانەدا ،لەبابەت‌هاندان و دەست دان بەبەشتی بیشەسازی هیندستاندا لە دوای جەنگەکە ، گەرچی ئەمە ئەگەر لەسەر حیسابی (لانکشیر) وەیا پیشەسازی بەریتانیا بێت.

بەم جۆرە حوکومەتی بەریتانیا بۆیە بەم تەقەلا بەجەرگانە هەلسا تاکو سەرکردایەتی ، و ئیمپراتوریەتەکەی بپارێزێت ، گەرچی ئەم تەقەلایە زۆر کەوت لەسەر بەریتانیا لەسەرەتاوە ، وە وا دەزانرا کە ئەم تەقەلایە سەرناگرێت ، چونکە نە حوکومەتی بەریتانیا وە نەهیچ حوکومەتێکی تر

ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر گۆڕانکاریە ئابوریەکاندا کە دەبێت بەرەو روو بدەن ، راستە جونەیهی ئیسترلینی بۆ ماوەیەك گەیشتەوە نرخەکەی خۆی ، بەڵام ئەمە لەسەر حیسابی زێدە ئیفلیج کردنی پیشەسازی بو ، ئنجا بێ ئیشی تەشەنەی کرد پیشەسازی خەلور ـ(هەلوزی بەرد ـ وەرگێر) توشی زیانێکی زڵ هات ، ئەمانە هەمووی ئەنجامێکی ناچاری گەڕانەوەی نرخی جونەیهی ئیسترلینی بوو ، بو نرخەکەی پێشوی (ئەمە مانای بەرزکردنەوەی نرخەکەیەتی لە زێر) ، وەگەلێك هۆی تریش هەبو یەکێك لەوانە خەلوزی ئەلمانیا گەیشتە بەریتانیا وەك بەشێك لە زیانی بژاردنەوەی (التعويضات) جەنگەکە ئەمە وا دەگەیەنێت کە میقداری پێویست لەخەلوزی ئینگلیزی لەچاو جارانیدا کەم بێتەوە ، وە ئەمەش بو بەهوی بێئیشی لە ناوکرێکارانی کانگاکانی خەلوزدا. بەم جۆرە هەریەکە لەوانەی قەرز دەدەن ، و لەگەل دەولەتە سەرکەوتوەکان لە جەنگەکەدا هەستیان کرد و زانیان کە وەرگرتنی ئەم جۆرە زیانی بژاردنەوانە (التعويضات) هیچ خیرو بیرێکی پێوە نیە ، ئنجا ئەوی زیاتر قورەکەی خەست کرد پیشەسازی خەلوز ئینگلتەرەدا رێکو پێك نەبو ، بریتی بو لەصەدەها شەریکەی بچکۆلە ، ئەمانە نەیان دەتوانی بەرامبەر بەربەرەکانی شەریکە گەورەکان لە ئەوروپاو ئەمەریکا دا ، بوەستن.

کە پیشەسازی خەلوز نوشوستی هێناو ، لە خراپەوە بەرەو خراپتر چو خاوەن کانگاکان (المناجم) بریاریان دا کرێی کرێکارەکانیان کەم کەنەوە ئەمە بوبە هۆی ئەوە سەغلەتیەکی زۆر رووی کردە مەلبەندی کرێکارەکان ، و لەگەل پشتگیری کردنیشیان لەلایەن کرێکارانەوە لە پیشەسازیەکانی تردا ئیتر هێزی کرێکاران خۆی دەرخست و کۆبونەوە لەپێناوی بریاردانی بەرگری لەمافەکانی کرێکارانی کانگاکان دا ، ئنجا ئەنجومەنێکیان بۆ ئیش کردن پێك هێنا ، پێش ئەمەش "هاو پەیمانیەکی سێ کوچکەیی" پێك هاتبو کە هەرسێ نەقابە بەهێزەکەی کرێکاکارانی تێدا بوو کە بریتیبو: لە نەقابەیکرێکارانی کانگاکان ، و کرێکارانی هێلی شەمەندەفەرو ، کرێکارانی گواستنەوە (نقليات) بەمە ئەم هاوپەیمانیە بەهێزو رێك و پێکەشەش ملیون کرێکاری تێدابو. کرێکارەکان حوکومەتەکەیان ترساند چونکە حوکومەتەکە دینیازیان چیە بیکەن. ئنجا حوکومەتەکە بریاری

دواخستنی جێبەجێ کردنی کێشەکەی دا بەوەی کە بەشێك لەئەرك و مەرجی دا بەخاوەن کانگاکان ئاکو رادەی کرێی کرێکارەکان بۆ ماوەی ساڵێك بپارێزێت ، ئنجا بۆ ئەم مەسەلەیە لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە دروست کرا بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبو لەساڵی ١٩٢٦ز. دا ئنجا کێشەکە رووی‌دا خاوەن کانگاکان بریاریان دا جارێکی تر کرێی کرێکارەکان کەم کەنەوە ، لەم کاتەدا حوکومەت ئامادە بو بەرامبەر کرێکارەکان بوەستێتەوە و داخوازیەکانیان جێبەجێ نەکات ، دوای ئەوەی‌لە مانگەکانی پێشوداهەمو مشورێکی بو ئەمە خواردبو ، وە لە خۆئامادەکردن بو بوەوە.

دوا بەدوای ئەمە خاوەن کانگاکان بریاریان دا نەهێڵن کرێکارەکانیان بچنە ناو کانگاکانەوە ، ئەگەر بەکەم کردنەوەی کرێکەیان رازی نەبن ، لەئەنجامی ئەم بریارەدا کۆنگرەی نەقابە کانی کرێکارەکان بریاریان دا مان گرتنێکی گشتی پێك بێنن ، هەمو کرێکارەکانی نەقابەکان وەڵامی ئەم بریارەیان دایەوە ، ئیتر هەمویان لە ئیش کردن وەستان ، زیان لەولاتەکەدا پەکی کەوت ، شەمەندەفەر ، و چاپخانەکان ، وە زۆربەی ئیشەکانی تر پەکیان کەوت ، بەلام حوکومەت بەهۆی چەند کەسانێکەوە کە خۆیان تەرخان کردبو بۆ ئیش‌کردن توانی بەچەند فرمانێکی پێویست هەڵسێت ، مان گرتنە گشیتەکە لەناوەراستی شەوی ٣ـ٤ مانگی مایسی ١٩٢٦ز. دا دەستی پێ‌کرد دوای تێپەر بونی دە رۆژ بەسەریدا پێشەوا مام ناوەندیەکانی کرێکارەکان کەوا حەز بەم جۆرە هەنگاوە شۆرشگێرانانە ناکەن ، ئەمانە بریاریان دا ، کە کۆتایی بەمان گرتنە کە بێنن ، بەبیانوی پشت بەستن بەچەند بەڵێنێکی نەزانراوەوە ، بەڵام کارگەرانی کانگاکان مان گرتنەکەیانیان کۆتایی پێ نەهێنا ، ئیتر چەند مانگێك بەتەنها مانەوە ، برسیان بو ، لەدواییدا بەسەریاندا زاڵ بون ، ئەمە تەنها جاردان و پێشەکیەك نەبو بو بەتێشکا نی کرێکارەکانی کانگاکان بەلکو پیشەکیەك بو بۆتێشکانی بزوتنەوەی کرێکاران تێکرا لەئینگلتەرەدا لەگەلێك رووەوە ، ئنجا کرێی کرێکارەکان هاتە خوارەوە رادەی گوزەرانی چینی کرێکار نزم بوەوە ، حوکومەتیش سەرکەوتنی خۆیی بەسەر کرێکارەکاندا بە هەڵزانی ، دەستی کرد بەدانانی گەلێك یاسا بۆ لاوازکردنی رێزی کرێکاران ، بەتایبەتی قەدەغەکردنی هەمو مان گرتنێکی گشتی لێیان لە پاشە رۆژدا. مان گرتنی

ساڵی ١٩٢٦ز سەری نەگرت ، لەئەنجامی ڕارایی بو بێهێزی و بو دەلەیی پێشەوایانی کرێکارەکانداو ئامادە نەبوونیان بۆ ئەمە ، لەراستیدا ئەم پێشەوایانە تاکەمەبەسیان ئەوەبو کە لەم مان گرتنە دورکەونەوە ، ئیتر لەبەر ئەوەی ئەم ئیشەیان بۆ نەکرا ، چاوەڕوانی یەکەم هەلیان کرد بۆ کۆتایی پێهێنانی مان گرتنەکە ، دیسانەوە حوکومەتیش بەتەواوی ئامادە بو بو ، بو بەرەنگار بونیان ، وە چینی ناوەراستیش پشتی حوکومەتیان دەگرت.

مان گرتنە گشتیەکە لە ئینگلتەرەدا ، وە نەهێشتنی کرێکارەکان کەبچنە ناو کانگانیانەوە سۆزو بەزەیی کرێکارانی روسیای جولاند ، نەقابەی کرێکارانی ئەوی دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆرو ناردنی بۆ کارکەرانی کانگاکان لەئینگلتەرەدا بۆ یارمەتی دان و پشت گرتنیان.

ئیتر تاماوەیەك بزوتنەوەی کرێکاران لەئینگلتەرەدا نەما ، بەلام ئەمە هیچ جێبەجێکردن نەبو بۆ نوشوستی پیشەسازیو بێ ئیشی کە دەستیکرد بو بەتە شەنەکردن ، بێکاری لەناو کرێکاراندا مانای ئازار ، و ئەشکنجێکی بێ ئەندازەیە بۆیان ، دیسانەوە مانای گرانباریەکی زۆرە کەدەکەوێتە سەرشانی دەولەت ، دوای ئەوەی کە رژێمی مسۆگەر کردن دژی بێئیشی لەگەلێك ولاتدا بلاو بوەوە ، چونکە یەکێك لەئەرکەکانی سەرشانی دەولەت ئەوەیە ، کە گوزەرانی کرێکارەکە مسۆگەر کات کە دوچاری بێ ئیشی دەبێت ، بێ ئەوەی خەتایەکی کردبێت ، لەبەر ئەمە حوکومەت ناچار بو کە یارمەتی ئەو کرێکارانە بدات کە ناونوس کراون و بێ ئیشن ئەمە وادەگەیەنێت کە بودجەی (خزینە) دەولەت و هەیئەتەکانی تر ، گرانباریەکی زل تریان بکەوێتە سەرشان.

بۆچی ئەم هەموە ڕوویدا ؟ بۆچی پیشەسازی بەرەو خراپی چو ، بازرگانی دواکەوت وبێئیشی لەزیاد بوندابو ، وە هەمو بارو ، وەزعێك لەخراپە وە دەچێت بۆ خراپتر نەك تەنها لە ئینگلتەرەدا بەلکو لەزۆربەی ولاتەکانی تردا؟ گەلێك کۆنگرە بەسترا لەپێناوی دۆزینەوەی حەلێك و جێبەجێکردنێك بۆ ئەم کێشانە پیاوە سیاسیەکان و حوکوم فەرماکان کۆبونەوە بەلام نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك و سەرنەکەوتن ، ئەم مەینەتیانە

وەکو کارەساتە سروشتیەکان نین کە توشی جیهان دەبن وەکو بومە لەرزە ، و لافاو ، د بێ بارانی ، هەرگیز وەکو ئەمانە نین ، هەمو شتێك ا.جیهاندا لەجێی خۆیدا ماوە ، لەواقیعدا خواردەمەنی زۆرە ، ژمارەی کارگەکان لە زیاد بوندان ، هەیە کەچی لەگەل ئەمەشدا ، کولۆلیو کوێرە وەری ئادەمیزاد لەزیاد بوندایە بۆچی؟ بێگومان هەلەیەکی سەرەکی هەیە ، بێگومان بەرێوە بردنێکی ناهەموار لە شوێنێکدا هەیە. سوشیالیزم و شیوعیەکان ئەم دیمەنە والێك دەدەنەوە کە هەلەی سەرمایەداریتی یە کەوا لە گیانەلادایە ، بۆ ئەمە روسیایان بەنمونە هێنایەوە کەوا بەلای کەمەوە ببرای ببر بێئیشی تێدا نەماوە ، گەرچی هەندێ کێشەش هەیە ، ئەم کاروبارانە گران ، و ئالوزن زاناکان رێك ناکەون لەسەررێبازی چارەسەرکردنی. بەلام سەرەرای ئەمە با تەماشایەکی دەورو پشتمان بکەین و کاروبارەکان هەلسەنگێنین.

ئەمرۆ جیهان بوە بەیەك پارچە ، واتە زیان ، و لایەنە جۆربە جۆرەکانی چالاکیو ، بەرهەم هێنان ، و دابەشکردن ، و بەکارهێنان ، وسەرف کردن (الاستهلاك).. هتد ئەمانە هەمووی روفسار ، شێوەیەکی نیو دەولەتانی هەیە. بۆ نمونە پیشەسازی ، و رژێمەکانی سکەو پارە پەیوەندی بەهەمو دەولەتەکانەوە هەیە ، زۆربەی دەولەتەکان بەیەکەوە بەندن ، هەر شتێك لەهەر ولاتێك رووبدات خێرا کار لە ولاتەکانی تریش دەکات ، بەلام سەرەرای ئەم پەیوەندایەتیە تێك هەلکیشراوەی نیو دەولەتان ، هەر دەولەتێکیش لەدەولەتان هەول دەدات لە چوارچیوە تەسکەکەی خۆیدا ئیش بکات ، و بکەوێتە کار بەتایبەتی لە دوای سالانی جەنگەکەوە ، کاروبار لەخەراپەوە بەرەو خراپتر دەچو ، لەئەنجامی ئەمەدا زۆرانبازیەکی بەردەوام پەیدا بو ، لەنێوان کارەساتەکانی جیهانی نیوە دەولەتان و نیوان سیاسەتی حوکومەتەکانی ناوخودا ، ئەم زۆرانبازیە دەتوانین و های دابنیین ؛ با بیرکەینەوە کارەساتی جیهانی نیو دەلەتان ، بە روبارێکی گەورەی دابنیین کە دەرژێتە دەریاوە ، وە سیاسەتی ناوخۆکەش بەتەقەلادان دابنێین بۆ وەستاندنی روبارەکە وە یا بەر بەستێك (سد) بەرامبەری روبارەکە ، بو لادان و گۆرینی رێبازەکەی ، وەیا گێرانەوەی بۆ دواوە ، دیارە روبارەکە پاشەوپاش ناگەرێتە وە ، هەروها ناتونرایت بوەستێنریت بەلام ئەگەر تۆزێك

رێبازەکەی بگۆرێت ، وەیا بەربەست بکرێت ، پەنگ دەخواتەوە ، ودەبێتە لافاو ، بەم جۆرە ئەم سیاسەتی ناوخۆیە ، دەستکاری کردنێکە لەرێبازی سروشتی روبارەکەدا ، کەلەئەنجامدا دەبێتە لافاو ، وەزەلکاو دروست دەبێت بەلام بە هیچ جۆرێك نابێتە کۆسپ لەرێبازی روبارەکەدا .

زاراوەیەك هەیە کە بەبازرگانی ، و کاروباری ئابوری دەوترێت وە پێی دەلێن "ئابوری نیشتمانی" ئەمەش وا دەگەیەنێت ، هەمو ولاتێك دەیەوێت زیاتر بفرۆشیت لەوەی کە دەیگرێت ، وە زیاتر بەرهەم بێنی لەوە زیاتر کەبەکاری دێنیو سەرفی دەکات ، هەمو دەولەتێك دەیەوێت کەل وپەکانی بفرۆشیت ، بەلام کێ بیکرێت؟ دەبێت لە هەمو مامەلەبەکدا کریار و فرۆشیار هەبیت لەبەر ئەمە کارێکی نەشیاوە (مستحیل) کەجیهان تێکرا کریار بێت ، لەگەل ئەمەشدا ئەوی باسم کرد کوتومت (ئابوری نیشتمانیە) هەمو دەولەتێك باجێکی زۆری گومرك دەخاتە سەرکەل و پەلی بێگانە ، وە کوسپی ئابوریانەی دێنێتە پێش ، وە لە هەمان کاتیشدا دەیەوێت بازرگانی کردنی خۆی لەگەل دەرەوەدا پەروەردە بکات و پەرە پێبدات ، واتە دەیەوێت بەرهەمەکانی خۆی لەولاتانی تردا بفرۆشیت ، وەری نادات بە بەرهەمەکانی ولاتانی تربێنە ولاتەکەیەوە ، ئەم کۆسپە گومر گیانە بازرگانی نیو دەولەتان دەگوژێت کەوا ئەم بازرگانیە بناغەی دروست کردنی جیهانی شارستانیە ، ئەگەر بازرگانی بەرەو خراپی بچێت ئەمە کار لەپیشەسازیش دەکات ،کە دەبێتە هۆی تەشەنەکردنی بێئیش کەوا حوکومەت ناچار دەکات کە بە هەندی کار هەلسێت کە بەتوند ، و تیژی قەدەغەی کەل وپەلی بێگانە بکات کە نەیەتە ولاتەکەوە بەبیانوی ئەوەی کە بەرهەلستی بیشکەوتنی بیشەسازی نیشتمانی دەکات ، ئیتر بەم جورە دەست دەکات بەدانانی باجی گومرگی زۆرتر. لەئەنجامی بازرگانی نیو دەولەتان توشی زیانی دێت ، وە لە ئەلقەیەکی بۆ شدادە سورێتەوە .

سەردەمی نیشتمانی پەروەری تەنگەبەر ، لە جیهانی پیشەسازی نویدا کە لەم رۆژانەدا هەیە بەسەرچو ، بەر هەم هێنانی کەل وپەل و دابەش کردنی نەبەستراوە بەسنوری تەنگەبەری تاکە ولاتێکەوە بەلکو ئەو قاوغە کەپیگەیشتن و گەشەکردنی جیهانی لەناو دایە تەسك بۆتەوە کە بیگومان رۆژێك لە رۆژان هەردەشکیت. بێگومان دەبێت لەبیرمان نەچێت کە ئەم

کوسپە گومرگیانە ، و تەگەرانە لەهەمو ولاتێك لەولاتەکاندا کە لەرێبازی بازرگانیدا دا دەنرێت تەنها سودی بۆ هەندی چین (طبقة) هەیە ، ئەم چینانەش سەبارەت بەهێزیان دەسەلاتدارن بەسەر سیاسەتی ئەو ولاتەدا ، ئنجا ئەم چینانە ولاتەکە ناچار دەکەن کە پێشبڕکێ (مسابقة) بکات لەگەل ولاتەکانی تردا کە دەبێتە هوی بەربەرەکانیو ناخۆشی لەناو ئەم ولاتانەدا وەتەقەلایەکی بێ ئەندازە دەدریت بۆ کەم کردنەوەی ئەم ناخوشیە ، کۆنگرە دەبەسترێت ، پیاوە سیاسیەکان بەباشترین ئاواتەوە بۆی دەچن ، بەلام هەرگیز بەخت یاریان نابێت. کچم ئابا ، ئەمە ئەو تەقەلا زۆرانەت بیر ناخاتەوە ، دەدرا بۆ ریکخستنی هیندوس ، و موسلمان ، و سیخەکهان لە هیندستاندا؟ لەوانەیە سەرنەکەوتن لەهەردو حالەکەدا لەوە دابێت ، کە ئەم تەقەلایانە لەسەر چەند کریمانیکی هەلە (افتراضات خاطئة) پەیدا بوین ، هەرووها ئەنجامەکانیشی هەمان دەستور هەر بەهەلە دێنەو.

ئەم چینانە کەوا لەم کوسپانەی کە لەرێی گومرك دان سودمەند دەبن وەشەریکە جۆر بەجۆرەکان وەکو شەمەندەفەرو هیتر هان دەدەن بەگەلێك بەخشین و یارمەتی ، ئەمانە لەخاوەن کارگەکان پێك هاتون کەوا مەبەسیان پاراستنی بەرهەمەکانیانە ، بۆیە ئەمانە بەرهەلستی هەمو گۆرانکاریەك دەکەن کە کاریان تێبکات ، ئەمانیش وەکو خاوەن بەرژەوەندیە تایبەتیەکان ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی کەوا کوسپی گومرك لەپێناویدا بەردەوامە ، و دەمێنێتەوە ، سەرەرای ئەوەی کە زۆر بەی خەلکی لەو باوەرەدان کە مانەوەی ئەم کۆسپە گومر گیانە زیان بەهەمو کەسێك دەگەیەنن ، ئیتر هەرگیز دانانی سنورێك بۆ ئەم کوسپانە ئاسان نیە ، دیسانەوە زحمەتە هەج دەولەتێك دەست پێشکەری بکات لە لابردنیدا پێش دەولەتەکانی تر ، خۆ ئەگەر هەمو دەولەتەکان لەسەر لابردنی ئەم کوسپانە لەیەك کاتدا رێك کەون ، لەوانەیە ئەمە بە ئەنجام بکات تەنانەت لەم حالەتەشدا دەولەتە دواکەوتوەکان لەرووی پیشەسازیەوە گەلێك کێشەیان دێتەبەر ، لەبەر ئەوەی کە ناتوانن بەرامبەر بەربەرەکانی دەولەتە پێشکەوتوەکان بوەستن ، چونکە ئەگەر پیشەسازیە نوێکان لەناو ولاتەکەیدا پارێزکاری نەکرێت ، ناتوانێت هەلسیتە سەرپێو خۆی بگرێت.

سیاسەتی (ئابوری نیشتمانی) بەکەڵك نایەت بۆ بازرگانی نێو دەولەتان سەرباری ئەمەش هەول دەدات کەبە تەواوەتی بیوەستێنی ، بەم جۆرە بازرگانی نێو دەولەتانی بێ بەزمور دەدەبێت. ئنجا هەمو دەولەتێك دەبێتە ناوچەیەکی قەدەغەکراو بۆ بازرگانیەکی پاریزراو ، ئیتر بازرگانی ئازاد نامێنیت ، ئنجا ئیحتیکاری تایبەتی لەناو ولاتەکە خۆیدا دروست دەبێت ، بازرگانی کردنی ئازاد ، تیایدا کەم دەبێتەوە ، شەریکە گەورەکان و کارگە زلەکان پێدەگەن بازرگانیکەی (المتاجر) گەورە بازرگانیکەی بچوك هەڵ دەلوشێت ، بەمە سنورێك بۆ هەمو بەربەرەکانیەك دادەنێت بەم پێیە هێزی ئەم ئیحتیکارانە (کارتیل) لەبەریتانیا ، و ئەمەریکا ، و ئەلمانیا ، وژابون و لاتە پیشەسازیەکانی تردا زیادیکرد و مانەوە بەدەست چەند کەسانێکی زۆرکەمەوە ، ئنجا پیشەسازی نەوت (پترۆل) ، و سابون ، مەوادی کیمیاوی ، و چەك و ئاسن ، و پۆلا ئیحتیکارکران و بە دەست چەند کەسانێکەوە بوون ، هەروها گەلێك بانق و دامەزراوانی تریان کەوتەلا ، ئەم ئیحتیکاراتانە (کارتیل) ئەنجامێکی حەتمی ، و یەکسەری زانیاری ، و سەرمایەدارین لەگەل ئەمەشدا ئەمە دەبێت هۆی روخانی ئەم سەرمایەداریتیە ، چونکە سەرمایەداریتی بە بازرگانی ئازاد ، لە نێو دەولەتاندا دەستی بیکرد ، وەبەربەرەکانیش رەگی زیانی ئەم پێك دێنی ، خۆ ئەگەر بازرگانیکردن بەئازادی و سەربەست لە نێو دەولەتاندا فەوتا ، وەبەربەرەکانیش لەناو هەرولاتێك لەم ولاتانەدا نەما سەرمایەداریتی نامێنی ، بەلام ئایا جێ جێی سەرمایەداری.

دەکرێتەوە ، ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە ، بەلام وام بۆدەرکەوتوە کە رژێمە کۆنەکە دەوام ناکات و نامێنێتەوە شان بەشان لەگەل ئەم هەمو ناکۆکیانەدا.

زانیاری و گۆرانکاری پیشەسازی پێش رژێمی کۆمەڵگە کەوتن. زانیاری و پیشەسازی میقدارێکی زۆر لە خواردەمەنیو شتومەکی تری بەکەڵك بۆ ژیان بە رهەم دێنن بەلام سەرمایەداری هیچ رێگەیەك ناگرێت بۆ سود لێوەرگرتنی. هەروەك دەبینین ، خواردەمەنی خراپ دەکات ، و دەفەوتێنی وە بەرهەم هێنان کەم دەکاتەوە ، و سنوری بۆ دادەنێت ، بۆیە

دەولەمەندی و هەژاری ، وزۆر ، و کەمی لەگەل یەکدا دەبینین ، خۆ ئەگەر سەرمایەداریتی نەتوانیت ، رژیمەکەی خۆی پیش خات ، تاکو ئەم کیشانە جیبەجی بکات ، ئەوسا پیویستە رژیمیکیتر بیتە جیگەی ، تاکو هاوشانی پیشکەوتنی زانیاری بروات ، وە ئامرازی زانیاری بیت ، ئەگینە تاکە حەل ، و جیبەجی کردنیك ، بریتی دەبیت لەتاساندنی زانیاری ، و وەستاندنی بە جۆریك هیچ هەنگاویك بۆ پیشەوە نەنیت ، دیارە ئەمەش عەقل نای بریت.

بۆیە هەرگیز شتیکی سەیر نییە کە لەم جیهانەدا پشیوی تەشەنە بکات کەوا (ئابوری نیشتمانی) تیایدا حوکوم فەرمایە ، وە هەروها ئیحتیکارات (کارتیل) پەرەبسینی ، بەراستی ئیستیعماری نوێ بەرهەمی ئەم سەرمایەدارییەیە ، چونکە هەمو دەولەتیکی ئیستیعماری دەیەویت کیشەکانی خۆی بەچەوساندنەوەی میللەتانی تر جیبەجی بکات ، دیارە ئەمەش دەبیتە بەربەرەکانی ، و ناخۆشی لەنیوان دەولەتە ئیستیعماریەکاندا لەئەنجامدا وام بۆ دەرکەوتوە هەمو شتیك لەم جیهانەدا بەرەو ، بەربەرەکانی ، و ناکۆکیەوە دەچیت.

ئەم نامەیەم بەوە دەست پیکرد کە ئاگادارت کەم کەوا چۆن پارە ئەم رەوشتە سەیرەی گرت لەماوەی دوای جەنگەکەوە ، ئیتر ئایا سەرزەنشتی پارە بکەین لەسەر ئەم رەوشتەی ، لەکاتیکدا لەم جیهانەدا هەموشتیك هەر هەمان رەوشتی هەیە؟!

# موسولینی و فاشیستیتی له ئیتالیادا

## ٣١/یونیو/١٩٣٣

له نامەکانی پیشومدا چیرۆکی ئەوروپام بۆ گێرایتە وە تاکو سالی ١٩٢٩ ز. بەلام نوختەیەکی گرنگ هەبو بە ئەنقەست گویم نەدایە بۆ ئەوەی لەم نامەیەدا بەتایبەتی لێی بدویم ئەم نوختەیەش چیرۆکی کارەساتەکانە ، کە دوای جەنگە جیهانیەکە لە ئیتالیادا رووی دا ، گرنگی ئەم کارەساتانە هەر لەوەدانی یە کە لە ئیتالیادا روویان داوە ، بەلام لەبەر ئەوەیە کە جۆرێکی تازەن لە جۆرەکانی زۆرانبازی لە جیهاندا بە تێکرایی ، چونکە گرنگیەکەی و ئەنجامەکەی هەر لەئیتالیادا نامێنێتەوە بەلکو لەسنوری ئیتالیا تێ پەردەکات. لەبەر ئەوە ئەم نامەیەم تەرخان کرد کە باسی (موسولینی) بکەم کە یەکێکە لە بیاوە دەرکەوتوەکانی ئەم سەردەمەمان ، هەروها بو ئەوەی باسی فاشیستیەت بکەم لە ئیتالیادا.

ئیتالیا پێش بەرپا بوونی جەنگە (یەکەمەکە) ی جیهانی لە بارێکی ئابوری تا ساودا بو ، سەرەرای ئەوەی کە لەجەنگەکەدا بەکژ تورکیادا چوو ، وەسەرکەوت بەسەریدا ، وەلیبیای لی داگیرکرد ، بەلام ئەم وردە جەنگانە ، نەیتوانی کێشە ئابوریەکانی ئیتالیا جێبەجێ بکات ، بەلکو بە پێچەوانەوە ، وەزع وبار ناهەمواروخراپتربوو ، تەنانەت کە سالی ١٩١٤ ز هات ئیتالیا لەسەر پی بو ، بۆشۆرش: ئاژاوە ، وپشێویەکی زۆر لە کارلەگاندا بلاوبوبوەوە ، هیچ شتێك نەبو جلەوگیری ، وتوندوتیژی کرێکارەکان کەم کاتەوە ، پیشەوا ئیشتراکیە مام ناوەندیەکان نەبێت کەوا سەرکەوتن لە کوژاندنەوەی ئەم مان گرتنانەدا ، کە جەنگەکە بەرپابوو ئیتالیا نەی ویست بچێتە پال ئەلمانیای هاوپەیمانی ، ئنجا هەلوێستێکی بێلایەنانەی گرت ، بەمەبەسی ئەوەی کە تا لە توانادایە لە هەردو لا شەرکەرەکان ئیمتیازات ، و جیاوازی بیجرێت ، گومانی تێدانی یە ئەم

هەلویستە گەلێك رێكەوتن (مساومە)ی تێدایە لە نێوان هەردولادا ، وە ئەم هەلوێستە بە هەلوێستێکی پاك و خاوێن دانانرێت بەلام دەولەتەكە وارا‌هاتوە ئەو رەوشتەی کە چەند کەسانێك هەیانە ، وپێوەی بەندن و لەسەری دەرون ، ئەم دەولەتە نەیبێت ، لەبەر ئەمە دەولەت رەفتارەکانی شەرمەزاریانە بوو ، ئینگلتەرە ، و فەرەنسا بە ئیتالیایان راگەیاند کە بەرتیلێکی زۆرتری دەدەنی ، لەوەی کە ئەلمانیا دەیداتی ، ج بەشێوەی پارە وەیا بەلێن ، کە نیازاوایە چەند ولاتێکی بدەنێ ، ئیتر ئیتالیا شان بەشانی ئینگلتەرەو فەرەنسە لەمایس ١٩١٥ز دا ، چوە شەرەوە دژی ئەلمانیا ، وابزانم لەپێشدا باسی پەیماننامە نەهێنیەکەم بۆ کردیت کە بە پێی ئەم پەیماننامەیە (ئەزمیر)و پارچەیەك لەئاسیای بچکۆلە (انادول ـ وەرگیر) داربو بە ئیتالیا ، بەلام شۆرشەکەی روسیا بەرپابو ، پێش ئەوەی پەیماننامەکە ئیمزا بکرێت ئیتر مامەلەکە (الصفقة) بەجێ نەگەیشت و نەما ، ئەمەبوو بەهۆی ئەوەی کەئیتالیاییەکان رقیان هەلسێت ، ئەوی زیاتر فینی هەلساندن ئەوەبو کەلە(کۆنگرەکەی ئاسایش)دا هەستیان کرد کە بەش خوراون ، و "مافەکانیان قوت دراووە". سەرمایەدار ، و بورجوازیە ئیتالیاییەکان هەمو هیوایان ئەوەبو موستەعمەرەی نوێیان دەست کەوێت ، سا بەشکو توندوتیژی کێشەی ناو ئیتالیای پێسوك دەکەن.

لەدوای جەنگەکەوە ، بارو ، وەزع لەئیتالیادا لەولاتە هاوپەیمانەکان زیاتر خراپتربو وادیاربو کەرژێمە ئابوریەکە ، بەرەو روخان دەچو ، وەلایەنگرانی سۆشیالیستی‌و شیوعیەکان بەر دەوام لەزیادبوندابون ، بەتایبەتی کە دیان شۆرشەکەی روسیابوە بەنمونە ، و پیشەنگێك بوئەوە دەشی کەپەیرەوی پێ بکرێت ، ئنجا لەلایەکەوە کرێکارانی کارگەکان هەبون کە مەینەتی زیانیان دەچێشت وە لەلایەکی تریشەوە ، گەلێك سەربازی بەرەلاکراوی بێئیش هەبون ، پشیوی تەشەنەی کرد ، پێشەوایانی

چینی مام ناوەندی داوایان کرد کەئەم سەربازانە رێك بخرین ، تاکو بەرەنگاری هێزی کرێکارانی ، و بەربەستی ئەمانی پێبکرێت کەوا لەزیادبوندابون ، تەنگو چەلەمەکە لەهاوینی ١٩٢٠ز. دا گورا یەکێتی کرێکارانی مەعادین کەوا نیو ملیون کرێکاردەبون داوای زیادی کرێیان

دەکرد ، ئنجاکە ئەم داخوازیەیان قوبول نەکرا بریاری مان گرتنیـــان دا ، جۆرێکی تازەیان لەمان گرتن گرت ، بریتی‌بو لەوەی کە کرێکارەکان بچنـە ناو کارگەکانەوە ، و تیایدابمێننەووە بێ‌ئەوەی هیچ ئیش بـکـەن ، ئـەم جۆرە مان گرتنە کرێکارە فەرەنسیەکان بەماوەیەك پێش ئەمان دایان هێـنـا وە خاوەن کارگەکانیش بەرپەرچی ئەمەیان بەداخستنی کارگەکانیان دایەوە ، ئنجا کرێکارەکانیش کارگەکانیان داگیرکـرد ، هـەولـیـان دا کـەلـەسـەر بناغەیەکی سوشیالیستیانە بی‌بەن بەرێوە.

ئەم کردەوەیە بەتـەواوەتی شۆرشگێرانەبو ، ئەگەر دەوامی بـکـردایـە دەبو بەشۆرشیکی کۆمەلایەتی فراوان ، وەیان دەبوە بەلایەکـی سـەرومـر ، چونکە هیچ ماوەی جێ بەجێ کردنێکی مام ناوەندیانە نەمـابـووەوە ، ئـەو کاتە حیزبی سۆشیالیستی لەئیتالیادا زۆر بەهێز بـوو ، جـگـە لـەوەی ، کەزاڵ بو بەسەر نەقابەکانی کرێکارەکاندا ، هەروهـا دەسـەلاتـی هـەبـو بەسەرسی هەزار شارەوانی ، و صـەدو پەنجا نوێنەر لەبەرلەمـانـەکـەدا ، واتە بەسەرسی‌یەکی هەمو ئەندامەکاندا خو ئەگەر حیزبەکە بەهێـزو رێـك وپێك بێت ، وە دامەزراو ، ودام ودەزگای گەورەی هەبێت ، وە جـێـگـە بەرزو گرنگیشیان لەدەولەتدا بەدەسەوە بێت ، زۆر زەحمەتە بۆ ئەو حیزبـە کەشۆرشگێر بێت! لەگەل ئەمەشدا ئەم حیزبە ـ سەرەرای زۆری ژمارەی مـام ماوەندیەکان تیابدا ـ پشتی کرێکارەکـانـی گـرت لـە داگـیـر کـردنـی کارگەکاندا بەلام هەربەمە وازی هێناو بەس ، بێ‌ئەوەی هیچی تربکـات ، حیزبە کەنەی ویست پاشگەز بێتەوە ، کەچی لەهەمان کـاتـدا نـەی وێـرا بۆپێشەوە بچێت ، هەلویستێکی مام ناوەندی گـرت ، هـەروەك لـەهـەمـو کەسێك دەقەومیت کەراراو دودڵ بێت لەبریاردانی بنەبردا لەهەل و کـاتـی گونجاوی خۆیدا ، ئیتر بزوتنەوەی کرێکاران لەداگیرکردنی کارگەکاندا سەر نەکەوت.

ئەم سەرنەکەوتنە خاوەن کارگەکانی ئازاکرد ، هێـزی راسـتـەقـیـنـەی کرێکارانیان بۆ دەرکەوت وە جەوهەری پێشەواکانیانی دی ، کـەگـەلـێـك کەمترە لەوەی کە دەیزانن ، ئیتر بیریان لە پیلانیك بۆ تۆلـەسـەنـدن ، وتێك شکاندنی بزوتنەوەی کارگەران و حیزبی سوشیالیستی کردەوە یـەکـەم شتێك کەبیریان لێ کردەوە ، کە داوای یارمەتی ، وپشت بـەکـۆمـەلـێـك

سەرکێش و چەتون و جەربەزە ببەستن ، لەساڵی ١٩١٩ز. دا لەسەربازە بەرەڵاکراوەکان بەسەرکردایەتی (موسولینی) تاقمێك دروست بو پێی دەوترا (تاقمی فاشیستەکان) ئامانجیان ئەوەبو ، هەرکە ، هەلێکیان بۆ هەلکەویت پەلاماری سوشیالیستەکان ، و دام و دەزگانیان بدەن ، وەکو تێك شکاندنی چاپخانەی یەکێك لەرۆژنامە سوشیالیستیەکان ، وەیا هێرش برنە سەر ئەنجومەنێکی شارەوانی وەیان کێلگەیەکی هەرەوەزی کەبەدەست سوشیالیستەکانەوە بێت ، ئیتر سەرمایەدارە گەورەکان ، و گۆرانی چینە بورجوازیە گەورەکان پارەیان دەدا بەم تاقمە فاشیستیانە وبە خیویان دەکردن ، و هەولیان دەدا بەکاریان بێنن ، لەبەر هەڵستیو بەرەنگاربوونی سوشیالیستەکاندا ، تەنانەت حوکومەت خویشی لەتێك شکاندنی هێزی حیزبی سوشیا لیست دا دەستی دەدابە پشتی ئەمان دا وهانیدەدان.

ئەم (بنیتو موسولینی) یەکێیە ، ئەم پیاوەی کەوا ئەو تاقمە فاشیستیەی رێکخست؟ لەوکاتەدا لاوێکی چەتون و سەرگەرم بو (ساڵی ١٨٨٣ لەدایك بوە) ، باوکی ئاسنگەربو باوەری بەبیرورای سوشیالیستی بو ، ئەمەبو بەهۆی ئەوەی کە (موسولینی) پێبکات و گەلێك بیرورای سوشیالیستیانەی هەبێت ، لەتافی لاویدا ئاژاوە کەرێکی توندو تیژبو ، لەگەلێك لەناوچەکانی سویسرەدا دەکرا سەبارەت بەپروباغەندە کردنی شۆرشگێرانەی ، بەتوندی هێرشی دەبردە سەر پێشەوا سوشیالیستە مام ناوەندیەکان ، لەبەر مام ناوەندیتیان ، بەئاشکرا داوای بەکار هێنانی بومبا ، و هەمو جۆرە شێوازێکی توندوتیژی دەکرد دژی دەولەت. لەما وەی جەنگەکەی ئیتاليا لەگەل تورکیادا زۆربەی پێشەوا سوشیالیستیەکان لایەنگری جەنگەکە بون ، بەپێچەوانەی (موسولینی) یەوە ، کەوا چەند جارێك خرایە بەندیخانەوە ، سەبارەت بەوەی کە شێوازی توندوتیژی بەکار دەهێنا لەبەر بەرەکانی کردنی جەنگەکەدا ، لەهێرش بردنیدا بۆسەر پێشەوا سوشیالیستیەکان توندو تیژبو چونکە لایەنی ئەم جەنگەیان دەگرت ، تاکو سەلماندی یەحیزبەکەی ، کەدەریان کات لەریزەکانیدا ، ئیتر ئەم بوبەسەرەك نوسەری رۆژنامە رۆژانە گەورەکەی سوشیالیستەکان کەناوی (افانتی) بو ، لەشاری (میلان) دەردەچو ، وە هەمیشە تیایدا دەنوسی

داوای لەکرێکارەکان دەکرد ، کە بەرهەڵستی توندو تیژی ، بەتوندو تیژی بکەن ، ئەم داواکردنە لەلایەن پێشەوا مام ناوەندیە مارکیسەکانەوە ، بەرهەڵستیەکی بەتین دەکرا.

ئنجا کە جەنگە جیهانیە (یەکەمەکە) بەرپابو ، تا چەند مانگێك (موسولینی) بەرهەڵستی بەشداربونی ئیتالیای دەکرد لەجەنگەکەدا ، وە داوای بێلایەنی (الحیاد) دەکرد ، بەلام لەپڕێکا بیروراکانی خۆیی تێکرا گۆڕی ، و داوای کرد کە ئیتالیا بچێتە پال هاوپەیمانەکان ، و وازی لە رۆژنامە سوشیالیستیە کە هێنا ، رۆژنامەیەکی دەرهێنا تیایدا پروپاغەندەی بۆسیاسەتە نوێ کەی دەکرد ، ئیتر حیزبە سوشیالیستەکە (موسولینی) دەرکرد لەریزەکانیدا ، ئنجا پاش ماوەیەك خۆیکرد بەسەربازێکی ئاسایی لەسەنگەری ئیتالیادا شەڕی دەکرد تاکو بریندار کرا.

کە جەنگەکە کۆتایی هات (موسولینی) بەخۆیی نەدەوت سوشیالیستی ، ئیتر بوبە کابرایەکی رارا ، بیروباوەرێکی تایبەتی نەبو ، سوشیالیستەکان خۆشیان نەدەویست ، وە هەرگیز هیچ پەیوەندیەکی بە کرێکارانەوە نەبو ، ئیتر دەستی کردبە هێرش بردنە سەرسوشیالیستی ، و بەلکو دەولەتی بورجوازیش ، هەروها هێرشی دەبردە سەر هەمو جورێکی دەولەت بەخۆیی دەوت تاکیە (فردی)ە ، وە دەستی کرد بەداواکردنی ئاژاوەکەری ، لەم رووەوە گەلێك وتاری ئاشکرای نوسی ، دوای ئەمە دروست کردنی (فاشیستیتی ئاشکرا کرد لە مارتی ۱۹۱۹ز. دا لەسەربارە بەرەلاکراوەکان ، تاقمێکی جەنگاوەری لێ رێکخستن ، شێوزایو پەیرەوی ئەم تاقمانە لەئیش کردندا بریتیبو لەزۆرە ملی ، لەبەر ئەوەی کەحوکومەتیش دەستینە دەخستە کاروباری ئەم تاقمانەوە ، و گوێی نەدەدانی دەست درێژی کردنیان زیادی کرد ، و زیاتر ئازابو ، گەلێك جار کرێکارەکان لەشارەکاندا بەتوندی بەگژیاندا دەچون و دەیان بەزاندن ، کەچی پێشەوا سوشیالیستەکان بەرهەڵستی بیرورای بەربەرچ دانەوەی زۆرە ملی بەزۆرە ملیان دەکرد ، وە داوایان لەکرێکارەکان کرد بەر بەرچی تۆقاندنی فاشیستیتی بەئاشتی ، وهێمنی بدەنەوە ، بەو هیوایە کە فاشستیتی ماندوو دەبێت و دادەنیشێت و پشوو دەدات وخەڵکیش پشوو دەدەن بەلام بەپێچەوانەوە تاقمە فاشسیتەکان هێزیان زیادی کرد بەهۆی پارەوە ،

گەدەولەمەندەکان دەیان دانی ، وە حوکومەتیش چاوی لێ دەپۆشین کەچی بیروورای گشتی (الرأي العام) گیانی بەر بەرەکانیو بەرهەڵستی کردنی نەمابو کە دژی ئەم تاقمە هەیبو ، بۆ نمونە هەوڵیان نەدا کە مان گرتنێك بەرپاکەن ، وە بێزاری دەربڕن دژی ئەم زۆرە ملیە فاشستیانەیە.

فاشستەکان بەسەرکردایەتی (موسولینی) ، دوو داوای دژبە یەکتریان تێکەل دەکرد ، یەکەمیان دوژمنایەتی سوشیالیستیو شیوعیتی ، کەبەهۆی ئەمەوە پشت گیری کردنی چینە دەولەمەندەکانیان مسۆگەر کرد بۆ خۆیان ، دوەمیان (موسولینی) پێشوتر نا سرابو کە کابرایەکی سوشیالیستی ، ووروژێنەر ، و شۆڕشگێڕە ، هەروها ناسرابو بەدروشمە دژەکانی بە سەرمایەداریتی ، ئەمەشیان بەدلی چینە هەژارەکان بو ، هەروها گەلێك ڕێبازی ، ورزاندن ، و جوڵاندن لەشیوعیەکانەوە فێربوبو ، بەم جۆرە فاشستیەت هەرەمە یەك بوو گەلێك شتی دەگەیاند: بریتیبو لەبزوتنەوەیەکی سەرمایەدارانە ، جاری بانگەوازی دژ بەسەرمایەدار یتیشی دەدا ، و هەمە جۆر خەلکی تیدابوو ، بەلام بربرە پشی فاشستیەت چینی ناوەراست بو بەتایبەتی بچکۆلەکانیان. هەروها ئەم بزوتنەوەیە کرێکارەبێ ئیشەکان وەئەوانەی کارامەنین کە نەقابەکان بەتێبەر بوونی زەمان نەی خستبونە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە ئەمانەی بۆلای خۆی رادەکێشا وەکو رووىدا لەکاتێکدا کە فاشستیەکان بازرگانەکانیان بەزۆر ناچار کرد کە شتومەك هەرزان کەن ، بەمەتوانیان هەستی چینی هەژارەکان ، وسۆزیان بەلای خۆیاندا ، هەمو چەتون ، سەرکێشەکان چونە پال بزوتنەوەکە ، لەگەڵ ئەمەشدا فاشستیتی بزوتنەوەیەك بو ، تەنها نوێنەری خەلکێکی کەم بو.

بەم جۆرە لەکاتێکدا کەپێشەوا سوشیالیستەکان لەگومان و دوودڵی دابون وە لەناو خۆیاندا ناکۆك بون ، وە حیزبەکەیان دوو کەرت دەبو ئنجا هێزی فاشستیەت پێ دەگەیی ، و پەروەردە دەبو ، جەنرال و سەرکردەکانی سوپای بۆلای خوی دەهێنا ، بە راستی (موسولینی) بتوانێت ئەم هەمو ناکۆکیانە لەناو حیزبەکەیدا کۆکاتەوە مایەی سەرسام بون بو ، وەبە هەمو بدردیەك بسەلمێنی کە فاشستیتی هەرلە پێناوی ئەمدا دروست بود. دودلەمەنددکان فاشسیتیان بەپارێزەری مولکەکانیان دەزانی ، ئیتر

وتارو ، دروشمەکانی دژبە سەرمایەداریان ، بەوتەیەکی پروپوچ یان دادەنـا کەوا بو فریودانی ، جەماوەرە ، هەژارەکانیش بـروایـان وابـو ، ئـەمـە بزوتنەوەیەکە دژی سەرمایەدارێتی ، وە ئەوی تری پێ کەنینە بـەریـشـی دەولەمەندەکان و لاقرتی کردنە پێیان ، بەلام جۆرە (موسولینی) بـەردەوام بو لەبەزمەکەیدا ، رۆژێك بۆ هەژاران دەهاتە گفتار ، وە رۆژێکی تـریـش بۆ دەولەمەندەکان ؛ گەرچی لەواقعیدا دەست تیژی چینە دەولەمەندەکان بون وە ئەمان پارەیان دەدانی چونکە دەیان ویست بەکاریان بـێـنـن بـۆتـێـك شکاندنی هێزی کرێکارن ، و سوشیالیستی کـەوا مـاوەیـەکـی دورو درێـژ هەرەشەیان لەبەرژەوەندیان دەکرد.

ئنجا لەئۆکتۆبەری ١٩٢٢ز. دا تاقمە فاشستیەکانی کە جەنرالـەکـانـی سوپا سەرکردەییان دەکردن بەرەو (روما) کشان لەم کاتەدا سەرەك وەزیـران کەوا ماوەیەکی زۆر دانی بەخۆیدا گرتبو بەرامبەر کرداری فاشستـەکـان ، حوکمی عورفی ئیعلان کرد ، بەلام ئیشە زۆر دەنگ کرا ، وفریانەکـەوت ، چونکە مەلیك خویشی چوبوە رێزی (موسولینی)یە وە ، بریار لەسەر حوکمە عورفیەکە نەدا ، و ئیمزای نەکرد ، وە ئیستیقالەی سەرەك وەزیرەکـەیـی قوبول کرد ئنجا (موسولینی) بانگ کرد کەوەزارەتێکی نوێ دامەزرینـی ، لەشکری فاشستەکان لـ٣٠٩ ئۆکتۆبەری ١٩٢٢ز.دا گـەیـشـتـە (رومـا) وە لەهەمان رۆژدا (موسولینی) لە (میلان)ەوە بەشەمەندەفەر گەیشت تاکو ببێت بەسەرەك وەزێران.

کەوابو فشبەت سەرکەوت ، وە (موسولینی) حوکمرانی داگیـر کـرد ، بەلام ئامانجی چی بو ، بەرنامەو سیاسەتەکەی چیە؟! گومانی تێدانیـیـە بزوتنەوە گەورەکان دەبێت لەسەر پەیرەوێکی رون و ئاشکرا بێت ، ئـنـجـا پەروەردەو ، کرد دەبنەوە لەدەوروبەری بیروباوەر ، و ئامانجە نەگورەکـان ئەم بیروباوەرەش بەرنامەیەکی تایبەکاری رێکی دەخات. بەلام ، فاشستیەت جیاوازە لەوددا کەپەیرەویکی تایبەتی ، نیە کە باوەری پێی هەبـێـت ، وەیان بروا ، و فەلسەفەیەکی هەبێت پشتی پێ ببەستێت و لەسەری بـروات مەگەر تەنهابەربەرەکانی سوشیالیستی وئا زادی نەبێت ، کەلە وانەیە ئەمـە فەلسەفەیەکی فاشسینە بێت. (موسولینی) لەسالی ١٩٢٠ز. دا دوای سالێـك بەسەر دروست بونی رێکخراوە فاشسیتەکاندا بلاوی کردەوە "کە فاشستەکـان

گەرچی بەهیچ باوەڕێکی تایبەتیەوە بەندنین ، بەلام هەمیشە بۆ مەبەسێك هەوڵ دەدەن ئەویش خوش گوزەرانی میللەتی ئیتالیایە" ئاشکرایە ئەم مەبدەسە بەنوێنەری سیاسەتێکی تایبەتی ناژمێررێت ، چونکە لای هەموکەسێك ئاسانەکە بڵێت بۆ خۆش گوزەرانی میللەت هەول دەدات ، وە (موسولینی) نیازی رسەقینەی خۆی لە ساڵی ١٩٢٢ز.دا بەئاشکرا دەرخست ، پێش ئەوەی کە بەرەو (روما) بکشێت بەمانگێك کەوتی: "بەرنامەکەمان زۆر ئاسانە: دەمانەوێت حوکمرانی ئیتالیا بکەین".

(موسولینی) جارێکیتر ئەم راستیەی لەوتارێکیدا کەنوسیبوی دەربارەی بنەچەی فاشستەکان لە ئەنسیکلو بیدیای (دائرة المعارف) ئیتالیادا ، دەرخست چونکە وتبوی هیچ نەخشەیەکی تایبەتی بۆ پاشە رۆژ نەبو ، باشە رۆژ نەبو ، کەبریاری دا بەرەو (روما) بکشێت ، بەلام بریاری دابو تەنگو جەلەمە سیاسیەکە بەکاربێنی ، وسودی لێ وەرگرێت ، بۆهەڵمەت بردنێك ، وە لەمەی دا ئەوەی لەسەردەم ، ولە کاتێکدا سوشیالیست بو ، فێری بوبو ، کاری تێ کردبو.

سەرەرای ناکۆکی ، ودژایەتی فاشستیەت و شیوعیتی ، بەلام هەردوکیان لەچەند روویەکەوە هاوەبەشن ، گەرچی هیچ شتێك نیە وەکو فاشستیەت و شیوعیەت لەیەکەوە دوربن لەبابەت پەیرەو ، وبیرو باوەرەکانەوە ، هەروەك دیمان فاشستیەت هیچ بیرو باوەرێکی نیە ، لە هیچەوە دەست پێ دەکات بەلام شیوعیتی ، وەیامارکسیەت نەزەرییە ، و بیرو باوەرێکی ئابوری مەزن ، ولیکدانەوەیەکی بۆ مێژوو هەیە ، کە دەبێت بەجورێکی گران ، ورێك و پێك ، ژیریو عەقلی بەکار بهێنرێت.

فاشیستیەت گەرچی هیچ بیرورایەك وەیا باوەرێکی نیە ، بەلام بەراستی شێوازێکی لەزۆرەملی تۆقاندن دا هەیە ، وە لەبیرورایەوە بەرامبەر بەمێژوو ، ناتوانین لەراستیەکەی هیچ تێ بگەین ، وبی زانین ، بەلام دوروشم و نیشانەکانیشی لەدروشم و نیشانەی کۆنەوە وەر گیراون کەئیمپراتور ، و حوکوم فەرما کۆنەکانی (رومان) هەڵیان دەگرت ، کەبریتی بوو لە گورزەیەك جلەدار (کەناوی بەلاتینی "فاشس"ە ، ئنجا وشەی فاشستی لەمەوە وەرگیراوە) وەلەناوەراستی گورزەکەدا باجیکی تێدایە هەروها رێکخراوە فاشستیەکان لەرێکخراو دام و دەزگاکانی جەنگی رومای

کۆنەوە وەرگیراوە ، تەنانەت ناوەکانیشیان هەر ئەو ناوانەیە کەلە رابوردودا بەکار دەهێنرا شێوەی سەلاو کردنی فاشستیەکان هەربە هەمان شێوە سەلاو دەکەن کەلە زەمانی رومای کۆندا دەکرا ، کە بریتییە لەبەرزکردنەوەی پاڵ بۆ پێشەوە ، لەبەر ئەمە دەبینین فاشستیەکان چاویان بریوەتە ئیمپراتوریەتی رومانی کۆن و بیروباوەریان لەوەوە وەردەگرن ، واتە بیرورایان ئیستیعماریانەیە ، و دروشمیشیان بریتییە لە: "بێ گفتوگۆ ، وچەند و چون ، مل کەچ بەس" ئەمەش دروشمێکی کۆنە بو لەشکرە جەنگاوەرەکان دەشیت و هەرگیز بەکەلکی دەولەتە دیموکراتییەکان نایەت ، بە (موسولینی) سەرکردەیانیان دەوت: (دوتشی) وەیا (دوجی ـ وەگیر) ئەمەش وشەیەکی ئیتالیبە مانای (دیکتاتورە). بەرگی رەسمیان بریتیبو لەکراسێکی رەش ، لەبەر ئەمە پێیان دەوترا: "کراس رەشەکان".

تەنیا بەرنامەی فاشستەکان بریتی بوو لەدەستکەوتنی دەسەلات ئەم بەرنامەیەیان بەکردنی (موسولینی) بەسەرەك وەزیران هاتەدی ، ئیتر(موسولینی) دەستی کرد بەبتەو کردنی جێو شوێنی خۆی لەری تێك شکاندنی ،بەربەرەکانی کەران و ناحەزانی یەوە. لەمێژوودا زۆر جار توندو تیژی بەکار هاتوە ، بەلام بۆ ئەم توندو تیژیە هەمیشە برو بیانو هەبوە چونکە پێداویستینەکی بەئازارە ، بەلام فاشستەکان بۆ ئەم توندو تیژییە هیج بروبیانویەکیان نییە ، بەلکو فاشستەکان بەئاشکرا داوای ئەم توندو تیژییە دەکەن وپەنچەی بۆ رادەکیشن و بەکاری دێنن ، بێ ئەوەی کە هیج بەرهەلستیەك هەبێت. (موسولینی) ئەندامانی بەرلەمانی دەتوقاند ، بەلێدانێکی خراپیان ، بەم شێوازە ناچاری کردن کە بریار لەسەر یاسایەکی هەلبژاردن بدریت ، کە وەکو لابردنی دەستور وابو ، بەم جۆرد (موسولینی) زۆر بەیەکی زۆری دەست کەوت.

بەراستی زۆر سەیرەکە فاشستیەکان لەکرداری زۆرە ملیو توندو ، تیژی نارەوا دا بەردەوام بن تەنانەت دوای ئەوەی کەبون بەحوکوم فەرماو دەسەلاتیان لەپولیس ، و گەلێك لەدام و دەزگاکانی دەولەتدا هەبوو ، لەگەل ئەمەشدا ، ئەمەیان هەردە کرد ، دیارە کەس بەرهەلستی نەدە کردن چونکە پولیسی دەولدت خۆی بەرهەلستی نەدەکرد بۆیە بەتاوانی کوشتن ، و ئازاردان ، و لێدان ، وروخاندن ، وێرانکاری مولك وَ ماڵ هەلدەستان ،

شێوازێکی بێ هاوتایان گرت کە هەر لەخۆیان دەهات وشایانی خۆیان بو ئەویش ناحەزان و بەرهەڵست کەرانی خۆیانیان ناچار دەکرد کە میقدارێکی زۆر رون کەرچەك بخواتەوە..!

لەساڵی ١٩٢٤ز. دا بۆ کوشتنی (جیاکوموماتیونی) کەئەندامی بەرلەمان ویەکێك بۆ لەپێشەوا مەزنەکانی سو شیالیستەکان هەمو ئەوروپا هاتە لەرزە ئەم پیاوە لەبەرلەماندا ، هەستایە سەرپێو هێرشی بردە سەر شێوازی فاستستەکان کەوا بەکاریان هێنا لەوکاتەدا کەلە ماوەی هەڵبژاردنە کەدا رووی دا ، ئیتر لەدوای وتارەکەی بەچەند رۆژێك کوژرا ، تاوانبارەکان بەروالەت موحاکەمە یەك کران و بێ سزادان بەرەلاکران ، بەم جۆرە پێشەوایەك لەپێشەوای ئازادیوەکان (الاحرار) کە ناوی (امندولان) بو مرد لەئەنجامی لێ دانێکی بێئەندازەدا ،یەکێك لە سەرەك وەزیرەکانی پێشوکە ناوی (نیتی)بو توانی لەئیتالیا رابکات و بروات بەلام فاستستەکان خانوەکەیان روخاند ، ئەمانە بریتین لەهەندی لەوکارە ساتانەی کەسەرنجی جیهانیان راکێشا ، بەلام سەرەرای ئەممەش تۆقاندن (الأرهاب) بەردەوام بو پەرەی سەند ، ئەم توقاندنەش بریتی بو لەپاشکوی ئەو توقاندنەی کەبە جۆرێکی رەسمی لەکەر دابو تۆقاندنەکە ، توقاندنێکی جەماوەرنەبو ، بەلکو توقاندنێکی رەسمیو حوکومەتی ، ورێك وپێك بو ، هەر ئاراستەی شیوعی ، و سوشیالیستەکان نەکرابو ، بەتەنها بەلکو دیسانەوە ئازادیوە .ام ناوەندیە کانیشی گرتەوە. (موسولینی) پەیرەوی دابو بەدەستو پێوەندەکانی خوی بەژیان و گوزەرانی ناحەزەکانی سەغلەت وەیان نەشیاو (مستحیل) کەن ، وەدەست و پێوەندەکانیشی بەراستی و دڵسوزی یەوە ئەم پەیرەوەیان جێ بەجێ کرد ، ئیتر نەدەبو بێچکەلە حیزبی فاشستی بەولاوە هیچ حیزبیکی تر لەولاتەکەدا هەبێت ، وهیچ رێکخراوێك نابێت ، هەبێت بێجگەلە رێکخراوە فاشستیەکان ، وە هەموشتێك دەبێت فاشستی بێت ، و هەمو فەرمانبەرایەتیەکان دەبێت بە دەست فاشستەکانەوە بێت.

بەم جۆرە (موسولینی) بوبە فەرمان رەوایەکی سەرو مر لەئیتالیادا ، (موسولینی) هەرسەرەك وزیران نەبو بەتەنها بەلکو دەرەوەو ، ناوخو ، موستەعمەرەکان وجەنگ ، و دەریا ، و فرۆکە و فرمانیش بو! لەواقیعدا خۆی ئەنجومەنی وەزیران بو ، مەلیکیش دورە پەرێز کەوتە پشت پەردەوە

دەسەلاتەکانی بەرلەمان وردە وردە تێك شکان ، تاکو تارماییەکی مابـوەوە ، ئەنجومەنی بەرزی فاشستـەکـان حـوکـمـرانـی دەولـەتـی دەکـرد ، و (موسولینی)ش خۆی ئەنجومەنی بەرزی فاشستەکانی بەرێوە دەبرد.

یەکەمین وتارکەوا (موسولیـنـی) دای دەربـارەی سـیـاسـەتـی دەرەوە ، سەرنجی ئەوروپای راکیشا ، وتارێکی سەیربو ، دەتەقیەو ، و هـەرەشـەو گورەشە بو ، بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەوتاری پیاوە سیاسـیـە کـان ، و دیبلوماسی ، و سەرەکی دەولەتەکانی ترەوە نـەبـو ، وا دەردەکـەوت کـە هەمیشە سەرپێچی ، و داوای زۆرنبازی دەکات ، باسی ئەوئیمپراتوریەتـەی دەکرد ، کەوا ئیتالیا بنیاتی دەنێت ، وە فرۆکەکانی ئیتالیـا ئـاسـمـان دادەپۆشن ، گەلێك جار لەهیچە هەرەشەی لـەفـەرەنـسـە دەکـرد ، دیـارە فەرەنسە زۆر لەئیتالیا بەهێزتربو ، بەلام هیچ کەسیك لەفەرەنسەدا ئامـادە نەبو کە بجەنگێت ، لەبەرئەمە گوێیان نەدایە وتارەکانی (موسولینی) ، وازیان هێنا کە هەربلێت ، کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم) بـوبـە سـەرەك نیشانکە بۆ هێرشی (موسولینی)و هەرەشەو سوکایەتی پێ کردنی سـەرەرای ئەوەش کە ئیتالیا خۆیشی ئەندام بوتیایدا ، لەگەل ئەمەشدا کۆمەلەکەوە دەولەتەکانی کەبەشداربون تیادا لێی بێ دەنگ بوون.

لەم ماوەیە دا ئیتالیا زۆر گـۆرا ، گـەشـت گـەران سـەرسـام دەبـون لەدیمەنی رێك و پێکی کە دەیان بینی. (روما) بوبـە جـوانـتـریـن ولات سەبارەت بەو پرۆژە ، و دروستکراوانەی کەتیایدا پەیدا بوبو ، ئیتر خـەو بینین بەئیمپراتوریەتی رومانی یەوە لەبەر چاوی (موسولیـنـی)دا دەهـات وەدەچو.

لەسالی ١٩٢٩ ز. وە ناخۆشی نێوان (بابا)و حوکومەتی ئیتالیا کۆتایی هات بەرێکەوتنی هەر دوولا ، دوای ئەوەی (بـابـا) دانـی نـەدەنـا بـە (روما)دا کەپایتەختی حوکومەتی ئیتالیا بێـت لـەوکـاتـەوە کـە کـرابـو بەپایتەخت واتە لەسالی ١٨٧١ ز.وە ، لـەبـەر ئـەمـە (بـابـاکـان) کـە هەلدەبژێرران راهاتبون لەکوشکەکانیاندا لە (فاتیکان) کە کەنیسەی (قدیس بەتروس) تێ دایە بمێننەوە ، ونەیەنە دەرەوە تاکو پێیـان بـەرخـاکـی ئیتالیا نەکەوێت ، بەمە بەئارەزووی خـۆیـان ، خـۆیـانـیـان دەخـسـتـە

بەندیخانەوە ، ئنجا بەپێی ڕێکەوتنی سالی ١٩٢٩ ز. لە (روما)دا دانیان نابە ناوچەی (فاتیکان)دا وەك دەولەتێکی سەربەخو. وە (بابا) بوبە سولتانی سەر وەری ئەم دەولەتە کە دانیشتوانی لەپێنج صەد کەس زیاتر نیە. ئەم دەولەتە دادگا ، و سکە ، و پولی (طابع) تایبەتی خوی ، و خزمەت گوزاری گشتی خوّیی هەیە ، هەروها لەجیهاندا بەنرخترین هێلی ئاسنینی شەمەندەفەری هەیە ، دوای ئەم ڕێکەوتنە (بابا) بەحەبس کراوی نەمایەوە ، بەلکو جاروبار دەهاتە دەرەوە. ئەم ڕێکەوتنە ناو بانگی (موسولینی) لای کاثولیکەکان باش کرد ، ئیتر توقاندنی نارەوا سالێك وەیا زیاتری خایاند تاکو سالی ١٩٢٦ز. لەکاتێکدا (موسولینی) لەم سالەدا یاسا جیاوازەکانی (القوانین الأستثنائیة) دەرهێنا ، ئەم یاسایانە دەسەلاتێکی فراوانیان دا بەدەولەت ، تاکو بەرهەلستی کەران دابمرکێنێتەوە وبیان فەوتینی ، بەم جوّرە بیویستی بەتوقاندنی نارەوا نەما ئەم یاسایانە تارادەیەکی زوّر لەپەیرەوەکانی لەمەر ئێمە دەچێت کەلە هیندستاندا زوّرە ئیتر لەسایەی ئەم یاسا جیاوازانەوە (القوانین الأستثنائیة) خەلکی بەژمارەیەکی زوّر دەگیران ، و سزادەدران و لەولات دەربەدەر مادەکران ، لەسەرژمێرە رەسمیەکاندا هەیو ژمارەی ئەوانەی کە بەپێی ئەم یاسایانە دراون بەدادگا لەماوەی نێوان سالانی ١٩٢٦ ، تاکو ١٩٣٢ گەیشتبوە ١٠٠٤٤ دەهەزارو چل و چوار کەس ، سێ دورگەی نزیك ئیتالیا تەر خان کرابو ، بوّ ئاوارگەی دزو ناحەزان ، ئەم دورگانە ش: (بونزا ، فنتولین و ترمینی) یەکە گوزەران تیایاندا زوّر خراپ و ناهەموار بوو.

تین بوّ هێنان ، و گرتن بەجوّرێکی فراوان بەردەوام بو ، ئەمە وا دەگەیەنێت کە بەرهەلستی کردنی شوّرشگێرانە ، و نەهێنی لەم ولاتەدا لەبلێسەسەندن دابو ، سەرەرای هەمو ئەو تەقەلایانەی کەدەدرابو دامرکاندنەوەی. لەم ماوەیەدا ، گرانباری دارایی (مالی) زیاتر کەوتە سەر ئەستوّی، دەولەت وەباری ئابوری گەلێك خراپتر بوو.

# شۆرشێك له (چین)دا،و شۆرشێکی تری ئاوەژوو

## ٢٦/یونیو/١٩٣٣

بائێستا ئەوروپا لەکێشەکانیدا بەجێ بهێلین ، ئنجا تەماشایەکی ولاتە زۆر فراوانەکان بکەین کە کێشەکانی زۆر ئالۆزترە ـ ئەمەش ولاتەکانی رۆژهەلاتی دورن: (جین) و (ژابون) ، لە دوامین نامەمدا باسی (چین) م بۆ کردیت و دەربارەی ئەو تەنگو چەلەمانەی کە جمهوریەتە ساواکە توشی هات لە کۆنترین ولاتی جیهاندا ، وەلە هەمویشیان دێرینترە لە رۆشنبیریدا. (جین) وا دەردەکەوت کە لەناو خۆیدا پارچە پارچەیە ، ئنجا بەیارمەتی دەولەتە ئیستیعماریەکان ، کە هیچ مەبەسێکیان نەبو ئەوە نەبێت کە (جین) بەپارچە پارچە کراوی بمێنێتەوە ، لەناو (چین)دا بەریامەتی ئەم دەولەتە ئیستیعماریانە چەند سەرکردەیەکی سوپایی پەیدابون کە پێیان دەوتن (توشون) ئەم سەرکردانە هیچ بیرو باوەرێکیان نەبو ، هەر یەکەیان هەولی دەدا ، کە ناوی خۆی بەرزکاتەوە زور جار یەکێکیان لەم بەرەوە دەچوە ئەوبەری دژ ، لەکاتی وردە جەنگی هەمیشەیی ناو خۆیاندا ئەمانە لەسەر رەنجی فەلاحە کولولەکان دەژیان ، کچم دیسانەوە باسی حوکومەتە نیشتمانیەکەم بۆ کردیت کەلە (کانتون) لە خواروودا بەسەرۆکایەتی دوکتۆر (صن یات سن) دروست بو ، ئەم پێشەوا مەزنەی کەوا هەمو ژیانی خۆیی بۆ ئازادبوونی (چین) تەرخان کردبو.

ولاتەکە لەژێر دەسەلاتی بەرژەوەندیە ئابوریەکانی دەولەتە ئیستیعماریە بێگانەکاندابو ، کە مینا گەورەکانی وەکو (شنغهای)و (هونك كونك)یان کردیو بەهێنکەی خۆیان. لەبەر ئەمە دەسەلاتداربون بەسەر هەمو بازرگانی دەرەوەی (چین)دا. دوکتور (صن یات سن) دەربارەی ئەمەوتی: (چین) موستەعمەرەیەکی ئابوری ئەم دەولەتانەیە ، لەبێ بەختیە ، کەلە ولاتەکەدا تەنیا یەك سەرداری بێگانە هەبێت ، دەلێیت چی ئەگەر سەردار

و گەورە زۆربن؟ دوکتور (صن یات سن) هەوڵیدا کە یارمەتی بێگانە وەرگرێت بۆ پێشخستنی وڵاتەکەی لەرووی ئابوربەوە وە رێکخستنی بەتایبەتی لەئەمەریکاو لەبەریتانیا ، بەلام ئەم دوانە سەرەرای دەولەتە ئیستیعماریەکانی تر ، هیچ بایەخێکیان پێ نەدا ، و گوێیان نەدایە ، هەمو ئەم دەولەتانە تەنها بەچەوساندنەوەی (چین)ە وەخەریک بون نەك بەخۆش گوزەرانی ، و بەهێز کردنی یەوە ، ئنجا دوکتور(صن یات سن) لە ساڵی ١٩٢٤ز. دا رووی کردە روسیای سۆڤێتی.

. شیوعیتی لە(چین)دا بەندهێنی لەناو رێزی قوتابی ، چینە هەژارەکاند پێ دەگەیی ، و پەرەی دەسەند ، حیزبێکی شیوعی لەساڵی ١٩٢٠ز. دا دروست بو وەکو کۆمەلە نەهێنیەکان تێ دەکۆشا ، چونکە حوکومەتە جۆر بەجۆرەکان رێیان نەدەدا کە بەئاشکرا تێ کۆشێت ، دوکتور (صن یات سن) لە هەمو کەسێك زیاتر لەشیوعیەتەوە دوربو ؛ سوشیالیستیەکی مام ناوەندی بو ، هەروەکو دیار بو لە(سی بیروراکانی میللەتە) وە کە بلاوی کردەوە بەلام رەوشتی راست و رەوانی ، و دەست و دڵ و کەرەمی سۆڤیێت ، بیرورایەکی باشی لای دوکتور (صن یات سن) دروست کرد ، ئنجا هەوڵی دا کە پەیوەندایەتیەکانی خۆی لەگەڵیاندا چاکتر کات ، لەبەر ئەمە هەندێك پسپۆر ، و راوێژ پێ کراوانی لە سوڤێتەوە هێنا ، گرنگیان (بورودین) ناوبو کە بو لشەقیکێکی لێهاتو وبو.

(بورودین) لەناو کومنتانکدا لە (کانتون) بو بەهێزێکی گەورە ، شەو ورۆژ لەتێکۆشان دابو ، بۆیێك هێنانی رێکخراوێکی هێزبیانەی بەهێز کەپشت بەجەماوەر ، و لایەنگرتنی ببەستێت. هەرگیز هەوڵی نەدەدا کە ئەم رێکخراوە لەسەر بناغەیەکی شیوعیانە دروست کات ، بەلکو هەوڵیدا لەسەر بنچینەیەکی نەتەوایەتی ، دروستی بکات ، بەلام رێ درا بەشیوعیەکان ، وەکو ئەندام بچنە حیزبی کومنتانکەوە بەم شیوەیە حیزبی کومنتانك ، و حیزبی شیوعی بون بەهاو پەیمان بەڵام نەك بەجۆرێکی رەسمی ، دیارە ئەم هاوپەیمانیەیە بە دڵی نەریت پەروەرەکان (المحافظین) و ئەندامە دەولەمەندەکانی ناو کومنتانك نەبو بەتایبەتی دەرەبەگەکانیان وە لەلایەکی تریشەوە بەدڵی هەندێ لەشیوعیەکان نەبو ، چونکە ئەم

هاوپەیمانی یە مانای واز هێنانە لە بەشێك لەبەرنامەكانیــان ، و پــەكــی ئەوشتانەیان دەخات كە دەیانەوێت بیكەن ، بۆیە هاوپەیمانیە كە لــەســەر بناغەیەكی پتەونەبو ، لەبەر ئەمە دیمان لەیەكــەمــیــن تــەنــگــانــە ، و سەغلەتیدا روخا ، ئنجا ئەم روخانە بوبە هۆی بەلایەكی مەزن بــو(چــیــن) چونكە زۆر زەحمەتە دو تاقــم لــەیــەك ریــكــخــراودا كــۆبــنــەوە كــەلــە بەرژەوەندیاندا جیاواز ، و ناكۆك بن ، ئیتر هێــزی (كــومــنــتــانــك) و حوكومەتی (كانتون) زیادی كرد ، ئنجا بەدرێژایــی مــاوەی هــاوكــاری ، وهاوبەیمانیەكە ، رێكخراوانی فەلاحەكان ، و نەقابەكانی كرێكاران ، ئازا و گورج و كول بونەوە ، لەراستیدا ئەم رێكخــراوانــە پــشــت و تــوانــای (كومنتانك) بوون لە (كانتون)دا ، دیسانەوە هەر ئەم رێكخراوانە پێشــەوا دەرەبەگە كانیان ترساند بو بەهۆی ئەوەی كەلە پــاشــە رۆژدا داوا بــكــەن حیزبەكە هەل بوەشێتەوە.

وەزع و بار لە (چین)دا تارادەیەكی زۆر ، لەبارو ، وەزعەكانــی نــاو هیندستان دەچێت ، هەرچەندە هەندی جیاوازیشیان لەنێواند[1]هەیە ، تێكــرا (چین)و لاتێكی كشت وكالی یە ، پیشەسازی سەرمایەدارانە تەنها لــەشــەش وەیان حەوت شاردا هەیە ، كەمل كەچی دەسەلاتی بێگانەن ، ملــیــونــەهــا لەفەلاحەكان دەنالێنن بەدەست قەرزداریەكی زۆرەوە ، كــرێی زەوی ، و زار ئیجگار زۆربو هەروەك هیندسان فەلاحەكان ناچار دەبون زۆربەی كاتی خۆیان بەبێ ئیشی رابوێرن لەكاتێكدا لەزەوی وزارەكاندا ئیــشــیــان نــەبــوایــە ، پێویستیان بە وردە پیشەسازی لەناو خۆ دەبو كە لە زنجە كانیانــدا دەیــان كردو كاتی بێ ئیشی خۆیانیان پێ رادەبوارد ، وە باری ژیانی خۆیانیــان پێ باش دەكرد لەراستیدا ئەم پیشەسازیانە زۆر بەرەی سەندبــو ، ئــیــتــر لەكێلگە گەورەكان ، كەمێكیان نەبێت هیچی وانەمابوەوە ، ئەم كێلگانــەش كە خاوەنەكانیان دەمرد دابەش دەكران بەچەند پارچەیەكی بچكۆلەوە لەنێوان وەچەكاندا ، ئنجا نیوەی فەلاحەكان خاوەنی زەوی ، وزاری خۆیــان بــون ، وە نیوەكەی تریان لە زەویو زاری خاوەن زەویەكاندا بە كــرێ ئــیــشــیــان دەكرد ، لەبەر ئەمە (چین) لەژمارەیەكی زۆری كێلكەی بچوك پێك هاتبــو خەلــكی (چین) بەصەدان سالە بەناو بانگن كــەوا دەوتــوانــن ، ئــەوپــەری بەروبوم لەزەوی پەیداكەن لە بەر بچوكی پانتایی زەویەكانیــان ، نــاچــار

بون بەهۆی توانایەکیانەوە ئیشی تێدا بکەن ، و هیچ دەزگای نوێیان نەبو کە زۆر لەوەخت دەگێریتەوە ، بۆیە ناچاربون رەنج زۆر بدەن تاکو ئەنجامێکی باشیان دەست کەوێت.

سەرەرای ئەو هەمورەنجە کە لە زەوی ، و زارەکاندا دەی دەن ، لەنیوەیان زیاتر ناتوانن پێداویستی خۆیان چ لەبەرگ و چ لەخواردەمەنی سازکەن ، تەمەنی کورتی خۆیان لەکوێرەوەری ، و نیمچە برسیتیدا بەسەر دەبەن، هەروەکو لە هیندستاندا هەیە، لەسەر لیواری هەژاریو نەبونی دەژین ئیتر بەیتابەیتا بەلا ، و برسێتی رووی تی دەکردن ، و لافاویش بەملیونەهای لێ دەکوشتن ، حوکومەتی دکتور (صن) لەسەر پێشنیاری (بورودین) یاسایەکی دانا بۆ چاك کردنی باری فەلاح و کرێکارەکان ، کرێی زەویەکانی بە رازەی لە ٢٥٪ کەم کردەوە سەعاتی ئیش کردنی رۆژانەی کردبە ٨هەشت سەعات ، سنوری بۆ رادەی کەمی کرێ دانا ، وە نەقابەی بۆ فەلاحەکان پێك هێنا ، دیارە ئەم ئیصلاحاتانە جەماوەری میللەت بەگەرمی پێشوازی کرد ، و بەوپەری گەرم و گوری یەوە رژانە ناو نەقابە تازەکانەوە ، وپشتگیری حوکومەتی (کاننون) یان کرد.

بەم جۆرە حوکومەتی (کانتون) خۆی داکوتا ، خۆی ، ئنجا دەستی کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ بەرەنگار بوونی پێشەوا سوپاییەکانی (توشون) بۆیە کۆلیجێکی سوپایی کردەوە ، و لەشکرێکی دروست کرد ، گۆرانێکی گرنك نەك هەر لە (کانتون) دا بەتەنها بەلکو لە هەمو (چین)دا رووی دا ، وەتا رادەیەکی زۆریش لە هەمو رۆژ هەڵاتدا ، لەواقیعدا (چین) رۆژێك لە رۆژان ، لەو ولاتانە نەبوە کە بەهەمو مانای وشەکە ئاینەکان دەسەڵاتیان تیایدا هەبو بێت لەگەل ئەمەشدا زیاتر بەرەو عیلمانی چو ، بۆ نمونەی بۆ ئەمە بەکار هێنانی پەرستگە کۆنەکان بو ، وە کردنیان بەمەڵبەندی راهێنان و مەشقی پۆلیس و بازاری سەوزە ، و شتی لەم بابەتە.

دوکتور (صن یات سن) لەمارتی ١٩٢٥ز. دا مرد بەلام حوکومەتی (کانتون) لە بەهێز کردنی خۆیدا بەردەوام بو ، بەیارمەتی (بورردین) راوێژپێ کروا. ئنجا هەندی کارەسات رووی داکە قینی (چین)یەکانی هەڵساند دژی ئیستیعمار کەرانی بێگانە ، بەتایبەتی بەریتانیاییەکان ، سەبارەت بەوەی کەلە کارگەکانی لوکەدا لە (شانغهای) لەمانگی مایس

١٩٢٥ز. دا مان گرتنێك روویدا ، کرێکارێك لەکرێکارانی کارگەکان کوژرا لەکاتی بەشداربونیدا لەخۆپیشاندانەکاندا ، ئنجا قوتابیەکان و کرێکارەکان ناشتنی تەرمی کوژراوەکەیان بەهەڵ زانی ، و کردیان بە خۆپیشاندانێك و هاواریان بەروخانی ئیستیعمار دەکرد ، ئەفسەرێکی بەریتانیایی لەوی چەند پۆلیسێکی لە (سیخ)ەکان لەبەر دەستدابو ، فەرمانی دانی کە تەقە بکەن لەجەماوەرە کەو (بیان کوژن) لەمەدا چەند قوتابیەك کوژرا ، ئیتر لەهەمو (چین)دا رقەو کینە لەبەریتانیایەکان تەشەندی کرد ، کارەساتێکی تریش روویدا ، وەزع و باری خراپ کرد ئەمەش لەساڵی ١٩٢٥ز. دابو ، لەناوچەی بێگانەکان لە (کانتون) کەبە (ناوچەی شامین) دەناسرێت ، ئەویش لە کاتێکدا کە تەقە لەقوتابیەکان کرا ، و پەنجاو دووکەس تریان لێ کوشتن ، ئینگلیزەکان بەڵی پرسراو دادەنران بەرامبەر بەم کارەساتە کەبە (کوشتارەکەی شامین) بەناوبانگە،ئیتر لە (کانتون)دا جار درا کەوا کەل ، و پەلی بەریتانیا نەکررێت و موقاتەعە بکرێت ، وە بازرگانی کردنی (هونك کونك) چەند مانگێك وەستا ئەمەبو بەهۆی ئەوەی کە زیانێکی زۆر لەحوکومەتی بەریتانیا وشەر بکاتەکانی بەریتانیا بکەوێت ، کچم وەکو شارەزایت (هونك کونك) کەوتوۆتە خواروی (چین)ە وە ، ونزیکە لە (کانتون)ەوە ، بەڵام بەریتانیاییەکان داگیریان کرد ، و بو بەبنکەیەکی بازرگانی گەورە.

دوای مردنی دوکتور (صن یات سن) هەراو ناکۆکی کەوتە نێوان بەرەی راست رەوی نەریتپەروەرلە حوکومەتی (کانتون) و بەرەی چەپرەوی پێشکەو تنخواز ، جارێکیان ئەم و جارێکی تر ئەوی تریان حوکوم فەرمادەبو ، لەناوەراستی ساڵی ١٩٢٦ز. دا (شیان کای شیك) کە لەبەرەی راست رەوبو بو بەسەرکردەی بەرز ، ئنجا دەستی کرد بە دەربەدەر کردنی شیوعیەکان لەگەڵ ئەمەشدا هەردو بەرەکە پێکەوە ئیشیان دەکرد ، گەرچی هیچ لایەکیان متمانەی بەوی تریان نەدەکرد ، لەپاشاندا لەشکری (کانتون) بەرەو سەروو روشت بو کوشتاری سوپاییەکان (توشون ـ وەرگێر) ودەر کردنیان ، وە دامەزراندنی حوکومەتێکی نیشتمانی بۆهەمو ولاتەکە. ئەم سەرەو زۆر کشانە شتێکی سامناك بو ، سەرنجی جیهانی راکێشا ، لە

شکرەکە توشی بەرهەڵستیەکی وانەبو ، کەشایانی باسکردن بێت• ، و پەیتا پەیتا لەسەرکەوتندابو ، بەتایبەتی ناوچەکانی سەروو لەناو خۆیاندا ، جیاوازو ناکۆك بون ، بەلام لەمەگرنگتر ، لەوەدا بو کەوا هێزی خوارووی (کانتون ـ وەرگیر) میللەت بەفەلاح و کرێکارەوە پشتیان دەگرت ، لەپێش لەشکرەکەوە ، تاقمێکی کەم لەپرو پاغندەکە ردەرویشتن دەستیان کرد بەرێکخستنی نەقابەی کرێکاران و فەلاحەکان ، وە چونە پال حوکومەتی (کانتون)یان بەمیللەت رادەگەیاند ، بەم جۆرە لەشکرەکە لەشارو لادێکاندا ئەوپەری پێشوازی دەکراو ، یارمەتی دەدرا. بەلام ئەو سوپایاندی کە دەنێرران بۆ بەکژدا چونی حوکومەتەکەی (کانتون) نەدەچون بەکژیدا ، بەڵکو پشتیان دەکردە شەرکردن ، بەخایە ، و مایەوە دەچونە ناویانەوە. هێشتا ساڵی ١٩٢٦ کۆتایی نەهاتبو کە نیشتمانیەکان نیوەی (چین)یان بریبو ، وەشاری (هانکو)ی مەزنیان داگیر کرد کە لەسەر روباری (یانکتسی)یە ، ئنجا پایتەختەکەیان لە (کانتون)ەوە گواستەوە بو (هانکو) ، وە ناویان نا (ووهان) ، ئیتر سەرکردە سوپاییەکان لەسەروودا شکان و دەرکران لەناوچەکانی دەسەلاتیاندا ، ئنجا لەمەدا دەولەتە ئیستیعماریە کان ، لەناو ئاگاداربونەوە لەو مەترسییەی کە ئاوقایان دەبێت لەبوونی (چین)یکی نوێی بەهێزی ئازا ، کەوا دەیەوێت بەرامبەریان یەکسان بوەستێتەوە.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٧ز. دا هەرا ، و ناخوشیەك کەوتە نێوان (چین)یەکان ، و بەریتانیاییەکانەوە ، لەکاتێکدا کە نیشتمانیەکان ویستیان جیاوازی ، و ئیمتیازاتی بەریتانیاییە کان لە(هانکو)دا ، داگیر کەن ، دیارە ئەگەر (جین)یەکان ، بیان وێرایە بەم ئیشە هەڵسن ئەمە مانای جەنگ بو. ئەوسا حوکومەتی بەریتانیا دەی بلیشاندنەوە ، و جەریمەی دەگرت و جەزای لێ دەسەندن ، وە داوای جیاوازی ، و ئیمتیازاتی تریشی لێ دەکردن ، چونکە دیمان بە درێژایی سەدەیەك لەزەمان واتە لەجەنگی تلیاکەوە لەساڵی ١٨٤٠ز. وە ، رەوشت وەها بوە بەلام زەمان گۆرراو ئیستا (چین)یکی تازەیان لەبەردەمدایە هەر لەبەر ئەمە و یەکەم جارە کە بەریتانیاییەکان سیاسەتی خۆیان بگۆرن ، بۆیە هەولیان دا کە بگەنە جێ بەجێ کردنێکی ئاشتیانە.

بەریتانیاییەکان وتیان ، مەسەلەی جیاوازو ئیمتیازات لە (هانکو) دا مەسەلەیەکی ئاسانە ، و بەئاسانی جێ بە جێ دەکرێت ، ئیتر لەبەردەمی نیشتمانیەکانداو لەرێ رەوی پێشکەوتنیاندا ئێستا شاری (شانغهای) هەبو کە گەورەترین ، و دەولەمەندترین مەڵبەندی دەسەلاتی بێگانە بو ، لە(چین)دا ، بەرژەوەندی بێگانەکان تیایدا ئیجگار زۆر ، و ئەستوربو ، شارەکە خۆی ، وەیا ناوچەی جیاوازی ، و ئیمتیازاتەکان بەتەواوی مل کەچی بێگانەبون ، هەروەکو شارێکی سەربەخو وایە لە حوکومەتی (چین) ئەم بێگانانە لە (شنغهای)دا تەواو سەغلەت بوون ، هەروها حوکومەتەکانیشیان کە لەشکری نیشتمانیەکان لێیان نزیك بوەوە ، لەبەر ئەمە خیرا کەشتی جەنگیو ، لەشکریان ناردبو میناکە ، وە حوکومەتی بەریتانیاش سوپایەکی گەورەی لەسەرەتای ینایری ١٩٢٧ ز.دا ناردبو (شنغهای) ، بەشیك لەم لەشکرە لەسربازە هیندیەکان پێك هاتبو.

لێرەدا حوکومەتە نیشتمانیەکە لە(هانکو) وەیان (ووهان) دا توشی کێشەیەکی گران هات ـ ئایا بۆپێشەوە بچێت یان بوەستێت؟ ئایا (شنغهای) بگرێت یانە؟ سەرکەوتنەکەی کە تا ئێستا دەستیکەوتبو ، وای لێ کردبو بەخویدا رایپەرموێت ، وە ئێستا (شنغهای) لەبەر دەمدایە وەکو بەرهەمێکی کەبو وایە ئاو دەژێنێتە دەم ، لەلایەکی تریشەوە ، درێژایی (٥٠٠) میلی لەناوچە کاندا داگیر کردوە ، هێشتا حوکمرانی خۆیی تێدا بتەو نەکردوە ، خۆ ئەگەر پەلاماری (شنغهای) بدات توشی گەلێك کێشە دەبێت ، لەوانەیە بەکژ دەولەتە بێگانەکاندا بچێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی فەوتانی دەسکەوتەکانی تا ئێستای ، لێرەدا (بورودین) ئاموژگاری کردن لە ئەوپەری وریایی ، و ئاگاداری بەکار بێنن ، لەپێش هەمو شتێکدا با حوکومەتە کە پێنج داکوتی ، بیروڕای (بورودین) وابو ، کە نیشتمانیەکان دەبێت دورگەونەوە لە (شنغهای) ، شوێنی خۆیان لەنیوەی خوارووی (چین) دا کەوا پێشتر داگیریان کردبو ، لەوێدا قایم کەن ، ئنجا رای گشتی (الرأي العام) ئامادە کەن لەناوچەکانی سەروودا لەرێی بڵاو کردنەوەی پروپاغەندەوە ، وە وای دانا کەلە ساڵێك زیاتر تێ ناپەرێت تاکو هەمو (چین) ئامادە دەبێت کە پێشوازیان بکەن ، ئەوسا (شنغهای) داگیر دەکەن و بەرەو (بکین) دەچن ، ئنجا دەتوانن بەرامبەر دەولەتە ئیستیعماریە

بێگانەکان بوەستنەوە ، ئەم ئاموزگاریـە ، بـەئـاگـاداری ، ووریـا بـون (بورودین) پێشکەشی کردن ، گەرچی ئەم شۆرشگێرێك بو لە پلەی یەکەمـدا بەلام ئەم توانی بریار بەسەر وەزع و باری گشتی دا بدات ، چونکـە لـەم کاروبارانەدا شارەزابو ، بەلام پێشەوایانی بـەرەی راسـت رەو (الـجـنـاح الأیمن) لە (کومنتاك) دا بەتایبەتی (شیان کای شیك) سـوربـون لـەسـەر ئەوەی کە بەرەو (شنغهای) پێشکەون و برۆن ، ئنجا هۆی راستەقـیـنـەی ئەمە دەرکەوت کەوا ئەمانی هان دا کەوا (شنغهای) بکرن ، لەکاتێکدا کە (کومنتاك) بوبە دووکەرتەوە ، نەقابەکانی کریـکـارەکـان و فـەلاحـەکـان پەرەیان دەسەندو بەهێز دەبوون ، ئەمە بەدلی پێشەوایانی بـەرەی راسـت رەو (الجناح الأیمن) نەبو کەوا ئەمان خۆیان دەرەبەگ بوون لەبـەر ئـەمـە بریاریان دا کە ئەم نەقابانە بفەوتێنن گەرچی لەسەر حیسابی کەرت بوونی حیزبە کە بێت بەدو کەرتەوە ، لەگەل لاواز کردنی مەسەلە نیشتمانیەکەش. (شنغهای) بنکەیەکی گرنگی چینە بورجوازیەکانی خەلکی (چـیـن) بـو ، لەبەر ئەمە پێشەوا راست رەوەکان (الزعماء الیمنیون) بەتەمای یـارمـەتـی پارە ، و دارایی ، وشتی تربون لـیان لەتێکۆشانیـانـدا دژی ئـەنـدامـە پێشکەو تنخوازەکانی لەمەر حیزبەکە ، بەتایبەتی شیوعیەکان ، هـەروهـا بەتەمای ئەوە بوون کە پشتگیریان بکرێت لەلایەت بانفە بێگـانـەکـان ، و خاوەن کارگەکانەوە لە (شنغهای)دا.

بەم جۆرە بەرەو (شنغهای) کشان لە ۲۲ مارتی ۱۹۲۷ز.دا بەشە (چین) یەکەی (شنغهای)یان داگیرکرد ، بەلام پەلاماری نـاوچـەی جـیـاوازی ، و ئیمتیازاتەکانی بێگانەکانیان نەدا لەواقیعدا توشی هیچ بەر بـەسـتـیـەك نەبون ، وە لەشکری بەرهەلستی کەران چونە پالیان کرێکارانی شارەکە مان گرتنێکی گشتیان کرد بۆ پشتگیری نیشتمانیەکان ، بەمـە دوا سـەنـگـەر لەسەنگەرەکانی حوکومەتیان لە (شنغهـای) داگـرت ، دوای دووڕۆژ شـاری (نانکین) یشیان گرت ، ئیتر (کومنتانك) بوبە دووبەشەوە ، حیـزبـەکـە بوبە دوان یەکێکیان چەپ رەو (یساری) ، ئەوی تریان راست رەو (یمینی) ئەم دوکەرت بونە سنورێکی بۆ سەرکەوتنە کانی نیشتمانیەکـان دانـا ، و توشی بەلای کردن ، ئنجا شۆرشەکە کۆتایی هات وە شۆرشی ئاوەزوو دەستی پێ کرد.

(شیان کای شیك) بەبێ ڕەزامەندی حوکومەتی (هانکو) بەرەو (شانغهای) چو. ئیتر بەرە ، و تاقمێك ، دەسیسە ، و موئامەرەی لەوی تر دەکرد ، خەلکی (هانکو) دەیان ویست ، دەسەلاتی (شیان کای شیك) لەناو سوپادا کەم کەنەوە ، ئنجا ڕزگاریان بێت لێی ، (شیان) بەر پەرچی ئەمەی بەوەدایە وە کەوا حوکومەتێکی تری لە (نانکین) دا دروست کرد ئەم هەموە دوای گرتنی (شنغهای) لەچەند ڕۆژێکد رووی دا ، (شیان) لە(هانکو) دا لەسەر شۆڕشەکەی رویشت ، دەستی کردبە جەنگێکی پێوچان دژی شیوعیە چەپڕەوەکان ، و کرێکارانی نەقابەکان لەوێدا ـ ئەو کرێکارانەی کەوا پێشوازیان کرد کەچوە (شنغهای) یەوە ، و یارمەتیان دا لەسەرکەوتنەکەیدا ؛ کەلێکیان تەقەیان لێکرا ، و گەلێکی تریشیان سەر ـ بڕران ، بە هەزارانی تریان گیران ، و خرانە بەندیخانەوە ، بەم پێیە نیشتمانیەکان کە دەبوابە ئالای ئازادیان بڵاوبکردایەوە لە (شنغهای) دا کەچی کرا بەسەردەمی تۆقاندنێکی خراپ.

هەر لەم ڕۆژانەدا واتە لەنیسانی ١٩٢٧ ز.دا هێرش برایە سەر باڵیوزخانەی سۆڤێت لە(بکین) و قونسولیەتی سوفیت لە (شنغهای) دا ، دیاربو (شیان کای شیك) ریك بو لەگەل سەرکردە سوپاییەکەی سەروو (شان تسولین) دا کە گوایا لەجەنگدایە لەگەلیدا ، لەپاشاندا (شیان کای شیك) بەگەلێك هێرشی (پاکژکردنەوە) هەستا لە (بکین) و (شنغهای) دا دژی شیوعیەکان و کرێکارە پێشکەو تنخوازەکان ، دیارە دەولەتە ئیستیعماریەکان پێشوازی ئەم جۆرە گۆرانگاریەیان کرد ، چونکە ئەمە مانای لاوازبونی ڕێزی نیشتمانیە (چین) یەکانە ، ئنجا (شیان کای شیك) لەنوێنەرانی دەولە بێگانەکان لە (شنغهای) دا نزیك دەبوەوە ، بێگومان کچم لەبیرتە نزیکەی لەم کاتەدا لەمایسی ١٩٢٧ز. حوکومەتی بەریتانیا هەستا بەهێرشی (ارکوس) بۆسەر بروزەو دامەزراوەکانی سۆڤیت لە (لندن) دا ، ئنجا دوای ئەمە پەیوەندایەتی خۆیی لەگەل روسیادا بری.

بەم جۆرە یەك دوو مانگ تێ نەپەری تاکو بارو ، وەزع بەتەواوی لە (چین) دا گۆرا دوای ئەوەی حیزبی (کومنتاك) یەکگرتو ، بەهێزو سەرکەوتو بو نوینەرایەتی میللەتی (چین)ی دەکرد وئامادەبو بدەنکاری دەولەتە بێگانەکان بێت ، کەچی ئێستە بوبە [illegible] بێگەن ،

و لەناو خۆیدا پارچە پارچە ، وە کرێکارو فەلاحەکانی کەوا چاکەیات هەبوبە سەریەوە لەسەرکەوتن و توانای دا ، توشی جەزرەبەو چەوساندنەوەی (کومنتانك) بوون ، خاوەن بەرژەوەندیەکانی بێگانەکان لە (شنغهای)دا ، ئەم هەلوەشاوی ، و بۆگەن بونە دڵی خۆش کردن ، بۆیە زیاتر ئاگریان خۆش دەکرد ، بەوەی کەلایەنی تاقمێکیان دژی ئەوی تر دەگرت تاکو هێزیان لێ ببرێت ، کرێکارانی کارگەکانی (شنغهای) لە (واقیعدا لە هەمو چین) دا دەچەوسێنرانەوە لەلایەن کارگەکانەوە ، رادەی گوزەرانیان زۆر نزم بو ، کە نەقابەکانی کرێکاران دروست بو ، توانی باری ژیانیان باش ، و کرێ کانیان زیادکات ، لەبەر ئەمە نەخاوەن کارگە ئەوروپاییەکان وەنە ژابونی نە (چین) یەکان لەم نەقابانە رازی نەبون.

لە(مۆسکۆ) سەر زەنشتێکی توندی (بورودین) یان کرد ، سەبارەت بەگۆرانی کارەساتەکان بەم جۆرە لەناو (چین)دا. لەیولیوی ١٩٢٧ز.دا بانگ کرایە وە ، بۆ روسیا ، ئیتر بەرویشتنی (بورودین) بەرەی چەپ رەو لەناو (کومنتاك) لە (هانکو)دا پالپشتێکی تریان لەکیس چو ، ئنجا حوکومەتی (نانکین) بەتەواوەتی زاڵ بو بەسەر حیزبی (کومنتاك)دا ، وە هەر بەردەوام بو لەبەکژداچوونی شیوعیەکان ، و چەپرەوەکان ، وپێشەوایانی کرێکاراندا ، لەوانەی کەلە (چین) کرانە دورەوە خاتو (صن) بێوەژنەکەی پێشەوای مەزن دوکتور (صن یات سن) ، ئەم ئافرەتە بەدڵیغەمبارەوە ووتی: "کردو کۆشی مێردەکەی لەپێناوی (چین)دا ، سوپاییەکان و ئەوانەی وەك ئەمانن خراپیان کردو تێکیان دا".. لەگەل ئەمەشدا ئەم سوپاییانە بەردەوام بوون لەسوێند خواردندا بەسی بیروباوەرد بەناوبانگەکە: نەتەوایەتی ، دیموکراتیەت ، و یەکسانی کۆمەڵایەتی.

جارێکی تریش (چین) بوەوە بەمەیدانێك کە سەرکردە سوپاییەکان تیایدا بەکژیە کتریدا دەچون. (کانتون) لە (نانکین) جیابوەوە ، حوکومەتیکیتایبەتی لەخوارووی تیادا دروست بو. (بکین) لەساڵی ١٩٢٨ز. دا کەوتە دەست حوکومەتی (نانکین)و ناوەکەی بوبە (بیبمك) مانای "ئاشتیەکەی سەروو" وەوشەی (بکین)یش مانای "پایتەختی سەرووە" ناوەکەیان گۆری چونکە یەپایتەختی نەمایەوە.

سەرەرای ئەوەی (بکین) نەما وەیا ئێستە دەبێ پێی بڵێین (بنك) شەر وشۆڕ هەر بەدەوام بو ،لەنێوان ،بەشە جۆر بەجۆرەکانی ولاتدا ، ئنجا لە (کانتون)دا حوکومەتێکی سەر بەخۆ دروست بو ، بەلام لەسەرووەدا سەرکردە سوپاییەکان لەبەکژداچونی یەکتریدا هەر بەردەوام بون ، ئیتر حوکومەتە (نیشتمانیەکە) بێچکەلە (کانتون) هەر بەناو حوکوم فەرمای(چین) بو ، وە بەشێکی تر لەناوەوەدا حوکومەتێکی شیوعی تێدا دروست بو ، حوکومەتەکەی (نانکین) بشتی بەدەولەمەندەکان و خاوەن (شنغهای) دەبەست ئیتر لەشکری پێشەوا سوپاییەکان گرانباریەکی قورس بون بەسەر فەلاحەکانەوە ، ژمارەیەکی زۆر لەسەربازە بەرەلا کراوەکان ، لەولاتەکەدا بۆئیش دەگەران ، ئەگەر ئیشیان نەدۆزیبایەوە دزێتیوتالانیان دەکرد بەپیشەی خۆیان.

لەپاشاندا پەیوەندایەتیەکانی نێوان حوکومەتی (نانکین) و روسیای سۆڤێتی لەدیسەمبەری ١٩٢٧ز. دا پچرا ، وە حوکومەتی (نانکین) بەدەسیسەی دەولەتە ئیستیعماریەکان دەستی کرد بەجێ بەجێ کردنی سیاسەتێکی دوژمنانە بەرامبەر بەسۆڤیت ، ئەم پروبیانوە بەس بو بو ئەوەی کە هەردولا یچن بەکژیەکتردا ، لەساڵی ١٩٢٧ز. دا ئەگەر روسیای سۆڤێتی نەبوایە کەدەیویست خۆی لەمە دورخاتەوە ، و بپارێزێت بەهەج نرخێك بوایە. دەست درێژیەکانی حوکومەتی (چین) پەیتا پەیتا بەدوای‌یەکدا دەهاتن ، ئەمجارەیان لەساڵی ١٩٢٩ ز.دا لە (منشوریا)دابو ، لەوێ گەماروی قونسولیەتی سۆڤیتیان دا ، فەرمانبەرە روسەکان کەوا لەهێلی ئاسنینی (چین)ی رۆژهەلاتدا ئیشیان دەکرد دەرکران ، ئەم هێلە ئاسنینە حوکومەتی سۆڤیت خاوەنی‌بو ، ئنجا حوکومەتی سۆڤیت خیرا کەوتە کار دژی (جین) تاچەند مانگێك وەزع وبار ناهەمواری مایەوە ، وەکو هەردو دەولەتەکە لەحالەتی جەنگداین وابو تاکو حوکومەتی (چین) داخوازیەکانی سۆڤێتی سەڵماند کەوا کاروبار بچێتەوە دۆخی جارانی.

(منشوریا)و هێلە ئاسنینەکەی کەبیایدا تێ دەپەرێت گەلێك کێشەی بۆ دەولەتان دروست کرد چونکە گەلێك بەرژەوەندی تیایدا تێك ئالابون ، (چین)و (ژابون)و(روسەکان) هەمویان بەرژەوەندیان تیایدا هەیە، ماوەیەکی کەم لەمەو بەر (ژابون)ەکان ئەم ناوچانەی سەرووی رۆژهەلاتیان لە (چین)

داگیر کرد ، گەرچی هەمو جیهان بەرهەڵستی کردن ، لەبەشێکی تری نامەکەی داهاتومدا باسی ئەمەت بۆ دەکەم.

ناوی دروست بوونی حوکومەتێکی شیوعیم لەناوەوەی (چین)دا هێنا ، وادەر دەکەوێت یەکەم حوکومەتی شیوعی لەوێ لەنۆفەمبەری ۱۹۲۷ز. دا لەناوچەی (هیفنك) لەناوچەی (کوانتونك) لەخوارووەدا پێك هات ، بەم حوکومەتەیان دەوت "جمهوریەتی هیفنك ی سۆڤیێتی" ، لەیەکیەتی نەقابەکانی فەلاحەکان دروست بوبو ، ئەم حوکومەتە لەناوەوەی (چین)دا بێ گەیی ، و گەورەبو ، هێشتا نیوەی ساڵی ۱۹۳۲ز تێ نەپەریبو تاکو بەسەر شەش یەکی پانتایی (چین)دا دەسەلاتی هەبو وانە بەسەر نزیکەی ۲۵۰٫۰۰۰ میل چوار گوشەدا ، وە پەنجا ملیون کەسی تێدابو ئەم حوکومەتە لەشکری سوری دروست کرد کەچوار صەد هەزار کەس بو وەچەند پەلێك (و.ئدات) لەکچ و کور یارمەتیان دەدان ، حوکومەتی (نانکین)و حوکومەتی (کانتون) گەلێك هەولیان دا کە ئەم (جین)یە سۆڤیدیانە بفەوتێنن ، وە (شیان کای شیك) گەلێك پەلاماری دان ، بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکی دەست کەوێت ، هەندێ جار(سۆڤیتیەکانی چین) دەکشانەوە ، و هەندێ جاریش لەچەند شوینێکی تردا لەناوەوە خۆیان دادەکوتا.(۱)

---

۱) لەپاشکوی ئەم کتێبەدا چیرۆکی (چین)و مارشال (شیان کای شیك)و (سۆڤیتیەکانی چین)ت بۆ دەگێرمەوە ، لەگەڵ یەکگرتنیاندا دژی (ژابونی) دوژمنی هەردولا ، هەروها چیرۆکی هێرشەکانی (ژابون) بۆسەر (چین) لەگەل ئەوجەنگانەدا کە دوا بەدوای ئەمە بەرپابوون.

# ژاپۆن سەر پێچی جیهان دەکات

## ٢٩/نۆڤێنو/١٩٣٣

دوای چیرۆکە غەمناك و هەلوەشاوەکەی (چین) کەوتین و ، دیمان شۆرشەکەی کەوا هەمو کەسێك بێچەندو چون بەسەرکەوتویان دەبینی ، لەپرێکدا روخاو ، دوژمنەکانی هەڵیان لوشی ، بەلام ئەم چیرۆکە هێشتا کۆتایی نەهاتوە ، لەراستیدا شۆرشەکە لەبەر زۆرانبازی کەلە ناو چینەکاندا بەرپا بو بو سەرنەکەوت. ئەم زۆرانبازی ، و ناکۆکیە ئەوەندە توندو تیژبو بەجۆرێك بەسەر نەتەوایەتیدا زاڵ بوبو ، دەرەبەگ و خاوەن بەرژەوەندیەکان ، تێك شکانی بزوتنەوەی نیشتمانیان بەچاکتردەزانی ، نەوەك کرێکاران و فەلاحەکان ببێنن دەسەلاتداربن بەسەر حوکومەتەکە دا.

سەرەرای ئەم کێشە ناو خوییانە کە توشی (چین) هاتبو ، دیسانەوە دەبوایە بەرەنگاری ئەو هێرشەش ببوایە کەبێگانەی دوژمن دەی هێنایە سەری ، چونکە (ژابون) سوربو لەسەر ئەوەی کە هەڵی لاوازبونی (چین بەکاربێنی ، و پەلاماری بدات لەکاتی خەریك بونی دەولەتەکانی تردا.

(ژابون) جۆرە و لاتێکە بێهاوتا ، پیشەسازی نوێی تێدایە ، لەگەل دەرەبەگدا ، کەوا لەدەرەبەگەکانی چەرخی ناوەراست دەچن ، وە لەهەمان کاتدا رژێمێکی بەرلەمانی ، و حوکومرانیەکی ئوتوکراتی ، وسوپایشی تێدایە. چینی دەرەبەگەکان ، لەگەل سوپاییەکاندا هەولیان دا دەولەتەکە لەسەربنچینەیەکی خێلایەتی (قبلی) بنیات بنێن ، ئەمان خۆیان سەرەك خێلەکان لەگەل ئیمپراتورداسەرۆکی بالابن ، ئیتر ئاین و فێرکردن (التعلیم)و هەموشتێکیان بۆهینانە دی ئەمە بەکار هێنا ، ئیتر ئاین راستە ، و خۆ خرایە ژێر دەسەلاتی دەولەتەوە ، پەرستگەکان (المعابد) دەولەت بەرێوەی دەبردن ، پیاو ئاینیەکانی کەتیایدا بوون فەرمانبەری حوکومەت بوون ، لەبەر ئەمە دەبینین پروپاغەندەیەکی زۆر فراوان

لەقوتابخانەو پەرستكەكاندا دەكرێت نەك بۆ فێركردنی میللەت كە ولاتەكەیی خۆش بوێت بەتەنها ، بەلكو بۆ ئەوەی تەواو مل كەچی فێر ببێت بۆ ئیمپراتور كە دەبێت وەكو خواوەند وابێت. لەژابون دا بەشۆرە سواری دێرین دەلێن: "بوشیدو" كە جۆرێكە لەپەیوەندایەتی خێلەكی ، ئنجا ماناكەیان ئەوەندە فراوان كرد تاكو تێكرا دەولەت بگرێتەوە ، ئیمپراتوریش لەسەرەوەدا دەنرێت ، لەواقیعدا ئیمپراتورنیشانەی حوكمرانی چینە دەرەبەگەكان ، و پیاوە سوپاییەكان بو كە بەناوی ئەوەوە حوكوم فەرماییان دەكرد ، بوونی پیشەسازی لە(ژابون)دا چینێكی بورجوازی تێدا دروست كرد ، بەلام خاوەن كارگەكان هەمویان لەخێزانە دەرەبەگەكان بون ، لەبەر ئەمە بورجوازیە كان نەیانتوانی دەسەلات و سولتە وەرگرن ئەمە مانای وایە كەلە (ژابون)دا ئیحتیكاراتێكی فراوان هەیە تارادەیەكی واچەند خێزان و خانەوادەیەكی بەهێزو توانا ، بەسەر پیشە سازی ، وسیاسەتی ولاتە كەدا حوكوم فەرمان.

(ژابون)یەكان ئاینیان (بوذا) یبە كەچی "شنتو" بەئاینی نیشتمانی خۆیان دەزانن ، گرنگترین بنچینەی ئەم ئاینە پەرستنی باو ، و باپیران و ئیمپراتورە پیشینەكان ، و پالەوانەكانە ، بە تایبەتی ئەوانەی كەلە جەنگەكاندا گوژراون ، بەم شێوە یە ئەم ئاینە بو بەهۆیەكی بەهێزو بەكار لە هاندان‌دا بۆ خۆشەویستی نیشتمان ، و مل كەچیو بەگوێ گردنی ئیمپراتور ، میللەتی ژابون بەنیشتمان پەروەریەكی سەیرو ، خۆ بەخت كردنێكی مەزن لەپێناوی ولاتەكەیدا بەناو بانگە ، بەلام لەوێدا راستیەك.(حقیقة) هەیە زۆر كەس نای زانێت ئەم راستیەش بریتیە لەوەی كەئەم نیشتمان پەروەریە ، ئارەزووی دەست درێژیو خەوبینین بەبنیاتانی ئیمپراتوریەتێكی جیهانیەوە زالە بەسەریدا ، دەوروبەری سالی ١٩١٥ ز لە (ژابون)دا پەیرەوێكی نوێ پەیدابو ، خێرا لەهەمو لایەكی ولاتدا بلاو بوەوە ئەم پەیرەوەش بریتی بو لەوەی كەدەبێت (ژابون) ببێت بەحوكوم فەرمای هەمو جیهان ، و ئیمپراتوریش لەسەروویەوە دانیشێت ، یەكێك لەلایەنگرانی ئەم پەیرەوە ووتی:

"ئێمە ئامانجمان ئەوەیە كە ئیمپراتور بكەین بەحاكمی گشتی هەموو جیهان ، چونكە هەر ئەم تاكە حاكمە لە هەمو جیهاندا كە پەیامی گیانی

(روحی) پاراستوه کەوا لەدێرینترین باو ، باپیراندوه پشتاوپشت بە کەلەپوور بۆیان ماوەتەوه لەنێو جیهانی خواوەندەکاندا".

هەروەکو لەپێشەوه دیمان لەجەنگە جیهانیدکەدا (ژابون) ویستی (چین) داگیرکات بۆیە بیست و یەك داخوازیەکەیی پێشکەش کرد ، ئبنر ئەوی ویستی دەستی نەکەوت سەبارەت بەو هەرایەی کە ئەمەریکاو ئدوروپا بەرپایان کرد ، لەگەل ئەمەشدا گەلێك شتی دەست کەوت. بەلام هێشتا جەنگە کە کۆتایی نەهاتبو ، و ئیمپراتوریەتی قەیسەریش نەروخابو . (ژابون) زانی هەلە زێرینەکەی بۆتەشەنە کردنی لەئاسیادا هاتۆتە پێشدود ئنجا لەشکرەکانی چونە (سیبیریا)وه ، ئاشناکانی (عملاء) گەیشتند (سمرقند) و (بخاری) لەئاسیای ناوەراستدا ، بەلام ئەم سەرکێشیو چەتونیە سەری نەگرت چونکە روسیای سۆڤێتی وریابو ، وه ئەمەریکاش بەرهەلستی ژابونی دەکرد ، دەبێت لەبیرمان نەچێت کە ئەمەریکا ژابونی خۆش نەدەویست وه متمانەی پێ نەدەکرد ، دیسانەوه (ژابون)یش ئەمەریکای خۆش نەدەویست، وه هەریەکەیان بەتیلایی چاو ، لەم بەرو ئەوبەری دەریایباسفیکی یەوه سەیری یەکتریان دەکرد. کۆنگرەکەی کەلە (واشنطن) لەسالی ١٩٢٢ز.دا بەسترا ، دەست لێوەشاندنێکی کوشندەبو ، بۆ تەماع و چاوچنۆکی (ژابون) وەسەرکەوتنێکی گەورەبو ، بۆ سیاسەتی ئەمەریکا. چونکە ئەم کۆنگرەیەبە(ژابون)ەوە بۆ دەولەت بوون ، بریاردرا کە رێزی سەربەستی ، و سەربەخۆیی (چین) بگیرێت ئەمە وادەگەیەنێت (ژابون) لەمەولا بەئومێد نەبێت کە ئیتر بەسەر حیسابی (جین) تەشەنە بکات ، وه هەر لەم کۆنگرەیەدا دیسانەوه هاو پەیمانەکەی کە لە نێوان (زابون) بەریتانیادا بەسترا بو کوتایی هات ، بەم بەید (زابون) هەر خۆی بەرووتی مایەوه لەرۆژهەلاتی دوردا ، ئنجا بەریتانیاش بنکەیەکی دەریایی مەزنی لە (سنغافورە)دا دروست کرد ئەمەش مانای هەرەشەیەکی راست و رەوانە لە (زابون). لە سالی ١٩٢٤ز. دا ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا یاسایەکی دانا بەپێی ئەم یاسایە ، کوچ کردنیکرێکارە (ژابون) یەکانی بۆ ئەمەریکا قەدەغەکرد ، (ژابون)و گەلێك لەولاتەکانی رۆژهەلاترقیان لەم جیاوازیرەگەزپەرستیە هەستا بەلام نەیان توانی دژیئەمەریکا هیچ بکەن ، ئنجا کە (ژابون) هەستیکرد بەتەنیا ناوەتەوه

لەجیهاندا وە لەهەمو لایەکدا بە دوژمن دەورە دراوە ، ئیتر رووی‌کردە روسیا پەیماننامەیەکی لەساڵی ١٩٢٥ز. دا ، لەگەڵدا بەست.

دەمەوێت باسی لێقەومانێکت بۆ بکەم کە لەم ماوەیەدا تووشی ژابون هات و زۆر لاوازی کرد ، ئەمیش لە١ یەکی سەبتەمبەری ١٩٢٥ز. دا بومەلەرزەیەك لە (ژابون)دا دوای ئەوە دەریا هەڵسا ،و ئاگرێکی گەورە لە (طوکیو)ی پایتەختدا کەوتەوە ، و کاولی‌کرد ، هەروەها مینای (یوکوهاما)یشی وێران کرد ، لەم کارەساتانەدا نزیکە ٠٠٠ر١٠٠ صەد هەزار کەس فەوتا ، ولاتەکە زیانێکی گەورەی لێکەوت. (ژابون)یەکان بەرامبەر ئەم کارەساتە ئازابون و خۆیان راگرت ئنجا شارێکی نوێیان ، لەجێی شوێنەواری (طوکیو) دروست کردەوە.

سەربارەت بەزۆری کێشەکانیەوە. (ژابون) ناچاربو ، لەگەل روسیادا رێك کەوێت ئەمە مانای وانی‌یە لەگەل شیوعیتیدا بگونجێت چونکە شیوعیتی مانای سنورێك بۆبەرستنی ئیمپراتور دادەنێت ، وە کۆتایی بەدەرەبەگایەتی دێنی ، وە چەوساندنەوەی چینە هەژارەکان لەلایەن چینە فەرمان رەواکانەوە کۆتایی دێنی ، بەکورتی شیوعینی کۆتایی هێنانە بەهەموشتێك کە رژێمی حوکوم فەرمای ئیستای ژابون دەی پارێزێت ، شیوعیتی لە (ژابون)دابەردەوام لە پەرەسەندندابو ، بەهۆی خراپترزیادبونی کوێرەوەری میللەت و چەوساندنەوەیە وە لەلایەن خاوەن کارگەکانەوە ، وە ژمارەی دانیشتوان پەیتا پەیتا لەزیادبوندابو ، نەیان دەتوانی کوچ بکەن بو ئەمەریکا وەیان (کندا) وەیا تەنانەت بو بیابانەکانی (اوستراليا)ش ، ئیتر هەمو دەرگاکان بەرامبەریان ، داخرابو ، راستە (چین) نزیکە لێیانەوە ، بەلام ئەمیش برە لەخەلك هەندێکیان ناچاربون کوچ کەن بۆ (کوریاو منشوریا) سەرەرای‌ئەم کێشانە (ژابون) دەبوایە بەرەنگاری کێشەکانی تریش ببوایە کەلە ئەنجامی بوونی پیشەسازی وسەبارەت بەتەنگو چەلەمە ئابوریەکەی جیهانی‌یەوە ، پەیدابوبو ، هەر چەندە باری‌ناو خۆ زیاتر خراپ بوایە ، ئەوەندە حوکومەت زیاتر تینی دەخستە سەر بیروراکانی شیوعیتی ، و هەمو بیرورایەکی ئازادیخوازنەی تر ، لەساڵی ١٩٢٥ز.دا حوکومەتیاسای (پاراستنی ئاسایشی) دانا ، لەبەر ئەوەی کەشتێکی سەیرە یەکەم‌بەندی‌دەردەخەم:ـ

"هەرکەسێك بچێتە هەر کۆمەڵێکەوە ، مەبەسی ئەو کۆمەڵە گـۆریـنـی دەستور ، وەیان لابردنی رژێمی‌خاوەندایەتی تایبەتی بێت (الملكية الخاصة) هەرکەسێك بچێتە ئەم کۆمەڵانەوەو ، ئامانجی ئەم کۆمەڵانەی زانـی بـێـت بەمردن سزادەدرێت ، وەیان بەحەپس کردن بۆماوەی پینج ساڵ".

رەقی ، و سەخی ئەم یاسایە کەوا شیوعیتی هەربەتەنیا قەدەغەناکـات بەلکو ، هەمو جورەکانی جاکخوازی (الاصلاح) سوشیالیستی ، و دەسـتـوری قەدەغە دەکات ، وە نیشانەی رادەی ترسە کەوا حوکومـەتـی ژابـون دوای پەیدابونی شیوعیتی هەستی پێ کرد.

بەڵام شیوعیتی بەهۆی زیادبونی کوێـرەوەری ، وسـەبـارەت بـەبـارە ناهەموارەکانی کۆمەلایەتیەوە پەرەی‌سەند ، ئیتر تا ئەم بارو ، وەزعـانـە چاك نەکرێت بەرهەڵستی کردنی شیوعیتی بێ سودە ، ئەوەمەینـە تـیـیـەی لە(ژابون)دا هەیە زۆربە تێنە: فەلاحەکان لەژێر گرانباری قـەرزداریـەکـی بەئەندازەدا دەنالێنن ، هەروەکو چۆن لەهیندستان و (چـیـن)دا هـەیـە ، باجێکی زۆریش سەبارەت بەچەکدار کردن ، و پێداویستیەکانـی جـەنـگـە کانەوە دەسێنرێت ، هەندێ‌رابورتمان بۆهاتوە دەڵێت هەندێ لەفـەلاحـەکـان ئەوەندە برسی بون تەنانەت گەراون بۆ پوش و پەلاش ، و خواردویانە ، وە هەیانبوە منداڵەکانی خۆیی فرۆشتوە ، تەنانەت چینی ناوەراستیش بەساغ وسەلامەتی‌دەر نەچو ، سەبارەت بەپەرەسەندنی بێ ئیشی ، ئیتر خۆ کوشتن زیادی کرد.

هێرشی دژی شوعیتی بەجۆرێکی فراوان لەسەرەتای سـالـی ١٩٢٨ز. وە دەستی پێ کرد لەکاتێکدا کە (١٠٠٠) هەزار کەسیان لەشوێـکـدا گـرت ، وەری نەدرا بەهیچ رۆژنامەیەك ئەم هەواڵە بلاوکاتەوە ، تامانگـێـك وەیـا زیاتر تێ پەرنەبێت ، هێرشەکانی پولیس و گرتن ، دوبارە دەبوەوە ، ساڵ بەساڵ لەزیادبوندابون ، گەورەترینی ئەم هێرشانە ئەوەیان بو کەلە سالـی ١٩٣٢ز. رووی‌دا کە (٢٢٥٠) کەسیان گرت ، زۆربەیان کرێکارنەبون بەلکـو قوتابی ، و ماموستابون بەسەدان لەدەرچوانی زانکۆکان و ئافرەتانی‌تێدابـو ئەوی بەراستی زۆر سەیرە گەلێك لەلاوە دەولەمەندەکانی (ژابون) یەکانمـان دەبینی لەرێزی شیوعیەکاندان ، ئنجاهەروەکو بارو ، وەزع لەهیندستانـدا ، ئەوانەی بیرورای ئازادیخوازیان هەیە بەترسناك تر دادەنرێن لەتاوانـبـارە

کان ، ئیتر موحاکەمە کردنی شیوعیەکان چەند سالێکی‌خایاند لە(ژاپون)دا.

کچم ئەم هەمو باسەم بۆ کردیت کە وەزع و باری ژاپۆنت بۆ رون کەمەوە ، تاکو دەربارەی (ژاپون) بیرورایەکی تایبەیت هەبێ یارمەتیت بدات لە تێگەیشتنی چەتونیو سەرکێشەیەکەی (ژاپون) لە (منشوریا)دا کەوا ئێستا چیرۆکەکەیت بۆ دەگێرمەوە.

کچم لەنامەکانی پێشومدا خوێندتە وەکە (ژاپون) هەمیشە هەولی داوە لەخاکی ئاسیادا جێ پێ یەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. لە (کۆریا)وە دەستی پێ کرد ئنجا چو بو (منشوریا) لە سالی ١٨٩٤ز. دا ، شەریکی لەگەل (چین)دا کرد ، ئنجا دوای دەسال بۆ ئەم مەبەسەی بەکژ روسیا شداچو ، (ژاپون) سەردەکەوت و هەنگاو بەهەنگاو پێش دەکەوت (کۆریا)ی داگیرکرد ، کردی بە بەشێك لە ئیمپراتوریەتی (ژاپون) ، ئیتر لە (منشوریا)دا کە بریتی‌یە لە سێ ناوچەو ، لەرۆز هەلاتی (چین)دایە ، ئەو جیاوازی ، و ئیمتیازاتانەی کە روسیا هەیبو لە مینای (بورت آریز) دا ، ژابون بۆ خۆی‌برد ، هێلەشە مەندەفەرەکەی ، کەروسیا رای‌کێشابو ، وەبە (منشوریا) دا تێدەپەری وپێیان دەوت: هێلی‌ئاسنی رۆژ هەلاتی (چین) کەوتە ژێردەسەلاتی (ژاپون) ەوە ، وناوی ناهێلی ئاسنینی خوارووی (منشوریا) سەرەرای ئەم هەمو گۆران ، و دەستکاری کردنە (منشوریا)، هەرلەگەل حوکومەتی (چین) دابو ، بەهۆی بوونی هێلی ئاسنینی شەمەندەفەرەوە ، لێشاوی‌کۆچ کردوان لە خەلکی (چین) بەرەو (منشوریا) دەهاتن ، ئەم کۆچ کردنە بۆئەم سێ‌ناوچەی سەرووی رۆژهەلاتەبەگەورەترین کۆچ کردنەکانی مێژوودا دەنرێت لە جیهاندا. چونکە لەماوەی نێوان سالانی ١٩٢٣ تا ١٩٢٩ نزیکەی دووملیون ونیوکەس ٢ر٥٠٠ر٠٠٠ کۆچیان کرد ، دانیشتوانی (منشوریا) ئیستانزیکەی (٣٠) سێ‌ملیون کەسن ، لە ٩٥٪ یان بریتین لە خەلکی(چین) ، لەبەرئەمە ئەم سێ‌ناوچەیە بە (چین) دادەنرین ، بەلام لە ٥٪ کەی‌تری روس ، ومەغولە کوچەریەکان ، وکوریایی وزابونیەکانن. (منشوس) ە کان کە دانیشتوانی ئەسلی (منشوریا) ن ئەمانە تێکەلاوی (چین) بون زمانەکەی خۆیانیان لە بیرچووەوە ، وەبوون بەبەشێك لەوان.

کچم گۆمانی تێدانی‌یە لەبیرتەپێم وتیت کەپەیماننامەیەکی نۆدەولەتی لەکۆنگرەی (واشنطن) ساڵی ١٩٢٢ ئیمزاکرا ، دەولە تەرۆژئاوایی‌یەکان مەبەسیان لەم پەیماننامەیە راگرتن و ، وەستاندنی چاوچنۆکی وتەماعی (ژابون) یەکان بو ، لە (چین) دا. لە پەیماننامە کەدا بەجۆرێککی رون وئاشکرا وبێ چەندوچون تیایدابو - (ژابون خۆیشی‌یەکێک بو لەوددەولەتانەی کەئیمزای کردبو) ئەم دەولەتانە رازین کە: "رێزی دەسەلات و ، سەربەستی (چین) وسنورو خواستی بگرن".

(ژاپون) چەند ساڵێك مایەوە پارێزگاری بەڵێنەکەی خۆیی‌کرد ، بەلام لەهەمان کاتدا یارمەتی پێشەوا سوپاییەکانی بە پارە ، وشتی‌تر دەدا ، بۆ بەردەوام بون لەجەنگی خۆبەخۆییاندا تاکو (چین) لاوازکات ، گرنگترینی ئەمانە (شان تسوین) بۆ ، کەدەسەلاتی بەسەر (منشوریا) ، و(پکین)دا هەبو پێش سەرکەوتنی نیشتمانیەکانی خوارووو لە ساڵی ١٩٣١ز. وە حوکومەتانی (ژاپۆن) دەستیان کرد بەجێبەجێ‌کردنی سیاستێکی دوژمنانە لە (منشوریا)دا لەوانەیە هۆی ئەمە ئەوکێشە ئابوریە توندوتیژەبوو بێت کەژاپۆنی ناچارکرد ، تاکو لەدەرەوەدا شتێك پێك بێنی کە سەرنجی میللدتی پێ راکێشیت ، وبی‌خافلێنی لە وتەنك چەلەمەیەی کە لەناوەوەدا هەیە رەنگە هۆکە دەسەلاتی سوپاییەکان بوبێت بەسەر حوکومەتەکەدا ، وەیان حوکومەتی ژاپون هەستی کردوە کەدەولەتەکانی‌تر خەریکی کێشە ، و وتەنك و چەلەمە ئابوریەکانی خۆیانن ، نایان بەرزیت دەست تێخەنە ئەم کارەوە ، دیسانەوە ئەم هەمو هۆیانە تێکرا پێکەوە باڵیان نابێت بە حوکومەتی ژاپۆنەوە کە ئەم جۆرە هەنگاوە بەجەرگە بنێت چونکە بەراستی سەرپێچی‌یەکە لە پەیماننامەکەی کەوا نۆدەولەتەکە لە ساڵی ١٩٢٢ز. دا ئیمزاکرا. هەروها سەرپێچیشە لەبروانامەی (میثاق) کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم) چونکە (چین) و ژاپۆن هەردوکیان ئەندام بوون لەکۆمەلەکەدا لەبەر ئەمە هیچ کامێکیان ، ناتوانێت پەلاماری ئەوی‌تر بدات لەپێش ئەوەدا کە کۆمەلەکە ئاگادار نەکرێت. دیسانەوە سەرپێچی‌یە لە بروانامەی (پاریس) کە لە ساڵی ١٩٢٨ز. دا بەسترا کە جەنگی قەدەغەکرد ، بە مە ژاپون هەمو پەیمان و بەڵێنەکانی نەهێنایە دی ، بەلکو سەرپێچی جیهانی

کرد بە کرداری جەنگ ئامێزیانەی دژی (چین).

دیارە ژاپۆنیەکان دانیان بەمەدا نەنا ، بەلکو بە هانەیەکی پووچیان هێنایەوە ، ووتیان گوایا چەتەکان لە (منشوریا)دا هەرەشە لەبەرژەوەندیان دەکەن ، ئەمە ناچاری کردون هێزەکانیان بنێرن بۆ ئەوی ، تاکو ئاسایش و رژێم و بەرژەوەندیان بپارێزن ، هەرچەندە ژاپۆنیەکان ئیعلانی جەنگیان نەکرد بو بەلام دەستی‌یان بە داگیرکردنی (منشوریا) کرد میللەتی (چین) تورەبو ، حوکومەتەکەی بێزاری دەربری ، وەلای کۆمەلی میللەتان و دەولەتانی شکاتی‌کرد بەلام کەس گوێی نەدایە و بایەخی پێ نەدا ، هەمو دەولەتێك کێشەی تایبەتی زۆری خۆیی هەبو ، هیچیان نەیان ویست دوژمنایەتی ژاپون بکا بەسەرباری کێشەکانی خۆی ، زۆر دەگونجێ هەندی لەدەولەتەکان بەتایبەتی ئینگلتەرە لەژێرەوە لەگەل ژاپوندا لەم ئیشەدا رێك کەوتێت ، خەلکی (چین) بەرهەلستیەکی بەتینی ژاپونیان کرد لە (منشوریا)دا ، لەگەل ئەمەشدا دەبون لەنێوان هەردو ولاتەکەدا هیچ جەنگێك نەبوایە لە (چین) دا بزوتنەوەیەکی گەورە بەرپابو بو نەکرین و موقاتەعەکردنی کەل ، وپەلی ژاپون ئەمە گەورەترین چەك بو بەدەستی (چین) ەوە.

لە کانونی دوەمی (ینایر) ١٩٣٣ز. دا لە (شانغهای) لە خاکی (جین)دا (ژاپون) دا بەزی کوشتارێکی کرد کەبەناشیرین ترین رووداو دادەنرێت لە سەردەمەکانی نوێدا. لەشکرەکەی ژاپون لە گەرەکی بێگانەکان دورکەوتەوە ، نەوەك دەولەتە رۆژئاواپیەکان بۆروژینی ، تورەیان بکات. هێرشەکەیی ، ئاراستی گەرەکی نیشتمانیەکان کردەوە ، لەنزیك (شنغهای) ەوە ناوچەیەکی فراوان هەیە (وابزانم پێی‌دەلێن شایی) ئەم ناوچەیە بۆمباباران ، وبەتەواوی وێران کرا ، بەهەزاران لە دانیشوانی کوژران ، وە گەلێکی‌تریان بێ‌لانەمانەوە ، لە بیرت نەچێت ئەم هێرشە بەرامبەر لەشکرو سوپانەبو ، بەلکو بەرامبەر دانیشتوە بەسەزمانەکان بو. سەرکردە دەریاییەکەی (امیرال) ژاپون کە سەرکردەی ئەم کردەوە ئازایا نەبەبو! کە پرسیاریان لێ‌کرد وتی: ژاپون بریاری داوە لەبەر بەرەحمی و بەزەیی "ئەدها دوو رۆژی‌تریش لەسەر بۆمبا بارانی شارستانیەکان بەبێ‌جیاوازی بەردەوام بێت" ئەم قەسابیە ئەوەندە توندوتیژبو ، یەکێك لەوانەی کە لە

رۆژنامەی تایمسی (لندن) یدا دەنوسن لە (شنغهای) دا وەلایەنگری زایونیەکانیشی بوو باسیکردو ، ووتی: "ئەمە کوشتارێکی سەرجەمە" کە لەش کرژ دەکات ئنجا بیرکەوەوە کە هەستی خەلکی (چین) چون بوە ، شەپۆلێکی ترس ، وتورەبون سەرتاپای (چین)ی گرتەوە لە (چین) دا بازرگانانی چەنك ناکۆکیەکانیان لەگەل حوکومەتەکەدا لەبیرچوەوە ، وەیا بەروالەت خۆیان واپیشان دا کە وا لەبیریان چوتەوە ئنجا کە ئەم داگیرکردنە درندانەیەیان لەلایەن بێگانەوە چاوپێکەوت ، ئیتر دەستیان کرد بە باسکردنی بەرەیەکی یەکگرتو دژی (ژابون) ، تەنانەت حوکومەتە شیوعیەکەی ناوەوەی (چین) خزمەت گوزاری خۆیی پێشکەش حوکومەتەکەی (نانکین) کرد ، بەلام لەگەل ئەمەشدا ئای چەند سەیرە حوکومەتەکەی (نانکین) وەیا راستیەکەی سەرۆکەکەی (شیان کای شیك) نەجولاکە (شنغهای) بپارێزێت دژی هێزەکانی (ژابون) کە بەرەوپێشەوە ، دەچون ، هەمو ئیشێکی حوکومەتەکەی (نانکین) ئەوە بو کەبێزاریەکی دابەکۆمەلی میللەتان ، وە هەرگیز هەولی نەدا کە بەرەیەکی یەککگرتوریکخات بۆ بەرەنگار بوونی (ژابون)یەکان ، دادیار بو کە حەزی بە بەرەنگارکردن ، و بەرهەلستی کردن نەدەکرد سەرەرای ئەو هەمو گفتەی کەدەی دا لەگەل رق وقین کە میللەتی گرتبوەوە.

ئنجا لەشکرێك بەرەو (شنغهای) کەوتەری پیان دەوت لەشکری ریگای نۆزدەهەم ئەم لەشکرە لە خەلکی (کانتون) پێك هاتبو ، نە لەژێر دەسەلاتی حوکومەتی (نانکین) نە لەژێر دەسەلاتی حوکومەتی (کانتون) دا نەبو ، لەشکرێکی هەژار بو ، چەك وجبەخانەی کەم بو ، تۆپی زلیشی نەبو سەربازەکانی بەرگیان لەیەك رەنگ نەبوو ، ئەوەندەشیان جل و بەرگ نەبو کە لەسەر ما و سولەی (چین) بیان پارێزیت ، تەمەنی زۆربەی سەربازەکانی لە بەینی چواردە سال شانزە سالدا بو ، تیایاندا بو تەمەنی دوانزە سال بو ، ئەم لەشکرە بریاریدا کە بەربەستی لەشکری زایونیەکان بکات ، وە لەسنوری خۆیاندا بیان وەستێنێت ، بەمە سەرپێچیان لە فەرمانەکانی (شیان کای شیك) کرد ، ماوەی دو حەفتە بەکژ زایونیەکاندا چون لە کانونی دووەم و شوباتی سالی ١٩٣٢ز. دا شەرێکی سەختیان کرد ،

بۆ ئەوەی لە حوکومەتی (نانکین)ەوە هیچ یارمەتیە کیان بگاتێ ، لە شەرکردنیاندا ئازایەتی ، و قارەمانیەتیەکی بێ ئەندازەیان نواند ، بەکردار ، و لەراستیدا توانیان پێشکەوتنی زایونیکان راوەستێنن کەوا تازەترین چەك و جبەخانەیان پێبو ، هەمو کەسێك چ زایونیەکان ، وە چ هی تر تەنانەت (چین)یەکان خۆیشیان لەم سەرکەوتنە سەرسام بونی ، دوای دو حەفتە لە شەرکردندا بێ ئەوەی لەشکرە هیچ یارمەتیەك بدرێت لە سوپاس وستایش بەولاوە! ئنجا (شیان کای شیك) لوتفی کرد و چەند فیرقە و پەلیکی خۆیی نارد بۆ یارمەتی دانیان لەپاراستنی ولاتەکەدا.

لەشکری رێگای نۆزدەهەم مێژووی بەخوێنی خۆی نوسی ، لە هەمو جیهاندا ناوبانگی پەیداکرد ، ئەو ئازایەتیەی کەنواندی ، هەمو توخشەی زایونیەکانی سەرەو ژێر هەڵگیرایەوە ، ئیتر ژابون ناچاربو ، کە هێزەکانی خۆی لە (شنغهای) بە هێواشی بکێشێتەوە ، دوای ئەوەی لە دی دەولەتە رۆژئاواییەکانی تر زۆر بە پەرۆشەوە بەرژەوەندیەکانیان لەوێدا دەپارێزن ئەوی شایانی تێبینی‌یە لەم رووەوە ئەوان بەرژەوەندی پارە و دارایی خۆیانیان گەلێك لاگرنگ تر بوو لە کوشتارە سامناکەکان وەکو کوشتارەکەی(شایی)کە بەهەزاران کەس بوون بەقوربانی هەروها بەرژەوەندی پارە و دارایی خۆیانیان گەلێك لاگرنگ تربو ، لەپاشگەز بونەوەی ژابون لە بەڵێن ، و بروانامە ، و پەیمانامەکان.

بەڵام کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) بەهانەی دەهێنایەوە بۆ دواخستنی باسکردنی کێشەکە ، چونکە بوونی جەنگێکی راستەقینە ، و کوشتنی هەزاران کارێکی گرنگ وبەپەلە نەبو لای کۆمەڵەکە ، دەیان ووت هیچ جەنگێك لەوێدا نی‌یە چونکە بە جۆرێکی رەسمی ئیعلان نەکراوە ئەم هەڵوێستەی کە کۆمەڵەکە گرتی ، کۆمەڵەکەی زۆر لاوازکرد ، لێ پرسینی ئەمەش و ئوبالی دەکەوێتە سەرشانی دەولەتە گەورەکان بەتایبەتی ئینگلتەرە کەوا پشتیوانی ژابۆنی دەکرد لەدالانەکانی کۆمەڵەکەدا ، ئنجا دوای ماوەیەکی زۆر کۆمەڵەکە لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی دانا بۆ مەسەلەکەی (منشوریا) بەسەرۆکایەتی لورد (یتون) دەولەتەکان رازی بوون بە دانانی ئەم لیژنەیە چونکە ئەمە وادەگەیەنێت چەند مانگێکی کە بریاردان دواکەوێت ، لەبەر ئەوەی (منشوریا) ولاتێکی دورە چون بۆ ئەوێ وەختێکی

دورو درێژی دەوێت ، لەوانەیە لەم ناوەیەدا مەسەکە گربێتەوە و نەبینی ئیتر ئاسودەیان دەکات.

ژاپۆنیەکان لە (شنغهای)دا کشانەوە بەڵام بایەخیان بە (منشوریا)دا، هەر بەناو حوکومەتیکیان تێدادانا ، وەبڵاویان کردەوە کە (منشوریا) مافی خۆیی لە چارەنوسی خۆیدا بەکارهێناوە ، بەم حوکومەتە دەوترا حوکومەتی (منشوکو) ، مەلیکێکیان بۆ دانا لە بنەچەی "مانشو" کەوا کون لە "چین"دا حوکوم فەرمابون ، ئەمەیان بۆ چاو وراوکرد چونکە لە راستیدا ژاپۆنیەکان خویان حوکومرانیان دەکرد ، هەمو کەسێك دەیزانی کە ئەگەر سوپای ژاپون بکشێتەوە حوکومەتەکەی (منشوکو) رۆژی ئاینده دەروخێت.

ژاپۆنیەکان رێبازیان لەبەرەو(منشوریا) بە گوڵ و رەیحانەدا نەچەنرابو بەلکو پێشمەرگە (چین)یەکان بەردەوام بون لە شەرکردن لەگەلیاندا ، ژاپۆنیەکان بەم تێکۆشەرانە یان دەوت "چەتەکان". ئنجا ژاپۆنیەکان دەستیان کرد بەراهێنان و مەشق کردن بە سوپایەکی ناوخو ، بۆ حوکومەتی (منشوکو)کە لە خەلکی (چین) پێك هاتبو ، ئیتر ئەم لەشکرە ، هەر کەراهێنان و مەشقی تەواو دەکرد ، وچەکیان دەدرایە ، ودەنێرران بۆ شەر کردن لەگەل "چەتەکاندا" پشتیان لە حوکومەتی (منشوکو) دەکرد بە هەمو چەکە نوی کانیانەوە ، دەچونە پال ئەم چەتانە. (منشوریا) بە هۆی شەر و شۆری هەمیشە ییەوە زۆرویران بو ، بازرگانی دانەوێلەی (فول الصویا) کە لەوێ بەناوبانگە توشی بێبازاری بو.

دوای چەند مانگێك کە لیژنەی (یتون) لە لیکۆڵینەوەدا بەسەری برد ، راپۆرتەکەیی پێشکەش کۆمەڵی میللەتان کرد ، راپۆرتێکی مام ناوەندی ، زویرانەبو ، زۆر بەوردی ئامادە کرابو دەیەویست ژاپون بپارێزێت. ئنجا باسکردنی ئەم مەسەلەیە چەند مانگێکی کە دواخرا بە پێچەوانەی ئینگلتەرەوە ، ئەمەریکا بەرهەڵستی ژاپۆنی دەکرد ، بڵاوی کردەوە دان بە هیچ بارو ، وەزعێکدا نانێت کە ژاپون بە زۆر بیسەپێنی بەسەر (منشوریا) و هەر لایەکی تردا ، سەرەرای ئەم هەلوێستە بە هێزەی ئەمەریکا ، کەچی ئینگلتەرە هەریشتی ژاپۆنی دەگرت ، لەمەدا فەرەنسە ، و ئیتالیا ، و ئەلمانیا یارمەتیان دەدا.

کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) بە هەمو توانایەکیەوە هەوڵی دەدا کە هیچ بریارێك نەدرێت ژاپۆنیش بەئیشێکی تازە هەڵسا: لە یەکەم رۆژی ساڵی ١٩٣٣ز. دا لەشکری ژاپۆن لەناکاو چوە خاکی (چین) ەوە پەلاماری شاری "شانهیك وان" دا کە دەکەوێتە لای شورەمەزنەکەی (چین) بەروکاری (چین)دا ئەم هێرشە بەتۆپی قورس ، بۆ مباباران بو ، لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا "شانهیك وان" بۆ بەپارچەیەك دوکەل ، دانیشتوە شارستانیەکانی کوژران ، لەشکری ژاپۆن لەناوچەی (جیهول)دا بەرەوپێشەوە چو نزیك (بکین) بوەوە ، بیانوی ئەم هێرشەی ژاپۆن ئەوەبو کە: "چەتەکان" (جیهول) بەکاردێنن و کردویانە بە بنکەی پەلاماردانیان بۆ سەر(منشوکو) هەر چونێك بێت دەبێ "جیهول" بە بەشێك لە(منشوکو) دابنێین!!

ئەم دەست دریژیە تازەیە کۆمەلەکەی (عصبە الامم) لە خەو خەبەر کردەوە ، وە لەسەر داخوازی دەولەتە بچکۆلەکان و رازی بون بە راپۆرتەکەی (یتون) بریاری تاوانباری (ژاپون) یان دا ، بەڵام ژاپون زۆر گوێی نەدایە (چونکە دەیزانی کە دەولەتە گەورەکان و ئینگلتەرە لەژێرەود و بە نەهێنی پشتی دەگرێت). ژاپون لە کۆمەلەکە هاتەدەرەوە ، وبەردەوام بو لەبەرەو پێش چون بو (بکین) بەرنگاربونێکی وای توش نەهات کە شایانی باسکردن بێت ، ئیتر لەشکرەکانی ژاپون نزیك بوەوە لە دەروازەکانی (بکین) ، لە مایسی ١٩٣٣ دا ئیعلانی شەر وەستاندن کرا لە نێوان ژاپون و (جین) دا ، ئەمە سەرکەوتنێك بو بۆ ژاپون لەبەر ئەمە شتێکی سەیر نەبو کە حوکومەتی (نانکین) لەگەل (کومنتانك) دا بە جووت پشتیوانی میللەتیان لەکیس بچێت دوای ئەوەی میللەت بە چاوی خۆی دی کە چەندە بەرهەڵستی وبەرەنگاری دەست درێژی ژاپۆنیان کردوە!

گەلێك باسی مەسەلەکەی (منشوریا)م کرد چونکە گرنگە ، و کار لە پاشەرۆژی (چین) دەکات ، وە لەمەش گرنگتر کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) ئیسپاتی بو دەلەیی ، وسەرنەکەوتنی خۆیی کرد بەرامبەر هەڵەکانی کە دەولەتەکان دەیان کرد ، هەروها ئیسپاتی درو ، ودەلەسەی دەولەتە گەورەکانی ئەوروپاو ، دەغەلیانی کرد ، ئیتر لەم کێشەیەدا ئەمەریکا (گەر چی ئەندامیش نەبو لەکۆمەڵەکەدا) هەلوێستێکی توندی گرت دژی ژاپۆن ، ئەوەندەی نەما بو ، لەگەڵیدا توشی شەر بێت ، بەلام ئەو

پشتیوانی‌یە نەهێنی‌یەی کە ئینگلتەرە و دەولەتەکانی تر ، هی ژاپۆنیان کرد ، لە گرنگی هەڵوێستی ئەمەریکای کەم کردەوە ، ئنجا ئەم کە هەستی کرد خەریکە لە دەولەتەکانی تر جیابێتەوە ، و بە تەنیا بمێنێتەوە لە جاران زۆر وریاتر بوەوە. ئیتر کۆمەلەکە بەبریارەکەی ژاپۆنی تاوانبار کرد ئیتر دوابە دوای ئەمە کۆمەلەکە هیچ ئیشێکی بە کەلکی نەکرد ، راستە ئاگاداری دەولەتە ئەندامەکانی کرد کەدان نەنێن بە حوکومەتی (منشوکو) دا بەڵام ئەمە هەرگیز هیچ کاری لەبارو ، وەزعەکە نەکرد وە هیچ ئەنجامێکی نەبو.

جگە لەوەی کە کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) ژاپۆنیان تاوانبار کرد بەڵام وەزیرو باڵیۆزەکانی بەریتانیا سوربون لەسەر هێنا نەوەی بەهانە بو کردەوەکانی ژاپۆن. لە نیسان ١٩٣٣ز. دا چەند ئەندازیارێکی ئینگلیز لە روسیادا بەتاوانی جاسوسی کردن حوکوم دران ، هەندێکیان بێ تاوان دەرچون وهیچیان بەسەردا ئیسپات نەبو ، وە دوانیشیان بە گرتنێکی سوک حوکوم دران ، ئیتر ئینگلتەرە وروژا ، و جیهانی خرۆشاند ، خێرا بریاری قەدەغەکردنی کەل ، و پەلی روسی کرد بۆ بەریتانیا ـ وەروسەکانیش بەرپەرچی ئەمەیان دایەوە کەوا نەیان هێشت کەل و پەلی بەریتانیا بچێتە روسیاوە (١).

بەم پێیە (چین) (منشوریا) و گەلێکی تری لەکیس چو ، ژاپۆنیش لە هەرەشە کردن لە بەشەکانی تری ولاتەکە کە مایوەوە بەردەوام بو ، (تبت) ولاتێکی سەربەخو بو. (منغولیا) ولاتێکی سوڤێتی‌یە لەگەل یەکێتی سۆڤیت دا هاوپەیمانە ، هەروها (چین) توشی گەلێك کێشەی تربو لە (سینکیانك) وە یاتورکستانی چینی کە کەوتۆتە نێوان (تبت) و سیبریاوە ، کاروان بە جۆرێکی رێك وپێك لە (سرنغار) لە کشمیردا دەچێت بۆ (یرقند) و (کشغر) لەم ناوچانەدا لەرێی (لە)ەوە لە (لوخ) دا ، دانیشتوانی ئەم ناوچانە تورك و موسلمانن ئەمانە لەدەم وچاو ، وشێوە ، ورۆشنبیریاندا تەنانەت لە ناوەکانیاندا (چین)ین ، بەڵام زۆر دورن لەناو جەرگەی (چین)ەوە ، وە بیابانی (جوبی) لە (چین) یان جیادەکاتەوە ، بەلام رێگە وبان ئەو پەری سەرەتایی ، وساکارە ، ئەو پەیوەندایەنیەی کە بە

(چین) یانەوە دەبەستێت بە هێز نییە هەمیشە تاسەی نەتەوایەتی تورکی دەکەن ، ئەم ناوچەیە هەر لە سەرەتای جەنگە جیهانیەکەوە مەڵبەندی دەسیسە ، موئامەرەی نێو دەولەتان بۆ ، هەریەکە لە ئینگلتەرە ، و روسیا ژاپۆن جاسوسیان بەسەریەکتریەوە دەکرد بەلام هەمویشیان جاسوسیان بەسەر حوکومەتی (چین) ەوە دەکرد ، وە یارمەتی پێشەوا ناوخۆییە کانیان دەدا لە شەر وناکۆکیان دا دژی یەکتری.

لە سەرەتاکانی سالی ١٩٣٣ز.دا شۆرشێکی تورکی لە (سنکیانك) دا تەقیەوە شۆرشگێرە کان (یرقند) و (کشغریان) داگیرکرد و ئیعلانی جمهوریەتێکی سەربەستیان کرد ، بەریتانیاییەکان لەمەدا سوفیتیان تاوانبار کرد کە گوایا ئەمان پشتیوانی شۆرشە کە بون ، بەلام سوڤێت بە ئاشکرا بەریتانیاییەکانیان تاوانبار کردەوە کەئەمان خەلکیان هانداوە بۆ شۆرش بەمەبەسی دروست کردنی دەولەتێك کە (چین) لە روسیا جیاکاتەوە وەکو دەولەتی(منشوکو) وەناوی ئەو ئەفسەرە بەریتانیاییەکان هێنا کەوا شۆرشەکەی لە (سینکیانك)داساز کرد بو.

ترێبینی:ـ لایەنگرانی حوکومەتی چین توانیان بەیارمەتی حوکومەتی سۆڤیت ، جۆرێکی غەیرە رەسمی ئەم شۆرشە سەرکوت کەن بەمە ناوبانگی حوکومەتی سۆڤیت لەناوەراستی ئاسیادا بەتەوبو ، بەلام ئەوەندە ناویئینگلیزەکان زرا.

---

١) ئەم جەنگە بازرگانییە لە نێوان ئینگلتەرە و روسیادا بەرێکەوتنی [illegible] دو ولاتەکە کۆتایی هات.

# یەکێتی جمهوریەتە سۆشیالیستەکانی سۆڤێت

## ٧/یولیو/١٩٣٣

ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ روسیا ، خاکی سۆڤیت ئنجا لەکوێدا چیرۆکەکەیمان جێ هێشت دەستی پێبکەینەوە ، لەسەری بڕۆین ، گەیشتینە کانونی دوەمی ١٩٢٣ز. کە (لینین) ی سەرکردەی شۆڕشەکە ، و پەیام هێنەرەکەی مرد ، لەگەڵێك لەنامەکانمدا کە بۆم ناردبویت دەربارەی ولاتانی تر ، باسی روسیام تێداکرد بو ، ئیتر کە سەیری کێشەکانی ئەوروپا ، و مەسەلەی سنوری هیندستان ، وەیا ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست ، یان تورکیا ، و ئیران و چین و ژاپون لە رۆژهەلاتی دوردا دەکەین ، بێگومان دەبێ ناوی روسیا بێتە کایەوە ، گومانی تێدانی یە ئێستا ئاشکرایە لات کە هەرگیز راست نی یە سیاسەت لە ئابوری جیاکرێتەوە، لە هیچ دەوڵەتێك لەدەوڵەتەکاندا. بەرژەوەندی دەولەتەکان لەم سالانەی دواییدا بەرادەیەك تێك ئالاوە کە جیهان بوە بەهیەك پارچە ، سەربارەت بەمە مێژوو بوە بە مێژووی دەولەتان ، ئیتر ناتوانین لە هیچ میللەتێك بگەین بەبێ ئەوەی کە لەهەمان کاندا سەیری مێژووی جیهان نەکەین.

یەکێتی سۆڤیت پانتاییەکی پان وبەرینە لە زەوی ، لە نێوان ئەوروپا و ئاسیادا درێژ بوتەوە ، سەرەرای ئەوەی کە جیایە لە جیهانی سەرمایەداری ، بەلام پەیوەندایەتی سۆڤیت لەگەلیاندا ، چ چاك چ خراپ بەردەوامە. کچم لە نامەکانی پێشومدا دەربارەی سیاسەتە دڵ فراوانەکەی کە یەکێتی سوفیت لەسەری دەرویشت لەگەل دەولەتە رۆژهەلاتیەکاندا ، وە ئەو یارمەتیەی کەوا پێشکەشی تورکیا ، وئێران ، وئەفغانستانی کرد ، وە لەبابەت پەیوەندایەتیە زۆر دوستانەکەی لەگەل (چین) دا کەوا لە دواییدانەما باسم بۆ کردیت ، هەروها دیسانەوە دەربارەی هێرشەکەی ، کە

کرایە سەر بنکەی بازرگانی کای روسی لە (ارکوس) لە ئینگلتەرەدا ، ود لەبابەت نامەکەی(زینوقیف) کە ئیسپات بو ساختدیە ، ئەمانەم بۆ گێڕایتەوە ، لەگەل ئەمەشدا ئەمە کاری کردە هەڵبژاردنە گشتیەکانی بەریتانیا ، ئیستا دەمەوێت باسی خاکی سۆڤیت خۆێت بۆ بکەم ، تاکو ، پێگەیشتن ، وپەرەسەندنی یەکەم تەجروبەی سەرسام هێنەری سوشیالیستی ببینیت.

چوار ساڵی یەکەم بە سەرشۆرشەکەدا تیپەری لە ساڵی ١٩١٧ وە تا ١٩٢١ ، لە شەرو شۆڕیکی بەردەوامدا بۆ پاراستنی شۆرشەکە لە خراپەی دوژمنەکانی ، ئەم ساڵانە پربو لەکوشتارو برسێتی و مردن ، لەم کاتەدا جوش و خرۆشی جەماوەر ، و قارەمانێتی لەبەرگری کردن لەبیروباوەرە بەرزەکانی کە هەیەتی دەرکەوت ، جەماوەر لەم کوشتارە راستەوخۆ سودمەندنەبو ، بەلکو هیوا و ، ئاواتێکی زلّ ، وای لیکردبو هەمو ئیش و ئازار وبرسێتی‌یەکەیی لەبیر بچێتەوە ، بەم ماوەیەیان دەوت: "شیوعیتی سوپایی".

کە لە ساڵی ١٩٢١ز.دا (لینین) کە سیاسەتە ئابوریە نوێکەی گرت ، ماوەیەکی کورت لە خۆش گوزەرانی پەیدابو ، ئەم سیاسەتەش بریتی بو لەپاشگەزبونەوە لە شیوعیتی ، وەیان قایل بون بەجێ بەجێ کردنێکی مام ناوەندیانە لە پێناوی رازی کردنی بورجوازیەکان لە ولاتدا ، ئەمەش واناگەیەنێت ، کە پێشەوایانی بو لشەفیکەکان ئامانجەکانی خۆیانیان گوریوە بەلکو ئەمەمانای وایە هەنگاوێك کشاونەتەوە بو دواوە تاکو پشوو بدەن ، ئنجا بتوانن چەند هەنگاوێکی کە بچنە پێشەوە. لەپاشدا سۆڤیت بریاریان دا ولاتەکەیان سەر لە نوێ دروست کەنەوە ، دوای ئەوە کە زۆربەی وێران و کاول بوبو ، وە بو ئەوەی ولاتەکەیان دروست کەنەوە ، پێویستیان بە ئامیر (آلات) ودەزگای وەکو هیلی ئاسنینی شەمەندەفەر ، وگالیسکە وئوتومولبلی لۆری ، تراکتور وپێداویستیەکانی کارگەکان هەبو ، دەبو ئەم شتانەیان لە دەرەوە بکریایە ، بەلام پارەو دارایی تەواویان نەبو لەبەر ئەمە هەولیان دا ئەم شتانە بەقەرز بکرن ، ئامێریان (الآلة) دەکری ئنجا نرخەکەی وردە وردە بەقیست لە دوایـیـدا دەیان دا ، بەلام ئەو دەولەتەی کە قەرز دەکات دەبێت پەیوەندایەتی باش بێت لەگەل ئەو

دەولەتانەدا کە قەرز دەدەن ، لەبەر ئەمە یەکێتی سۆڤیت هەمو قەلاکانی خۆی بەرەو روو ی ئەوە کردەوەکە ، دەولەتە گەورەکان دانی پێدا بنێن ، وەپەیوەندایەتی بازرگانیان لەگەلدا ببەستێت ، بەلام دەولەتە ئیستیعماریە گەورەکان بو لشەفیکەکانیان خۆش نەدەویست ، و حەزیان لە هەمو کردارەکانیان نەدەکرد ، هەروەکو بەتایەك (وباء) تەماشای شیوعیتی یان دەکرد ، کە دەبێت بفەوتێنرێت! هەرچەندە لە جەنگی دەست خستنە ناوەوەدا بەکردەوە هەولیان دا بیفەوتێنن کەچی سەرنەکەوتن ، وە وایان بە چاك دەزانی کە لەگەل یەکێتی سۆڤیندا هیچ پەیوەنداتیەکیان نەبێت باشە بەلام هەرگیز نابێت کە بایەخ بە حوکومەتێك نەدرێت کە شەش یەکی پانتایی جیهانی گرتوتەوە.هەروها ندیان دەتوانی گوی لەدەنە کریارێك کە ئامادەیە میقدارێکی زۆر لەئامێرە بەنرخەکان بکرێت ، ئیتر بازرگانی لەگەل ولاتێکی بەکشت وکالٚ دا وەکو روسیا ، لەگەل ولاتە پیشەسازەکانی وەکو ئەلمانیا ، و ئینگلتەرە ، و ئەمەریکادا سودی هەردو لای تێدایە چونکە روسیا ئامێرەکانی (الآلات) دەوێت ، وەردەگرێت ، ئنجا لەبەر ی ئەم ئازوقە و خواردەمەنی ، و کەرەسە (المواد الخام) پێشکەش دەکات.

وادیار بو شەیدابون بو پارە و مالٚ لە دلٚ و دەرونی دەولەتەکاندا بە هێزتر بو ، لەنەویستن ، و حەز نەکردن بە شیوعیتی ، بۆیە زۆربەی دەولەتەکان دانیان بدیەکێتی سۆڤیتدانا ، جگە لە ئەمەریکا کەنەیویست دانی پێدابنێت ، سەرەرای ئەوەی کە پەیوەندایەتی بازرگانیشی هەبو لەگەلیدا. (١)

بەم جۆرە یەکێتی سۆڤیت پەیوەندایەتی لەگەل زۆربەی دەولەتە سەرمایەدارەکان ، و ئیستیعماریەکاندا بەست ، وەتوانی لەبەربەرەکانی و ناکۆکی نێوان ئەم دەولەتانە سود وەرگرێت هەروەکو سالی ١٩٢٢ لەگەل ئەلمانیادا کە شکابو لەجەنگەکەدا کردی ، بەلام ئەم پەیوەندایەتیانە پچرپچربو ، چونکە جیاوازیەکی بنەرەتی ، و جەوهەری لە نێوان رژێمی سەرمایەداری و شیوعیتیدا هەیە ، بولشەفیکەکان هەمیشە میللەتە کەساس و چەوساوەکانیان هان دەدا کە زالم و چەوسینەرەوەکانیان تێك شکێنن. چ لە موستەعمەرەکان ، وەیا لە کارگەکاندا بێت ، دیارە بە جۆرێکی رەسمی بەم هاندانە هەلٚ نەدەستان بەلکو لە رێی (کومنترن) وە یاشیوعیتی نێو

دەولەتانەوە. لەلایەکی تریشەوە ، دەولەتە ئیستیعماریەکان بەتایبەتی ئینگلتەرە بەردەوام بون لەدروست کردنی دەسیسە و ، دەغەلی و موئامەرەدا دژی سۆڤیت ، لەبەر ئەمە دەبوایە کێشە و ناخۆشی پەیدا ببوایە ، چارندبو کە زۆرانبازی ، وناکۆکی بەردەوام بو ، ئنجا ئەمە دەبو بەهۆی ئەوەی کەوا گەلێك جار پەیوەندایەتی دیبلوماسی دەپچڕا ، کچم لەبیرتە کە لە ئەنجامی هێرشەکەی سەر(ارکوس) لە ساڵی ١٩٢٧ز.دا ، پێم وتیت کە پەیوەندایەتیەکانی لەگەڵ ئینگلتەرەدا پچڕا. دەتوانین لەنەهێنی ئەم ناکۆکی ، و بەکژ چونەدا تێبگەین. ئەگەر بیرکەینەوە کە ئینگلتەرە گەورەترین دەولەتی ئیستیعماریە ، وەیەکێتی سۆڤیتیش نوێنەری بیروباوەرێکە کە دەیەوێت خودی ئیستیعمار بفەوتێنێت. لەوانەیە جگە لەوە کەوتمان گەلێك شتی تریش هەبێت لە نێوان ئەم دوو دەولەتەدا ، چونکە دوژمنایەتی و ناکۆکی لە کۆنەوە لە نێوانیاندا هەبوە ، لە روسیای قەیسەری ، و ئینگلتەرەی کۆنەوە بۆیان ماوەتەوە.

ئەو ترسەی لە ئینگلتەرە ، دەولەتە سەرمایەداریەکانی ترنیشتوە لە سوپای سۆڤێتی نیە بەڵکو لەشتێکی نەبەدیە (غیر ملموس) ئەمەش لەواقیعدا بە هێزترە لە سوپا ، وە کاریگەرتریشە کە ، بریتیە لەبیروباوەری سۆڤێتی ، و پروپاغەندەی شیوعیی. ئنجا بۆ بەربەست ونەهێشتنی ئەمە ، دەولەتە سەرمایەدارەکان گەورەترین پروپاغەندەی سەر لێشیواندنیان دژی روسیا کرد ، لەم رووەوە سەیر ترین چیرۆك ، ودورترین چیرۆك لەراستیەوە بلاویان دەکردەوە ، پیاوە سیاسیەکانی ئینگلیز ناشیرین ترین ناو وناتورەیان لەپێشەواکانی سۆڤیت دەنا ، مەگەر هەر دوژمن لە کاتی شەردا بەیەکتری بڵێت ، لورد (برکنهد) بەپیاوە سیاسیەکانی سۆڤیتی دەوت: "بەرەیەك لەپیاو کوژ" و ، تاقمێك لە بوقی ئاوساو" لە کاتێکدا کەدەبو پەیوەندایەتیەکی باشیان هەبوایە ، چونکە نوێنەرایەتی دیبلوماسیان لەنێواندا هەبوو ، لەم بارو ، زروفەدا لەنێوان سۆڤیت و دەولەتە ئیستیعماریەکاندا هەرگیز پەیوەندایەتیەکی باش حوکوم فەرمانابێت ناکۆکی لەنێوانیاندا سەرەکی و جەوهەوەریە ، لەوانەیە کەسەرکەوتوەکان لە جەنگدا لەگەڵ شکاو ، وبەزیوەکاندا رێك کەون ، بەلام ئەمە هەرگیز

ناگونجێت لەنێوان سەرمایە دارێتی ، وشیوعیتیدا ، خۆ ئەگەر رێك كەون تاماوەیەكە ، بێ كەم وزیاد لە هودنە ، راوەستاندنی شەروشۆر دەچێت.

یەكێك لە هۆی ناكۆكیەكانی روسیای سۆڤێتی ، و دەولەتە سەرمایەدارەكان ئەوەیەكە روسیا قەرزی دەولەتە بێگانەكانی لەغوكرد ، ونەیدایەوە ، ئەم كارە هەرچۆنێك بێت گرنك نیە چونكە ئەمرۆ هەمو دەولەتێك قەرزدارە، وەقەرزەكەشی ناداتەوە ، هەر چەندە ئەم كێشەیە ناوبەناو دێتەكایەوە، كە بولشەفیكەكان حوكومرانیان وەرگرت هەمو قەرزەكانی كە رژێمی قەیسەر لەدەرەوە كردبوی ئەمان نەیان دایەوە ، روسیا هەر لە یەكەم شۆرشە سەرنەكەوتوەكەی ساڵی ١٩٠٥ز. وە ، بریاری ئەم سیاسەتەی دابو ، بەپێی ئەم سیاسەتە روسیا لە قەرزەكانی خۆی خۆش بو كە لەسەر دەولەتەكانیتر هەیبو. هەروها وازی لە داخوازیەكانی پێشووی خۆی هێنا كە لە ولاتەرۆژهەلاتیەكانی وەكو (چین) هەیبو ، دیسانەوە داوای هیچ بەشێكی لەبژاردنەوەی ، زیان نەكرد كە لێی كەوتبو. هاوپەیمانەكان دەربارەی قەرزەكانیان لە ساڵی ١٩٢٣ ز دا ، یاد داشتێكیان دا بە سۆڤیت ، سۆڤیتیش وەلامی یادداشتەكەیانی دایەوە ، ئنجا بیری هاوپەیمانەكانی هێنایەوە كە گەلێك لە دەولەتە سەرمایەدارەكان خۆیان لەرابوردودا ، قەرزەكان وپێداویستیەكانی سەرشانی خۆیانیان لابردوە ، ولەغوكردوە ، وەماڵ وموڵكی بێگانەكانیان زەوت كردوە ، وەلەولامەكەدا هاتبو: "بەراستی ئەو حوكومەت ورژێمانەی كە لە شۆرشەوە پەیدابوبن ، مەجبور نین كە خۆیان ببەستنەوە بەپێداویستیەكانی سەرشانی حوكومەتەكانی پێشوەوە". حوكومەتی سۆڤیت بیری هاوپەیمانەكانی خستەوە كە یەكێكیان فەرەنسەیە بەش بەحالی خۆی جێكردوە لەكاتی شۆرشە مەزنەكەیدا؟ "ئەنجومەنی فەرەنسا كە خۆی بە میراتگری شەرعی حوكومەتی فەرەنسەدا دەبێت لە ٢٢ دیسەمبەری ١٧٩٢ز. دا بریاریدا". "كە دەسەلاتی میللەت نابێت ببەسترێتەوە بە پەیمانەكانەوە كە زۆردارەكان ئیمزایان كردوە" ئیتر بەپێی ئەم بریارەی فەرەنسەی شۆرش هەر بەشرو ، وركردنی پەیماننامە سیاسیەكانەوە نەوەستا كە حوكومەتەكانی پێشو لەگەل دەولە بێگانەكاندا بەستبویان ، بەلكو تەنانەت هەمو قەرزەكانی كە حوكومەتەكانی پێشو لە خەلیكان كردبو لەغویكرد ، ونەیهێشت".

سەرەرای ئەم هەمو هۆیانە کەبیانویەك بو ، بۆ هەڵویستی حوکومەتی سۆڤیت ، بەلام حوکومەتی سۆڤیت سوربو لە سەر ریکەوتن لەگەل دەولەتەکانی تردا تارادەیەك بە تەواوەتی ئامادەبو ، بۆ باسکردنی مەسەلەی قەرزەکان لەگەلیاندا ، بەڵام سۆڤیت دوو پاتیکردە وە کە مەسەلەی قەرزەکان دوای دان پێدانان بە سۆڤیتدا لەلایەن دەولەتەکانی ترەوە ، ئنجا پێویستە باس بکرێت ، بەراستی سۆڤیت بۆ ئینگلتەرە ، وفەرەنسە ، و ئەمەریکای دووبارەکردەوە کە غەرزەکان دەداتەوە ، وە پێویستیەکانی سەرشانی بەئەنجام دەگەیەنێت ، بەڵام حوکومەتە سەرمایەدارەکان حەزیان بە رێکەوتن نەدەکرد لەگەل روسیادا.

سۆڤیت داوایەکیان لە ئینگلتەرە هەبو بەرامبەر داوای ئینگلتەرە لە سۆڤیت. ئینگلتەرە داوای (٨٤٠) ملیون جونەیهی لە روسیادە کرد بە قەرز وقولەی جەنك و سەنەداتی هێلە ئاسنینەکان ، وپارە ، ومالەوە ، بەڵام سۆڤیت وتیان: بەریتانیا و سوپای بەریتانیا لەکاتی جەنگە ناوخوکەدا یارمەتی دوژمنانی سۆڤیتیان داوە ، کەوا بای (٠٤٠و٢٢٦و٦٧٠و٤) جونەیهی ئیسترلینی زیانیان پێگەیاندوە ، بەشیبەریتانیا لەم بارەیە (٠٠٠و٢) ملیون جونەیهە بەم جۆرە داواکەی سۆڤیت دوو ئەوەند ونیوی داوا ئەصلیەکەی بەریتانیا دەبو.

هەڵویستی سۆڤیت لەم رووەوە لاواز نەبو ، چونکە مەسەلەی گەشتیە جەنگیەکەی (ألباما)یان بە بەلکە هێنایەوەچیرۆکی ئەم کەشتیە جەنگیەش ئەوەیە: لە ئینگلتەرەدا دروست کرابو بوویلایەتەکانی خواروی ئەمەریکا لە کاتی جەنگە ناوخوییەکەی ئەمەریکادا. ئەم کەشتیە جەنگیە ، دوای ئەوەی جەنگە ناوخوییە کەدەستی پێکرد مینای (لیفربول)ی بەجێهێشت. زیانێکی زۆریدا لە بازرگانی ، و کەشتیەکانی ویلایەتەکانی سەروو. ئینگلتەرە و ئەمەریکا لە جەنك نزیك بوبونەوە ، حوکومەتی ولاتە یەککگرتوەکان ، لەمەدا ووتی: ئینگلتەرە بۆی نیە کە ئەم کەشتیە جەنگیە لەکاتی شەردا بنێریت بو ویلایەتەکانی خواروو ، وە داوای بژاردنەوەی ئەو زیانانەی کرد کە کەشتیە جەنگیەکە دابوی ، کێشەکە خرایە حوکوم بەسەرداندا (التحكيم) ئنجا ئینگلتەرە ناچاربو (١٦٦ر٢٢٩ر٢) جونەیهی ئیسترلینی بداتەوە بە حوکومەتی ولاتە یەککگرتوەکان.

خۆ ئەگەر بەراوردێکی یارمەتیەکەی ئینگلتەرە بکەین کە هی دوژمنەکانی روسیای داوە ، لە کاتی جەنگە ناوخۆییەکەندا ، دەبینین زیانیەکانی کەوا ئەم کەشتیە جەنگیە داوێتی و بای ئەوپارەیەیە کە باسکرا ، هەر هیچ نییە لە چاوزیانیەکانی کە ئینگلتەرە بە روسیای گەیاندوە ، سەر ژمێرێك کرا دەربارەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە کوژران لە کاتی جەنگی دەست خستنە ناو کاروباری روسیاوە ، دەرکەوت کە ملیونێك و سی صەد وپەنجا هەزار کەس کوژراون.

مەسەلەی کۆنە قەرزەکانی روسیا تۆزێك جێبەجێبو ، بەتێپەر بوونی
مەسەلەی کۆنە قەرزەکانی روسیا تۆزێك جێبەجێبو ، بەتێپەر بوونی
وەخت بەرەونەمان دەچێت. لە هەمان کاتدا دەبینین دەولەتە سەرمایەدارەکانی وەکو ئینگلتەرەو ، فەرەنسا ، وئەلمانیاو ، وئیتالیا ، هەر بەهەمان کردەوە هەڵساون کەوا ئێستا لەروسیا بەسەیری دەبینن ، و سەرسام دەبن لێی ، بەڵێ راستە ئەمان قەرزەکانیان لانەبردو ، لەغونەکرد وە سەرپێچیان لە رژێمی سەرمایەداری نەکرد ، وەکو روسیا کردی ، بەلام خۆ ئیتر قەرزەکانیان نەدایەوە.

سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیت لەگەل دەولەتەکانی تردا لەسەر ئاشتی بنیات نرابو بە هەج نرخێك بوایە ، چونکە ویستیان ماوەیەك پشوو ، ویاهەناسە یەك بدەن ئنجا خۆیان ئامادە کەن بۆ گەورەترین فرمان کە بنیات نانی بناغەی رژێمی سوشیالیستیە لە ولاتەکەدا ، و هەمو هۆش و کۆششێکی خۆیانیان بۆ تەرخان کردبو ، ئیتر کە لە ئاسووە پیشەنگەکانی شۆرشە سوشیالیستیەکان لە ناو ولاتانیتردا دەرنەکەوت ئنجابیروورای "شۆرشە جیهانیەکە" هاتە کزی وبوکانەوە ، روسیا پەیوەندی دوستایەتی و یارمەتی و یارمەتی لەگەل دەولەتە رۆژهەلاتیەکاندا بەست ، سەرەرای ئەوە کە ئەم دەولەتانە لەسەر رژێمی سەرمایەداری دەرویشتن ، باسی زنجیرەیەکم لەپەیماننامەکان بۆکردیت ، کە روسیالەگەل تورکیا ، ئێران ، و ئەفغانستاندا بەستی ئەم دەولەتانەش هیچ شتێك بێکیەوە نەبەستبون تەنها ترس ، وقین نەبێت کە لەدەولەتە ئیستیعماریەکانیان هەبو.

ئنجا کە (لینین) لە ساڵی ١٩٢١ز. دا دەستی کردبە سیاسەتە ئابوریە تازەکەی ، لەمەدا مەبەسی ئەوە بو کە چین فەلاحەمام ناوەندیەکان بێنێتە لای رێزی سوشیالیستی ، لەبەر ئەمە یارمەتی فەلاحە دەولەمەندەکانی

نەدەدا کەپێیان دەوتن: "کولاك" ئەمە وشەیەکی روسییە مانای (مشتیـك)ە چونکە ئەمانە سەرمایەداری بچکۆلەبون ، بەرهەڵستی سوشـیـالـیـسـتـیـان دەکرد ، لە پاشاندا (لینین) دەستی دایە بڕۆژەیەکـی مـەزن بـۆ ئـەوەی کارەبا بچێتە ناوچەی دێهاتەکانەوە ، مەکینە گەورەکانی کاردبای بۆ ئەم ئامانجە دامەزراند ، مەبەسی لەم بڕۆژەیە یارمەتـدانـی فـەلاحـەکـان ، و ئامادەکرنیان بو ، بۆ پیشەسازکردنی (التصنيع) ولاتەکە ، لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە فەلاحەکان بیرورایەکی (عقلیە) پیشەسازیان هەبێت ، ئەمـە لـە کارگەرانی شارەکان وەیا پرۆلیتاریابان نزیك دەکاتەوە ، ئەو فەلاحەی کەوا ماڵەکەی کارەبا روناکی کاتەوە تۆزی تەودرەلی ، وپرو پوچ (الخرافات) لە خۆی دەتەکێنی ، بیرکردنەوەیەکی تازەی دەبێت. هەمیشە لەنێوان شـار ، ولادێدا ، لەنیوان دانیشتوانی شارو دانیشتوانی لادیدا ناکـۆکـی هـەیـە. دانیشتوانی شار خواردەمەنی ، و کەرەسەیان (المواد الخـام) بـە هـەرزان دەوێت وە بەرهەمەکانی کە خۆیان دروستی دەکەن بەنرخێکی گرانـی دەدەن لەلایەکی تریشەوە ، دانیشتوانی لادێکان ئامـێـرو (الآلـة) و بـەرهـەمـی کارگەکانیان بە هەرزان دەوێت ، وە خواردەمەنی وئازوقە، و کەرەسە بەگران ، ئەم ناکۆکی وزۆرانبازیە لە روسیا لە ئەنجامی شـیـوعـیـتـی سوپاییدا چوار ساڵی خایاند ، بە هۆی ئەمەوەو ، لە پێناوی سوك کردنـی توندوتیژی ئەم ناکۆکی وزۆرانبازیە ، (لینین) دەستی کرد بەجـێـبـەجـێ کردنی سیاسەتە ئابوریە نوێکە هۆی پێویستی بۆ بەرهەم هێـنـان دا بـە فەلاحەکان تاکو بازرگانی تایبەتی بکەن.

(لینین) زۆر بایەخیدا بەبلاوکردنەوەی کارەبا لەولاتەکەدا تەنانەت موعادەلەیەکی بەکارهێنا ناوبانگی پەیداکرد کە بریتییە لە. "کـارەبـا + سوفیت = سوشیالیستی" تەنانەت دوای (لینین)یش ئەم پڕۆژەی کارەبـایـە هەنگاوی زل زلی دەنا ، ئنجا رێبازی دووەم کە کاری پیکردە فەلاحەکـان ، وهۆی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵیان باشتربو ، هێنانی تراکتوربـو ، بـو کێڵانی زەوی ، وئیشی تر ، لە کومپانیای (فورد) یان کری لە ئەمەریکا. لەدواییدا لەگەل ئەم کومپانیەیەدا رێکەوتن کە کارگەیەکی زل دانێـت بـۆ دروست کردنی ئوتوموبیل کەهەمو ساڵێك بتوانێت (١٠٠,٠٠٠) ئوتوموبـیـل

دروست بکات مەبەسی لەم کارکەیەش لە هەمو شتێك زیاتر ، دروست کردنی تراکتوربو.

مەسەلەیەکی تریش کە ناکۆکیەکەی نێوان سۆفیت و بەرژەوەندیەکانی بێگانەی زیاتر توند و تیژکرد ، بریتی بو لە بەرهەم هێنانی نەوت (پترول) و فرۆشتنی لە دەرەوە. (پترول) نەوتێکی زۆر هەیە لە ئازربایجان و جۆر جیاکە لە قەفقاسیادان ، لەوانەیە ئەم هەمو نەوتە بەشێك بێ لەو کۆمە گەورە نەوتەی کە لە ئێران و عێراقدا هەیە. شاری (باکو) لەسەر قەراغی دەریای (قزوین) هەڵبەندی سەرەکی پیشەسازی نەوتە لە خوارووی روسیادا. سۆفیت دەستیان کرد بەفرۆشتنی نەوتەکەیان لە دەرەوەدا بە نرخێکی هەرزانتر لە کۆمپانیەکانی نەوتی بێگانە و کۆمپانیەکانی (ستاندارد ئویل ئوف ئەمەریکا) و (ئەنکلوئیرانیان) و (شل) ئەمانە چەند کۆمپانیەیەکی زۆر بەهێزن ، وپیشەسازی نەوتی جیهانیان بەدەستەوەیە ، هەر کە ئەم کۆمپانیانە دیان سۆفیت نەوتەکەی خۆی بەنرخێکی هەرزانتردە فرۆشیت لەنەوتەکەی ئەوان ، زۆر زیانیان کرد ، و تورەبون ، هێرشێکی گەورەیان کردە سەرنەوتەکەی سۆفیت پێیان دەوت: "نەوتە دزراوەکە"چونکە بیری نەوتەکان لەقەفقاسدا ، سۆفیت لەخاوەنە سەرمایەدارەکانیی داگیرکردبو ، لە گەل ئەمەشدا دوای ماوەیەك ئەو کۆمپانیانە رێکەوتن لەگەل خاوەنی ئەم "نەوتە دزراوە".

لە رێبازی باسەکەمدا وشەی "سۆفیت" بەکاردێنم ، وهەندێ جاریش باسی "روسیا" دەکەم ئیتر منیش ئەم وەیائەو ، وشەیەم وابەوردی بەکار نەدەهێنا تاکو یەك ماناببەخشێت ، بەلام دەبینم پێویستە لەسەرم کە مانای ئەم دوو ، وشەیەت پێبلێم. جمهوریەتی سۆفیتی لە نوفەمبەری سالی ١٩١٧ دا ئیعلان کرا. هەر وەکو دەزانیێت لە "بطرس بورك" دا ئەنجامی شۆرشی بولشەفیکەکاندا. پێش ئەم جمهوریەتە ، ئیمپراتۆریەتی قەیسەر دەولەتێکی یەککگرتوونەبو ، ئەو روسیایەی کەوا لە ئەوروپا و ئاسیادایە ، بەشێکی گەورەبون لەم روسیایە ، بێ جگە لەمیش نزیکەی دووسەد نەتەوەی تر هەیە ، هەریەکە لەم نەتەوانە جیاوازە لەوانیتر ، ئەم نەتەوانەلە زومانی رژێمی قەیسەردا نیمچە موستەعمەرەبوون ، تین بۆ زمان ، و رۆشنبیریان هاتبو ، لە راستیدا هیچ شتێك لە پێناوی چاك کردنی باری

میللەتە دواکەوتوەکان لە ناوچەی ئاسیای ناوەراست دانەگرابو. جولەکەکان سەرەرای ئەوەی کەدانیشتوی ناوچەیەکی تایبەتی نەبون ، زۆر لێکراو ، و چەوساوەبون ، گەلێك کوشتاریان لێدەکرا ، ئەم زۆر لێکردن ، وچەوساندنەوەیە بو بە هۆی ئەوەی کە گەلێك لەم نەتەوە زۆر لێکراوانە بچنە پال شۆرشە روسیەکە ، گەرچی ئەم نەتەوانە مەبەسیان شۆرشێکی نیشتمانی بو ، نەك شۆرشێکی کۆمەلایەتی. ئنجا هەر کە حوکومەتەوەختیەکە دوای شۆرشی شوبات ١٩١٧ دروست بوو ، گەلیك بەلێنی بەم نەتەوانەدا گەچیبەکردار هیچیان دەستگیر نەبو ، بەلام هەر رۆژانی یەکەمی حیزبی بولشەفیك و پیش شۆرشەکەوە (لینین) سور بو لەسەر ئەوەی کە ئەم نەتەوانە مافی چارەنوسی خۆیان بدرێتی ، گەرچی ئەنجامی ئەمە جیابونەوە ، و سەربەخۆییان بێت ، ئەمە لەبەرنامەی حیزبە بولشەفیکەکونەکەدا هەبو ، ئنجا هەر کە بولشەفیکەکان حوکمرانیان وەرگرت دوای شۆرشەکە ، بیرورای چارەنوسیان دووپات کردەوە.

لە کاتی جەنگە ناوخۆکەدا ئیمپراتوریەتی رژێمی قەیسەر خراپ شەق وپەق بو ، ئیتر جمهوریەتی سۆڤیتی تەنها پانتاییەك بو لە دەوروبەری مۆسکۆ ولینینغراد ، سەربارەت بەدەسیسەو ، هاندانی دەولەتە رۆژئاواییەکان چەند نەتەوەیەك کە لەسەر قەراغی دەریای (بلطیق)ن وەکو فنلندا ، ئەستونیا ، لاتفیا ، ولیتوانیا هەروەها پولندا ئیعلانی سەربەخۆیی خۆیانیان کرد ، کە روسەسوفیتیەکان لە جەنگە ناوخۆکەدا سەرکەوتن ، وە لەشکری بێگانەکان کشانەوە گەلێك حوکومەتی سەربەست لە سیبریا ، وناوەراستی ئاسیادا پەیدابو ، لەبەر ئەوەی ئەم دەولەتانە یەك ئامانج بون دیارە زۆر هاوپەیمان دەبن. ئەم حوکومەتانە بون بەیەك لە سالی ١٩٢٢ز. دا یەکێتی سۆڤیتیان دامەزراند ، وەیا یەکێتی جمهوریەتە سوشیالیسەکانی سوڤیتیان پێك هێنا ، ئیتر لە سالی ١٩٢٣ز. وە هەندی گۆران لەژمارەی ئەم جمهوریەتانەدا رووی‌دا چونکە هەندێکیان بون بە دوو جمهوریەت ، ئەمرۆ حەوت جمهوریەتی یەکگرتو هەیە.

١ـ یەکێتی جمهوریەتی روسیای سۆڤیتی سوشیالیستی.

٢ـ = = = سبی = =

٣ـ = = = ئوکرانیای = =

٤- = = پشت قەفقاس = =

٥- = = توركمانستان = =

٦- = = ئوزبەكستان = =

٧- = = تاجیكستان = =

هەروها (منغوليا) لەگەل یەکێتی سۆڤیتدا هاوپەیمانە.

بەم جۆرە دەبینێت کە یەکێتی سۆڤیت بریتیە لەیەکێتی‌یەك لە نێوان گەلێك جمهوریەتدا ، وە هەندێك لەم جمهوریەتانە خۆیشیان بریتین لە یەکێتیەك لە نێوان چەند جمهوریەتێکی بچوکتردا هەروەکو جمهوریەتی روسیای سۆڤێتی سوشیالیستی یەکگرتو کەوا بریتیە لەیەکێتیەك لە نێوان دوانزە جمهوریەتدا ، هەروها جمهوریەتی پشت قەفقاسیا یەکێتیەکە لە نێوان سێ جمهوریەتدایەکە: ئازربایجان و جورجیا ، و ئەرمینیایە ؛ سەرەرای ئەم جمهوریە تەیەکگرتو ، وتێك ئالاوانە کەوا پشتیوانی یەکترین چەند مەلبەند وناوچەیەکی "نیشتمان" یشیان لەناو دایە ، وە مەبەسیش لەم سەربەستیانەی ناوخۆدا ئەوەیە کەوا زمان وڕۆشنبیری نەتەوایەتی بپارێزرێت ، و لەگەل ئەمەشدا ئازادی‌یەکی زۆریشیان بدرێتی. گەلێك تەقەلا دەدرێت کە هیچ نەتەوەیەك بەسەر ئەوی تردا زاڵ نەبێت ، جێبەجێ‌کردنی کێشەی کەمایەتیەکان لە یەکێتی سۆڤیتدا بەلای ئێمە مانانەوە گەلێك گرنگە ، چونکە ئێمەیش هەر هەمان کێشەمان هەیە. گەرچی کێشەکانی سۆڤیت گەلێك گرانترن کە کێشەکانی لەمەر ئێمە چونکە (١٨٢) نەتەوەیان هەیە ، ئەمان لەئازادی دان بە تەواوی بە هەمو نەتەوەیەك ، وەپشتیوانی کردنی بۆ ئیش کردن ، و فێربون بەزمانەکەی خۆی ، وە گفتوگو پێکردنی ، گەلێك چونەتە پێشەوە ، ئەم تەجروبەیە زۆر سەرکەوتوە. ئەم ئیشەی سۆڤیتیەکانیش لەبەر ئەوە نەبوە ، کەوا دلی دورەپەرێزەکان (الأنعزاليين) خۆش کەن ، بەلکو لەوباوەڕەدا بون ، کە بروایێ کردن ، وپیدا راپەرمونی راستەقینە ، بلاو نابێتەوە ، وکار لەجەماوەر ناکات ئەگەر بەزمانی نەتەوەکە نەبێت. ئنجا ئەو ئامانجانەی دەستیان کەوت بەراستی سەرسام هێنەربو.

سەرەرای ئەم سەربەستیە ناوخۆییانە ، بەشە جۆربە جۆرەکانی ناو یەکێتیەکەی زۆر لە یەکتری نزیك دەکردەوە ، زیاتر لەونزیك بونەوەیەی

که لەزەمانی قەیسەر و حوکومەتە مەرکەزیەکەدا هەبو ، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەبو کە ئێستا ئامانجێکی بەرزیان هەیە وتێدەکوشن بۆی. هەمو جمهوریەتیکی یەکگرتو لەرووی بیروباوەڕەوە مافی ئەوەی هەیە کە لەیەکێتیەکە جیابێتەوە هەر کاتێك ، بەڵام هەرگیز چاوەڕوانی ئەمە ناکرێت سەبارەت بەو سودوکەلکە زۆرەی کە لە مانەوەیاندا لەناو ئەم یەکێتیەدا دەستیان دەکەوێت ، چونکە بەرامبەر دوژمنایەتی جیهانی سەرمایەداری بەهێزیان دەکات.

گرنگترین جمهوریەت لەناو ئەم یەکێتیەدا جمهوریەتی روسیایە ، کە لە (لینینغراد) ەوە درێژدەبێتەوە تاکو سیبریا ، بەڵام روسیای سپی لەتەنیشت پولندەوەیە ، ئوکرانیا لەخوارەوەوە نزیك دەریای رەشە ، بەزۆری بەروبومی دانەوێڵە بەناوبانگە ، بەڵام جمهوریەتی پشت قەفقاس هەروەکو لەناوەکەیەوە دیارە ، کەوتۆتە ئەو دیو جیاکاتی قەفقاسەوە ، لە نێوان دەریای رەش و دەریای (قزوین) دا ، جمهوریەی ئەرمینیا کەوتۆتە ئەم ناوچەیە کە مەڵبەندی کوشتارە سامناکەکان بو لە نێوان تورکەکان وئەرمەنیەکاندا ، ئنجا لەبەرئەوەی کە ئێستا جمهوریەتێکی سۆڤێتیە ، ئاسایش ورژێم تیایدا بەر کەماڵە. لەو بەری دەریای (قزوین)ەوە سێ جمهوریەتەکانی ئاسیای ناوەراست هەیە کە تورکمانستان وەئەزبەکستانە کە شاری (سمرقند)و (بخاری)ی تێدایە ، هەروها تا جیکستانیش کە کەوتۆتە سەرووی ئەفغانستان ، تاجیکستان نزیکترین جمهوریەتەکانی سۆڤێتیە بەهیندستان.

جمهوریەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست بەتایبەتی لای ئێمە گرنگن چونکە پەیوەندایەتیان لەگەڵماندا هەیە. لەمەش گرنگتر لەم چەند ساڵانەی دواییدا گەلێك پێشکەوتون ، کەچی لە زەمانی قەیسەرەکاندا ، دواکەوتو ، و نەزان بون ، لە کۆتی بروبوچیدا (الخرافات) دەتلانەوە ، بەڵام ئێستە پێش کەوتون لە هەمو روویەکەوە بە چەند قۆناغێك پێش هیندستان کەوتون.

---

(١) لە ساڵی ١٩٣٣ز.دا ئەمەریکا دانی بە یەکێتی سۆڤیتدا ناو ئالوگۆڕی نۆێنەرایەتی دیبلوماسیان کرد.

# پرۆژە پێنج ساڵیەکە لە ڕوسیادا

## ٩/یولیو/١٩٣٣

(لینین) لە سەردەمی ژیانیدا ، بێ چەندو چون یەکە پێشەوای روسیای سۆفێتی بۆ هەموان مل کەچی بریارەکانی بون ، وشەیەکی ئەو خۆی لەخۆیدا یاسابو ، بەرەناکۆکەکانی ناو حیزبی شیوعی لە دەوری ئەو وشەیە کۆدەکردەوە ، لە دوای ئەم چەند بەرەیەك بەکژیەکدا چون هەریەکەیان دەیویست زاڵ بێت بەسەر حیزبەکەدا ، دەرکەوتوترین پیاوێك دوای (لینین) چ لە ناو روسیا و ، چ لە دەرەوەی روسیادا ناوی (تروتسکی) بو ، ئەمە ئەو (تروتسکی)یە بو ، کەوا دەورێکی گرنگی بینی لەبەرپابونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دا ، سەرەرای ئەو هەمو کێشە و سەغلەتییەی کە توشی شۆرشەکە هات ، لەشکری سوری دروست کرد ، کەوا سەرکەوت لە جەنگە ناوخۆکە ، و دەست خستنەکەی ناوکاروباری ، ناو روسیاوە لەلایەن بێگانەوە سەرەرای ئەم هەموە (تروتسکی) لەریزەکانی حیزبەکەدا تازەبو ، بولشەفیکەکان (لینین) نەبێت ، بروایان پێ نەدەکرد ، یەکێك لەم بولشەفیکانە پیاوێك بو ناوی (ستالین) کەوا کرا بەسکرتێری حیزبی شیوعی ، بەمە بو بەدەسەلاتدار بەسەر بەهێزترین رێکخراو لە روسیادا ، بێگومان لە نێوان (تروتسکی) و (ستالین) دا بەربەرەکانی روودەدات ، هەریەکەیان زۆر رقی لەوی تریان بو ، وە هەریەکەیان زۆر جیاواز بولەوی تریان ، (تروتسکی): نوسەر ، و وتاربێژێکی دەرکەوتوبو ، ئیسپاتی کرد کە توانایەکی مەزنی هەیە لەرێکخستن ، وئیش کردندا ، بێ ئەندازە زیرەك بو ، چونکە دەیتوانی نەزەریەکانی شۆرش بگۆرێت وپێش خات ، هەروەها بەوشەکانی کە وەکو قامچی وەیا دویشك وابو بە دوژمنەکانیەوە بدات ، بەلام (ستالین) لە چاو ئەمدا پیاوێکی ساکار ، هێمن وبێدەنگ بو ، بەلام لەهەمان کاتدا توانایەکی مەزنی لەرێکخستندا هەبو ، هەروەها جەنگاوەرێکی گەورە ، و

گەلێك قارەمانێتی نواندوە وە خواستێکی ئاسنینی هەبو ، لەواقیعدا ناوەکەی کە پێیان دەوت (ستالین) مانای پیاوێکی ئاسنینە ، خۆ ئەگەر (تروتسکی) لەوانەبێت بچێتە دڵە ، (ستالین) جێی باوەرو ، پێداراپەرمون بو ، لەناو جەرگەی جەماوەرەوە هاتبو ، لەبنەچەیەکی لادێیی لە جمهوریەتی جوڕ جیاوە ، لەبەر ئەمە جێی پێشەوایەتی ، ئەم دوانە نەدەبوەوە لەناو حیزبی شیوعیدا ، دەبو یەکێکیان نەمایە ، و جێی بۆ ئەوی تریان چۆل کردایە.

ناکۆکی وزۆرانبازی نێوان (ستالین) و (تروتسکی) شتێکی شەخسی بو گەرچی دیسانەوە لەمەش فراوانتر بو ، چونکە هەریەکەیان نوێنەری سیاسەت ، و شێوازێکی جیاواز بو لە گۆڕان ، و پێشخستنی شۆڕشەکەدا ، (تروتسکی) تاکو پێش شۆڕشەکە بە چەند ساڵێکیش ، جاری بۆ بیروڕای "هەمیشە شۆڕش" دەدا. ئەمە وادەگەیەنێت ، کە هیچ وڵاتێك لە وڵاتەکان بارو زروف هەر چۆنێك گونجاو بێت ناتوانێت سوشیالیستیەکی تەواو دامەزرێنێت ، چونکە سۆشیالیستی راستەقینە پەیدا نابێت مەگەر دوای شۆڕشێکی جیهانی. لەبەر ئەوەی کە گومانی نییە کە سوشیالیستی هەر دەبێت جێی سەرمایەداری بگرێتەوە لە گورانگاری ئابوریدا. لەبەر ئەمە دەبینین ، هەر چەندێك سەرمایەدارێتی تەشەنە بکات و ببێتە رژێمێکی گشتی دەولەتان رژێمی سەرمایەداری ئەوەندە بەرەو روخان دەچێت ، هەر وەکو لە گەلێك لە وڵاتاندا دەی بینین ، ئیتر بە تەنها رژێمی سوشیالیستیە کە بتوانێت ئەم بونی دەولەتانە بپارێزێت ، لەبەر ئەمە گومانی تێدانییە کە دەبێت سوشیالیستی بێتە کایەوە ، ئەمەیە بیروڕای مارکسیەت. بەڵام خۆ ئەگەر تەقەلا بدرێت سوشیالیستی لە تاکە وڵاتێکدا پەیدابببێت ، بێ ئەوەی تێکرا جیهان بگرێتەوە ئەمە وادەگەیەنێت کە پاشە و پاش بۆ دواوە دەگەڕێنەوە. بۆیە بڵاوبونەوەی سوشیالیستی لە هەمو جیهاندا بە بناغە یەك لە بناغەکانی پێشکەوتن دادەنرێت بە پێشکەوتنی خودی سوشیالیستیشەوە ، ئیتر پاشگەز بونەوە لێی بێ سودو بێ کەلکە ، ئنجا (تروتسکی) لەسەر لێکدانەوەی بیروراکەی دەروات و دەڵێت: "لەرووی بیروڕای ئابوریەوە هیچ وڵاتێك بە تەنیا ناتوانێت سوشیالیستی دامەزرێنێت هەر چەندە ئەو ولاتە گەورەش بێت تەنانەت ئەگەر یەکێتی سۆڤیت خۆیشی

بێت ، چونکە لەم حالەتەدا دەبێ سۆڤیت زۆر پشت بە ولاتە پیشەسازەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا ببەستێت ، ئەمەش لە مەسەلەی یارمەتدانی نێوان شارو لادێ دەچێت کە ڕۆژئاوای خاوەن پیشەسازی لەشارو ، روسیای بەگشت وکاڵیش لە لادێ. ئیتر (تروتسکی) لە رووی سیاسیەوە لەوباوەڕەدا بو ، ولاتێکی سوشیالیستی ، بەتاقی تەنیا لەناو دەولەتە سەرمایەدارەکاندا ناتوانێ بژی ، چونکە هەردو رژێمەکە ناتوانن بەجوت شان بە شانی یەکتری پێکەوە بژین. ئەمەمان بە چاوی خۆمان دی. یان دەولەتە سەرمایەدارەکان ئەم دەولەتە سوسیالیستیە دەبلیشیننەوە ، یان لەولاتە سەرمایەدارە کان ، و هەمو لایەکدا شۆڕشی سوشیالیستی بەرپا دەبێت و سوشیالیستی دادەمەزرێت ، دیارە ئەم دوو رژێمە چەند ساڵێك پێکەوەدەژین و دەبەنە سەر ، بەلام لەناوچەیەکی شێواو ، ترش و تاڵدا.

تەنانەت پێشەواکانی سۆڤیتیش ، پێش شۆڕش و دوای شۆڕشەکەش تارادەیەکی زۆر بیروڕایان وابو ، زۆر بە پەروشەوە چاوەڕوانی قەومانی شۆڕشیان دەکرد لە ناو دەولەتە ئەوروپاییەکاندا ، بە راستی لە ئاسمانی ئەوروپادا هەور کۆبوبوەوە بەلام بێ ئەوەی بگرمێنی بلاوەی لێکرد ، ئیتر روسیا دەستی کرد بەجێ بەجێ کردنی سیاسەتە ئابوریەتازەکەی ، و هەمو کرد وکۆشیکی خۆیی بۆ تەرخان کرد بو. کەچی (تروتسکی) زەنگی مەترسی لێداو ، وتی: شۆڕشەکە لە مەترسی دایە ، کە ئەگەر لە سەر سیاسەتێکی بەچەرگانە نەڕوات لە پێناوی بەرپابوونی شۆڕش لە جیهاندا ، ئەم رایە سەرپیچی‌یەکی سەخت بو لە (ستالین) کرا ، وە زورانبازی ئەم دوانە حیزبی شیوعی چەند ساڵێك شلەقاند بە سەرکەو تنێکی تەواوی (ستالین) کۆتایی هات ، ئەمەش سەبارەت بەوەبو کە (ستالین) دەسەلاتی بەسەر رێکخراوەکانی حیزبدا هەبو ، بەلام (تروتسکی) ولایەنگرانی بە دوژمنانی شۆڕشەکە دادەنران ، ئنجا لە حیزب دەرکران ، و (تروتسکی) نێررا بو سیبریا ، دوایی نێررا بۆ دەرەوەی ولات.

ناکۆکی نێوان (ستالین) و (تروتسکی) سەربارەت بە پێشنیارێك بو کە (ستالین) پێشکەشی کرد کە دەبێ لەسەر سیاسەتێکی بە جەرگی کشت وکاڵ بڕۆن ، تاکو فەلاحەکان بێننە رێزی سوشیالیستیەوە ، ئەم پیشنیارەش دیارە مەبەسی بە هێز کردنی سوشیالیستی بو لە روسیادا بێ ئەوەی گوێ

بەدەنە هەچ شتی کە لە دەرەوەدا ، (تروتسکی) بەرهەڵستی ئەمەی کـرد ، و بیروڕای "هەمیشە شۆڕشی" پەسند کرد وە لەم بابەتەوە وتی: بێ ئەمە ناکرێت فەلاحەکان بێنە ڕیزەکانی سوشیالیستیەوە ، لەواقیعدا (ستـالـیـن) گەلێك پیشنیارەکانی (تروتسکی) وەرگرت ، وە شێوازەکەی خۆیـی دابـەم پێشنیارانە. (تروتسکی) دەربارەی ئەمە لە کتێبەکەیدا لەبابەت مـێـژووی ژیانی‌یەوە دەڵێت: "لە سیاسەتدا هەرگیز گرنگ نی‌یە کەچ بریارێك دەدرێت بەڵام چۆن وەکی بریار دەدات ئەمەیان گرنگە".

بە جۆرە زورانبازی لە نێوان ئـەم دو وتـەبـەردە دا بـە شـکـسـتـی (تروتسکی) ودەرکردنی لە مەڵبەندەکەی کەوا دەورێکی قارەمانانەو دیاردی تێدا بینی بۆ کۆتایی هات ، ناچار کرا لەیەکێتی سۆفیت بچێتە دەردود ، کە خۆی یەکێك بو لە بنیات نەرانی ، لەبەر ئەوەی کە شەخسیەتێکی بـد هێزی هەبو زۆربەی دەولەتە سەرمایەدارەکان ترسان کە دالەی بدەن ، بۆید ئینگلتەرە و زۆربەی دەولەتە ئەوروپاییەکان نەیان هـێـشـت بـێـتـە نـاو ولاتەکەیانەوە ، لە دواییدا لە تورکیادا لە دورگەی (برنکیبـو)ی نـزیـك ئەستەمبول تاماوەیەك جێگەی بوەوە ، ئیتر هەمو کاتی خۆیی بۆ نوسـیـن تەرخان کرد ، لەوێ کتێبە بەناوبانگەکەیی دەربارەی (مێـژووی شـورشـی روسی) نوسی ، رق وقینی لە (ستالین) هەمو هەست ، ونەستی گرتبـووەوە لەبەر ئەمە هەمیشە بەلاماری دەدا ، و رەخنەی لێ دەگـرت ، لـە هـەمـو لایەکی جیهاندا حیزبێکی (تروتسکی) یانە دروست بو ، وە دەستی کرد بە هێرش بردنە سەر حوکومەتی سۆفیتی ، و شیوعیتی رەسمی کە (کومنتـرن) بروای پێ‌یەتی.

ئیتر (ستالین) هەر کە لە (تروتسکی) رزگاری بو ، هەمو تەقەلایەکی خۆیی بە ئازاپەتی یەکی بێ هاوتاوە بەرەو رووی بە ئەنجام گەیـانـدنـی سیاسەتە کشت وکاڵی‌یەکە کردەوە ، ئیتر ئەو کێشانەی کە ئاوقای دەبـون ئاسان نەبون ، بێ ئیشی و کوێرەوەری لەناو چینی خوێـنـدەوارە کـانـدا بڵاوبوبووە ، کرێکارەکان بە چەند مان گرتنێك هەستان ، یەکەم ئیشێك کـە کردی دانانی باجێکی زۆر بو لـە سـەر کـۆلاکـەکـان ، وە یـا فـەلاحـە دەولەمەندەکان ، ئەم بارانەی بۆ دروست کردنی کێڵگە هەرەوەزیەکان دانـا کەوا ژمارەیەکی زۆر لە فەلاحەکان تێکرا لە کێلگەیەکی فراواندا هـاوبـەش

دەبن ، وە قازانجەکەی لەناو خۆیاندا بەش دەکەن ، دیارە کولاکەکان بەرهەڵستی ئەم سیاسەتەیان دەکرد ، وە رقیان لە حوکومەتی سۆڤیت هەستا دیسانەوە ترسان لەوەی کە حوکومەت ئاژەڵەکانیان و دام ودەزگای کشتوکاڵیان زەوت کات ، و هەموي لەگەل ئاژەلی فەلاحە هەژارەکاندا دانێت لەبەر ئەمە دەستیان کرد بە کوشتنی ئاژەلەکانی خۆیان ئەم کوشتنە بە رادەیەکی وابو کە لە ساڵی ئایندەدا ، روسیای دوچاری ناتەواوی یەکی بێ ئەندازە کرد لەتفاقی خواردەمەنی وکوشت و ئەو شتانەدا کە لە شیر دروست دەکرین.

ئەمە دەستێکی خراپ بو ، وەشینرا کە (ستالین) چاوەروانی نەبو لەگەل ئەمەشدا بەردەوام بۆ لەجێ بەجێ کردنی بەرنامەکەیدا ، زۆر بەسوری و گەرم وکوریەوە بەرنامەکەیی بە هەردو لایەنەکەیەوە ، چ گشت وکالی ، وچ پیشەسازی پێشخست لە هەمو یەکێتیەکەدا. دەیەویست فەلاح لە پیشەسازی نزیك کاتەوە بە دروست کردنی کێلگەی نمونەیی زل وفراوان کەهی دەولەت بۆ ، لەگەل کێلگە تێکراییەکاندا (المزارع الجماعیة) ، هەروها ویستی ولاتەکە هەمووی بکات بەپیشەساز بە دامەزراندنی کارگە گەورەکان ، و مەکینەی کارەبا و ، کردنەوەی کانگاکان (المناجم) وەشتی تری لەم بابەتە ، سەرەرای ئەمانە هەموی وەشان بە شان لەگەلیاندا ، ویستی بە گەلێك چالاکی جۆر بەجۆر هەلسیت لە گشت لایەکەوە: لە رووی فێرکردن ، وزانیاری ، وبازرگانی ، و هەرەوەزی ، و دروست کردنی خانو بو ملیونە ها کرێکار ، سەرجەم ویستی رادەی گوزەرانی دانیشتوان بەرزکاتەوە ، ئەمە بو پرۆزە پێنج ساڵیەکە. بە راستی برۆژەیەکی زل بو ، وە هێنانە دی زۆر زەحمەت بو ، تەنانەت لە ولاتێکدا کە خاوەنی سامان ، و توانایەکی وابێت کە لەمەدا یارمەتی بدات ، ئنجا لەولاتێکی هەژار ، و دواکەوتوی وەکو روسیادا دەلێیت چی!؟ بە راستی ئەمە جۆرێکە لەشێتی.

برۆژە پێنج ساڵیەکە دوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواو نەخشەی بۆ کێشرا ، توانای گشت لایەکی ولاتەکە خرایە بەرچاو ، زانا و ئەندازیار ، وشارەزا وپسپۆرەکان باسی کێشەی گونجاندنی بەشەکانی بەرنامەکەیان لەگەل

یەکتردا کرد ولێی کۆلرایەوە ، ئەمە لە هەمو ئیشێك زەحمەت تربو ، وکو : هیچ کارگەیەکی مەزن بە هیچ ناچێت و کەڵکی نییە ئەگەر کەرەسەی (مواد الخام) تەواوی نەبیت ، خو ئەگەر کەرەسەشی هەبیت دەبیت ببریت بۆ کارگەکە ، لەبەر ئەمە دەبێت مەسەلەی گواستنەوە ، و دروست کردنی هێڵی ئاسنین باس بکرێت ، ئەمە شیان پێویستی بە خەلوزە (خەلوزی بەرد - وەرگێر) لەبەر ئەمە دەبێت کانگای خەلوز بکرێتەوە ، دیسانەوە کارگەکە پێویستی بەتوانای کارەبا هەیە بۆ ئیش پێکردنی ، وە بۆ ئەمە دەبێت روبارەکان بە ربەست کرێن ، بۆ دروست کردنی ئەم کارەبایە کەوا دەنێررێت بۆ کارگەکان و کێلگەکان و ە لەرووناك کردنەوەی شار ودێهاتەکاندا بەکاربهێنریت ، ئەمانە دیسانەوە ئەندازیار ، و میکانێکی و کرێکاری لی هاتویان دەوێت ، ئنجا بون و دەرچونی چەند هەزارێك لەمانە چ لە پیاو چ لە ئافرەت لە ماوەیەکی کەمدا کارێکی ئاسان نییە ، بەڵی راستە دەتوانرێت بە هەزاران تراکتور بنێررێت بۆ کیلگەکان ، بەڵام کێ ئیشیان پێ بکات ، وەکی چاکیان کاتەوە ئەگەر تێك چو؟ کێشەکە لەمەیاندایە.

کچم ئەمە نمونەیەکی کەمە کە بۆم هێنایتەوە ، تا بزانیت کە کێشەکانی پرۆژەکە تاچ رادەیەك ئالۆزە ، خۆ ئەگەر هەڵەیەك رووی بدایە ئەنجامێکی زۆر خراپی دەبو ، وە ئەگەر ئەلقەیەکی لاواز لە زنجیرەکەدا ببوایە ، ئەو بەشەی لەبەرنامەکەدا دوادەخست ، ئەگەر بەتەواوەتی نەی وەستاندایە. بەڵام روسیا ، یەك جیاوازی مەزنی هەبو لە دەولەتە سەرمایەدارەکان کەوا چالاکی هەمە جۆری سەرمایەداری ، بو چەند کەسانێکە بەشێکی زۆری وزە ، و توانا لەبەر بەرەکانی کردنی ناوخۆیاندا تیا دەچێت و دەفەوتێت ئیتر هیچ رێك وپێکی و گونجانێك لە نێوان بەرهەم هێنەرە جۆربە جۆرەکان وەیان دەستە وتاقمی کرێکارەکاندا نییە ، مەگەر لە خووەگونجان نەبێت لەکاتێکدا کە کڕیار و فرۆشیار دەچن بۆ بازار ، بەگورتی لە رژێمی سەرمایەداریدا نەخشە دانان بە جۆرێکی فراوان نییە ، هەر کەسێك نەخشەیەکی تایبەکاری بۆ خۆی و ، پاشەرۆژی دادەنێت ، مەبەسی لەمەش ئەوەیە بەربەرەکانی یەکێکی تری پێ بکات ، وە لەرێبازەکەی خۆیدا دەری بەرێنی دیارە میللەتێك لەم جۆرە کەسانە پێك

هاتبێ ، هیچ رێك وپێكیەكی تێدا نابێت بەلكو ئەو دەلاقەیەی كە هەژاری و دەولەمەندی لێك جیادەكاتەوە زیاتر فراوان دەبێت ، بەلام حوكومەتی سۆڤیت توانای ئەوەی هەبو كە زال بێت بەسەر هەمە جۆر پیشەسازی ، و هەمو لایەكی چالاكیدا لە هەمو ناوچەكانی یەكێتیەكەدا. بۆیە دەتوانێ كە نەخشەیەكی یەكگرتو دانێت كەوا هەمو لایەنێك لە لایەنەكانی چالاكی جێگەی تایبەتی خۆیی تیدا بدۆزێتەوە. بەم رێبازە رەنج وكۆشش بە فیرۆ ناچێت ، مەگەر لەكاتی هەلە كردندا نەبێت تەنانەت ئەمەش گورج چاك دەكرێت ، چونكە دام ودەزگا هەیە كە چاودێری هەمو ئیشەكە دەكا.

ئامانجی پرۆژەكە دانانی بناغەیەكی بەهێز بو لە پێناوی پیشەساز كردنی (التصنیع) یەكێتی سۆڤیتدا ، بیروراكە وا نەبو كە هەندی كارگە دروست بكرێت بۆ بەرهەم هێنانی كەل وپەلی بەكارهێنان (البضائع الاستهلاكیة) وەكو قوماش و شتی تری لەم بابەتە ، ئەمەیان زۆر ئاسانە چونكە هەر ئەوەندەیان دەوێت كە تەنها ئامێرەكان (الالات) لە دەرەوە بكرێت و دای مەزرێنن وەكو ئیمە لە هیندستاندا كردمانی. ئەم جۆرە پیشەسازیانە كە كەل وپەلی بەكارهێنان دروستت دەكەن پێیان دەلێن "سووكە پیشەسازی" وە ئەم سوكە پیشەسازیە بە تەواوی پشت دەبەستی بە پیشەسازیە قورسەكان "الصناعات الثقیلة" و ، ئاسن ، و پۆلا ، وپیشەسازیەكانی كەوا كارگەكان ، وئامێرەكان ، ودەزگا پێویستیەكان دروست دەكەن بو سوكە پیشەسازیەكە ، وەكو موتور (المحركات) وشتی لەم بابەتانە ، حكومەتی سۆڤیت دوربین بو ، بریاریدا كە هەمو كۆششی خۆی بۆ پیشەسازیە سەرەكیەكان وەیا قورسەكان تەرخان كات لە پرۆژە پێنج سالیەكەدا. بەم رێبازە بنچینەی پیشەساز كردن (التصنیع) دا دەرزێت ، ئنجا بەرهەم هێنانی سوكە پیشەسازی ئاسان دەبێت ، سەرەرای ئەمەش پیشەسازیە قورسەكان روسیا لە پشت بەستن بە دەولەتە بێگانەكان بۆ وەرگرتنی ئامێر و تفاقی چەنگ ئازاد دەكات.

وا دیارە هەلبژاردنی پیشەسازی قورس ، وبەسند كردنی بەسەر سوكە پیشەسازیدا كارێكە پێویستی بە بەلگەنیە ، بەلام لە راستیدا بە هۆی ئەمەوە دانیشتوان گەلێك زەحمەتی ، و ئازاریان چەشت ، چونكە پیشەسازی قورس زۆر گرانترە لە سوكە پیشەسازی وەكو توبر قازانج نادات بە

دەستەوە ، هەر وەکو کارگەیەکی قوماش دەتوانێت هەر کە دامەزرا قوماش بەرهەم بێنی ، وە گورچ بە خەلکی بفرۆشێت ، هەر هەمان دەستور پیشەسازیەکانی تریش کەوا کەل پەلی بەکارهێنان بەرهەم دێنن ، بەلام کارگەی ئاسن شیشی تازە ، و فارگون دروست دەکات ئەمە بەکار نایەت کە ئەگەر هێلی ئاسنین دروست نەکرێت ، وە ئەمەش ماوەیەکی دەوێت بەمە ئەو پارانەی کە لەم پیشەسازیانەدا بەکارهاتون رادەوەستێت ، گەرچی ولاتەکەش زۆر پێویستی بەپارە هەبێت.

بەم جۆرە دامەزراندنی پیشەسازیە فورسەکان بە جۆرێکی فراوان لە روسیادا گەلێك لە خۆبوردنی مەزنی دەوێت ، ئیتر هەرچیەکیان دروست کرد وەیا هەمو ئامێرەکانی کە لە دەرەوە کریان نرخەکەیان کاش بەزێر پێشکەش کرد ، چۆن میللەتی روس توانی ئەمە بکات ؟ پشتێنە کانیان لەسەر سکیان توند کردەوە ، پرسیان بو ، شتومەکی پێویستیان لەخۆیان قەدەغە کرد ، ئەمە هەمووی لە پێناوی ئەوە دا نابتوانن ئەوەی لە دەرەوە دەیان کری نرخەکەی بتوانن بدەن ، تفاقی خواردەمەنی خۆیانیان دەناردە دەرەوە تاکو بە نرخەکەی ئامێرەکان بکرن ، هەرچی شتێك لە دەرەوە بازاری بیوایە دەیان ناردە دەرەوە. گەنم ، جۆ ، گەنمەشامی و سەوزەوات ، میوە ، کەرە ، و گۆشت ، و مریشك و بالندەی مالی هەنگوین ، و ماسی ، و کافیار ، و شەکر ، رون و شیرینی.. هتد ناردنی ئەم شتانە بۆ دەرەوە مانای وایە خۆیان لێی بێبەش بن ، میللەتی روس کەرە وشتی تری نەبو چونکە ئەوی هەیبو ناردبویە دەرەوە.

دوای ئەم رەنجە زلەی کە بو بەئەنجام گەیاندنی پرۆژ ە پێنج سالیەکە لە سالی ۱۹۲۹ز دا درا ، گیانی شۆرشگێری و ، بیرو را بەرزکان بو کە لە پێناو یداتێ دەکۆشان جەماوەریان هان دەدا ، هێنابوە جۆش ، و وایان لە خەلکی دەکرد کە هەمو تەقەلاو کۆششی خویان تەرخان کەن لە پێناوی ئەم تێکۆشانە تازەیەدا ، ئەم تێکۆشانە دژی دوژمنێکی بیانە ، وەیا ناوخونەبو ، بەلکو دژی بارو زۆرفیێکی کۆنەپەرستی ، ودواکەوتوبی بو لە روسیادا ، ودژی پاشماوەی سەرمایە دارێتی ، و دژی هەزاری خەلك بو بەم لێ بوردنانە ، بەوبەری گەرم وگوریەوە قایل بون ، گوزەرانێکی

سەختیان بردە سەر بە راستی ئێستایان بەخت دەکرد لە پێناوی باشەڕۆژێکی مەزندا کە لە ئاسووە بۆیان دەردەکەوت کە دروست کردنی جێی شانازیان بو.

جاران دەولەتەکان هەمو کرد وکۆشی خۆیان بەرەو رووی کردەوەیەکی مەزن دەکردەوە ئەویش تەنها لە کاتی جەنگدا ، ئنجا لەماوەی جەنگە جیهانیەکەدا ، هەر یەکە لە ئەلمانیا ، ئینگلتەرە وفەرەنسە لەپێناوی یەك مەبەسدا کەوتبونە کار ، ئەمەش بردنەوەی جەنگەکە بو ، لەرێی ئەمەدا هەمو شتێك ئاسان بو ، بەڵام لە یەکێتی سۆڤیتدا یەکەم جارە لە مێژوودا دەبینین ، دەولەتێك هەمو کردوکوشی خۆی تەرخان کات نەك بۆ وێرانکاری بەلکو بۆ ئاوەدان کردنەوە تاولاتەکەی بەرزکاتەوە ، بی باتە رێزی دەولەتە پیشەسازەکان لەناو چوار چیوەی سوشیالیستیدا ، گەرچی ئەو نەبونی‌یەی کە چینەکانی ناوەراست و بەرزەکان و فەلاحەکان هەستیان پێ دەکرد زۆر بو ، گەلێك جار وا دەردەکەوت کە پرۆژەکە ئەوەندە زلە ، تا رادەیەك لەوانەیە بروخێت تەنانەت لەگەل خۆیدا حوکومەتی سۆڤیتیش راپێچ کات ، لەبەر ئەمە پێویستیان بەئازایەتیەکی بێ هاوتا هەبو تاکو کاروبارەکان بەرێوەبەرن ، گەلێك لە پێشەوا بولشەفیکەکان کردەوە کە ئەو کرژی تەنگانەیەی کەوا لە ئەنجامی بەرنامە کشتوکالیەکەوە پەیدابوە لەوزەدا دەبێت سوك کرێت. بەڵام (ستالین) رازی نەبو ، بەلکو بەهێمنی وبی دەنکی بریار دان بەردەوام بون کە شتیەکەی لی‌خوری. (ستالین) حەزی نەدەکرد ، بەدەگمەن نەبوایە بەرامبەر جەماوەر نەدەهاتە گفتار وەگو پەیکەرێکی ئاسن وابو موقە دەردای نابو بەو رێبازەدا بروات کە بۆی دانراوە. ئنجا بەشێك لە ئازایەنیەکەی ، وسوربونەکەی خۆی ئەندامەکانی حیزبی شیوعی و کرێکارەکانی تریشی لە روسیادا گرتەوە.

لەم کاتە دا پرو پاغەندە بۆ پرۆژە پێنج ساڵیەکە گەیشتبوە ، ئەو پەری ، وگورێکی دەدا بە میللەت بەرەو پێشەوەی دەبرد ، جەماوەر جۆش و خرۆشێکی تایبەتی هەبو لە بنیاتنانی مەکینەی کارەبا و دامەزراندنیدا ، و لە دروست کردنی بەست (سد) و برد و کارگە و کێلگە تێکراییەکاندا ، ئەندازیاری بیناسازی (الهندسة المعماریە) فرمانێکی میللەت بو کە خەلکی بەرەو پیری دەچون ، هەروها رۆژنامەکان بە دورو

درێژی هەواڵی راستەقینەی ئەندازیاریانەیانی دەربارەی ئیشە مەزنەکانی کە ئەندازیارەکان هێناو یانە تەدی ، بلاویان دەکردەوە. خەلکی بە دەشت و بیابانەکندا بلاوبونەوە ، ئاوەدانیان دەکردەوە ، وە لە دەوروبەری دامەزراوە پیشەسازیەکان گەلێك شاری گەورەیان دروست کرد ، گەلێك رێگای نوێیان کردەوە ، جۆگە و ئاو بارەی زۆریان دروست کرد کە روبارەکان بە یەکتری بگەیەنێت ، گەلێك هێلی ئاسنین یان راکێشا زۆربەی شەمەندەفەرەکان بەکارەبا دەرویشتن ، گەلێك فرۆکە خانە ، و رێگای ئاسمانیان دروست کرد ، کارگەی کیمیا ، و تفاقی جەنگی ، و کارگەی ئامێرەکانیان دروست کرد ، بەمە یەکێتی سۆفیت دەستی کرد بە دروست کردنی ، بەرهەم هێنانی تراکتور ، و ئوتوموبیل و شەمەندەفەر ، و

موتور ، و مەکینەی کارەبا ، و فرۆکە ، لەناوچەیەکی فراواندا کارەبا بلاوبوەوە هەروها بەکارهێنانی رادیویشی ئیشی بە تەواوی نەما ، چونکە خانو دروست کردن ، و ئیشەکانی تر پێویستیان بە هومو کرێکارێك هەبو ئەگەر ببوایە گەلێك ئەندازیار لەدەرەوە بۆ ئیش کردن هاتنە ئەوی بەخێر هاتینان دەکردن ،ئەوی شایانی باسە ، ئەم کاتە ، کاتی تەنگو چەلەمە ئابوریەکە بو ، لە رۆژئاوای ئەوروپا ، و ئەمەریکادا ؛ بێئیش لەوی بە جۆرێکی ترسناك بلاوبو یوەوە.

پرۆژە پێنج ساڵیەکە ، تەواو بەئاسانی تێپەری ، روسیا توشی هەندێك زەحمەتی و ناتەواوی لە گونجاندن دا هات ، بو بەهۆی هەندێك زیانی ، بەلام سەرەرای ئەمە بەردەوام بون لە ئیش کردندا ، وە بەرێوەبردنی بەگەرم وگوری ، و بۆ پێشەوە بردنی بە توندی پێویستی بەتێکۆشانێکی زۆر و هەمیشەیی هەبو ، ئیتر لەم کاتەدا دورشمی "پرۆژە پێنج ساڵیەکە لەچوارساڵدا" هاتە کایەوە ، هەروەکو پێنج ساڵەکە ماوەیەکی کورت نەبو بێت بو بەئەنجام گەیاندنی بەرنامە سەر سور هێنەرەکە. بە رەسمی پرۆژەکەیان لە ٣١ دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٢ز. دا تەواو کرد واتە دوای تێپەر بوونی چوار ساڵ بە سەر دەست پێ کردنیدا. ئنجا لە یەکی کانونی دوەمی ١٩٣٣ز. دا دەستیان کرد بەجێ بەجێ کردنی ، پرۆژەیەکی تازەی پێنج ساڵی تر.

گەلێك لەخەلکی لە پرۆژە پێنج ساڵەکە دوان ، و باسیان کرد هەیانبو لەو باوەڕەدا بو کە سەرکەوتنێکی تەواو سەرکەوتوە، وە دیسانە هەبو لەو باوەڕەدابو کە سەرنەکەوتوە ، زۆر ئاسانەکە بڵێین لەکوێدا سەرنەکەوتوە ، چونکە بەراستی هەر چیەکی دەیان ویست نەهاتە دی. هەمو شتێك لە روسیادا نارێك بو ، گەورەترین ناتەواوی کەبە دەستیەوە پەریشان بون ، کەمی پسپۆر و ، کرێکاری شارەزابو ، گەلێك کارگەی مەزن هەبو زیاتر لە ئەندازیارە کانی ، کەوا بەرێوەبردنیان پێویستن ، واتە چێشتخانە زۆرتربو لە چیشت لینەر دیارە ئەم ناریکیەیە ، دەبو خێرا نەمایە ، وەیا بەلای کەمەوە دەبو وردە وردە کەمتر بوایەوە تاکە شتێك کە زەق ودیار بو ، ئەوەبو پرۆژە پێنج ساڵیەکە ، روخساری روسیای گۆڕی. لە دەوڵەتێکی دەرەبەگی ، و دواکەوتوەوە یەکسەر بازیدا بو بە دەولەتێکی خاوەن پیشەسازی پێشکەوتو ، هەروها رۆشنبیری و کارگوزاری کۆمەلایەتی ، و تەئمینی تەندروستی ، وە تەئمین دژی کارەساتەکان ، ولێ قەومان گەلێك بیشکەوت لەهەمو دەولەتیکی تر زیاتر ، سەرەرای نەبونی ، و بیویستی ، ترس لە بێئیشی و ، برسێتی کەوا شمشێری ملی کرێکارانن بە تەواوەتی نەما ، میللەت هەستی بە دڵینایی ئابوری دەکرد.

ئیتر مشتومڕ لە بابەت سەرکەوتن وەیا سەرنەکەوتنی پرۆژە پێنج ساڵەکە هەرگیز لەجێی خۆیدانیە ، چونکە وەلامەکەی دەتوانین بدەینەوە و بزانین بەسەیر کردنی باری ئەمروی یەکێتی سۆڤیت ، ئەوی جێی تێبینیە ئەم پرۆژەیە سەرنجی جیهانی تێکرا ڕاکیشا ، هەمو ئێستا باسی "نە خشەدانان" وپرۆژەی پێنج ساڵی و دە ساڵیەکان دەکەن ، سۆڤیت ئەفسانەیەکی تایبەتی دا بەم وشەیە.

# سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی سوڤیێت لەتەنگانەکانیدا کە توشی هاتبو

## ١١/یولیو/١٩٣٣

پرۆژە پێنج ساڵیەکە زۆر زل و گەلێك گورانکاری مەزنی تێدابو ، لە مەیدانی کشت وکاڵدا شێوازە کۆنە شەق و شرەکە کرا بە شێوازێکی نوێ لە رووی بەکارهێنانی ئامێرەکان بە جۆرێکی فراوان لەمەیدانی پیشەسازیشدا ئەم پرۆژەیە توانی زۆر بەگورجی روسیا بکات بە خاوەن پیشەسازی ، بەڵام لەمانە هەموی گرنگ تر ، ئەو گیانە بو کە پشتیوانی ئەمەی دەکرد کەوا گیانێکی نوێ بو لەسیاسەت وپیشەسازیدا ، ئەمیش گیانی زانیاری بو کەوا تێدەکۆشا شێوازی زانیاری لە دروستکردنی کۆمەلگەدا بچەسپێنی ، لەم جۆرە هەرگیز لە هیچ ولاتێکی تردا رووی نەداوە تەنانەت لە ولاتە پێشکەوتوە کانیش دا ، چەسپاندن و بە ئەنجام گەیاندنی شێوازی زانیاری لەکاروباری مرۆڤایەتی و کۆمەلایەتیدا گرنگ ترین شت بو لەنەخشە دانانی سۆڤیت دا . لەبەر ئەمە دەبینین هەمو جیهان باسی نەخشەدانان دەکات ، بەڵام جێبە جێ کردنی ئەم نەخشە دانانە لە رژێمێکی کۆمەڵایەتی وەکو سەرمایە داریدا زۆر زۆر زەحمەتە چونکە ئەم رژێمە لەسەر بەربەرەکانی وبەپاراستنی بەرژەوەندیەکانی چەند کەسانێك ومولك ومالیانەوە بەندە .

بەڵام کچم هەروەکو لەپێشەوە پێم وتیت لەگەل پرۆژە پێنج ساڵیەکەدا تەنگا ، ومەینەتی هاوشانی بو لە پێناوی تەواو کردنی و هێنانە دیدا ، بۆیە لەسەر دانیشتوان نرخێکی زۆر کەوت گەلێکیان ئەم نرخەیان بە ئارەزووی دڵی خۆیان پێشکەش کرد ، گەلێك لە خۆبوردن و کوێرەوەریان چەند ساڵێك نۆشی ، بەتەمای ئەوەی کە لەپاشە رۆژدا وەزع وباریان باش دەبێت. وە هەندێکیش ئەم نرخەیان بەنا بەدڵی پێشکەش کرد ، چونکە حوکومەت بۆ ئەمە زۆری لێدەکردن لە هەمو چینێك زیاتر کە توشی چەرمە سەری بو ، چینی کۆلاك وەیا فەلاحە دەولەمەندەکان بو ، ئەمانە ،

سەبارەت بە ـ سامان و دەسەڵاتیانەوە ـ       نەدەگونجان لەگەڵ پرۆژەکەدا چونکە ئەمانە سەرمایەدار بون. بۆیە تەقەلابان دەدا کە لە دروست کردن و پەرەپێدانی کێڵگە تێکراییەکاندا لەسەر بنچینەیەکی سوشیالیستی کۆسپ بهێننە بەریان ، هەندێ جار بەرهەڵستی دروست کردنی ئەم کێڵگەیانەیان دەکرد ، و هەندێ جاری تریش دەچونە ناویەوە ، تاکو لە ناوەوە لاوازی کەن وبێتەپێنن ، و نەهێڵن هیچ قازانجێکی هەبێت ، وە حوکومەتی سۆڤیتیش بو ئەمانە لەسەر بیبو. ئیتر زیاتر تینی بۆ ئەمان ، و چینەکانی ناوەراست دەهێنا کەوا گومانی جاسوسی و ناپاکی لێدەکردن لەگەڵ دوژمنانی ولاتەکەدا. ئەوانی کە بە حەبس کردن سزادران ژمارەیەکی زور بو لە ئەندازیاران ، ئنجا لەبەر ئەمە کە ولات زۆر پێویستی بە ئەندازیاران هەبوو ، ئەمە گەلێك زیانی گەیاند بە خودی پرۆژەکە. دیسانەوە گەلێك جار نارێکی و نەگونجانیش هەبو رژێمی گواستنەوە (المواصلات) زۆر دواکەوتوبو ، لەبەر ئەمە ئەو شتومەکانەی کە کارگەکان دروستیان دەکرد بە ناچاری ماوەیەکی دورو درێژ دەمایەوە ، و چاوەروان بو ، دیارە ئەمە لە هەندێ شویندا تەگەرەی لە ئیش کردن دەدا ، بەلام گەورەترین کێشە کە توشیان هات کەمی شارەزا یان و پسپۆرانی لێهاتو ، و کارامەو ، ئەندازیاران بو.

جیهانی دەرەوەیان ـ جیهانی سەر مایەداری ـ لە سەردەمی پرۆژە پێنج ساڵیەکەدا دوچاری توندترین کێشە ئابورریەکان بوبو ، کەوا پێیدا تێ دەپەری ، بازرگانی بازاری نەبو ، کارگەکان داخرابون ، کرێکاران بێ ئیش بوون ، فەلاح و ئەوانەی پیشەیان کشتوکاڵە لە هەمو لایەکی جیهاندا جەزرەبەیەکی خراپیان خوارد ، لە ئەنجامی هاتنە خوارەوەی نرخی تفاقی خواردەمەنی و کەرەسەدا. ئەگەر پەرنورێکی ئەم وەزع و بارانە بکەین ، لەکەل وەزع و بارە کانی ناو یەکیتی سوفیت لەوکاتەدا دەبیتین یەکیتی سۆڤیت جیاواز بو بە بزوتنەوەیەکی بەردەوام ، وهیچ کرێکارێکی بێ ئیشی تێدانەبو. دیسانەوە یەکێتی سۆڤیت کێشە ئابوریە جیهانیەکە کاری تێنەکردبو ، چونکە بنچینەی ئابوری تەواو جیاواز بو ، بەلام لەگەل ئەمەشدا لەئەنجامی لابەلای ئەو کێشەیە رزگاری نەبو ، وەبو بەهۆی زیادبونی نەنگ و چەلەمەکانی. لەپێشدا پێم وتیت کە سۆڤیت ئامێرەکانیان

لە دەرەوە دەکڕی ، وە لە ئەنجامی فرۆشتنی بەرو بومی کشتوکاڵیەکانیان بەدەولەتە بێگانەکان نرخی ئامێرەکانیان دەدا ، ئنجا کە نرخی ئەم تفاقی خواردەمەنیە لە بازاری جیهانیدا هاتە خوارەوە لەگەل ئەمەدا نرخی بەروبومی کشتوکالەکانیشان کە دەیان فروشت ئەویش هەمان دەستور هاتە خوارەوە ، ناچاربون بەروبوم زیاتر بنێرنە دەرەوە هەروها میقدارێکی زۆریش لە زێر تا بتوانن نرخی ئامێرەکان بدەن ، بەم جۆرە هاتنە خوارەوەی نرخەکان زیانی‌یەکی زۆری دا لە سۆڤیت ، ئیتر ئەوی بەتەمای بون ، و دایان نابو سەرو ژێرهەڵی گێرایەوە ، هەروها بو بە هۆی ناتەواوی پێداویستیەکان لە ولاتەکەدا ، سەرەرای گەلێك زەحمەتی تریش.

ئەوی ئەم زەحمەتی ، و سەغلەتی‌یەی سەخت تر کرد ئەوە بو لە کاتێکدا کەتفاقی خواردە مەنی لە کەم بۆنەوەدابو ، ژمارەی دانیشتوان لە هەمو لایەکی ولاتدا ئەویش لەزیادبوندابو ، ئەم زیادبونە نە دەگونجا لەگەڵ پێشکەوتنی بەروبومی کشتوکالدا ئەمە سۆڤیتی توشی کێشەیەکی گەورە کرد ، دانیشتوانی سۆفیت پێش شۆرشەکە (١٣٠) ملیون کەس بو ، کەچی لە ساڵەکانی دوای شۆرشەکەدا سەرەرای ئەو ژمارە زۆرە لە خەلك کەلەکیسیان چو لەشەرو شۆری ناوخودا بەم جۆرە بو:

لە ساڵی ١٩١٧ ژمارەی دانیشتوان ١٣٠ ملیون کەس بو

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| = | = | ١٩٢٦ | = | = | ١٤٩ | = | = | = |
| = | = | ١٩٢٩ | = | = | ١٥٤ | = | = | = |
| = | = | ١٩٣٠ | = | = | ١٥٨ | = | = | = |
| = | = | ١٩٣٣ | = | = | ١٦٥ | = | = | = |

واتە دانیشتوان ٣٥ ملیون کەس زیادیان کرد لەماوەی پانزە ساڵ کەمتردا ، بەراژەی ٢٦٪ کە ئەمە راژەیەکی زۆر بەرزە.

هەر بەتەنها سەرجەم دانیشتوانی یەکێتی سۆڤیت زیادی نەکرد بو بەلکو ژمارەی شارەکانیش دیسانەوە زیادیان کردبو ، شارە کۆنەکان فراوان و گەورەتر بوبون ، شاری نوێی خاوەن پیشەسازی لەبیابان ودەشتەکاندا دروست کرابو ، گەلێك لەفەلاحەکان لە دێهاتەکانیانەوە چوبونە شارەکان ، چونکە ئیش کردن لە پرۆژە مەزنەکاندا ، بو بە ئەنجام گەیاندنی پرۆژە پێنج ساڵیەکە هێنابونی. لە ساڵی ١٩١٧ز. دا لە یەکێتی سۆڤیت دا بیست

چوار شار هەبو ، ژمارەی دانیشتوانی هەر یەکێکیان لەصەد هەزار زیاتر نەبو ، لە ماوەی پانزە ساڵدا سۆڤیت زیاتر لە صەد شاری خاوەن پیشەسازیان دروست کرد ، لە ماوەی نێوان ساڵی ١٩١٣ تا ١٩٣٢ ژمارەی دانیشتوانی شاری (مسکۆ) لە ٦٠٠ر٠٠٠ر١ بو بە ٢٠٠ر٠٠٠ر٣ کەسی وە دانیشتوانی شاری (لینینغراد) ملیونێکی تریان زیاترکرد بو بە نزیکەی سی ملیون ، دانیشتوانی شاری (باکو)ی پشت قەفقاس لە ٣٣٤ر٠٠٠ بو بە ٦٦٠ر٠٠٠ کەس ، سەرجەم دانیشتوانی شارەکان لە ساڵی ١٩١٣دا کە بیست ملیون بو تا ساڵی ١٩٣٢ بو بە (٣٥) ملیون کەس.

ئەو فەلاحەی کەوا دێکەی خۆیی بەجێ دەهیشت و دەهاتە شار ، وە دەبوبە کرێکار تیایدا دیارە تفاقی خواردەمەنی بەرهەم نەدەهێنا ، هەروەکو لە دێکەی خۆیدا دەی کرد. ئەم فەلاحە لە شاردا ئامێرو کەل وپەلی دروست دەکرد ، تفاقی خواردەمەنیشی بەکار دەهێنا. ئیتر ئەم دەبوبە ، بەکارهێنەری تفاقی خواردەمەنی ، نەك بەرهەم هێنەر ، ئەم رەوکردنە کە لەلادێکانەوە رووی کردە شارەکان بە جۆرێکی فراوان بەرهەم هێنەرانی تفاقی خواردەمەنی کەم کردەوە، وکردنی بە ، بەکارهێنەری ئەم تفاقە ، ئەمە هۆیەك بو کە چونبێتی بارو ، وەزعی تفاقی خواردەمەنی ناهەموار کرد.

هۆیەکی تریش هەبو: پیشەسازی تازە پێگەیشتو زۆر پێویستی بەکەرەسە (مواد خام) هەبو کارگەکانی قوماش پێویستیان بە لۆکە هەبو لەبەر ئەمە دەستیان دایە چاندنی لۆکە ، لەزۆربەی ئەو زەویانەدا ، کە لەپێشدا بە تفاقی خواردەمەنی دایان دەچاند ئەمەش سەرچاوە کانی خواردەمەنی کەم کردەوە.

زیادبون و پەرەسەندنی دانیشتون لە یەکێتی سۆ ڤیت دا خۆی لە خۆیدا نیشانەیەك بو لە نیشانەکانی خۆش گوزەرانی ، ئەم زیادبونە لە ئەنجامی رەوکردنەوەوە ، نەبو کە لە دەرەوەی وڵات و هەندەرانەوە هاتبن هەر وەکو لە ئەمەریکادا رووی دا ، بەلکو لە ناوەوەبو ئەمە مانای وایە سەرەرای ئەو هەمو تەنگوچەڵەمانەی کە توشی خەلکی ئەوی هات کەچی تێکرا هیچ گرانی ، و برسییەك رووی نەدا ، رژێمی کوبون (البطاقة) بە توندی پەیرەوکرا ، و هەمو کەسێك بێداویستی ژیانی خۆیی دەست دەکەوت.

چاودێرە بۆ لایەنە لێهاتووەکان وتویانە ئەم زیادبون وپەرەسەندنەی دانیشتون وا خێرا سەربارەت بەوەبوە کە دانیشتوان هەستیان بەدڵنیایی ئابوری کردوە لە مەولا منداڵ نابێتە گرانباریەك بە ئەستۆی خیزانەوە مادام دەولەت ئامادەیە ئاموزگاریان بکات و خواردنیان بداتی ، وپێیان بخوێنی وفێریان بکات. هوویەکی تریش بو ئەم زیادبون وپەرەسەندنە هەبو ئەویش بڵاوبونەوەی پاك و خاوێنی و شێوازەکانی تەندروستی بو کە مردنی منداڵانی کەم کردەوە بە جۆرێك لە هەزاردا (٢٧) بو بە (١٢) لە هەزاردا ، بۆ نمونە لە شاری موسکودا رێژەی مردنی منداڵ لە ساڵی ١٩١٣ دا لە هەزار منداڵ دا زیاتر لە ٢٣ منداڵ نەدەما ، بەلام لە ساڵی ١٩٣١ دا کەم بوە وە گەیشتە لە هەزاردا (١٣) منداڵ.

دیسانەوە ئەوی زیاتر کێشەی ناتەواوی خواردەمەنی ئالۆز کرد بێبارانی بو لە هەندێ لەناوچەکانی یەکێتیەکەدا ، لە ساڵی ١٩٣١ دا هەروها لە ساڵانی ١٩٣١ و ١٩٣٢ لە رۆژهەڵاتی دوردا ، نارمایی جەنگ دەهاتە بەرچاو ، سوڤیت ترسان کە نەوەك ژاپونیەکان بە هاوکاری دەولەتە سەرمایەدارەکانی تر شەریان پێ بفرۆشن دەستیان کرد بە داکردنی (خەزن) دەغڵ و دان تاکو کاتی پێویستیدا بیدەن بە لەشکرەکانیان چونکە پەندێکی پێشینانی روس هەیە دەڵێت: "ترس چاوی زەقە" ئەم پەندە چەند راستە منداڵی بچوك ، و هەیئات و میللەتانیش دەگوێتەوە ، لەبەر ئەوەی سەرمایەداری واز لە شیوعیتی ناهێنی بە هێمنی و دڵنیایی بژی ، دەولەتە سەرمایەدارەکان هەمیشە تەقەلا دەدەن کە شیوعیتی بفەوتین ، وە بو ئەم ئامانجە براوە دەکەن و تێدەکۆشن ، لەبەر ئەمە دەمارى بولشەفیکەکان هەمیشە کرژە ، بۆیە دەبینین بە بچوکترین هەڵچون (الاثارة) رادە چڵەکێن و چاویان دەکرێتەوە ، لەم ترسەدا هەقیانە چونکە گەلێك جار تەمنانەت لەناو ولاتەکەی خۆیاندا دوچاری تەقەلای روخاندن و ، وێرانکاری کارگە و پرۆژە کانیان هاتون.

ساڵی ١٩٣٢ لە مێژووی یەکێتی سۆڤیت دا زۆر تەنگانەبو ، ئەنجا حوکومەتی سوڤیت چەند هەنگاوێکی نا ، زۆر بە توند سزەواندیبە ئەوانەی کە وێرانکاری دژی پیشەیانە و شتومەکی کۆمەلکە دەدزن هەروەکو لە کێڵگە هەرەوەزیەکاندا رووی‌دا. بریاردان بە کوشتن (الحکم بالأعدام) کەپێشتر لە

روسیادا نەبو ، ئەم بریارەیان هێنایەکایەوە ، سزای ئـەوانـە بـدەن کـە دەیانەوی زیان بە شۆرشەکە بگەیەنن. لەپاشا حوکومەتی سۆڤـیـت بـڵاوی کردەوە کە: درینی شتەمەکی کۆمەڵگە هەروەکو زیان گەیـانـدن وایـە بـە شۆرشەکە بویە سزاکەی کـوشـتـنـە ، لـەم رووەوە (سـتـالـیـن) وتـی: "سەرمایەدارکان خاوەندایەتی و موڵکایەتی تایبەتی بەشتێکی پیرۆز دادەنین کە نابێت دەست درێژی لێبکرێت ئەمە لە پێناوی بە هیێز کردنی رژێـمـە سەرمایەداریەکەیاندا ، ئێمە مانانی شیوعیـش بـۆیـە خـاوەنـدایـەتـی و موڵکایەتی گشتی بەشتێکی پیرۆزدا دادەنین کـە نـابـێـت دەسـت درێـژی لێبکرێت تاکو رژێمە سوشیالیستیەکەمان بە هێز کەین"

ئنجا حوکومەتی سوڤیت بە چەند کرد و کوشێکی نوێ هەستا بـۆ سـوك کردنی تەنگانەکە ، لە هەمویان گرنك تر ئەوە بو کە رێی‌دا بە کێـڵـگـە هەرەوەزیەکان و تایبەتیەکان کە زیادی بەروبومیان لە بازاردا بفـرۆشـن ، ئەمەش ئەو کردارانەمان بیر دەخاتەوە کە حوکومەت لە (سیاسەتە ئابـوریـە نوێ کەیدا لە سەری دەروێشت) ، دوای ماوەی شیوعیتیە سوپاییـەکـە لـە ساڵی ١٩٢١ز. دا ، بەڵام ئێستا یەکێتی سۆڤیت جیاوازە لەوسا ، گەلـێـك هەنگاوی فراوانی ناوە لە رێبازی سوشیالیستی پیشـەسـازی کـردنـدا ، وە زۆربەی کشتوکاڵەکەی هەرەوەزیە.

لە نێوان ساڵانی ١٩٢٩ تا ١٩٣٣ نـزیـکـەی (٢٠٠ر٠٠٠) کـێـڵـگـەی هەرەوەزی ، و کێڵگەی حوکومەتی دروست بو(١) ئەم کێڵگە حوکومەتیانـە نمونە بون تاکو ئەوانی تر پەیرەویان بکەن ، هەندێکیان پان و بەرینن ، لەم ماوەیەدا (١٢٠ر٠٠٠) تراکتور خراپە کار ، هەروها لە سێ بـەش دو بەشی فەلاحەکان بون بە ئەندام لە کێڵگە هەرەوەزیەکاندا.

لەوی لایەنێکی تر هەبوو کە زۆر پێش کەوت ئەویش رێکخراوانی باربو وە یارمەت دان بوو کۆمەڵانی شت و مەك بەکارهێنەرەکان (الجمعیات المستهلكين التعاونية) لە ساڵی ١٩٢٨ دا (٢٦ر٥٠٠ر٠٠٠) ئەندامی هـەبـو بەڵام لە ساڵی ١٩٣٢ دا بوون بە (٧٥ر٠٠٠ر٠٠٠) ئەندام ئـەم کـۆمـەڵانـە زنجیرەیەك لە مەخزەنی گشتی (الجملة) ، وە دانەیان (المفرد) لە هەمـوو لایەکی یەکێتی یەکەداهەبوو.

مانگی کانونی دووەمی ۱۹۳۳ دەست کرا بە پرۆژەی پێنج ساڵی دووەم ئامانجی ئەم پرۆژەیە پیشەسازی سووکە بو تاکو خێرا رادەی گوزەران بەرزبێتەوە ، حوکمەت بە ئومێدی ئەوەبو کە پاداشی خەلکی بداتەوە دوای ئەو هەموو رەنجەی دایان لە پرۆژە پێنج ساڵیە یەکەمەکەدا چونکە ئیتر پێویستیان بە کرینی ئامێرەکان نەبو لە دەرەوە لەبەر ئەوەی پیشەسازیە قوورسەکانی سۆڤیەت ئەوی پیویستیان پێی بوایە دەیدانی دیارە ئەمە لە گران باری ناردنە دەرەوەی میقدارێکی زۆری تفاقی خواردەمەنی رزگاری کردن تاکوی ئەوەی دەیگرن بەو تفاقی خواردەمەنیە نرخەکەی پێشکەش نەکەن.

(ستالین) لە ساڵی ۱۹۳۳ دا لە کۆنگرەی فەلاحەکانی کەوا لە کێلگە هەرەوەزیەکاندا ئیشیان دەکرد ووتی:

یەکەمین ئامانجمان خۆش گوزەرانی فەلاحە هەرەوەزیەکانە ، بەڵێ ئەی هاورێیان بۆ ئەوان خۆش گوزەرانیمان دەوێت ، هەندی کەس دەڵێن: ئەگەر گەیشتینە سوشیالیستی ئیتر بۆچی ئیش بکەین: خۆ پێش تر ئیشمان کردووە ئێستاش ئیش دەکەین ، ئایا وەختی واز لە ئیش هێنان نەهاتووە؟ من وەڵام دەدەمەوە دەڵێم: نەء چونکە سوشیالیستی بنچینەی ئیش کردنە سوشیالیستی ئیشی لە هەمو کەسێك دەوێت بە دلسوزیەوە ، ئەم ئیش کردنە بۆ کەسیتر و ، دەولەمەندە کان ، و چەوسێنەرەوەکان نا ، بەلکو هەر بۆ خۆیان و بۆ کۆمەلگە.

ئیش هەردەمێنی ، وە دەبێت هەر بمێنی ، گەرچی سوك تر ، و ئاسانتر دەبێت لە چاو ساڵانی یەکەمدا ، ئەو بیروڕایەی کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا هەیە کە دەڵێت: "ئەوی ئیش نەکات نا خوات" راستە گەرچی بولشەفیکەکان هاندەرێکی نوێ یان خستە سەر ئیش کردن ئەویش چاککردنی کۆمەلگە ، و بەرزکردنەوەیەتی. لە رابوردودا ئەم هاندەرە (الحافز) توانای چەند کەسانێك و خاوەن بیروڕابەرزەکانی (المیثالیین) دەجولاند بەڵام لە پێشدا هەرکیز میللەتیکی تیکرا نەدەجولاندەوە ، وەکو لەیەکیتی سوفیت دا رووی دا ، بنچینەی ئەو بیروڕایەی کە سەرمایەداری لەسەر بنیان نرا پریتیە لەبەربەرەکانی (التنافس) و ، سودی تاکە

زەلامێك (الربح الفردي) كە ئەمەش هەمیشە لە سەرشان و حیسابی خەلكی‌تر پەیدا دەبێت ، ئنجا هاندەری ئەم سودی تاكە زەلامە ، لە یەكێتی سۆفیتدا خەریكە نامێنی[٢] و هاندەری گشتی دێتە جێی ، نوسەرێكی ئەمە رێگایی نوسویەتی دەڵێت: كرێكارانی روسیا فێردەبن كەوا. "سەبارەت بە پشتیوانی یەكتری كردن ، و پشت بەیەكتری بەستن لە نەبونی ، و ترس ئازاد دەبن" ئیتر بە نەمانی ترس لە هەژاری ، و دڵینا نەبون ، وەریشە كێش كردنیان ، كە لە هەمو لایەكدا بونەتە موتەكەی سەر سنگی خەلكی ، نەمانی ئەمانە خۆی لەخۆیدا كارێكی پیرۆز و مەزنە. راستە دەڵێن بە نەمان و ریشە كێش كردنی ببڕای ببڕی ئەم ترسە ، سنورێكی بۆ نەخوشیەكانی عەقل و شێت بون داناوە لە یەكێتی سۆڤیتدا.

سەرەرای‌ئەم هەمو ساڵە سەختانە یەكێتی سوفیت لە هەمو كۆڕ و مەیدانەكاندا گەشەی كرد ، هەر چەندە ئەمەش گەلێك زەحمەتی ، و نارێكی تێدایە ، پیشەسازیەكان و شارەكان لە هەمو لایەكدا پەرەیان سەند كێلگە تێكراییەكان ، و كۆمەلە مەزنەكانی پاربو ، و یارمەتدان پەیدابون بازرگانی بوژایەوە ، ژمارەی دانیشتوان زیادی كرد ، رۆشنبیری ، و زانیاری ، و فێركردن بڵاوبونەوە ، و پەرەیان سەند ، سەرباری ئەم هەموە یەكێتی ، و یەكگرتنی میللەتە جۆر بە جۆرەكانی كە لە یەكێتی سۆڤیتدا دادەنیش ، هەر لە دەریای بەلطیقەوە تا دەریای باسفیكی ، وە لە جیاكانی (بامیرو ، هیندكوش)ەوە تا ناوەراستی ئاسیا بەهێز بو.

من خۆم زۆر حەز دەكەم لە بابەت پێشكەوتنی فێركردن وزانیاریەكان ، رۆشنبیریەوە لە یەكێتی سۆڤیتدا بۆت بنوسم لەگەل ئەمەشدا خۆم دەكرم ، كچم كورتە باسێكت بۆ دەكەم كە لە هەندی رووەوە لەلات گرنگە. گەلێك لە چاودێرە لێ هاتوەكان رژێمی فێركردن لە روسیادا بە باشترین وبەرزترین رژێم دادەنێن كە لە جیهاندا هەیە ، نەخوێندەواری بە تەواوی نەماوە ، ئەوی جێی سەرسام بوونە ، ئەوپێشكەوتنە مەزنەیە كە لە ناوچە دواكەوتوەكانی وەكو (ئوزبەكستان و توركمانستان) وناوەراستی ئاسیادا پەیدابوە ، ئەم ناوچەیە لە ساڵی ١٩١٣ دا (١٢٦) قوتانجانەی تێدابو كە (٦ر٢٠٠) قوتابی هەبو ، ئیتركە ساڵی ١٩٣٢ كە هات تەنانەت ئەم

ناوچەیە خۆی (٦٩٧٥) قوتابخانەی تێدابو کە (٠٠٠ر٧٠٠) قوتابیان هەبو لە سێیەکی زیاتر کچ بون ، وە پەیرەوی بە زور بێ خوێندنیش هاتەکایە وە ، کچم تاکو بتوانێت لەم پیشکەوتنە سەرسام هێنەرە تێبگەیت ، دەبی لە بیرت نەچێت کە کچان تائەم نزیکانەش بە تەواوی دورە پەرێز بون.هەرگیز رێیان نەدەدان بێنە دەرەوە لەناو ئەم بەشەی ئەم جیهانەدا. دەڵێن هۆی ئەم خێرا پێشکەوتنە ، هێنانی بێتە لاتینیەکان بو کەوا فێرکردنی سەرەتایی زۆر ئاسانتر کرد لە چاو پیتەکانی پیشتر بەکاردەهێنران. کچم رەنگە لە بیرت بێت کە باسی (مستەفا کەمال) م بو کردبێت کە لە جیاتی پیتی عەرەبی پیتی‌لاتینی بەکارهێنا ، ئەم لە تەجروبەکەی سۆڤێتەوە ئەم پیتانە وبیروراکانی وەرگرت ، دوای ئەوەی دەستکاری کران تاکو لەگەل زمانەکانی تر دا بگونجێت ، جمهوریەتەکانی قەفقاسیا لە ساڵی ١٩٢٤ز. دا وازیان لە پیتی عەرەبی هێنا ، ودەستیان کردبە ، بەکارهێنانی بێتە لاتینی‌یەکان ، ئەمە گەلێك یارمەتی نەمانی نەخوێندەواری دا ، تەنانەت گەلێك لە نەتەوەکانی تری وەکو (چین) ، و تورك ، و تاتار ، و بوریا ، و باشگیر ، و تاجیکەکان هەمویان ئەم پیتە لاتینیەیان بەکارهێنا ، وە زمانی ناوچەکان هەر بەکار دەهێنرا بەڵام تەنها شێوازی نوسینەکانیان گۆرا.

کچم دەبێ بزانیت کە لە سێ بەش دو بەشی هەمو قوتابیەکان لە یەکێتی سۆڤیتدا بەخۆرایی خواردەمەنی گەرم و گور دەخۆن ـ دیارە ـ هەروها خوێندن و فێرکردنیش دیسانەوە بە خوراییە ، ئەمە پێویستە لە دەولەتی کرێکاراندا هەبێت.

پەرەسەندنی بێ‌خوێندن ، و پێشکەوتنی بو بە هۆی پەیدابوونی دەستە و تاقمێکی زۆری خوێندەواران لەوانەیە چاپکراوەکان چ لە کتیب ، و چ لە رۆژنامەکان لە یەکێتی سۆڤیتدا لە هەمو ولاتێکی تر زیاتر بێت ، زۆربەی ئەم کتیبانە راستەقینە ، و "گرانن" لەو کتێبە سوکانە نین کە لە ولاتانی تردا بو رابواردن ، و وەخت کوشتن هەن ، کرێکاری روس گەلێك بایەخ دەدات بەکارو باری هەندەسە ، و کارەبا ، تا رادەیەکی وا خوێندنەوەی ئەم بابەتانە پەسند دەکەن ، بەسەر خوێندنەوەی چیرۆکەکاندا بەڵام منداڵان خوشترین کتیبیان هەیە بە چیرۆکە خەیالی‌یە کانیشەوە ،

گەرچی من لەو باوەرە دام کە بولشەفیکە توخەکان حەز بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە کتێبە خەیالیانە ناکەن.

بەڵام روسیا لە رووی زانیاریەوە گەیشتە پلەی یەکەم ، چ لە زانیاریە نەزەریەکان وەیا زانیاری تەتبیقی دا (العلوم التطبيقية) گەلێك کولیج و مەعهەدی گەورە گەورەیان بۆ هەمو بەشە جۆر بە جۆرەکانی زانیاریەکان کردەوە ، هەروها گەلێك شوێنی تاقی کردنەوەیان (المحطات التجريبية) دروست کرد. بو نمونە لە (لینینغراد)دا مەعهەدیکی زۆر زل هەیە بو دەراسە ، و لێکۆڵینەوەی دروست کردنی روەك (صناعة النباتات) کەوا لە (٢٨٠٠٠) جۆر لە جۆرەکانی گەنمی تێدایە ، ئەم مەعهەدە ئیستا لەوە دەکولێتەوە کە هەستن بە تاقیکردنەوەی تو و کردنی چەڵتوك بە هۆی فرۆکەوە.

کۆشکی قەیسەرەکان ، و خانەدانە کۆنەکان گران بە مۆزەخانە (المتحف) و جێی حەساندنەوە ، و چاك بونەوە ، میللەت بەکاریان دێنی نزیك (لینینغراد) شارێکی بچوك هەیە پێی دەوترێت (دێی قەیسەر) چونکە دو کوشکی قەیسەری لێیە ، وە هاوینە هەواریئەو بوە ئێستا ناوەکەی گۆرراوە ، و کراوە بە (دێی منداڵان) چونکە ئێستا منداڵان ئەم دوو کۆشکە بەکاردینن ، منداڵان و نەوەی تازە پێگەیشتو ، لە وڵاتی سۆڤیتدا باشترین کرداریان لەگەڵدا دەکرێت ، چاکترین شتیان دەدرێتی گەرچی کەسی تر نەی بێت ، نەوەی ئیستا لە پێناوی ئەم منداڵانەدا تێدەکۆشن ، چونکە ئەمان میراتگری دەولەتە سوشیالیستیە زانیاریە کەن ، ئەگەر لەسەردەمی ئەماندا بێتە دی ، لە (موسکو) دا مەعهەدێکی گەورە هەیە پێی دەڵێن: "مەعهەدی ناوەندی لەپێناوی پاراستنی دایکایەتی و منداڵ دا".

بەڵام ئافرەتان لە روسیادا ئازاد یەکیان هەیە ، کە ئافرەتانی دەولەتانیتر نییانە ، لەهەمان کاتدا دەولەتەکەش بە تایبەتی دەیان پارێزێت ، ئافرەتان دەتوانن هەمو ئیشیك بکەن ، وە زۆریان بون بە ئەندازیار ، یەکەم بالیۆز لە ئافرەت کە حوکومەتێك دای بیت ، (مدام کولونتای) بێوەژنەکەی (لینین) بو ناوی (کروبکایا) بو ، سەرۆکی لقێك لە لقەکانی بەرێوە بەرایەتی پەروەردە و فێرکردن بو لە سۆڤیتدا.

یەکێتی سوفیت وڵاتێکە ئەو گۆڕانکاریەی هەمو سەعاتێك و هەمو رۆژێك تیایدا روو دەدات سەرسور دێنی ، لە هەمو بەشەکانی ئەم وڵاتە سەیرتر دەشتەکانی سیبریا ، و ناوەراستی ئاسیا یە ، هەردوکیان ماوەی چەنە پشتێك لەفەوبەر لە جیهان و لە شارستانی پچرابون. بەلام ئیستا لە کۆری پێشکەوتندا بە هەنگاوی زۆر زڵ بەرە و پێشەوە دەچن ، کچم ئنجا بۆ ئەوەی بیروراکەت پێشکەش کەم باسێکی کورتیلەت بۆ دەکەم لە بابەت ئەو روو داوانەی کە لە تاجیکستاندا روویان دا ، کە لە گەورەترین ناوچە دواکەوتوەکانی یەکێتی سۆڤیت دەژمێررێت.

تاجیکستان دەکەوێتە دولەکانی جیاـی (بامیر)ەوە سەرووی روباری (اکسس) لە سەر سنوری ئەفغانستان ، و تورکستانی چین دا تاجیکستان لە سنوری هیندستانە وە زۆر دور نیە. تاجیکستان بە دەست حوکمرانی ئەمیرەکانی (بخاری) وە بو کە ئەمانیش مڵ کەچی قەیسەرەکانی روس بون. لە ساڵی ۱۹۲۰ شۆرشێك لە (بخاری) دا رووی دا ، ئەمیر لابرا جمهوریەتێکی میللی سوفیتیان تیدا دامەزراند ، دوا بە دوای ئەم شۆرشە ، شەر و شۆرێکی ناوخو رووی‌دا ، (انور پاشا) کە یەکێك بو لە پێشەواکانی پێشووی تورکیا تیایدا کوژرا ، ئیتر بە جمهوریەتی (بخاری) یان ووت جمهوریەتی (ئوزبك)ی سۆشیالیستی سۆڤیتی ، وە چوەپال جمهوریەتەکانی یەکێتی سۆڤیت. لە ساڵی ۱۹۲٦ دا جمهوریەتی (تاجیك) لەناوچەی (ئوزبك) دا دروست بو ، لە ساڵی ۱۹۲۹ز. دا سەربە خۆبو ، بو بە ئەندامێك و چوەپاڵ جمهوریەتەکانی یەکێتی سۆڤیت.

تاجیکستان ئەمەی دەست کەوت گەرچی ناوچەیەکی بچوکی دواکەوتوبو ، دانیشتوانی لە ملیونێك زیاتر نەبون ، رێگا و بانی هاتوچۆی تێدا نەبو ، مەگەر رێگای کاروانی حوشتر نەبێت ، ئیتر هەر کە رژێمە تازەکە باڵی بەسەر داکێشا خێرا دەست کرا بە چاککردنی رێگا و بان ، و ئاودێری ، و کشتوکال و ، پیشەسازی ، وکارگوزاری پەروەردە و فێرکردن ، و تەندروستی ، رێگەوبان دروست کرا ، کشت کالی لۆکە پەرەی سەند ، سەبارەت بە پرۆژە تازەکانی ئاودێری‌یەوە ئەم کشتوکالە سەرکەوت ، هێشتا ساڵی ۱۹۳۱ نەهاتبوە پێشەوەکە زیاتر لە ٦۰٪ کێلگەکانی لۆکە ، وزۆربەی زەوی و زاری دەغڵ و دان ، بەپێی پەیرەوی هەرەوەزی دەبران بەرێوە ،

هەروها مەکینەیەکی کارەبا ، و هەشت کارگەی چنینی لۆکەو ، سی کارگەی دەرهێنانی جەوری لێی ، دروست کرا ، هێلیکی ئاسنی شەمەندەفەری تیادا راکێشرا کە بە (ئوزبکستان)دا تێ دەپەری ، و بەسیتەوە بە یەکێتی سۆڤیتەوە. هەروها کارگوزاری فرۆکە و ، رێی ئاسمانی دروست کرا ، وە لەگەل رێگا سەرەکیەکانی تری ئاسمانیدا پێکەوە بەسترانەوە.

لە سالی ١٩٢٥ز. دا یەك نەخۆشخانە هەبو ، بەلام لە سالی ١٩٣٢ دا بو بە (٦١) خەستەخانە و (٣١) شوێنی دانسازی هەبو کە (٢١٢٥) قەرەویلە و (٢٠) پزیشکی تێدابو ، بەلام لە کۆری فێرکردندا بە تەماشا کردنێکی ئەم ژمارانە و لێکۆلینەوەی دەتوانی کچم بریارێك بدەیت:ـ

لە سالی ١٩٢٥ تەنها شەش قوتابخانەی نوێی تێدابو.

لە کۆتایی سالی ١٩٢٦ بو بە (١١٣) قوتابخانە کە (٢٣٠٠) قوتابی تێدابو.

لە سالی ١٩٢٩ دا بو بە (٥٠٠) قوتابخانە.

لە سالی ١٩٣١ دا بو بە زیاتر لە (٢٠٠٠) مەعهەدی فێرکردن کە لە (١٢٠ر٠٠٠) قوتابی تێدابو.

دیارە بودجەی فێرکردنیش گەلێك بۆ پێشەوەچو ، بودجەی قوتابخانەکان لە سالی خوێندنی ١٩٢٩ تا ١٩٣٠ بو بە (٨) ملیون روبل (روبلیك دوشلنە وە یا دەقروشی میسریە). ئنجا لە سالی ١٩٣٠ تا ١٩٣١ بو بە (٢٨) ملیون روبل سەرەرای قوتابخانە ئاساییەکان گەلێك باغچەی ساوایان و قوتابخانەی راهێنان (مدارس التدریب) ، و کتێبخانە و ، زۆری خوێندنەوە دروست کران ، وە میللەتیش زۆر هەستی بە پێداویستی خوێندن و فێرکردن دەکرد.

ئنجا ئافرەتیش ـ کە بار تا ئەم سنورە گۆرا ـ وەکو جاران لە پشت پەچەوە ، بە دورە پەرێزی نەمایەوە ، چونکە پەچە بە گورجی دەستی کرد بە نەمان.

وا دەردەکەوێت کە ئەمانە هەموی بە ئاسانی جێی باوەر نەبن ، بەلام من ئەم هەوالانە ، و ژمارانەم لە رابۆرتی چاودێرێکی ئەمەریکایی بروا پێکراوەوە وەرگرتوە ، کە لە سەرەتای سالی ١٩٣٢ دا تاجیکستانی دیبو.

بێگومان لەو ساکەوە گەلێك شتی باشتر رووی داوە.

وادیارە یەکێتی سۆڤیت بەپارە ، و ماڵ یارمەتی جمهوریەتە ساواکەی تاجیکستانی داوە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی پەروەردە و فێرکردن و هێنانە دی ئامانجەکانی تردا ، چونکە سیاسەتەکەی لەسەر بنچینەی یارمەتدانی ناوچە دواکەوتوەکان بنیات نراوە ، وا دەردەکەوێت کە ولاتەکە پرە لە مەعدەن ، زێر ، و نەوت ، و خەلوزی بەردی تێیدا دۆزراوەتەوە. میقدارێکی زۆری زێر تێدایە ئەم کانە زێرانە لە زەمانی کۆندا ، تانەت تا زەمانی (جنکیزخان) یش سودیان لێ وەردەگرت ، ئیتر لەوساوە لێ هێناوە.

لە ساڵی ١٩٣١ دا شۆرشێکی ئاوەژوو لە تاجیکستاندا بەرپابو ، چینە دەولەمەندە کۆنەکان بەشداریان تێداکرد ، کە هەلاتبون و چوبونە ئەفغانستان و ئنجا گەرابونەوە پەلاماری ولاتەکەیان دا ، بەڵام سەرنەکەوت چونکە فەلاحەکان پشتیوانیان نەکرد.

ئەمە درێژەی کێشا و ئاڵوز بو. پێش ئەوەی کۆتایی بی بینم دەمەوێت باسی چالاکیەکانی سۆڤیت بو بکەم لە نێوکۆری دەولەتاندا: کچم دەزانیت سوڤیت پەیماننامەی (کلوج) ی ئاشتیان ئیمزاکرد ، کەوا جەنگی قەدەغەکردبو ، هەروها لە ساڵی ١٩٢٩ لە نێوان خۆیان ، و دراوسێکانیان دا پەیماننامەی (لتفنوف) یان ئیمزاکرد ، ئنجا سوڤیت پەیوەندایەتی خۆیانیان لەگەل دەولەتەکانیتر داپتەوکرد بە چەند پەیماننامەیەك لە پێناوی بە ئەنجام گەیاندنی سیاسەتەکە یاندا کە ئامانجی "قەدەغە کردنی دەست درێژی" لەگەل پاراستنی ئاشتی بو. ژاپۆن یەکێك بو لە دراوسیکانی سوڤیت کەوا هیچ پەیماننامەیەکی لەگەل سوڤیتدا ئیمزانەکرد. لە ساڵی ١٩٣٢ دا روسیاو فەرەنسە پەیماننامەیەکی دەست درێژنەکردنیان ئیمزاکرد ئەم پەیماننامەیە زۆر گرنگبو گرنك بو چونکە روسیای خستە ناو مەیدانی سیاسەتەوە لە ئەوروپا دا.

کەچی (چین) دوای ماوەیەکی دور و درێژ لە دوژمنایەتی کردنێکی بێ دەنگی ، و نەبونی پەیوەندایەتی دیبلوماسیدا ، سەر لە نوێ دانی نایەوە بە حوکومەتی سوڤیتدا ، لە کاتێکداکە هەستی بە مەترسی کرد لەلایەن ژاپونەوە کە هەرەشەی لە (منشوریا) دەکرد. ئنجا روسیا لەگەل ژاپوندا

پەیوەندایەتی دیبلوماسی پەیدا کرد ، گەرچی پەیوەندایەتی ئەم دوو ، ولاتە هەمیشە بە ناکۆکی مایەوە ، چونکە سوڤیت کۆسپیکن لە ریبازی تەماع و چاوچنوکی ژاپونیەکان لە ئاسیادا ، گەلێك جار لەسەر سنور بەکژیەکدا چون ، حوکومەتی ژاپون هەمیشە هەولی دەدا سوفیت تورەکات ، و هەمیشە هەرەشەی بە جەنگ لێ دەکردن ، بەلام روسیا بێدەنگ دەبو ، سوکایەتی پێ کردنی لە لا باشتربو لەوەی کە بجەنگێت.

بەڵام ناخۆشی نێوان ئینگلیز و روس نیشانەیەك بو لە نیشانەکانی سیاسەتی نیو دەولەتان موحاکەمە کردنی ئەندازیارە ئینگلیزەکان لە نیسانی ساڵی ١٩٣٣دا لە بو بە تۆڵەسەندن ، و تۆڵەسەندنەوە لە نێوان هەردو لایاندا ، ئنجا ئەم گێژەلوکەیە هێمن بوەوە ، وە پەیوەندایەتیەکانی نێوانیان وەکو جارانی لێهاتەوە ، بەڵام حوکومەتی (محافظ)ەکان لە بەریتانیادا سوڤیتیان خۆش ناوێت بۆیە ناخۆشیلە نێوان هەردو دەولەتەکەدا هەر دەمێنێتەوە ، کەچی لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا هەستی دەستایەتی بەستنن لەگەڵ روسیادا زیادی کرد. ئیستا سەرۆك (روزفلت) کەوتوتەکار بۆ دروست کردنی بەیوەندایەتی دیبلوماسی ئاسایی لەگەڵ روسیادا ، چونکە هیچ زۆرانبازیەك لە نێوان بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و روسیادا لە جیهاندا نییە!!

پەیدابونی حوکومەتێکی (نازی) لە ئەلمانیادا دوژمنێکی ترسناکی نوێی بۆ روسیا پەیداکرد گەرچی ئێستا ئەلمانیا ناتوانێت زیان بە روسیا بگەیەنێت ، بەڵام لە باشەرۆژدا مەتریسەکی گەورە پێك دێنێت ، تەوژمەکانی فاشیستیتی لەناو ئەوروپادا بەردەوام لە زیادبوندان.

روسیا لە کاروباری دەولەتاندا رەوشتی دەولەتێکی هەبو ، کە بە بەشی خۆی رازی بێت وەتوخونی هیچ نە دەکەوت ، لە هەمو کێشەیەك دوردەکەوتەوە ، وە تەقەلای پاراستنی ئاشتی دەدا ، بە هەرچی نرخێك بوایە ، دیارە ئەمە بە تەواوەتی ناگونجێ لەگەل سیاسەتی شۆرشگێرانەدا کە ئامانجی هاندانە بۆ شۆرش کردن لە ولاتانیتردا. روسیا لە سەرسیاسەتێکی نەتەوایەتی دەرۆیشت لە تێکۆشانیدا بۆ دروست کردنی سوشیالیستی لە ناکە ولاتێکدا ، تاکو لە هەمو کیشە و کارە ئالۆزەکان کە لە دەرەوەدین خویی لێ بپارێزیت ، ئیتر ئەمەش قایل بونی دەوێت

بەجێ بە جێکردنی بەشێك (حلول جزئية) و بەستنی پەیماننامە لەگەڵ دەولەتە سەرمایەدارەکان ، و ئیستیعماریەکاندا بەڵام ئەمە مانای هەمیشە پتەوکردنی بناغەی ئابوزی سوشیالیستی سوڤیتیە ، وە سەرکەوتنی گەورەترین پروپاغەندەیە بو چاکەی سوشیالیستی.

ئەمەیە هەڵویستی روسیای سوفیتی لە یولیوی ١٩٣٣ دا ، ئنجا کۆنگرەیەکی ئابوری لە (لندن)دا بەسترا روسیا بەشداری تێدا کرد ، هەمو هەڵیکی بەکارهێنا ، گەلێك پەیماننامەی دەست درێژی نەکردنی لە نێوان خۆی ، و هەر یەکێك لە دراوسێکانی کە ئەفغانستان ، ئێران ، ئەستونیا لاتفیا ، پولندە ، رومانیا ، تورکیا ، و لیتوا یتادا بەست بەلام ژاپۆن نەویست هیچ پەیماننامەیەکی لەگەلدا ئیمزابکات.

---

١) ئەم کۆمەڵە هەرەوەزیانە (کولخوز ، و سوفخوز)ن. کولخوز بریتیە لە کێلگە هەرەوەزیەکان کە فەلاحەکان بە ئارەزوی خۆیان دەبن بە ئەندام تیایدا ، بەڵام سوفخوز ئەو کۆمەڵە کشتوکالیانەن کە راستە و خۆ هی حوکومەتن — وەرگێری کوردی.

٢) لە بابەت ئیش کردن ، و چەوساندنەوەوە بیروڕای خەلکی لە یەکێتی سوڤیت دا بە تەواوەتی گۆڕاوە دوای جەنگی دوەمی جیهانی رۆژنامە نوسیکی ئەمەریکایی کە ناوی(شیرو وادیدی) دەبێت بەسەردانێك دەچێت بو مۆسکۆ لە باغچەیەکی گشتیدا توشی هەندێك منداڵ دەبێت ،دەڵێت کە: منداڵەکان چاویان پێم کەوت و زانیان بێگانەو ئەمەریکایم دەوریان دام ولێ یان پرسیم:- ئایا راستە لای ئێوە — لە ئەمەریکادا — تاکە زەلامێك دەتوانێت کارگەیەکی هەبێت و کریکارەکانی ناو کارگەکە بو ئەو ئیش بکەن ، و بیان چەوسێنێتەوە..؟! ئنجا لەوەڵامدا وتم:- بەڵی راستە ، تاکە زەلامێك بوی هەیە کە چەند کارگەیەکی هەبی و، بەهەزاران کرێکار بچەوسێنێتەوە.. منداڵەکان سەرسام بون ، و واقیان و رما ، وە بەیەك دەنگ هاواریان کرد:- ئەی بۆچی حوکومەت ئەو تاکە زەلامانە ناکرێت وحەپسیان بکات..! وەرگێڕی کوردی.

# چاکە و خراپەی بەکارهێنانی زانست

## ١٤/یولیو/١٩٣٣

کچم لەنامە ی دوایمدا باسی پێشکەوتنی زانیاریم بۆ کردبێت ، نازانم ئێستا سەیرکردنێکی ئەمە ئاسووکانی زانیاری ، وتێ گەیشتن و فێربونت لا خۆشەویست دەکات ، ئەگەر وابێت ، دەتوانی بە گەلێك کتێبی تری لەدم بابەتە بەرچاوی خۆت روون کەیتەوە ، بەلام لەبیرت نەچێت ، فیکر و بیری ئادەمیزاد هەمیشە لە پێشکەوتندایە ، وە تێدەکۆشێت کە هەمو شتێك بزانێت ، تەنانەت دەربارەی سروشت و "بنچینەی جیهان" لەبەر ئەمە ، لەوانەیە ئەوی ئەمرۆ بوت باس دەکەم سبەینی راست نەبێت. من بەشی بە حالی خۆم ، ئەم بیر و فیکرەی ئادەمیزادەم پێباشە کەوا بەرەوژور دەفرێ وە هەوڵ دەدا هەمو قوژبنێك لە قوژبنەکانی ئەم جیهانە فراوانە بدۆزێتەوە و بەناخیدا بچێتە خوارەوە ، بەراستی ئەم بیر و فیکرە دەتوانێت پەی بە هەمو شتێك بەرێت ، وە شتی زۆر زل ، وە هی تری زۆر بچوکیش ببویت.

ئەمانە هەمووی پێدەڵین "زانیاری رووتی" واتە زانیاریەك کەوا راستەوخۆ کار لە ژیانمان ناکات ، ئاشکرایە تیئوری راژەیی (النظریة النسبیة) ، وەیان پێوانی قەوارەی جیهان و شتی‌تر کەم و زۆر کارلەباری گوزەران ژیانمان ناکەن ، هەمو ئەم تیئۆرانە (نظریات) پشت بە بیرکاری (الریاضیات) بەرز دەبەستێت ئەم بیرکاریەیە کە پێی دەوترێت "زانیاری رووتی ، زۆربەی خەڵکی بایەخ بەم زانیاریە نادەن ، چونکە ئەوی گرنگ بێت بەلایانەوە بەکارهێنانێتی لە ژیانی رۆژانەماندا ، ئەم بەکارهێنانەیە کە ژیان وگوزەرانمان و هیتری یەکسەر هەڵگیرایەوە لە ماوەی صەد ؛ پەنجا ساڵی رابوردوودا ، لە واقیعدا ژیانی رۆژانەمان بە تەواوەتی بەستراوە بە ئەنجامەکانی ئەم زانیاریەوە ، زۆر زەحمەتە بێ زانیاری بیر

لەژیان‌و گوزەرانمان بکەینەوە. گەلێك کەس رۆژە رەنگینەکانی رابوردو دەکەن هەرووها لە بابەت سەردەمە زێرینەکەوە دەدووین کەوا تێپەربوون ، راستە چەند ماوەیەك لە مێژووی پێشین جوان و رەنگین بون ، رەنگە لەم رۆژانەمان باشتر بوبێت ، بەڵام ئەم باشتربونە لەواقیعدا زیاتر دەگەڕێتەوە بو ئەو ماوەدورە ، و نەهێنیانەی کە دەوری داوە ، لەبەر ئەوەیە هەندی جار لەوباوەڕەدا دەبین کە سەردەمێکی باشتر و جوانتر هەبوە چونکە هەندێ پیاوانی مەزنی تێداهەلکەوتوە ، بەڵام ئەوی جێی چەند وچون نىیە ، لە رۆژانی رابوردودا ژیانی خەڵکە ساویلکەکان ژیانێکی کوێرەوەری بوە ، زانیاری نوێ تورێك گرانباری سوك کردون.

کچم تەماشایەکی دەوروپشتت بکە زوربەی ئەو شتانەی دەی بینی دەسی زانیاریا ن تێدایە ، ئێمە بە هۆی بەکارهێنانی زانیاریەکانەوە گەشتت و هاتوچو دەکەین ، وە هەر بەهەمان هو بەیەکتری دەکەین ، دیسانەوە خوراکمان هەر بەهەمان هۆ ئامادەدەکەین و لەلایەکەوە بۆ لایەکی تری دەبەین. رۆژنامەکەی کەدەی خوێنینەوە ، کتێبەکانی کە لەبەردەستماندایە کاغەرەکەی لەسەری دەنوسم ، پێنوسەکەی کە پێی دەنوسم ، ئەمانە هەموی بەروبومی ، پاك و خاوێنی و تدروستی و بەسەرنەخوشیدا زاڵ بون پشت بەزانیاری دەبەستن ، جیهانی ئەمرۆمان بێزانیاریە بەکارهێنراوەکان ناتوانیت بژی ، لیرەدا هویەك     هەیەلە هەمویان کرنکترە ، کەوا بەبی زانیاری خواردەمەنی بەرهەم نایەت کە بەشی هەمو دانیشتوان بکات کە بەبێ خواردن نیوەیان دەفەوتێ. باسی زیادبونی دانیشتوانم بۆ کردیت لە ماوەی صەد  ساڵی رابوردودا ئەم زیادیە نازی بێ یارمەتی زانیاری لەبەرهەم هێنانی خواردەمەنیدا ، و گواستنەوەی لەلایەکەوە  بۆ لایەکیکە.

لەوساکەوە ئادەمیزاد توانی ـ بە هۆی زانیارییەوە ـ ئامێرە گەورەکان دابینی تائێشتاش ئادەمیزاد هەربەردەوامە لە باش کردن و بەرەوپێش بردنیدا ، لە پێناوی پێشخستنی ولێهاتویی ئەم ئامێرانەدا گەلێك گورانی وردیلەی ، هەمو ساڵێك تەنانەت هەمو مانگێك بەسەر دادێت. تاکو کەمتر پشت بەرەنجی ئادەمیزاد ببەستێت لە ماوەی ئەم (٣٠) سی ساڵەی رابوردوودا ئەم باش کردن و  پێشخستند گەیشتە  ئەوپەری ، ئەوەندە پێشکەوتوە تارادەیەك پیشەسازی ، وشێوازی بەرهەم هێنانی بەتەواوەتی

هەڵگیرایەوە ، هەروەکو چۆن شۆرشی پیشەسازی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا ئەم شیوازەی هەڵگیرایەوە. ئەمەش لە ئەنجامی زیاتر بەکارهێنانی کارەبا لە پیشەسازیدا رووی‌دا بەم جۆرە لە سەدەی بیستەمدا شۆرشێکی کارەبا دەبینین بە تایبەتی لەولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا ، ئەمە گورانێك بەتەواوەتی دەدابەبلاری ژیان هەروەکو چۆن شۆرشی پیشەسازی لە سەدەی هەژدەهەمدا سەردەمی ئامێری داهێنا ، ئنجا شۆرشی کارەبا ئەمرۆ سەردەمی وزەی هێنایە پێشەوە ، کارەبا لەپیشەسازی و شەمەندەفەرو ، گەلێك شتی‌تر کە لەقەمچ ، وسنورری کارەبادابێت بەکاردێت ، لەبەر ئەمە (لینین) ـ بەبیرە تیژەکە خۆی ـ بریاری‌دا مەکینەی زلی کارەبا کە بە ئاو بکەوێتە کار هەمو ناوەکانی روسیادا بنیات بنرێت.

لە ئەنجامی بەکارهێنانی کارەبا لە پیشەسازیدا ـ سەرەرای چاکەکانی تریشی ، گەلێك گۆرانکاری گرنگی بەرپاکرد ، بێئەوەی ئەرکێکی زۆر هەبێت وەزۆر بکەوێت بۆ نمونە: سوکە دەستکاریەك لە ئامێریکدا کە بەکارەبا ئیش بکات دەبێتە هۆی زیادبونی بەرهەمەکەی ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەواز لەو کرێکارانە بهێنرێت کە لە ئامێرەکە زیاتر هەڵدەدەکەن. وەیا سست تر ئیش دەکەن ، بەم جۆرە دەبینین هەرچەندە ئامێرەکە باش بکرێت و پێش بخرێت ، ئەوەندە کەمتر پشت بە ئادەمیزاد دەبەسترێت لەبەر ئەمە ئێستا ئامێرە زلەکان ، تاکە کرێکاریك دەی‌بات بەرێوە ، و تەنها پەنجە بە سویچێکی تایبەتیدا دەنێت. ئەمە دەبێتە هۆی زیادبونی بەرهەم هێنانی کەل وپەلی دروست کراو ، وە لە هەمان کاتدا وان لەگەلێك کرێکار دەهێنرێت ، چونکە پێویستیان پێیان نامینی ، بەلام پێشکەوتنی زانیاری زۆر خیرایە ، تلرادەیەك ئامێرێك لەکارگەیەکدا ، دانامەزرێت ، و ماوەیەکی کەمی بەسەردا تێناپەرێت تاکو پارچەیەکی ، وەیان هەموی کوون دەبێت ، چونکە گەلێك شتی‌تازەی باشتری دێتەسەر.

هەر کە ئامێرەکان داهات ئەم ئامێرانە ـ هەروەکو پێشتر پێم وتیت ـ جێی کرێکارەکانیان گرتەوە ، ئەم جێگرتنەوەیە لە وروژانەدا گەلێك شۆرشیان بەرپاکرد ، لەئەنجامی ئەمەدا کرێکارەکان ئامێرەکانیان دەشکاند بەلام لە دواییدا بۆیان دەرکەوت کە بۆنی ئامیرەکان دەبێتە هۆی بونی

ئیش وکاری نویٚ ، لەبەر ئەوە بەیارمەتی ئامێرەکان دەتوانرێت شتومەك زۆرتر بەرهەم بهێنرێت ، وە کرێی کرێکاریش زیاد دەبێت ، وە نرخی شتومەکە کانیش هەرزان. بەم جۆرە کرێکارەکان و خەلکی دەتوانن زۆر شتومەك بکرن ، ئنجا رادەی ژیانیان بەرزەبێتەوە ، وە زیاتر پێویستیان بە شتومەکی دروست کراو دەبێت. ئەمەش پال بە خەلکەوە دەنێت کە کارگەی نوێ بنیات بنین وە کارگەی زۆرتر بخەنەکار لەبەر ئەمە سەرەرای ئەوەی کە ئامێرەکان جێی کرێکارانیان گرتەوە لە هەمو کارگەیەك لە کارگەکاندا بەلام کرێکارێکی زۆرتر ئیشی تازەیان دۆزییەوە لە کارگە نوێیە کاندا.

ئەم بوژانەوەیە ماوەیەکی دورو درێژی خایاند ، ئەوی یارمەتی ئەم بەردەوامی یەیدا ولاتە پیشەسازەکان سودیان لە بازارە دورەکانی ولاتە جۆربە جۆرەکان وەرگرت ، وادەردەکەوێت لەم چەند سالانەی رابوردودا ئەم بوژانەوەیە وەستا ، چونکە لە سایەی رژێمی سەرمایەداریدا کە هەیە هەرگیز ئەم بوژانەوەیە بەردەوام نابێت و بەرگەناکات ، خۆ ئەگەر ئەم بوژانەوەیە ، بویستری بەردەوام بێت دەبی رژێمەکەی کەواتیایدا دەژین بگۆررێت. پیشەسازی نوی بە (بەرهەم هێنانێکی زۆرەوە) بەندە ، ئەم بەرهەم هینانە زورە ، و ئەکەر خەلکیکی زور ئەم شتومەکانە نەکرن ، ئیتر ئەگەر زۆربەی خەلك هەزارەویا بیٚ ئیش بێت ، ناتوانێت ئەم شتومەکانە بکرێت.

سەرەرای ئەم هەموە چاککردن ، و پێش خستنە فەنیی‌یە بەردەوامانە ، لە ئامێردا بەبێ وەستان ، و هەستانی بە ئیش و بەدەوری کرێکاران ، وە بەردەوام بون لەجێ گرتنی کرێکارەکاندا لەلایەن ئامێرەووە ، ئەم کرێکارانەش دەچونە ناولیستەی بێئیشەکانەوە. لە سالی ١٩٢٩ ز.دا لە هەمولایەکی جیهاندا ، بێ بازاری‌یەکی بێ ئەندازە لەبازرگانیدا رووی‌دا ، لەگەل ئەمەشدا پێشکەوتنی فەنی رانەوەستا. دەلێن ئەو باش کردن و پێش خستنە زۆرەی کە لەولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا سالی ١٩٢٩ ز. لە ئامێردا رووی‌دا گەیشتە رادەیەکی‌وا ، کەواز لە ملیونەها کرێکار بهێنرێت کە لەپێشدا لەئیشەکانیان دەرکرابون. تەنانەت ئەگەر بیانەوێت هەرهەمان بەرهەم رەنیوبێنن لە سالی ١٩٢٩ ئنجا بەرهەمیان نەدەهێنا.

ئەمە یەکێك بو لەو هۆیانە ـ گەلـیـك هـۆی تـربـش هـەبـو ـ کـە ئەنجامەکەی مەینەتیە گەورەکەبو ، واتە بڵاوبوونەوەی برشیشی بێکرا لـە هەمو جیهاندا ، بەتایبەتی لەولاتە پیشەسازە پێشکەوتودکانەدا ، بە راسـی ئەم کارە زۆرسەیرە ، دەبوایە زۆر بوونی بەرهەم سەبارەت بـەئـامـێـرە تازەکان ببێتە زیادبونی سامانی میللەت ، وەبەرزبونـەوەی راددی ژیـان و گوزەران ، کەچی ئەم زیادیە لەبەرهەم هێناندا ، وەکو ئەمرو دەیبینـیـن بۆتە هۆی هەژاری ، و ئەشکنج. لەوانەیە هەر کەسێك لە ئێمە وابزانـێـت ئەم کێشە یەرەنگە جێبەجێ بکرێت کە ئەگـەر شـێـوازە زانـیـاریـەکـان بەکاربهێنرێت ، رەنگە ئەمە راست بێت بەڵام ، زەحمەتی ، وگـرانـیـەکـە لەوەدایە ، کە تەقەلا بدرێت بوچێ بە جێکردنی بەشێوازە مەعقولەکـانـی زانیاری ، چونکـە هـەوڵ دان بـو جـێـبـەجـێ کـردنـی کـار دەکـاتـە بەرژەوەندیەکی زۆر ، وەخاوەنی ئەم بەرژەوەندیانەش دەسـتـیـان بـەسـەر حوکومەتەکاندا دەروات ، دیسانەوە بارو ، زروفی نێودەولەتانیش هەیە ، وە هەردەولەتێکیش بەربەرەکانی ئەوانیتر دەکات ، وەناهێڵێت بکەنە جێبەجێ کردنی کێشەکە. دەبینین روسیای سوڤیتی شێـوازەکـانـی زانـیـاری نـوێ بەکاردێنێت بەسەر کێشەکانی کە لەیەکـتـری دەچـن ، بـەڵام لـە هـەمـو دەولەتەکان زیاتر توشی زەحمەتی دێت ، چونکە لەم رێیەدا خۆی بەتەنیایە چونکە سەرمایەداری دوژمنایەتی سوڤیت دەکات. دەولەتانی جیهانی ئـەمـرۆ ئەگەر بیانەوی بژین ، دەبێت پشتیوانی یەکتری بکەن ، وەسوشیالیسـتـی ئەگەر بیەوێت سەرکەوێ دەبێت هەمو جیهان بکرێتەوە ، ئیمە ناتـوانـیـن سەعات ژمێری زەمان بگیرێنە دواوە ، هەروها پەیوەندایەنی نیو دەولەتـان نابێت بەدەست ئارەزووی چەند دەولەتێکەوەبێت. تەقەلادانـی هـەنـدێ لـە دەولەتە فاشیستیەکان بۆ بەرزکردنەوەی ولاتەکانی خۆیان لەسەر حیـسـابـی ئەوانیتر لە ئەنجامدا هەر سەرناکرێت چونکە بە پیچـەوانـەی سـروشـتـی ئابوری نێودەولەتانی ئەمرووەیە ، لەوەدەچێت ئەم دەولەتە فاشیستـیـانـە هەمو جیهان و شارستانیتی لەگەڵ خۆیاندا بەرەو کەندەلان رایبج کەن.

وەکو هەندێ کەس گومانی هەیە ، مەترسی لەم کارەساتە دورنـیـیـە ، هەروەکو چۆن زانیاریمان دی شتی چاکی تێدایە ، دیـسـانـەوە زانـیـاری کوێرەوەری و مەینەتیەکی گەورە لەئەنجامی لەگەڵ خویدادینی ، گەلێك لە

دەولەتەکان و حوکومەتەکان گەلێك لەبەشەکانی پشت گوێ دەخەن ، چ زانیاری رووتی بێت ، وەیازانیاری بەکارهێزاوبێت ، کەچی لایەنەکانی زانیاری جەنگ پشت گوێ ناخەن ، ئنجا هەمو توانایەك لەتواناکانی زانیاری تازە بەکاردێنن تاکو خۆیان پڕ چەك کەن وبەهێزکەن ، زۆربەی دەولەتەکان پشت بەهێز و شێوازی زانیاریەتازەکان دەبەستن بۆ بەهێزکردنی حوکومەتەکانیان ، وەترساندنی میللەتان ، بێئەوەی لەئەنجامی کردەوەکانیان سل بکەنەوە ، ئەو سەردەمەروی کە شۆرشە میللیەکان بەرپادەبون دژی حوکومەتە زۆردارەکان و دەست درێژیکەرەکان ، کەوا سەنگەر لە کۆلانەکاندا دروست دەکرا ، وە بەکۆ هیزە چەکدارەکاندا دەچون هەروەکو لە شۆرشی فەرەنسەدا رووی‌دا ، بەلام ئێستا مەحالە میللەتێکی بێچەك ودیا تەنانەت چەکداریش بێت ، بتوانێت بچەنگێت لەگەل لەشکر یکی ریك و پێکی پرچەکدا. لەوانەیە ئەم لەشکرە بچێتە پال میللەت دژی حوکومەتەکە ، وەکو لە شۆرشەکەی روسیادا رووی‌دا بەمە نەبێت هێز هیچ کەلکی نەیە. بۆیە پێداویستی شۆرشگێران لە پێناوی ئازادیاندا ، ناچار بۆن کە بۆ شێوازەکانی ئاشتیانەی‌تری گشتی بگەرێن.

بۆیە دەبینین زانیاری بو بە هۆی زال بونی هەندی کەس ، وەیا چەند تاقمێك بەسەر حوکومەتەکاندا لەئەنجامی ئەمەدا ئازادی شەخسی وە بیرورا دیموکراتیەکان کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا پەیدابوبون فەوتان ، ئەم دەستە و تاقمانە ، هەندێ جار بە روالەت خۆیان واپیشان دەدەن کەلایەنگری دیموکراتین ، وە هەندێ جاریش بە ئاشکرا دوژمنایەتی دیموکراتی دەگەن ئەم جۆرە رژێمە لەگەل یەکدا ناکوکن ، وەلە ئەنجامی ئەمەیاندا جەنگێکی جیهانی روودەدات ، کە ئەم حوکومەتانە و شارستانیتی لە ناودەچن ، لەوانەیە رژێمێکی سوشالیستی لەناو دەولەتاندا بێتەکایەوە ، هەر وەکو فەلسەفەی مارکسی پێش بینی‌کردبو.

جەنگ زۆر زەحمەت و سەختە بە جۆرێك بەبیردانایەت ، لەبەر ئەمە ، بۆیە جەنگ خوازەکان بەموسیقای جوانی سوپایی ، و بەرگی بریقەدار دەی شارنەوە. پێویستە بزانین جەنگ جی‌یە؟ و لەم سەردەمدا جەنگ چۆن دەبێت؟ جەنگە رابوردوەکەی جیهانی ، راستی جەنگ وسەختیەکەیی بۆدەرخستین ، لەگەل ئەمەشدا لە چاو هەر جەنگێکی دا هاتودا هەرگیز شایەنی باس کردن

نابێت. ئەگەر پێشکەوتنی زانیاری لەمەیدانی پیشەسازیدا لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەی رابوردودا دە ئەوەندەی جاران پێشکەوتبێ ، بە راستی زانیاری جەنگ سازی صەد ئەوەندە پێشکەوتوە. ئیتر جەنگ بزیتی نابێت لە هێرشێك کە سەربازی سوارە ، وەیا پیادەبی‌هەلسن ، ئەم شێوازە لەم رۆژانەدا بێکەڵکە بەتەواوی ، وەکو تیروکەوانی لێهاتوە ، بەلام جەنگی ئەمرۆ هی تانك و فرۆکە ، وبۆمبایە. ئەگەر جەنگ بەرپابو ، چاوەروان دەکرێت کە هەمو دەولەتێك بە ئیعلان کردنی جەنگ بکەونە شەرەوە لەگەل یەکتردا بە فرۆکە پەلاماری یەکتری بدەن ، لەوانە پێش ئیعلان کردنی جەنگ پەلاماری یەکتری بدەن ، بۆ ئەوەی سەرکەوتنێکی وەختی یان بەسەر دوژمنەکەیاندا دەست کەوێت ، ئنجا شارو کارکەکان بەربومبا دەدرێت ، رەنگە هەندی فروکەش بکەویتە خوارەوە ، بەلام تەوەی دەمێنێتەوە بەشی وێران کردنی شارەکە دەکات ، رەنگە شەرکەرەکان بۆمبای غازی زەهراویش بەکاربێنن ، ئەم بۆمبایانە کە دەتەقێنەوە ، غازی ژەهراوی بە دەوری خۆیاندا بلاودەکەنەوە ، هەمو زیندەوەرەکانی ئەو ناوچەیە دەخنکێنی ، زۆر بەخرایی ونەنگی جەنگ دەبێتە ماڵ وێران کردنی دانیشتوان ، کەلێك ئازارو ، ئەشکنجی دەرونی و نەفسی دروست دەکات ، ئەمە لە شارەکانی هەر دوبەرەی شەرکەرەکاندا دەقەومی ، ئەگەر جەنگ لە ئەوروپا رووی‌دا بو نمونە: شاری (لندن و باریس) لە چەند رۆژێك وەیا چەند هەفتەیەکدا دەبنە کەلاوە.

شتێك هەیە لەوانەی کە باس کران لە هەمویان خراپترە ، ئەو بۆمبایانەی کە فرۆکەکان فرێی دەدەن لەوانەیە میکرۆبی جۆرەها نەخۆشی تێدابێت بۆ ئازاردانی دانیشتوانی شارەکە وەبلاوکردنەوەی دەرد وبەتا لەناویاندا. ئەمە پێی دەوترێت (جەنگی میکروبات) ، لە شێوازەکانی ئەم جۆرە جەنگە دیسانەوە میکرۆبات خستنە ناو خواردەمەنی ، و ئاوەوە ، وە یا مشك میکرۆبی تاعونی پێوە دەکەن ، وە دەی نێرن بۆ شارەکانی دوژمن.

رەنگە ئەم وەسف ، وباس کردنە ئەوەندە تەنگ و ستەم بێت جێی باوەر نەبێت ، بەلام ئەمە راستە ، جانەوەر ، و درندەکان ئەم کردەوانە ناکەن بەلام خەلکی کە ترس زۆریان بو دینی ، وەدوچاری شەری مردن ،

وزین دەبن کاری وادەکەن کە جێی باوەر نییە ، ئینجا ترسی هەر دەوڵەتێك لەوەی کە دەولەتەکەیتر ئەم رێبازە بگرێت ، وای لێدەکات کە لەم رووەوە پێش دەولەتەکانی تر بکەوێت ودەست پێشکەری بگات چونکە هەر دەولەتێك زووتر ئەم شێوازە بەکار بێنیت هەنگاوێکی باش بەرەو سەرکەوتن دەچێت.

لە راستیدا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا زۆر جار غازی ژەهراوی بەکارهات ئەوی ئاشکرایە دەولەتە گە ورەکان ئێستا کارگەی گەورەیان هەیە بۆ دروست کردنی ئەمە ، لە مەوەشتی سەیر دروست دەبێت: بریتیە لەوەی کە جەنگی دا هاتو کوشتارێکی راستەقینە لەسەنگەرەکانی پێشەوە دا روو نادات ، کەوا دو لەشکر بەرامبەر یەکتری سەنگەر هەلکەنن بەلکو ئەم جەنگە دەکەوێتە پشت سەنگەرەکانی پێشەوە ، واتە لەناو شارەکان ، و مالەکانی شارستانیەکاندا دەبێت ، لەوانەیە سەنگەرەکانی پێشەوە شوێنێکی سەلامەت ترین ،چونکە سەربازەکان لەوێدا دورن لە بۆ مبابااران ، و غازی ژەهراوی ، و توش بونی نەخۆشی! ئەم خۆ پاراستنە بۆ ژنو و منداڵ کە لە دواوەن بۆیان پێك نایەت.

ئەنجامی ئەمە چیە؟ کاول کردنی جیهانە! وکۆتایی ئەم کۆشکە جوانەیە - کۆشکی روشنبیری ، و شارستانیتیە ، کەوا دروست کردنی بەسەدەها ساڵی خایاندوە!!

کەسمان نازانین سبەینی چی دەقەومی؟ چونکە ئێمە رێبە دێیی پاشەرۆژ لەو پەردەیەوە دەکەین کە تێوەی پێچراوە ، ئێمە ئەمرۆ لە جیهاندا دوو رژێمی جیاواز ، و ناکۆك دەبینین: یەکەمیان نوێنەری پێشکەوتن ، و یارمەتدان ، و عەقل ، و بنیات نانی شارستانیتیە ، دووەمیان نوێنەری کاول کردن ، روخاندنی هەمو شتێك و ، تەقەلایەکە بۆ خۆکوشتن ، هەردو رژێمەکە زۆر بە خێرایی دەرون ، وە خۆیان بە تازەترین جەك کە زانیاری ناسیبێتی و هێنا بێتیەکایەوە چەکدار دەکەن ، ئایا کامیان سەردەکەوت؟

# تەنگ و چەڵەمە ئابوری‌یەکەی جیهان

## ١٩/یولیو/١٩٣٣

هەر چەندە مرۆڤ بیر لەو توانایە دەکاتەوە کە زانیاری خستویەتە بەردەستی ئادەمیزاد ، وە چۆن بە خراپی بەکاری دێنی ئەوەندە زیاتر سەری سور دەمێنی. جیهانی سەرمایەداری لەم رۆژانەدا جیهانێکی سەیرە ، بەهۆی رادیووە زانیاری دەنگمان بە وڵاتە دورەکان دەگەیەنێت ، بە هۆی بێتەلەوە دەتوانین لەگەڵ کێدا بمانەوێت لەوپەری زەوی‌یەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەین. بەم زوانە دەتوانین بە هۆی تەلەفیزیونەوە بە چاو پێ‌ببینین ، بە هۆی زانیاریەوە دەتوانین هەر چیەکی بەرەی ئادەمیزاد پێویستی بێت بەرهەمی بێنین ، وە لەو هەژاری‌یەی کە پەرێشانی کردوە رزگاری بکەین. لە سەردەمە دێرینەکانەوە خەلك هەولیان داوە ــ بو دەربازبون لە واقیعی‌ترش و تال ، و ژیانی کۆ لە مەرگیان ، بەوەی بیر لە بەهەشت و خاکی بەختیاری بکەنەوە ، کە برە لە شیر و هەنگوین ، ئاسودەیی ، و خۆشی و هەرچیەکی پێویسانە تێ‌دابێت ، بیریان کردەوە کە سەردەمە زێرینەکە تێپەری ، و هیوایان وابو کە بە هەشت بەرەو بیریان دێت کە ئاشتی و خۆشی‌یان تێدادەست دەکەوێت ، ئنجا زانیاری هات هەمو هۆیەکی خستە بەردەستیان تا یارمەتیان بدات بۆ بەرهەم هێنانی هەمو شتێك ، کەچی لەگەل ئەم هەمو توانایانەشدا هێشتا ئادەمیزاد لە مەینەتی ، و هەژاریدا دەژی ، ئایا ئەمە لەشتە ناکۆکە سەیرەکان نی‌یە؟.

ئیتر زانیاری ، وئەوی زانیاری دەتوانێت پێشکەشمانی بکات ، کۆمەڵگەکەمان زۆر سەغلەت دەکەن ، چونکە لەگەڵ یەکتری ، و شان بەشانی یەکتری ناڕۆن ، جیاوازی لە نێوان رژێمی سەرمایەداری ئێستا ، و لە نێوان بەکارهێنانەکانی زانیاری ، وشێوازەکانی بەرهەم هێناندا هەیە. بەراستی کۆمەڵگەکەمان فێربوە چۆن بەرهەم بێنی ، بەلام تا ئێستا فێرنەبوە چۆن ئەم بەرهەمە دابەش کات.

دوای ئەم پێشەکی‌یە کورتیلەیە با جارێکی‌تر بگەرێینەوە بۆ ئەوروپا و ئەمەریکا ، کچم باسی کێشەکانم بۆ کردیت کە هاتەرێیان-لە ماوەی دە ساڵەکەی دوای جەنگە جیهانیە (یەکەمە) کەوە ، دەولەتە بەزیوەکانی وەکو ئەلمانیا ، و هەندێ لە دەولەتەکانی ناوەراستی ئەوروپا ، وەزع وبارتیایاندا گەلێك خراپ بو: سکە و پارەکانیان کەوت و بێ کەلك بوون ، باری چینەکانی ناوەراست لەوێدا بەرەو خراپی چو ، وەنەبێت دەولەتە سەرکەوتوەکانی ئەوروپا لەمان باشتر و بەختەوەرتر بوبن ، هەمویان قەرزاری ئەمەریکابون ، هەروها قەرزارێکی بێ شوماری میللەتەکانیشیان بون ، لەژێر گرانباری ئەم دوو قەرزەدا سەرسمیان دەداودەیان ناڵاند ، بە ئومێدی ئەوەبون کە قەرزەکانی دەرەوەیان بژاردنەوەی زیانی (تعویضات) کە ئەلمانیا کەوتیوە سەری ، بەوە ئەم قەرزانە بدەنەوە ، بەڵام ئەلمانیا خۆیشی نەی‌توانی هیچ بدانەوە. ئنجا ئەمەریکا فریای ئەم هەڵوێست و بارەکەوت بۆ رزگار کردنی دەستی کرد بە قەرزدان بە ئەلمانیا ، ئەمیش لەم قەرزە ، قەرزەکانی ئینگلتەرە و ، فەرەنسە ، و ولاتەکانی تری دەدایەوە تاکو ئەو بژاردنە وەی زیانی‌یە (التعويضات) کە لە سەرێنی بی‌داتەوە ، ئنجا ئەمانیش ئەو پارە و ماڵەی کە لە ئەمەریکایان وەرگرتبو دەیان دایەوە.

وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ، تاکە وڵات بو کە لەرووی ئابوریەوە بوژابیتەوە ، پارەی لێ‌دەرژا ، ئەمە گەلێك حەسی هان دا کە سەرکێشی و قومار بە (سهم) وسەنەدەکان بکەن. بیرورای جیهانی سەرمایەداری وابو کە ئەم تەنگانە ئابوریە دەروات و تێ‌دەپەرێت ، هەروەکو تەنگ چەلە ئابوریەکانی پێشتری تێپەرین ، وە جیهان وردە وردە دەگەرێتەوە سەرباری‌خۆش گوزەرانی بەڵام لەراستیدا ژیانی سەرمایەداریێتی هەمیشە لەناو تەنگوچەلەمە ، و خۆش گوزەرانیدا دەتلێتەوە. ئەمەش سەربارەت بەسروشتی خودی سەرمایەداری ، و شێوازی تاوانبارانەو ، پەیرەونەکردنی نەخشەیەکی ئاشتیانەیە. بوژانەوەی پیشەسازی دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانێکی ئەسنور ، چونکە هەر کەسێك دەیەوێت چەند بتوانێت زیاتر بەرهەم بێنی ، لە ئەنجامی ئەمەدا بەرهەم زیاتر دەبێت لەو میقدارەی کە لەوانەیە بفرۆشرێت ئەگەر پیشەسازی بوژایەوە نرخی پشکی (سهم) کۆمپانیە کان (الشركات)

زیاد دەکات ، خۆ ئەگەر بەهەرم هێنان کەم بێت نرخی پشکەکان (الأسهم) کەم دەکات ودێتەخوارەوە ، ئیتر تەنگ و چەلەمە روودەدات دوای ماوەیەکی هێمنی میقدارە زۆرەکە دەفرۆشرێت ، وەکارلەکان دەست دەکەنەوە بەبەرهەم هێنان ئنجا ماوەیەکی خۆش گوزەرانی پەیدادەبێتەوە ، بەم جۆرە ئەم خول ، وسورانە (الدورة) تەواو دەبێت ، وەخەلکی هەمیشە بەئومێدن ماوەی خۆش گوزەرانی بێتەوە.

لە سالی ١٩٢٩ز. دا وەزع و بارخراپ بو ، ئەمەریکا ئیتر قەرزی نەدا بە ئەلمانیا و دەولەتەکانی ئەمەریکای خواروو بەهۆی ئەمەوە بەستەکی کاغەزی کۆمپیالە ، و قەرزدانەوە روخا ، دیارە سەرمایەدارانی ئەمەریکا ناتوانن بەردەوام بن لە قەرزداندا هەتا ، هەتایە ، چونکە بەمە قەرزدارەکان زیاتر ناتوانن قەرزەکانیان بدەنەوە ، لەپێشدا بۆیە قەرزیان دەدا چونکە پارەیان زۆربو پێویستیان پێی نەبو ، ئەم پارە زۆریە وایلی کردن ، شێتگیر بن لە بازاری پارەدا (البورصة) بەربەرەکانی یەکترویپێک دادانی "المضاربة"یان دەکرد ئیتر دەردی قومارکردن تەشەنەی کرد چونکە هەمو کەسێك دەیەویست زۆر زوو دەولەمەندبێت.

نەدانی قەرز بە ئەلمانیا یەکسەر بو بە هۆی تەنگانەیەکی گەورە ، گەلێك لەبانقەکانی ئەلمانیا نابوت بون. دیارە ئەلمانیاش لە قەرزدانەوە ، و زیان بژاردنەوە (التعویضات) وەست ، دەولەتەکانی ئەمەریکای خواروو بەم جەزرەبەیە تەواو پەشۆکان ، کە سەروك (هوفر)ی سەرەکی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بینی: کۆشکی رژێمی قەرزو قولە دەتەپی ، لە سالی ١٩٣١ بلاوی کردەوە کە قەرزدانەوە بۆ ماوەی سالێك دوابخرێت ئەمە وادەگەیەنێت هەمو قەرزەکانی ناوخو لەگەل زیان بژاردنەوە (التعویضات) سالێك رابوەستێت و نەدرێتەوە ، بەمە قەرزارەکان مولەتێکیان دەدرێتی کە مشوری کاری خۆیان بخۆن.

لەم کاتەدا واتە لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٩ز. دا شتێکی گرنگ لە ئەمەریکادا رووی دا ، بەربەرەکانی وپێك دادان (المضاربة) لەبازاری پارەدا بو بە هۆی بەرزبونەوەی نرخ تێکرا بەرزبونەوەیەکی شێتانە ئنجالەپرێکدا بە جارێك ، ئێجگار هاتەخوارەوە ، لەم تەنگ جەلەمەیە ، کۆر ، وەمەلبەندی پارە لە نیویۆرك دا هاتە لەرزین ، و هەژان. ئیتر لەوساکەوە سەردەمی

خۆش گوزەرانی لە ئەمەریکاشدا کۆتایی هات ، بەمە ئەمەریکا چوەپاڵ کاروانی دەولەتەکانی کەوا دووچاری تەنگوچەلەمەی ئابوری دەێن ، ئنجا ناهەمواری باری بازرگانی و پیشەسازی لە هەمو لایەکی جیهاندا پەرەی سەند ، وەناوی تەنگو چەلەمەی ئابوری جیهانی لێنرا. کچم وانەزانیت کە بەربەرەکانی وپێك دادانە (المضاربة) وکەی بازاری پارە لە نیویۆرك دابو بە هۆی پەیدابونی ئەم تەنگوچەلەمەیە ، چونکە لەراستیدا ئەمە بایەخێکی ئەوتوی نەبو بەڵکوهۆ راستەقینەکانی گەلێك لەمەقولتربو.

لە هەمو لایەکی جیهاندابازرگانی هاتەکزی ، نرخ تێکرا بەتایبەتی نرخی بەروبومی کشتوکاڵ شکاو هاتە خوارەوە ، ئەوسا دەوترا گوایا بەرهەمی هەمو شتێك زۆرە ، لەراستی کارد! ئەمە وادەگەیەنێت کە لای خەلکی پارەنی‌یە کە ئەم شتومەکانەی پێبکرن ، ئەوی جاران بەکاریان دەهێنا نەیان بوبیکرن ، و بەکاری بێن بەرهەمی کارگەکان مایەوە بێئەوەی کەس بیکرێت ، و کۆمەل دەبو ئەمە خاوەن کارگەکانی ناچار دەکرد کە کارگەکانیان داخەن ، چونکە مەعقول نی‌یە لەبەرهەم هێنانی شتومەکدا بەردەوام بن ، و کەچی کەس نەبێت بیکرێت ، ئەمە بو بە هۆی بڵاوبونەوەی بێئیشی لەئەوروپا ، و ئەمەریکا ، و هەمو شوێنێکی‌تردا ، هەمو وڵاتە پیشەسازەکان جەزرەبەیەکی بە ئازاریان خوارد ، هەروها وڵاتە بەکشتوکالەکانیش کەواخواردەمەنی ، و کەرەسەیان دەدا بەبازاری جیهانی بەم جۆرە پیشەسازی هیندستانیش تارادەیەك کاری تێکرا ، بەڵام لە هەمو چینەکان کە زیاتر زیانیان لێکەوتبێ ، چینی فەلاح بو سەبارەت بە هەرزان بون و هاتنەخوارەوەی‌نرخ لەبار ، ووەرزێکی ئاسایی‌دا هەرزان بونی تفاقی خواردەمەنی بۆ خەلك شتێکی باشە چونکە دەتوانن ئەوی پێویستیانە بەهەرزان بیکرن ،بەڵام هەمو شتێك لەم جیهانەدا ، ولەسایەی رژێمی سەرمایەداریدا ، سەرەوژێر هەڵگەراوەتەوە ، ئەوەی چاکە بە خراپە وەرگەراوە. لەبەر ئەوە لەسەر فەلاحەکان پێویست بۆ کرێی زەوی ، وزارەکانیان کاش (نقداً) بدەن بە خاوەن مولکەکان وەیان بە حوکومەت ، وە ناتوانن ئەمە بکەن ئەگەر بەرهەمەکانیان نەفرۆش. نرخی بەرهەمەکان ئەوەندە هەرزان بو ، ئەگەر فەلاحەکە هەمو بەرهەمەکەیی بفرۆشتایە نەی دەتوانی کرێی زەویەکە بدات بۆیە گەلێك جار فەلاحەکان لەزەوی ،

وزنجەکانیان دەردەکران وەشتومەکی ناومالْیان ـ ئەگەر هەیان بوایە ـ هەراج دەکرا و دەفرۆشرا بەم جۆرە جگەلەوەی کە خواردەمەنی هەرزان بو ، بەلام ئەوانەی بەرهەمیان دەهێنا برسی وبێ‌لاتە بون.

سەربارەت بەوەی کە بازرگانی و بەرژەوەندیەکان لە جیهاندا تێ‌هەلْکیش ئەم تەنگوچەلەمەیە هەمو جیهانی گرتەوە ، تەنها ئەو ولاتانە نەبێت لەجیهانداکەدورەپەرێزن وەکو (تبت) ئیتر هیچ ولاتێك رزگاری نەبولێ‌ی. ئەم تەنگوچەلەمەیەلە ئیفلیجی دەچو کەوا هەمو لەشی کۆمەلْگە بکرێتەوە ـ بۆ ئەوەی بزانین ئەم تەنگوچەلەمەیە چەندە بەتین بوە ـ لەوانەیە سەیرکردنێکی ئەم ژمارە راستە قینانە زۆر بەکەلك بێت کە دەربارەی بازرگانی جیهانی کۆمەلْی میللەتان (عصبة الأمم) بلاویکردەوە ، ئەم ژمارانە ملیونەها دولارە بریتیە لەهی سێ مانگی یەکەم لە هەمو سالْێکدا :

| یەکەم چواریەك لە سالْی | نرخی ئەوشتای لە دەرەوەوە هاتون (الواردات) | نرخی ئەوشتای نیرراونەتە دەرەوەالصادرات | نرخی شتومەکی هاتو، و نێررا و الصادرات والواردات |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٩ | ٧٩٧٢ | ٧٣١٧ | ١٥٢٨٩ |
| ١٩٣٠ | ٧٣٦٤ | ٦٥٢٠ | ١٣٧٨٤ |
| ١٩٣١ | ٥١٥٤ | ٤٥٣١ | ٩٦٨٥ |
| ١٩٣٢ | ٣٤٣٤ | ٣٠٢٧ | ٦٤٦١ |
| ١٩٣٣ . | ٢٨٢٩ | ٢٥٥٢ | ٥٣٨١ |

ئەم ژمارانە دەری دەخات کە بازرگانی جیهانی چون بەرە و خراپی چوە وەیەکەمین چواریەکی سالْی ١٩٣٣ هێشتا نەهاتبو ، تەنانەت ئەم بازرگانی‌یە بوبە لە ٣٥٪ وەیا سێ‌یەکی ئەو بازرگانی‌یەی‌کە چوارسالْ لەودپێش هەبو.

بەزمانێکی ئاسان و رەوان ئەم ژمارانە چیمان بۆ روون دەکەنەوە؟ ئەوە مان بۆ روون دەکەنەوە کە زۆربەی خەلك ئەوەندە هەژار و نەدارابون ئەوی بەرهەمیان هێناوە نەیان توانیوە بیکرن ،ئەم ژمارانە بۆمان دەردەخەن کە ژمارەیەکی زۆری کرێکاران بێ‌ئیش ، وە ناتوانن ئیش بدۆزنەوە گەرچی

نیازێکی پاکیش هەبێت ،ژمارەی کرێکارانی بێئیش لە ئەوروپا ، ئەمەریکادا گەیشتە سی (٣٠) ملیون کرێکار ، سی (٣) ملیونیان لە بەریتانیادا بو ، وە (١٣) ملیونیش لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا ، وەتا ئێستا سەرژمێرێکی تەواو نییە بۆ زانینی ژمارەی کرێکارە بێئیشەکان لە هیندستان ، وولاتەکانی تری ئاسیادا. ڕەنگە ژمارەیان لە هیندستاندا ، سەرجەم لە ئەوروپا ، و ئەمەریکا زیاتربێت ، بیر لەم ژمارە زۆرەی کرێکارە بێ ئیشانە بکەرەوە لە هەمویەیەکی جیهاندا ، و لە خێزانەکانیان کە بەهیوایانن ، وە بیر لەوکوێرەوەری و مەینەتیە بکەرەوە کە ناهەمواربونی باری بازرگانی هێناوی تیەمەیدانەوە ، هەندێ لە ولاتانی ئەوروپا ، کەمەکێك پارەیان دەدا بە کرێکارە بێئیشەکان ، کە ناو نوس کرابون و بەشداربون لە مسۆگەربونی ئیشەکانیاندا لدی دەولەت ، لە ئەمەریکاشدا هەندێ خێریان پێ دەکردن ، بەلام نە ئەمە ، و نە ئەوە بە کەلکیکرێکارەکان نەدەهات وەتەنگانەیانی سوك نەدەکرد ، گەلێك جاربرسیان دەبو ، لەناوەراست ، و ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا بارو ، وەزع گەیشتە پلەیەکی ترسناك.

ئیتر ئەمەریکا کەلافی پارە و دارایی زۆری لێدەدا لەم جەزرەبە یەواقی ورما ، ئنجا هەرکە ژمارەی کرێکاری بێئیش زۆردەبو ، وە دەگەیشتە خانەی ملیون ئەوەندە برسێتی تەشەنەی دەکرد وەدیمەنی برسێتی دەبو بەشتێکی ئاسایی ، بەجۆرێك میللەت بروای بەخۆی کزبو ، متمانە بە بانقەکان لەق بوبو ، خەلکی بارەکانیاندەردەهێنا ولای خۆیان گۆیان دەکردەوە ، بنچینەی بانقەکان لەسەر متمانە بەندە ، ئەگەر متمانە و بروا پێکردن نەما بانقەکانیش نامێنن ، لەئەنجامی ئەمەدا بەهەزاران بانق لە ئەمەریکادا نابوت بون ، هەرچەندە بانقێك نابوت ببێ ، ئەوەندە زیاتر کاروبار ئالۆز دەبێت ، لە خراپەوە بەرە و خراپتر دەچێت.

کرێکارانی بێئیش چ لە پیاو ، چ لە ئافرەت بە ولاتدا دەگەران ، لە ولاتێکەوە بۆ ولاتیکیتر دەچون ، بۆ دۆزینەوەی ئیش ، بە ڕێگاوباندا دەڕۆیشتن ، داویان لە شوفێرەکان دەکرد ، پیاوەتیان لەگەلدا بکەن و سواریان کەن ، وەیان خۆیان بە بەیزەکانی شەمەندەفەرە سوك ڕەوەکانەوە هەلدەواسی. بەلام لە هەمو دیمەنێك ، زیاتر کە دلی دەپساند دیمەنی

منداڵان بو له کور ، و له کچ ، تەنانەت منداڵی بچوکیش ، بە پـاشـی و درێژی ولاتدا دەسورانەوە ، لەم کاتەدا ئەو پیاوانەی کە تـوانـای ئـیـش کردنـان هەیە ، دانیشتبون چاوەروان و بەتەمای ئیش دۆزینـەوەبـون. ئـا ئەمەیە سروشتی سەرمایەداریتی ، کار گەیشتە رادەیەك چەند کارگەیەکـی بچوك وپیس و تاریك پەیدابوون ، کە منداڵ لە دوانزە ساڵ تا شانزە ساڵی دەخستەکار ، دە ، هەتا دوانزە سەعات ئیشیان پێدەکردن بە کـرێیـەکـی کەم ، هەندی لە خاوەن کارگەکان نەبونی ئیشیان بە هەڵ زانی ـ منداڵـی کور و کچیان ناچار دەکرد کە لە کارگەنیاندا ئیشی قورس ، ماندوکەر ، و دور و درێژیان پێدەکردن ، بەم جۆرە ئەم تەنگ و چـەلـەمـەیـە دوبـارە رەوشـی ئیش بەمنداڵ کردنی هێنایەوە کایە ، و رێزی یاساکانی نەهێشـت و رسوایکردن بەیاسای ئیش ، و بە یاسای کرێکارانیشەوە.

دەبێ لێرەدا بڵێین نە لەئەمەریکا ، و نە لە جیهاندا نـاتـەواوی لـە خواردەمەنی ، وەیا لەگەل و بـەڵـێ دروسـتـکـرا ودانـەبـو ، بـەڵـکـو بەپێچەوانەوە ، کێشەکە بریتی بو لەزۆری بەرهەم هێنان. ئابوری شوناسی بەناوبانگی ئینگلیزی (هنری ستراکوش) لە یولیوی ۱۹۳۱ دا واتە لە دوەم ساڵی تەنك و چەلەمەکەدا باسی کردوە دەڵیت: ئەوەنـدە کـەل ، وپـەل ، وتفاق هەیە ، بەجۆرێك وەکو جاران بەشـی پـاریـزگـاری رادەی ژیـانـی دانیشتوانی جیهان دەکات ، بۆ ماوەی دوساڵ و سێ مانگی تر ، تەنانـەت ئەگەر لەم ماوەیەشدا ئادەمیزاد هیچ ئیشێك نەکات ، لـەگـەل ئـەمـەشـدا برسێتیو هەژاری لەم ماوەیەدا تەشەنەیان کرد بو بە جۆرێك لە جیـهـانـی پیشەسازی نوێماندا وێنەی نەبو ، ئەم مەسەلەیە لەم سنورەدا نـەوەسـتـا بەلکو لەهەمان کاتدا کە هەژاری ، و برسێتی پەرەی سەندبـو ، هـەنـدێ کەس تفاقیخواردەمەنـیـان دەفەوتاند و دەیان سوتاند، ـ هەرئەمەنا ، بەلکو بەروبومیان کۆنە دەکردەوە ، وازیان لێ دەهێنالە میللەکـانـدا بـرزیـن ، بەری درخت ومیوەیان نەدەچنی ، هەندێ جار دمیان بلـیـشـانـدەوە ، بـۆ ئەمەتەنها نمونەیەکت بۆدێنمەوە: لە (برازیل)دا لە نێوان یولیوی ۱۹۳۱ و شوباتی ۱۹۳۳دا (۱٤) ملیون کونیەیقاوەیان سوتاند ، لەبەر ئەوەی هەمـو کیسەیەك (۱۳۲) رەتلی تێدایە ئەمە مانای وایە (۰۰۰ر۰۰۰ر۸٤۸ر۱) رەتلی قاوە فەوتاوە کە لە پێداویستی هەمو دانیشتـوانـی جـیـهـان زیـاتـرە ،

ئەگەرهەریەکیکیان رەتلێك قاوەی بدەینی لەگەل ئەمەشدا ئێمە دەزانین ملیونەها لە خەلك حەز لە خواردنەوەی قاوە دەکەن کەچی ناتوانن بیگرن.

جگە لە قاوە بەرهەمی گەنم، و لۆکە ، و گەلێك شتی تری زۆر فەوتێنرا گەلێك کرد وکۆش کرا بو کەم کردنەوەی بەرهەمەکانی تر لە داهاتودا ، بەدانانی سنورێك بۆچاندنی لۆکە و لاستیك وجا... هتد چونکە مەبەس لەم فەوتاندن ، وسنوردانانە بەرزکردنەوەی نرخەکانی بەروبومی کشتوکال بو ، تاکو ناتەواوی و، کەم بونەوەیەك لە کەمیەکانیاندا پەیدابێت ، تاکو داواکەری زۆربێت و نرخەکەی بەرزبێتەوە ، ئەمەشتی چاکە و سەدی بۆ فەلاح هەیە کەوا بەرهەمەکەیخوی لەبازاردا دەفرۆشیت ، بەلام ئەو کەسەی بەرهەمەکە بەکاردینی (المستهلك) چی بکات؟ بەراستی ئەم جیهانەی ئیمە سەیرە ، چونکە ئەگەر بەرهەم هێنان کەم بێت نرخەکەی بەرزدەبێتەوە ، بە جۆرێك زۆربەی خەلك ناتوانن ئەوی دەیانەوی بیکرن ، لەبەر ئەمەلیی بێبەش دەبن ، خۆ ئەگەر بەرهەم هێنانیش زیاد بکات ، نرخیش دێتەخوارەوە وهەرزان دەبێت تا رادەیەك کارگەکان ناتوانن ئیش بکەن ، ئنجا بێئیشی بەرەدەسێنیّ ، ئیتر کرێکاری بێئیش چۆن دەتوانێت پێداویستی خۆی بکریّ کەپارەی نەبێت ! ئنجا لە هەردو حالەکەدا ، چ بەرهەم هێنان کەم بێت وەیان زیادبێت ، نەبونی ، وبێبەشی هەریەخەی جەماوەر دەکریت.

وەکو لەپێشدا ونم بە درێژایی ماوەی تەنك وچەلەمەکە ، کەمی کەلوپەل لەناو ئەمەریکا ونەلە هیچ شوێنێکیتردا نەبو ، ئەوانەی پیشەیان کشتوکال بو ، بەروبومی کشتوکالیان هەبو کە نەیان توانی بوبی فروشن وسەرفیکەن ، لەگەل ئەمەشدا ، هەمو ئەوانەی پیشەیان کشتوکالە ، لەگەل دانیشتوانی شارەکاندا پیویستیان بە تفاق ، و کەل وپەلی یەکتری هەیە ، سەربارەت بە کەمی پارە ئەم کەل وپەل گورینەوەیە راوەستا ، لێرەدا خەلکی لە ئەمەریکادا کە ولاتیکی سەرمایەداری پیشەسازی پێشکەوتوە ، گەرانەوە بۆ رزێمیئالوگۆر کردنیشتومەك و گۆڕینەوەی (المقايضة) هەروەکو لەرابوردودا هەبو ، پێش ناسینی پارە ، لەناو ئەمەریکا بە هەزاران رێکخراو بۆ ئالوگۆر کردن و گۆڕینەوە پێك هات ، چونکە گۆڕینەوە لەرزێمی سەرمایەداریدا نوشوستی هێنا وسەرنەکەوت لەبەر کەمی

پارە ، ئنجا خەلکی دەستیان بەکاروبار بەرێوەبردنی خۆیان کرد بێ ئەوەی پارە بەکاربێنن ، لەناو خۆیاندا کارگوزاری ، و کەلوپەلیان ئالوگۆر دەکردو ، دەگوریەوە ، کۆمەلانی ئالوگۆرکردن و گۆرینەوە ، بروانامەی دەردەهێنا بۆ یارمەتدان لە گۆرینەوەی کەل وپەل و ، شتومەکدا لە نمونە سەیرەکان: فەلاحێك شیر و کەرە و هێلکە دەدات بە زانکۆ ، تاکو بە مندالەکانی بخوێنن وفیریان کەن.

رژێمی ئالوگۆرکردن و گۆرینەوە لە ولاتانی تریشدا پەرەی سەند ، وەجێی رژێمە ئالوزەکەی لەمەرگۆرینەوەی بەپارەکرت کە لەنێودەولەتاندا هەیە ، ئینگلتەرە خەلوزەکەی خۆی (خەلوزی بەرد - وەرگێری) ، گوریەوە بە تەختەوداری (اسکندنافیا)و ، (کندا) ئەلەمنیومی دا بە یەکێتی سوفیت لە جیاتی ئەمە نەوتی وەرگرت ، ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا گەنمی دا بە (برازیل) بەقاود ، ئیتر بەم جۆرە.

خاوەن کێلگەکان لە ئەمەریکادا دوجاری هەزاریەکی بێوینەبون ، قەرزەکانی کە لە بانقەکانیان کردبو ، لەسەر حیسابی رەهن کردنی کێلگەکانیان ، نەیان توانی بیدەنەوە ، ئنجا بانقەکان هەولیان دا قەرزەکانیان بسێننەوە ، بە زۆر لێکردن لەخاوەن کێلگەکان کەزەویەکانیان بفرۆشن ، بەلام خاوەن زەوی و کێلگەکان بریاریان دا ئەمە نەکەن و نەهێلن بۆ ئەم ئامانجە گەلێك لێژنە پێك هات بۆ تێکۆشان لە پێناوی نەفروشتنیدا ، لە ئەنجامی ئەمەدا کەس نەیوێرا کێلگە و زەوی خاوەن کێلگەکان بکرێت لە هەراج کردندا. بانقەکان ناچاربون بە مەرجەکانی خاوەن کێلگەکان قایل بن ئەم شۆرشە لەمەلبەندەبە کشتوکالەکانی ئەمەریکای ناوەراستدا بلاوبوەوە ، ئەمە زۆر گرنگ بۆ نیشانە و مانایەکی زۆر گەورەی هەبو ، چونکە دەریخست ئەو خاوەن کێلگە نەریت پەروەرانە (المحافظین) کە بربرەی پشتی ولاتەکە بون ، چون تەنگ وچەلەمەکە لەناکاو کردنیبە شورشگیر لە بیرراو کردەوەیاندا ، ئەم بزوتنەوەیەیان لەبارو زورفیانەوە پەیدابوبو ، وە هەرگیز فریبە سوشیالیستی و شیوعیتییەوە نەبو ، ئەم کێشە ئابوریە لەخاوەن کێلگە ، و زەوی وزار ، و خاوەن مافەوە کردنی بە فەلاح کە هیچ مافێکی نییە تەنیا کێلانی زەوی جاندنی نەبێت ، وە دروشمی وەکو: "مافەکانی ئادەمیزاد پێش مافەکانی

خاوەندایەتی (التملك)" وە "لەپێشەوە بایەخدان بد ئافرەت و منداڵ ئنجا دانەوەی قەرزەکان" یان هەبو.

باسی بارو ، وەزعی ئەمە رێگام زۆرکرد لەبەرئەوەی وڵاتێکە دەق ، وشێوازێکی تایبەتی هەیە ، هەمو ولاتە سەرمایەدارەکان پێشکەوتوترە ، رەك و ریشەی دەرەبەگایەتی تێدانیە ، وەکو لە ئەوروپا ئاسیادا هەیە بویە گورانگاریەکانی ناوی دەبێت خێرا بێت ، هەرچەندە ولاتانی‌تر بەبینینی هەزاری جەماوەرەکەیان راهاتون ، بەلام ئەمەریکا ئەمەی بەخۆیەوە نەدیبو ، دەتوانی شارەزای وەزع وباری ولاتانی‌تر ببێت ئەگەر بەئەمەریکا بەراوردی بکەیت ، هەیان بو لەم زۆر خراپتر ، وە هەیا نیوتۆزیك باشتر ، سەرجەم ولاتە بە کشتوکالەکان و ، ولاتە دواکەوتوەکان ئەوەندەی ولاتە پێشکەوتوەکان لە پیشەسازیدا ئەم تەنگوچەلەمەیە کاری تێنەکردن دوا کەوتوییەکەیان تارادەیەك فریایان کەوت! گەورەترین کێشەی ئەم ولاتە دواکەوتوانە ، هەرزانی بەرهەمی کشتوکال بو کە کەلێك تەنگانەی بۆ فەلاحەکان پێك هێنا بۆ نمونە: (استرالیا) کەبەوڵاتێکی خاوەن کشتوکال دەژمێررێت نەی‌توانی قەرزی بانقەکانی ئینگلتەرە بدانەوە و خەریك بو نابوت دەبوبە هۆی هەرزانی بون و هاتنەخوارەوەی نرخی بەرهەمەکانی کشتوکالەوە ، بۆ ئەوەی خۆی رزکار بکات مەرجە سەختەکانی کە بانقەکانی ئینگلتەرە بۆی دانابو پێی قایل بو ، ئیتر هەروەکو دەستورێکی گشتی لەکاتی کێشەئابوریەکاندا تەنیا چینی خاوەن بانقەکان دەبوژێنەوە.

لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەمەریکا قەرزدانی راوەستاند ، وەنەی‌دا یە دەولەتەکانی ئەمەریکای خوارو ، تەنگ وچەلەمەیەکی ئابوری لەناویاندا رووی‌دا ، زۆربەی حوکومەتەکانیان وەیا فەرمان رەوا دیکتاتورەکانیان کودەتا ، وئینقلابیان بەسەرداکرا ، ئیتر کودەتا و ئینقلاب لەهەمولایەکدا لە (ارجنتین ، برازیل و ، شیلی) پەرەی‌سەند ، ئەم کودەتا و ئینقلابانەش هەروەکو هەمو کودەتا و ئینقلابەکانی‌تر کە لە ئەمەریکای خوارووا دەقەوما بریتی بون لە ئینقلابەکانی ناو کوشکەکان ، تەنها دیکتاتورەیا دەستەی فەرمان رەوای تیدادەگۆررا ، ئەوی زاڵ دەبو بەسەر

سوپا ، وپولیس دا ، ئەو حوکومرانی وڵاتەکەی دەکــرد ، لــەبــەر ئــەوەی دەولەتەکانی ئەمەریکای خواروو تاکوپچکەیان لــە قەرزدا نــوقــوم بــوبــو قەرزەکانیان پێنەدرایەوە.

# هۆكانی تەنگ و چەڵمەكە چین ؟

٢١/یولیو/١٩٣٣

تەنگ وچەلەمە ئابوریەكە فورتمی جیهانی گرتیو ، لەوانە بوبی خنكینی ، لەگەلێك ولاتاندا ئامێری كاركەكان لە جولە كەوتن ، ئەو كێلگانەی كە خواردەمەنی وبەروبومی تریان بەرهەم دەهێنا ، بەبەیاری مانەوە ، وكەس نەی كێلان ، درختی لاستیك ، لاستیكی لێدەتكا ، وكەس نەبو گوی كاتەوە ، دەوەنی چاپی كە بە قەدپالی جیاكانەوە بون كە جاران بایەخیان پێدەدا ، خرانە پشت گوێ ، وبەرەلاكران ، ئەوانەی كە لەم مەڵبەندانەدا ئیشیان دەكرد چونە پال لەشكری بێئیشەكان ، وهەر چاوەروانی هەلی ئیش دوزینەوە بون ـ بەلام بە نامرادی ـ لەگەلێك لە ولاتاندا خۆكوشتن زیادی كرد ، وپەرەیسەند.

وەكو لەپێشدا وتم هەمو پیشەسازیەكان ئەم تەنگانەیە كاری تێكردن تەنها پیشەی چەك سازی ، وتفاقی جەنگی نەبێت كە لەبرەودابو ، بو ناردنی یارمەتی (امدادات) ، وپێداویستی سوپا ولەشكرە دەریایی وئاسمانیەكان ، بازرگانی چەك بوژایەوە ، وكەوتە برەو ، وەبازرگانی گدرانی گەلێك قازانجیان كرد ، چونكە هەلی ناكۆكی وزورانبازی نێوان دەولەتانیان بەكارهێنا ، كەوا زیاتر بەرەو خراپتر دەچو هەر كە كێشەكە زیادی بكردایە وزیفی بسەندایە.

تەنها تاكە ولاتێكی مەزن هەبو كە تەنگانەكە كاری تێنەكردبو ئەویش یەكێتی سوڤیت بو ، لەوی بێئیشی نەبو ، بەڵكو زوّر بەكور ئیش كردن لە پرۆژە پێنج ساڵیەكەدا بەردەوام بو ، یەكێتی سوڤیت لەناوچە ومەڵبەندی سەرمایەداری بەدەربو ، وەرژێمە ئابوریەكەی جیایە لە رژێمی ئابوری سەرمایەداری بەلام هەروەكو وتم یەكێتی سوڤیتیش لابەلا توشی هەندێ زەحمەتیبو كە لەتەنگ وچەلەمەكەوە پەیدابوبو لە ئەنجامی هاتنە

خوارەوەی نرخی بەروبومی کشتوکالەکاندا کە بەدەولەتەکانی تری دەفرۆشت.

هۆی ئەم تەنگانە بەتینە چییە؟ ئەم تەنگانە جیهانییە کە لە سەغلەتی وسەختیدا لە جەنگی جیهانی دەچیت؟ ئەمە پێیدەوتریت تەنگ وچەلەمەی سەرمایەداری ، چونکە دام ودەزگای رژێمی سەرمایەداری توانای هەلگرتنی گرانباری ئەم تەنگوچەلەمەیەی نییە ، بوچی؟ ئایا تەنگانەکە وەختیبو ، سەرمایەداری دەیتوانی بەسەریدا تێپەڕێت ، یان سەرەتای مردنی ئەم رژێمە مەزنەبو کەوا ماوەیەکی دور ، و درێژ دەسەلاتی بەسەر جیهاندا هەبو؟ ئەمانە پرسیارێکی گرنگن پاشە رۆژی ئیمە ، وئادەمیزاد بەندە بەوەلام دانەوەیانەوە ، حوکومەتی بەریتانیا لە دیسەمبەری ١٩٣٢ز.دا یادداشتێکیدا بەحوکومەتی ئەمەریکا ، لەم یادداشتەدا دەست نیشانی ئەو چارەسەرکردنەی کرد کە هەولی دا بەکاری بینی ، کەچی دەردەکەی نوندتر وئالۆزتر کرد ، لەیادداشتەکەدا وتی: "بی بەزەیی لە هەمولایەکدا باجەکان "الضرائب" زیادکران ، مەسرەف بەجورێکی فراوان کەم کرایەوە لەگەل ئەمەشدا سنوری چاودێری کردن کە ئامانجی چارەسەرکردنی بارو ، وەزعەکان بۆ زیاتر ئەمەی ئالۆز کرد" یادداشتەکە لەسەری رویشت و ، وتی: "ئەو زیانی ، وئازارانەی کە دوچاری ئادەمیزادبوە سەبارەت بەبەدی ، و خرابی رەوشت وکردەوەی سروشتەوە (الطبیعة) نییە ، سەرکەوتنەکانی زانیاریە سروشتیەکان (العلوم الطبیعیة) بەردەوامە ، وەتواناکانی بەرهەم هێنانی سامانە راستەقینەکان ، هەروەك خۆیان ماونەتەوە ، هەلەکە هەلەی سروشت نییە ، بەلکو هەلەی ئادەمیزادە ، هەلەی ئەو رژێمەیە کە لەسەری دەروات".

زانینی دەردی سەرمایەداری ، زانینێکی راستەقینە وشارەزابونی ، لەگەل دانانی چارەسەرێك بوی شتێکی ئاسان نییە تەنانەت زانایانی ئابوری لەناو خۆیاندا ناکۆکن لەسەرهۆ ، وریبازەکانی چارەسەرکردنی ، ئەو کەسانەی کە بروایان وایە ، وبەیەم کاربارە بە تەواوەتی دەبەن تەنیا سوشیالیستی ، شیوعیەکانن ، کەوا لەناو ئەم تەنگوچەلەمەیەدا ، راست ودروستی بیروراکانیان کدێش بێنی ، بەنەمانی سەرمایەداری دەدۆزنەوە ، بەلام شارەزایان و ، پسپۆورانی سەرمایەداری سەرسامن ، تەنانەت

(مونتاجونورمان) کە گەورەترین ، وبە تواناترین پیاوانی پارە ودارایی بەریتانیاییە ، وەپارێزەری (محافظ) بانقی ئینگلتەزەیە لە ئاهەنگێکی گشتیدا وتی: "چارەسەرکردنی کێشە ئابوریەکەی کە یەخەی گرتوین لەوزەماندا نییە ، زەحمەتیەکان زۆرن ولەبابەتێکی تازە وبێوێنەن ، وپێشتر روویان نەداوە بەجۆرێك ناچارم کە باسیان بکەم لەکاتێکدا کەمل کەچی ونەزانین زاڵن بەسەرمدا ، بەڵام دەربارەی پاشەرۆژ هیوام وایە کە لەلایەکی تری ئاسووە رونکی ببێنین ، ئەو روناکیەی کەوا هەندێکمان خەریکە بەدی دەکات" بەلام وادیارە ئەم روناکیە دڵخۆش کەرەیە ، پێش ئەوەی هیوا بژیەنێتەوە مرداری دەکاتەوە. پیاوێکی سیاسی ئینگلیزی (سیراوکلاندجدس) ناو ، ووتی: "پیاوە داناکان لەوباوەرەدان کە رژێمەکەمان بەرەونەمان دەچێت ئێمە مانان لە ئەوروپادا ئێستا دەزانین کە سەردەمێك لە سەردەمەکانی مێژوو لە گیانەلادایە".

ئەلمانەکان لەوباوەرەدا بون کە هۆی تەنگوچەلەمەکە ئەو زیانی بژاردنەوەیەیە (التعویضات) کەوا خرابوە سەریان بێدەنەوە ، هەندێکی‌تر لەوباوەرەدابون کە بە هۆی قەرزەکانی جەنگەکەوە پەیدابوە ، ئەمە چ لە نیوان دەولەتیك ودەلەتەکانی تردا ، وەیان لە نێوان دەولەتەکە ومیللەتەکەی خۆیداکە بو بە هۆی قورستر کردنی گرانباری ، ئنجا پیشەسازی کلا ، ونوشوستی هێنا ، بەم جۆرە ئوباڵی کێشەکانی جیهانیان خستە ئەستوی جەنگەکەوە ، بەلام هەندی لەزانایانی ئابوری بروایان وابو کە هۆ راستەقینەکە بریتیە لە رەوشتی سەیری بارە ، وهاتنە خوارەوەی نرخەکان سەربارەت بەکەمی زێر ، وەکەمی زێریش لەئەنجامی ئەوەدابو کە میقدارێکی زۆریان دەرنەدەهێنا بەڵام گەلێکی تریش وایان دەزانی کە سیاسەتی ئابوری نیشتمانی کە کوسپی گومرك دادەنێت هۆ راستەقینەکەیە چونکە بەمە بارزگانی کۆسپی دێنەبەر ، هەروها هەندێکی کە لەو باوەرەدا بون کە هو کە پێشکەوتنی زانیاری ، وبەکارهانینیەوەیە ، کەبوە بە هۆی کەم کردنەوەی ژمارەی کرێکاری پێویست لە ئیش و ، فرمانەکاندا ، بۆیە بێئیشی بڵاوبوتەوە.

لەوانەیە ئەم هەمو شتانە کۆمەکیان بە هاتنی تەنگانەکە کردبێت ، بەڵام هەڵەیەکی زڵە ، ئەگەر سەرزەنشتی یەکێکیان ، وەیان هەمویان

بگەن. بەلکو بە پێچەوانەوە ، هەندێکیان سەر ئەنجامی تەنگانەکەیو ، لەگەل ئەمەشدا هەر یەکێك لەمانە یارمەتیدا لە زیف سەندنی تەنگوچەلەمەکەدا ، کەوابو دەبێت هو راستەقینەکەی لەمە زۆر قولتر بێت سەبارەت بە شکاندن وبەزین نەبو لە جەنگەکەدا ، چونکە دەولەتە سەرکەوتوەکانیش ، هەمان دەستور توشی بوبون ، سەبارەت بە هەژاری خەلکەوە نەبو ، چونکە دیمان ئەمەریکا کە دەلەمەندترین دەولەتی جیهانە لەوانی کە زیاتر توشی هات ، هیچ گومانی تێدانیيە تەنگوچەلەمە جیهانیەکە سەبارەت بە دوو هۆ خێرا پەیدابو: یەکەم قەرزێکی زۆر کەوا کەوتبوە سەرریەك ومابوەوە. دووەم: شێوازی دابەشکردنی ئەم قەرزە بەسەر قەرزدارەکاندا. هەروها لەبەرئەوەی کە نرخی پێداویستیەکان لەکاتی جەنگەکەدا نرخێکی راستەقینە نەبو ، بۆیە دەبوایە بهاتایە خوارەوە ، دەبا کچم سەیرێکی کێشەکە بە جۆرێکی قولتر بکەن.

دەوترا هۆی کێشەکە گوایا بریتیيە لە زۆری بەرهەم وشەی بەرهەم زۆری قێلیکە ، چونکە نابێت بەرهەم زۆری هەبێت ، لەکاتێکدا کە دەبینین ملیونەها خەلك پەرێشانن لەبەر کەمی شتومەك کە بۆ پاراسنی ژیانیان زۆر پێویستە. بە صەدان ملیون خەلك لە هیندساندا بێ جل وبەرگن کەچی کارگەکانی قوماش هیندستاندا جمەی دیت لە گەل وپەلدا ، و "زۆرە" کەوابو راستەکەی ئەوەیە کە خەلکی زۆر هەزارن ، تارادەیەکی ئەوتو ناتوانن ئەم شتومەکانە بکرن ، نەك لەبەرئەوەی پێویستیان نیيە بەلکو لەبەر کەمی بارە بەدەست خەلکەوە ، ئەمەش وانا کەیەنیت کە بارە لە جیهاندا خۆی شاردوتەوە ، ونەماوە ، بەلکو مانای وایە کە دابەش کردنی لە جیهاندا گۆراوە - وەتا ئێستاش هەر دەگورری - واتە نارەوایيەك هەیە لە دابەشکردنی سامانەکاندا ، لەلایەکەوە دەبینین سامان لای چینێك لە خەلك کۆدەبیتەوە ، کەلەکە دەبێت ،ونازانن چۆن سەرفی دەکەن ، بەلکو لە بانقەکاندا دای دەنین ، وە بەکاری ناهێنن لە کرینی شتومەکدا لەبازار ، لەلایەکی تریشەوە دەبینین چینێکی تری خەلك بارەی نیيە ئەوەی زۆر پێویستیتی پێی بکرێت.

دەتوانین ئەم خالە کورت کەینەوە ، وبلێین: دەولەمەندی هەیە ، وهەژاری هەیە ، ئەمە راستەکە(الحقیقة) ، کەوا پێویست بەرون کردنەوە

ناکات ، ئەمەش لە دروست بونی مێژووەوە هەیە ، بەلام ئۆبالی ئەم کێشەیەی ئێستا بۆچی بچێتە ئەستۆی ئەم راستییەوە (الحقیقة)؟ وا بزانم لەپێشدا پێم وتیت کە لەرژێمی سەرمایەداریدا سامانەکان خراپ دابەش دەکرێت ، لە سەردەمی رژێمی دەرەبەگایەتیدا بار ، ووەزع چەقیبو خێرا نەدەجولا ، بەلام لەسەرما یەداریدا - چونکە ئامێرە مەزنەکان وبازرگانی نیودەولەتان هەیە بۆیە گۆڕان خێرا روودەدات ویارمەتی کۆبونەوەی سامان دەدات کە تەنها لەلایەك کۆبێتەوە ئیتر لە ئەنجامی خراپ دابەش بونی سامانەکان لەگەل گەلێك هۆی تردا ، دەبونە ناخۆشی وناکۆکیەکی تازە لە نێوان کرێکارەکان وسەرمایەدا لەناو ولاتە پیشەسازەکاندا ، سەرمایەدارەکان هەولیان دا لە توندوتیژی ئەم ناخۆشی ، وناکۆکیە کەم کەنەوە ، ئنجا هەندی کرێیان بۆ کرێکارەکان زیادکرد ، و وەزع وباری گوزەرانی کرێکارەکانیان تۆزێك چاك کرد.. هتد ، ئەمە لەسەر حیسابی چەوساندنەوەی موستەعمەرەو ، ولاتە دواکەوتوەکان بو ، بەم جۆرە چەوساندنەوەی موستەعمەرەکان ، وولاتە دواکەوتوەکان لە ئاسیا ، وئەفەریقا وئەمەریکای خواروودا بو بەهۆیەك لەبارمەتدانی ولاتەکانی رۆژئاوای ئەوروپا و سەرووی ئەمەریکا کە خاوەن پیشەسازین ، کەوا سامانیان لاکۆبێتەوە ، وە بەشێکی کەمی بدەن بە کرێکارەکانیان ، ئنجا کە بازاری نوی دوزرایەوە. وبیشەسازیەکان کوران وبیشکەوتن ، ئیتر ئیستیعمار وینە وریبازیکی توندوتیژی گرت لە دوزبنەوە ، وپەیداکردنی بازاری نوێ ، وکەرەسەدا (المواد الخام) ئنجا بەربەرەکانی لە نێوان دەولەتە پیشەسازەکاندا پەروەردەو ، پەیدابو ، وە بوبە زۆرانباری ، وناخۆشی ، ئیتر کە جیهان گەیشتە پلەیەکیوا ، و کەوتە رکێفی دەسەلاتی سەرمایەداریتی یەوە ، ئنجا ریی بەربەرەکانی نەماوە زۆرانبازیەکەش بوبەجەنگی جیهانی.

ئەم باسەم لەپێشدا بۆ کردیت ئێستاش دوبارەی دەکەمەوە تاکو لە تەنگ وچەلەمە جیهانی یە کە تێبگەیت ، لە ماوەی پێشکەوتنی سەرمایەداری ، وپێگەیشتنی ئیستیعماردا گەلێك تەنگ وچەلەمە لە رۆژئاوادا رووی‌دا ، سەبارەت بەکۆبونەوەی سامان لەلایەك ، وەکەمی سامان لەلایەکیتردا بەلام ئەم تەنگوچەلەمانە بەهێمنی تێپەر دەبون چونکە سەرمایەدارەکان پارە

زیادەکانیان لە گۆڕان ، وچەوساندنەوەی ولاتە دواکەوتودکاندا بدکار دەهێنا لەوێدا بازاری نوێیان دروست دەکرد ، کە کەل وپەلێکی زۆری تێدا سەرف دەبو ، وە ئیستیعماریش بەوە ناودەبرا کە: "دواقۆناغە لە قۆناغدکانی سەرمایەدارێتی ، دەبوایە چەوساندنەوەی میللەتان هەر بەردەوام بوایە ، هەتا هەمو دەولەتێك دەبو بە خاوەن پیشەسازی خۆی بەلام زەحمەتیەکی زۆر لەم رێبازەدا پەیدابو ، گرنگەکەیان بەربەرەکانییە توند وتیژەکەی نێو دەولەتە ئیستیعماریەکان بو ، هەریەکەیان بەشێکی زۆرتری دەویست ، سەرباری ئەمەش پەیدابونی بزوتنەوە نوێکانی نیشتمانی کە لەموستەعمدرد و ولاتە ژێر دەستەکاندا لەگەل پێگەیشتنی پیشەسازیەکان تیایاندا ، کە لە ئەنجامیدا لەبەربومی خۆیان پێداویستیەکانی خۆیانیان مسۆگەر دەکرد ، ئەمانە هەموی بو بەهۆی جەنگ بەلام خۆجەنگیش کێشەکانی سەرمایەداری جێبەجێ ناکات ، بۆ نمونە: یەکێتی سوڤیت لە جیهانی سەرمایەداری ببرای ببرهاتە دەرەوە ، و ئیتر نەدەچەوسایەوە ، هەروەها بزوتنەوەی نیشتمانی لە رۆژهەلاتدا پەرەیسەند ، وەشێوازێکی توندوتیژی گرت ، دیسانەوە پیشەسازیش بلاو بوەوە. کاتی جەنگ ودوای جەنگ سامانەکان بەجۆرێکی نارەوا دابەش کرایەوە ، ئنجا بێئیشی بلاوبوەوە ، سەرەرای ئەمەش قەرزو قولەی جەنگەکەش بو بەهۆیەکی گرنگ بۆ رووداني تەنگوچەلەمەکە.

ئەم قەرزانە زۆر قورس بون ، وە لە بری ئەم قەرزو قلانە سامانێکی بەدیکراو ، و ئاشکرا ، وەرنەگیرابو ، واتە ئەگەر ولاتێك پارەیەك بەقەرز وەرگرێت بۆ راکێشانی هێلی ئاسنینی شەمەندەفەر وەیا بۆ دروست کردنی بەستێك (سد) وەیا هەرشتێکی تر بە کەلکی بێت ، تارادەیەك دەستکەوتی گەلێك زیاتر بێت لەو پارەیەی کە تیایدا سەرەف کراوە ، وبەکار هێنراوە ، ئەم ئیشانە پێیدەوتریت (فرمانە بەبەرهەمەکان). بەلام ئەگەر تەماشای قەرزەکانی جەنگ بکەین دەبینین بۆ ئەم ئامانجە بەکارنەهاتوە ، بەلکولە پێناوی وێرانکاریدا سەرف کراوە ، بەم جۆرە قەرزەکانی جەنگ زۆر قورسە ، هیچ شتێك گرانباریەکەی سوك ناکات ، ئەم قەرزانە سێ جۆرن: بژاردنەوەی زیانی (التعویضات) جەنگ بریتیبو لەو پارەیەی کە بەسەر دەولەتە بەزیو ، شکاوەکاندا سەپێنرابو ، وە ئەو

قەرزانەی کە دەولەتە هاوپەیمانەکان لەیەکتریان قەرز کردبو ، بەتایبەتی لە ئەمەریکا ، وە قەرزە نیشتمانیەکان واتە ئەو قەرزانەی کە دەولەتەکان لە هاونیشتمانیەکانی خۆیانیان قەرز کردبو.

هەمو جۆرەکانی ئەم قەرزانە زل بون بەلام لە هەمویان گەورەتر قەرزە نیشتمانیەکان بو ، بۆ نمونە: ئەم لە بەریتانیادا گەیشتە (٦٥٠٠) ملیون جونەیهی ئیستر لینی ،تەنانەت فایزەکانی ئەمبارانە گرانباریەکی قورس پێك دێنی ، بۆیە باجەکان زیادکران ، بەلام ئەلمانیا لە قەرزە نیشتماکەی رزگاریبو ، بەوەی کە پارەکەی خۆییزۆرکرد ، وە زیاتر سکەی لێدا بەمە (مارك)ە کۆنەکەی شکاند ، بەم جۆرە رزگاربونی لەسەر حیسابی ئەو خەلکەبو کە پارەی لێ قەرزکردبون دیسانەوە پارەش لە فەرەنسەدا زۆربو ، بەلام تا رادەی ئەلمانیانا ، نرخی (فرەنك) بوبە پێنج یەکی جارانی ، بەم جۆرە فەرەنسە بەجارێك نرخی قەرزەکانی کرد بەپێنج یەك. ئەم فیلە لەدانەوەی قەرزدا لە نیودەولەتەکاندا ، وەیان لە بژاردنەوە زیانیدا (التعویضات) نەدەکرا چونکە دەبوایە بە زێر ئەم دو جۆرە قەرزە بدرێتەوە.

هەر دەولەتێك کە قەرز دەداتەوە بە دەولەتێکی کە مانای وایە ، چەندی داوەتەوە ئەوەند پارەی لەکیس دەچی وهەژار دەبێت ، بەلام کە قەرز دەداتەوە بە هاونیشتمانیەکانی ئەو پارە ومالە لەناو ولاتەکەدا دەمێنێتەوە ، رەنگە لە سەرەتاوە وابێت بە یادماندا کە ئەمە ئەنجامێکی ئەوتۆی نییە ، بەلام ئەگەر باش بیری لێبکەینەوە دەبینین ئەو دەولەتەی کە دەیەوێت قەرزەکانی بداتەوە گەلێك باج دەخاتە سەر میللەت بەهەژار ودەولەمەندیانەوە ، ئەو پارانەیکۆیدەکاتەوە ، دەیداتەوە بە خاوەن سەنەدی قەرزەکان ، کە ئەم خاوەن سەنەدانەش لە دەولەمەندەکانن ، واتە لەئەنجامدا باج لەسەر هەژار ودەولەمەند دادەنرێت تاکو ئەو پارەیەی کۆدەبێتەوە بدرێتەوە بە دەولەمەندەکان ، ئنجا دەولەمەندەکە ئەو پارەیەی کە داویێتی وەری دەگرێتەوە ، بەلام هەژار هیچ وەرناگرێت ، بەم جۆرە هەژار هەژارتر ، ودەولەمەند دەولەمەتر دەبێت.

ئەگەر دەولەتە قەرزدارەکانی ئەوروپا ، قەرزەکانیان بدەنەوە بە ئەمەریکا ، ئەمە مانای وایە ئەم پارانە هەموی دەچێتە لای خاوەن بانقەکان

و پارەدارەکان ، بەم شێوەیە قەرزی جەنگەکە پارمەتی خراپ بون ، وناهەموارکردنی بارو ، وەزعەکەیدا ، بە کۆبونەوەی پارەیەکی زۆرلای دەوڵەمەندە کان لەسەر حیسابی هەژارەکان دیارە دەولەمەندەکان حەز دەکەن پارەکانیان بەکاربێنن ، وەحەزناکەن بە پەك کەوتویی بێبینن ، بەم شێوەیە بەشداریان کرد لە دروست کردنیکارگە وکرینی ئامیردا بە جۆرێکی فراوانیوا ، کەوا ولاتەکە پێویستی پێنەبێت ، هەروها دەستیان کرد بە ، بەربەرەکانی وپێك دادانی یەکتری (المضاربة) لە بازاری پارەدا (البورصة) هەمو شتێکیان سازکردبو ، بۆ بەرهەم هێنانی کەل وپەل بە جۆرێکی فراوان ، بەڵام ئەمە کەلکی چییە؟ ئەگەر جەماوەر توانای کرینی ئەم کەلوپەلەی نەبێت لەبەر کەمی پارە بەدەستیانەوە ، بەم جۆرە بەرهەم زۆربو ئنجا کەلوپەلەکان نە دەفرۆشران ، وکارگەکان رەرەریان دەکرد ، ودەرگاکانیان پێوە دەدراو ، دادەخران کە خاوەن فرمانەکان ئەم هەمو زیانی ورەرەیان دی لە ترساندا بەشداریان لە پیشەسازیدا نەکردوراوەستان ، پارەکانیان لای خۆیان گلدایەوە لە بانقەکاندا دایاننا. بەم جۆرە بێئیشی پەرەی.سەند ، وە تەنگوچەلەمە ئابوریەکە هەمو جیهانی تێکرا گرتەوە.

جیا بەجیا باسی هۆی تەنگ وچەلەمە کەم کرد ، دیارە ئەم هۆیانە تێکرا هەمووی یارمەتی قەومانی تەنگ وچەلەمەگەیاندا ، وە کردیان بە گەورەترین گەورەترین تەنگانەیەك کە رووی دابێت ، ئەم تەنگانەیە لە سەرەتاوە لە خراپ دابەش بونی زیادە داهاتەوە (الدخل) پەیدابوبو ، کە کوتومت بەپێی پێداویستیەکانی رژێمی سەرمایەداری لێکرد ، بابە جورێکیتر باسی کێشەکە بکەین: جەماوەر وخەلکی موچە وکرێیان ئەوەندە نەبو کە بەشی کرینی پێداویستیەکان بکات کە خۆی بەرهەمی دێنی چونکە نرخی بەرهەمەکان گەلێك لەدارایی و داهاتی (الدخل) کرێکارەکان زیاتربو خۆ ئەگەر پارە لای کرێکارەکان زور بوایە ئەم بەرهەمانەیان پێدەکری ، بەڵام پارەکە لە دەستی چەند کەسانێکی کەمدا ، کۆبوبوەوە ، ونەی دەزانی چۆنی بەکاربێنی ، ئەم پارە زیادەیەبو کە ئەمەریکا بە قەرز دای بە ئەلمانیا ، و دەولەتەکانی ناوەراستی ئەوروپا وئەمەریکای خواروو ، هەر ئەم پارە زیادیەبو کە رەورەوەی سەرمایەدارێتی لەگەردا چەندسالێك هیشتەوە ، وە لە هەمان کاتدا هەر ئەم پارە زیادیەبو ، کە بو بە هۆی

قەومانی تەنگانەکە ، ئنجا راگرتنی ئەم قەرزانە سەرەتایەك بو بوّ روودانی کارەسات ومەینەتەکە.

ئەگەر ئەم شیتەل کردنەوەیەیتەنگووچەلەمەی سەرمایەداریە راست بێت ئنجا چارەسەر کردنەکەی لە یەکسانی داهات ودارایی (الدخل) دایە ، وەیا بەلای کەمەوە تێکۆشانە بۆ ئەم ئامانجە ئەمەش پێك نایەت بەجێبەجێکردن وبەکارهێنانی سوشیالیستی نەبێت ، بەلام سەرمایەدارەکان بەمەقایل نابن ئەگەر وەزع وزروف ناچاریان نەکات وزۆریان لێنەکات ، خەلکی باسی سەرمایەداریتی نەخشە کراو ، و (رێك وپێك) دەکەن ، هەروەها لە بابەت هەیئەتەکانی نیو دەولەتانەوە دەدوین کە بو کەلك وسود وەرکرتنە لەناوچە دواکەوتوەکان ، بەلام لە پشت ئەم هەمو گفت وگۆیەوە بەربەرەکانی ، وزۆرانبازیەکی زۆر بەتین خۆیان شاردوتەوە کەوا ناکۆکی ، وزۆرانبازی لە نێوان دەولەتە ئیستیعماریەکاندا پەیدا دەکات ، نەخشە دانان یۆچی ؟ ئایا بو جەوساندنەوەی خەلکیتر ، وەقازانج کردن لەسەر حیسابیئەوان ؟ سەرمایەدارێتی لە پێناوی قازانجی تاکی ، وەیا تەنیا کەسێکدا پەیدا دەبێت ، وەبەربەرەکانیش بنچینەکەیەتی ، کەوابو چۆن بەربەرەکانی ونەخشەدانان رێك دەکەون ؟!

جگە لەسوشیالیستی ، وشیوعیەکان زۆر لەدانایان دەبینین ، کە گوێ رادەگرن ودەپرسن لە بابەت توانای سەرمایەداریتیەوە لەم‌بار وزروفی ئێستایدا گەلێك چارەسەرکردنی سەیریان پیشنبارکرد ، نەك بۆ لابردنی رژێمی قازانج کردن بە تەنها بەلکو بۆ لابردنی خودی رژێمی نرخەکان کەوا بەپێی ئەمە ئادەمیزاد پارە دەدات لە بریکەل وپەلەکانی کە دەیکرێت. ئەمانە مەسەلەیەکی ئالۆزن پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەین ، بەلام ئەمانە دەری دەخەن کە چۆن خەلکی بروای بەم رژێمە لەق بوە ، هەندی کەس پیشنیاری شۆرشگێرانە دادەنیین لەگەل ئەوەشدا لە هەموکەسێك دورترن لە شۆرشەوە.

رێکخراوی ئیشوفرمانی نێودەولەتان (منظمة العمل الدولية) لە (جنیف)دا ، پێشنیاری ئاسانی پێشکەش دەکرد بۆ کەم کردنەوەی بێئیشی کە بریتیبو لە کەم کردنەوەی سەعاتی ئیش کردن ، وەکردنی بە چل سەعات لە هەفتەیەکدا بۆ ئەوەی ئیش بو ملیونەها کرێکاریتر پەیدابکرێت

نوێنەری کرێکاران ئەم پێشنیارەیان پێخۆش بو ، پێشوازیان کرد ، کەچی حوکومەتی بەریتانیا بەیارمەتی ئەلمانیا وژاپۆن بەرهەڵستی پێشنیارەکەیان کرد ، ئیتر ئەم پێشنیارە خرایە پشت گوێ ، بەم بۆنەیەوە دەمەوێت دەربخەم کە مێژووی بەریتانیا بەرامبەر رێکخراوی فرمان وئیش لە نێو دەولەتاندا هەمیشە کۆنەپەرستانەبوە ، لە ماوەی دوای جەنگەکەوە.

لەبەر ئەوی کە تەنگوچەڵەمە ئابوریەکە هەمو جیهانی گرتبووەوە ، وادێت بەبیردا کە چارەسەرکردنەکەیشی دەبێت لە چوارچیوەی دەولەتاندا بێت ، گەلێك ولات لەم رێبازەدا زۆریان هەوڵ دا بەلام هیچی سەری نەگرت ئنجا کە دەولەتەکان ، بێ ئومێدبون ، لە دۆزینەوەی چارەسەرێك لە چوارچیوەی دەولەتاندا ئیتر هەر دەولەتێك بۆ چارەسەرێك دەگەرا لە ناو ولاتەکەی خۆیدا ، بیروڕایان وابو ئەگەر بازرگانی نێودەولەتان کزبوبێت و هاتبێتە خوارەوە باخۆمان بازرگانی خۆمان بپارێزین ، وە نەهێلین کەل وپەل لەدەرەوەوە بێتە ناوەوە ، واتە: کە بازرگانی نێودەولەتان مسۆگەر نەبێت ، وە نوشوستی هێنابێت ئیتر هەمو دەولەتێك کرد وکۆشی خۆیی لە بازرگانی ناوخودا هێشتەوە ، لەبەر ئەمە کوسپی گومرکیان دانا ، وەباجیان لەسەر کەل ، وپەلەکانی بێگانە زیادکرد ، بەم جۆرە بازرگانی لە نێودەولەتاندا زۆر زەرەری کرد ، ولاتانی ئەوروپا وئەمەریکا لەم دەولەتانەبون کە کوسپی گومرکیان دانابو ، لەم دانانی گومرکە نرخی پێداویستیەکان بەرزبودوە ، چونکە کومرك ناهیلیت تفاقی خواردەمەنی لەدەرەوەوە بێت ، ئیتر لەناو ولاتەکەدا ئیحتیکاراتی (کارتیل) نیشتمانی پەیدا دەبێت لەبەر ئەمە بەربەرەکانی کردن (المنافسة) لەگەل دەرەوەدا کەم دەبێتەوە ، ئەگەر ئیحتیکارات (کارتیل) هەبو نرخەکان زیاددەکەن لەبەر ئەمە تەنیا پیشەسازی ئیحتیکار کراوە کە سودمەند دەبێت وەیان خاوەنەکانیان ئەمەش لەسەر حیسابی ئەوانەی کەل وپەل بەکادێنن (المستهلك) چونکە ناچارن کە نرخێکی زۆر بدەن. کچم بەم جۆرە دەبینین کە کوسپی گومرك چینێك لە خەلك سودی لێ وەردەگرن ، ئەمە بەرژەوەندی ئابوری دروست دەکات ، بۆیە خاوەن کارگەکان هەول دەدەن ئەم گومرك دانانە هەر هەبێت ، وەبمێنێتەوە ، هەروکو چۆن دروست کردنی قوماش لە هیندستاندا دەپارێزرێت دژی ژاپۆن ، ئەمە بۆ خاوەن کارگەکانی قوماش لە هیندستاندا زۆرباشە ، چونکە بێ ئەم پاراستنە ناتوانن بەربەرەکانی ژاپۆن

بگەن ، بۆیە دەیان بینین حوکوم فەرما دەبن بە سەربازاردا ، وەنرخی گران دادەنێن ، هەروەها دروست کردنی شەکریش پـارێـزراوە ، لـەبـەر ئـەمـە کارگەیەکی زۆری شەکر بەتایبەتی ناوچە یەکگرتوەکان و "بـیـهـار"دا ، دامەزراوە. ئەو بەرژەوەندییەی کـە ئـەمـەی دروسـت کـردوە ، ئـەگـەر نەپارێزرێت ، لەوانەیە دوچاری کێشە ببێت ، ئەوسا کارگەکانی شـەکـردا دەخرین.

دوجۆر ئیحتـیـکـارات (کـارتـیـل) هـەیـە کـە زیـادیـان کـردوە: ئیحتیکاراتەکانی دەرەوە کە لەنێودەولەتاندا هەیە کەوا رەسـمـی گـومـرك یارمەتی ئەم جۆرە ئیحتیکارەیدا. وەئیحتیکـاراتـی نـاوخـو کـە دەزگـا دامەزراوە گەورەکان ، دەزگا دامەزراوە بچکۆلەکـان قـوت دەدەن ، دیـارە پێگەیشتن وپەرەسەندنی ئیحتیکارات (کارتیل) شتێکی تازەنی‌یە چـونـکـە پێش جەنگی یەکەمی جیهانیش هەرهەبوە ، بەڵام لەم دواییەدا خێرا زیادی کرد ، هەروەها رەسمی گومرکیش لە زۆر ولاتاندا هەبوە ، بەڵام ئینگلتـەرە تا ئەم دواییەش هەر لە سەر بازرگانی ئازاد دەرۆیشت وەرەسمی گومـرکـی بەکار نەدەهێنا ، کەچی ئێستا هەڵوێستی خۆیی گۆڕی لەمـەدا پـەیـرەوی دەولەتەکانی‌تر کرد وکۆسـپـی گـومـرکـی دانـا ، بـەمـە هـەنـدێ لـە پیشەسازیەکانی خۆیی بوژاندەوە.

لە راستیدا سەرەرای ئەم خێرابوژاندنەوەیە کە ئـەم کـردو کـۆشـانـە هێنایە گۆڕێ وپەیدای کرد ، کەچی تێکرا لە هەمولایەکی جیهاندا بـارو ، وەزع زیاتر خراپتربو ، چونکە ئەم کوسپانە ، بازرگانی دەولەتانیان کـەم کردەوە ، ، وە بەردەوام یارمەتیان دا لە خراپ دابەش کردنی سامانەکاندا وە هەروەها هەمیشە بوە بە هۆی پەلپ گرتن ، ونـاخـۆشـی لـەنـێـو ئـەو دەولەتانەدا کە بەربەرەکانی یەکتریان دەکرد ، و هەریەکەیـان کـۆسـپـی لەبەردەمی ئەوی تردا دادەنا ئەمە پێی دەوترێت جەنگەکانی گومرك ، هەر چەندە بازاری جیهانی کەم بێتەوە ، و بازرگانی دەرەوە بپـارێـزرێـت ، ئەوەندە زۆرانبازی لە پێناویدا توندوتیژ دەبێت ، و خـاوەن ئـیـشـەکـان سوردەبن لە سەرکەم کردنەوەی کرێی کرێکارەکانیان تابتوانن بەربەرەکانی دەولەتەکانی تربکەن ، بەم جۆرە تەنگوچەڵەمە کە زیفی سـەنـد ، وەژمارەی کرێکارە بێئیشەکان زیـادیـان کـرد ، وە هـەرچـەنـدە کـرێی کرێکارەکان کەم کرێتەوە ، ئەوەندە توانای شت کرینیان کەم دەبێتەوە.

# بەربەرەکانی نێوان ئەمەریکا وبەریتانیا لە سەر پێشەوایەتی

٥ ٢٥/یولیو/١٩٣٣

باسی بێ بازاری بازرگانی کردنم بۆ کردیت کە چۆن لە سێیەکی زیاتر نەمایەوە ، ئنجا دوابە دوای ئەو ، سەبارەت بەلاواز بوونی توانای شت کرینەوە تەنانەت بازرگانی ناوخویش بێبازاری بەسەر داهات ، بێئیشی پەرەیسەند ئەرکی سەرشانی حوکومەتەکان گران بو ، لەبەر بەخێوکردنی ملیونەها لە کەسانی بێئیش ، ئنجا ئەم حوکومەتانە ناچاربون باجێکی (الضریبة) زۆر دانێن ، لەگەل ئەمەشدا نەیان دەتوانی مشوری کاری خۆیان بخۆن ، داهات (الواردات) هاتەخوارەوە ، سەرەرای کەم کردنەوەمەوچە (الراتب) ودەست گرتنەوە ، مەسرەف گرانی هەروکو خۆی مایەوە ، چونکە بەشی زۆری مەسرەف بو لەشکر وسوپای دەریایی ، وئاسمانی ودانەوەی قەرزەکانی ناوخو ، و دەرەوە تەرخان کرابو ، بودجەکان (المیزانیات) هەمیشە کزبون ، واتە مەسرەف زیاتربو لە داهات. ئەم کزیەش جێگە وشوێنی ولاتەکەی لاوازکرد ، چونکە تاکە رێباز ئەوەبو کە پارەی تر قەرزبکرێت وەیات پارەی نوستو یەدەك (الاموال الاحتیاطیة) بەکاربهێرێت.

لەهەمان کاتدا میقدارێکی زۆری کەل وپەل مابوە وەکەس نەیدەکری لەبەر پارەکەمی بە دەست خەلکەوە ، لەکاتێکدا ئەم کەل وپەلە "زۆرە" لەگەلێك حالەتدا دەفەوتێنراو دەسوتێنرا سەرەرای ئەوە گەلێك کەس هەبون کە پێویستیان بو ئەم تەنگوچەلەمەیە هەمولایەکی جیهانی گرتەوە (جگەلە یەکێتی سۆڤیێت) لەگەل ئەمەشدا دەولەتە جۆربەجۆرەکان نەگەیشتنە رێبازێك بۆ یارمەتدان لەکەل یەکتردا ، هەمو دەولەتیك تەقەلای دەدا کە لە سەر حیسابی مەینەتی ئەوانیتر سودمەندببێ ، کە ئەمە بارو ، وزعی زیاتر خراپ کرد ، دومەسەلەیتر هەیە کە هەرچەندە پەیوەندیان بەکێشە ئابوریەکەوە نیە ، کەچی گەلێك کاری تێدەکەن ، ئەم دوانەش :

یەکەمیان: بەربەرەکانی نێوان جیهانی سەرمایەداری ، ویەکێتی سوڤێتە ، دوەمیان: بەربەرەکانی نێوان ئەمەریکا وبەریتانیایە.

ئەم تەنگوچەلەمەیە دەولەتە سەرمایەدارەکانی پەرێشان ، وهەژارکرد ، تارادەیەك توانای جەنگ کردنی کەم کردەوە ، چونکە هەمو دەولەتێك لەپێشەوە هەولی دەدا کە مشوری کاروبارەکانی ناوخۆی بخوات ، هیچی وایان نەبوکە لە جەربەزەیی ، وسەرکێشی جەنگیدا بەکاری بێنن ، وەلەهەمان کاتدا ئەم تەنکوچەلەمەیە مەترسی جەنکی زیاترکرد جونکە دەولەتەکانی بێزار ، و هەراسان کرد ئەنجا ئەوی هەراسان بێت ، وبێزاربێت هەولٚ دەدات کە کێشەکانی ناوخۆی بەجەنگ کردن لەگەل هیتردا جێبەجێبکات ، ئەم بیرورایە دروستە بەمەرجێ دەولەتەکە دیکتاتۆرێك حوکومرانی بکات ، ئنجاپێش ئەوەی ناچاربکرێت واز لەجێ وشوێنی خۆیبێنی ، ولاتەکە توشی جەنگێکی وێرانکاری دەکات بەمە میللەت بیر لە کێشەکانی ناوخونەکاتەوە. لەبەر ئەمە ئەوی هەمیشە چاوەروان دەکرێت ئەوەیە کە دەولەتە سەرمایەدارەکان جەنگێکی سەلیبی لەگەل یەکێتیسۆڤێت وەیاشیوعیتی دا بکەن بە ئومێدی ئەوەی کە ئەم دەولەتە سەرمایەدارانە لە یەکتری نزیك ببنەوە ، وەکو لەپێشدا پێم وتیت کە تەنگوچەلەمە ئابوریەکە راستەوخو کاری لە یەکێتی سۆڤیت ئەکرد چونکە ئەم لەسەر بە ئەنجام گەیاندنی برۆژە پێنج سالیەکانیدا بەردەوام بو ، وە لەسەری دەرۆیشت ، ئنجا تا لەتوانای دایە بە هەرچی نرخێك بێت لە جەنگ دورکەوێتەوە.

بەلام بەربەرەکانی نێوان ئەمەریکا وئینگلتەرە ، دوای جەنگەکە دەبو هەررووی بدایە ئەم دوو دەولەتە لە گەورەترین دەولەکانی جیهانن، وە هەریەکەیان دەیەوێت زال بێت بەسەر کاروباری نێودەولەتاندا. پێشن جەنگە جیهانیەکە ئینکلتەرە کەورە وسەرداری جیهان بو کەجی دوای جەنگەکە ولاتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکابو بە دەولەمەند وبەهێزترین دەولەت ، لەبەر ئەمە ویستی مافی سروشتی خۆی لە پێشەوایەتی جیهاندا وەرگرێت ، ئیتر لەمە ولاری بە ئینگلتەرە نادات کە بریاری هەمو شتێك بدات ، هەروەها ئینگلتەرەش زانی کە رۆژان گۆراون واباشە بۆی کە خۆی لای ئەمەریکا خۆشەویست کات و دۆستایەتی بکات ، ئیتر لە بەرخاتری ئەمەریکا وازی

لەپەیماننامەکەی هێنا کە لەگەل ژاپوندا هەیبو ، بەڵام ئامادە نــەبــو واز لە جێو شوێن وبەرژەوەندیە تایبەتیەکــانــی بــهــێــنــی. بــەتــایــبــەتــی پێشەوایەتیەکەی لەپارە ، ودارایی‌دا (الزعامة المالية) چونکە گەورەیــی ، وئیمپراتۆریەتەکەی بەمەوەبەندن ، وهەرهەمان پێشەوایەتی بو کە ئەمەریکا چاوی تێبڕی بو ، وە بەتەمای‌بو ، لەبەر ئەمە دەبو لە نێوانیاندا مشتومر رووی بدایە ، ئنجا خاوەن بانقەکان ، لە هەردو ولاتەکەدا ـ بەپشتیوانــی حوکومەتەکانیان ـ لەسەر ئەم پێشەوایەتی پارە ، ودارایی ، وپیشەســازیــە لەناخۆشیدابون ، وەناخوشی وناکۆکی ناوخــۆیــان بــەوشــەی رێــك وپــێــك ورەنگاورەنگ دەشاردەوە ، ئەمەریکا وادیاربو لەم پێشبرکی‌یەدا (المبــاراة) بێگومان خۆی بەسەرکەوتو دەزانێت ، چونکە کاغەزەکانی کە سەرکەوتوویی پێوەیە بەدەستی یەوەیەتی ، بەڵام ئینگلتەرەش شارەزاییەکــی دوورودرێــژی هەیە ، چاپوك ولێهاتوە لەباری یەکەدا.

قەرزەکانی جەنگەکە رق وکینەی لــە نــێــوان هــەردوو دەولــەتــەکــەدا زیاترکرد. ئینگلیزەکان ، نەفرەتیان لە ئەمەریکاییــەکــان دەکــرد ، وەتــا- وانباریان دەکردن ، وەبە (شیلوك)یــان دادەنــان کــەوا ســوربــو لــە ســەر پڕکردنەوەی رەتلە کوشتەکە ، لەراستیدا قەرزەکانی ئەمــەریــکــا لــەســەر بەریتانیا لە کاتی جەنگەکەدا بانقە تایبەتیەکانی ئەمەریــکــا ، دابویان بە بەریتانیا ، بەڵام حوکومەتی ئەمەریکا تەنها کە فێلی ئەم قەرزانــەبــو ، لەبەر ئەمە مەسەلەکە بریتی نەبو لەوەی کە حوکومەتی ئــەمــەریــکــا لــەم قەرزەی بەریتانیا خۆش بێت، خۆ ئەگەر حوکومەتــی بــەریــتــانــیــا ئــەم قەرزەنەداتەوە دەبی ئەمەریکا بیداتەوە. ئنجا (گۆنگرســی ئــەمــەریــکــا) هەڵگرتنی ئەم گرانبارییە تازەیەی لەکاتی تەنگ وچەلەمەیەکی وەکو ئــەم تەنگوچەلەمەیدا ، بەشتێکی بەجێنەدەزانی.

• بەم جۆرە بەرژەوندیەکانی ئینگلتەرە وئەمــەریــکــا بــەپــێــچــەوانــەی یەکتریەوەبون ، وە هەریەکەیان بەلایەکدا رای‌دەکێشا ، خۆ ئەگەر مەسەلەکە ئەمە سەلە ئابوریەکان بێت ئیتر مەسەلەکانی‌تر بەرامبەری دەپوکێــتــەوە ، وبزردەبێت. سەرەرای ئەوەی کەوا میللەتی هەردو دەولــەتــەکــە گــەلــێــك پەیوەندیان پێکەوە هەیە ، بەڵام ناخۆشی ومشتــومــر لــە نــێــوانــیــان دا

هەردەبێت روودات ، بەروبوم وتوانای ئەمەریکا گەلێك لەهی ئینگلتەرە زیاترە ، ئنجا ئەم مشتومڕو ناخۆشیە لەوانەیە بگۆڕێت وگەلێك شێوازی بکرێت ، دەگونجی جیاوازی جێوشوێنی (المركز) تایبەتی لە ئینگلتەرەوە وردە ، وردە بەرەو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریك بڕوات ، هەرچەندە ئینگلیزەکان تەماشای دەوروپشتی خۆیان دەکەن ودەبینن کە لەپاشەرۆژدا لەوانەیە واز لە هەندێ شتی زۆربە نرخ بێنن ، وجێگەو شوێنە کۆنەکەیان وگەلێك قازانجیان لەکیس بچێت بجیت کە لە ئەنجامی چەوساندنەوەی موستەعمەرەکانەوە دەستیان دەکەوت ، و مەرگەر وشوێنێکی دوەمیان لە جیهاندا دەبێت ئەوەندە دڵتەنگ دەبن ، وەبڕیاریان دەدا کە سوربن لەسەر ئەوەی کە بە تێکۆشانێکی سەخت نەبێت دەست بەرداری ئەم هەمو شتانە نەبن و ، وازی لێنەهێنن ، ئەمەیە ئەو مدینەتییەی کە ئەمرۆ ئینگلتەرە پیایدا دەڕوات. هەمو هۆکانی تواناکەی پێشوی لەفەوتاندایە ، وەپاشەرۆژیشی بێ چەند وچون بەرەونەمان دەچێت ، چونکە ئینگلیزەکان چەند پشتێکە راهاتون کە خاوەن دەسەت وموستەعمەرەبن ، بۆیە بەئاسانی قایل نابن بە چارەنوسی خۆیان ، وەزۆر بەسەختی ودرندەییەوە دەجەنگن ، تاکو لەم چارنوسە دورکەونەوە.

با ئێستا بگەڕێینەوە ، ودوای کارەساتەکان بکەوین کە لە سایەی کێشە ئابوریەکەدا روویان دا. لەیونیوی ۱۹۳۰ز.دا فەرەنسەییەکان وازیان لە ناوچەی (راین) هێنا ئەلمانەکان بەمە ئاسودەبون ، گەرچی ئەم وازهێنانە درەنگ هات بە جۆرێك هیچ یارمەتی نەداڵە چاك بونی پەیوەندایەتیەکانی نێوان هەردو دەولەتەکەدا ، هەروها تارمایی بێبازاری بازرگانی بەری ئاسمانی بەتاریکیەکی تاریك داپۆشیبو ، ئیتر هەر کە باری بازرگانی خراپ دەبو ئەوەندە پارە بە دەست قەرزدارەکانەوە نەدەما ، وەلایان زەحمەت بو ـ ئەگەر شتێکی نەشیاو (مستحیل) نەبوایە ـ کەبتوانن قەرزەکانیان ، وەیان ژیانی بژاردنەوەکە (التعویضات) بدەنەوە ، ئنجا بۆ چارەسەرکردنی ئەمە (هوفر)ی سەرۆکی ئەمەریکا بڵاویکردەوە کەوا ماوەی ساڵێك مۆڵەتی قەرزدرەکن دەدات تاکو کاروباری خۆیان چاك دەکەن لەسەرەتاوە گەلێك تەقەلادرابۆ باس کردنی مەسەلەی قەرزەکانی جەنگ ، کەچی (کۆنگرسی) ئەمەریکانەی ویست باسی ئەم مەسەلەیەکرێت ، هەروها فەرەنساش

توندوتیژبو له هەڵویستیدا لەمەسەلەی وەرگرتنەوەی زیانی بژاردنەوە (التعویضات) لە ئەلمانیا بەڵام حوکومەتی بەریتانیاکە قەرزداربو ، وە لەهەمان کاتدا قەرزیشی هەبو ، وای بەچاك دەزانی نەداوای قەرزبکات نەداوای قەرزیشی لیٚبکەن بەڵکو حەزی دەکرد لاپەرەیەکی نوێی خاوێن لە پەیوەندایەتیەکانی پارەودارایدا بکاتەوە. ئیتر هەردەولەتێك بیری لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدەکردەوە لەسەر حیسانی ئەوانیتر ، ئەو دەولەتانەی کە پەیوەندیان بەمەوەبو نەگەیشتنە هیچ رێکەوتنێك. ئنجا لەناوەڕاستی ساڵی ۱۹۳۱ز.دا لە ئەلمانیاد بارو ، وەزع گەلێك خراپ بو ، گەلێك لەبانقەکان نابوت بون ، کە لە ئەنجامدابو بە هۆی روودانی تەنگانەیەك لە ئینگلتەرەدا ، چونکە نەیدەتوانی ، پێداویستیەکانی سەرشانی جێبەجێبکات ، وەئەوەندەی نەمابو نابوت بێ. کە سەرۆکی حوکومەتی بەریتانیا (مکدونالد) ناو کە لەحیزبی کرێکارانی بەریتانیابو ئەمەی دی "حوکومەتێکی نەتەوایەتی" نوێی پێك هێنا کەزۆربەی ئەندامەکانی لە نەریت پەروەرەکان (المحافظین) بون لەگەل ئەمەشدا ئەم حوکومەتە نەیتوانی جونەیهی ئیسترلینی رزگارکات ، لە هەمان کاتدا کەشتیە وانەکانی بەریتانیا کە لەسوپای دەریایی ئەتلەسیدابون سەبارەت بەکەم کردنەوەی موچەکانیان یاخیبون ، ئەم یاخیبونە ئاشیانەیە لە بەریتانیا ، وئەوروپادا ، دەماری دەجولاند لەگەڵ یاخیبونەکەی کەشتیەوانەکانی سەردەمی شۆڕشەکەی روسیادا بەراوردیان دەکرد ، وەترسیان لیٚنیشت کە ئەمە پێشەنگی هاتنی بولشەفیکیتی بێت ، ئیتر سەرمایەدارەکانی بەریتانیا بریاریان دا کەسەرمایەکانیان دەربازکەن پێش ئەو توشی جوٚرتمێك ببێت ، ئنجا سەرمایەکانیان نارد بۆ دەولەتە بێگانەکان ، وادەردەکەوێت کە نیشتمان پەروەری دەوڵەمەندەکان بەرگەی مەترسی لەکیس چونی بەرژەوەندیەکانیان ناگرێت.

کە سەرمایەکانی بەریتانیا برایە دەرەوە ئیتر نرخی جونەیهی ئیسترلینیش هاتەخوارەوە لە ۲۳ سەبتەمبەری ۱۹۳۱ ز.دا ئینگلتەرە ناچار واز واز لەپەیرەوی زێر بهێنی ، واتە جیا کردنەوەی جونەیهی ئیسترلینی لەزێر لە پێناوی رزگارکردنی ئەم جونەیهانەی کە لە ئینگلتەرەدا

ماوەتەوە ، بەم پێیە ئەوی جونەیهی ئیسترلینی لابێت ئیتر نەیدەتوانی وەکو جاران بە قەدەر جونەیهەکانی داوای زێر بکات.

هاتنەخوارەوەی نرخی جونەیهی ئیسترلینی کارێکی مەزنی لە ئیمپرتوریەتی بەریتانیا ، و جێوشوێنی ئینگلتەرە کرد لەناو دەولەتاندا ئەمە وادەگەیەنێت - گەرچی بو موەیەکێش بێت - وازهێنانە لە پێشەوایەتی پارە ودارایی کەوا (لندن)ی کردبو بۆبنکە وپایتەختی جیهان لەرووی پارە وداراییەوە ، ئنجا بۆ ئەوەی بەریتانیا ئەم مەرکەزو بنکەیە وەرگرێتەوە ، ونەی درێنی لە سالی ١٩٢٥ ز.دا ، چوەوەسەر پەیرەوی زێر هەرچەندە ئەمەش بو بە هۆی زیان گەیاندن بەپیشەسازیەکانی ، وەزیادبون و پەرەسەندنی بێئیشی ، لە ئەنجامی ئەمەدا کرێکارانی خەلوز مانیان گرت.. هتد ، بەلام ئەم هەمو کرد وکۆشانە هەرگیز کەلکی نەبو ، دیسانەوە جارێکیتر ناچار بوکەجونەیهی ئیسترلینی لەپەیرەوی زێرجیاکاتەوە ئەم کارەسات ، ورووداوە لە هەمو لایەکی جیهاندا بەسەرەتای کۆتایی ئیمپراتوریەتی بەریتانیا دادەنرێت ،بەراستی رۆژی ٢٣ سەبتەمبەری ١٩٣١ رۆژێکی گرنگە لە مێژوودا.

بەلام ئینگلتەرە بە ئاسانی خۆیینەدا بەدەستەوە تەماشای دەوروپشتی خۆیکرد داوای یارمەتی لەولاتە زێر دەستەکانیکرد ،لەواقیعدا توانی خۆی بپوژێنێتەوە ، وهەلسیتەوە بەوزیرەی کە لەهیندستان ومیسری سەندبو ، ئیتر نرخی جونەیهی ئیسترلینی شکا ، وئنجا پیشە سازی ئینگلتەرە بوژایەوە ، چونکە دەلەتە بێگانەکان دەیان توانی لەبەرهەمی ئەم پیشە سازیانە بگرن بەهەرزانتر لە جاران.

ئێستا کێشەی زیان بژاردنەوە (العویضات) وقەرزەکانی جەنگ ماوەتەوە دیارە ئەلمانیانەی توانی زیانی ببژێرێتەوە ، وبەئاشکرا دەریبڕی ، لە دواییدا لە سالی ١٩٣٢ز. دا گۆنگرەیەك لە (لۆزان) بەسترا ، زیانی بژاردنەوە کەم کرانەوە ، بەمیقدارێك پارە بەلام هەر بەناو ، بە هیوای ئەوەی ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکایش ئەم رێبازە بکرێت ، وەقەرزەکانی خۆی کەم کاتەوە ، بەلام ئەم مەسەلەی قەرزو زیانی بژاردنەوەی (العویضات) تێکەل نەکرد ، ئەو قەرزانەی کە هەیبو لای نەبردن و ، لەغویشی نەکردن ئەم بریارە لەئەوروپادا دەنگێکی ناسازیدایەوە ،

میللەتانی ئەوروپا شەپۆلێکی رق وکینەیان دژی ئەمەریکا بەسەردا هات.

لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٢ز. دا کاتی دانەوەی قیستی قەرزەکانی ئەمەریکا هات ، وئەمەریکا سوربو لە سەروەرگرتنەوەیان ، وسەندنەوەی سەرەرای ئەوەی کە ئینگلتەرە ، وفەرەنسە گەلێك بەلگە وبەهانەی راست ودروستیان هێنایەوە ، ئنجا دوای هێنان وبردن ، وچەند وچون بەریتانیا قیستەکەی خۆیی دایەوە ، ووتی ئەمە دوامین قیستەکە دەیداتەوە ، بەلام فەرەنسە ، و دەولەتەکانی تر ، نەیانویست هیچ بدەنەوە. ئیتر لە یونیوی ١٩٣٣ز دا کاتی قیستی دووەم هات بەلام فەرەنسە ئەمجارەش نەیدایەوە ، کەچی ئەمەریکا لەم رووەوە ئینگلتەرەی بەخشی ، بەناو پارەیەکی لێوەرگرت ئیتر وازی لەمەسەلەکە هێنا کە لەدواییدا جێبەجێبکرێت.(١)

ئیستا ئەوی سەیری ئەوەیە لەکاتێکدا کەوا دەولەتە سەرمایەدارە ، گەورە ، ودەولەمەندەکان هەولیان دەدا قەرزەکانیان نەدەنەوە ولەوی دەربازبن ، سەرەرای ئەوەی کە ئەم قەرزانە ، بە پێی پەیمان ،وبەلێن بون ، وەبەلێنیش پیرۆزە ، وشایانی رێز لێگرتنە ، کەچی یەکێتی سۆڤیت ویستی قەرزەکانی کە لە سەریتی ، لەغویان بکات وتەمینی چۆن توشی گەرداوێکی بێزاری دەربرین بو ، هەروها لە هیندستاندا ئەگەر حیزبی کۆنگرە (حزب المؤتمر) داوابکات و بلێت ، لەبابەت مەسەلەی قەرزەکانی ئینگلتەرەو بەسەر هیندستانەوە کەوا حەکەمێکی بێلایەن تەماشای بکات ، بێگومان لەلایەن حوکومەتەوە لە هیندستاندا هاوار هەلدەستێت مەسەلەیەکی وەکو ئەم قەرزانە بوبە هۆی جەنگێکی بازرگانی لەنێوان ئینگلتەرە ، وئیرلاندەدا.

باسی پێشەوایەتی پارە ، وداریی ئینگلتەرە ، وتەقەلای ئەمەریکا بۆ زال بون بەسەر پێشەوایەتیەدا ، هەروها باسی کێشەی بانقەکان ، و نابوت بونی هەندی لە دەولەتانم دووبارەکردەوە ، ئەم هەموە چی دەبەخشێت؟ کچم وا چاکە ئەم پرسیارەم لێبکەیت چونکە گومانم هەیە کە تێیبگەیت ،

---

١- دوای پێنج ساڵی ئاینده لە ساڵی ١٩٣٣ تا ١٩٣٨ ئینگلتەرە ، وفەرەنسە هیچ قیستێکیان نەدایەوە گەرچی بەناویش بێت. بەلام وادەردەکەوێت ئەم قەرز خرا بێتە پشت گوێ ، ونەدرێتەوە بەخاوەنەکانی.

لەوانەیە باسەکە بێتام بێت لەلات ، بەڵام ئێستا هەست دەکەم دوای ئەم هەمو گفت وگۆیەم پێویستە لەسەرم بۆت لێک بدەمەوە ، وتۆزێک زیاتر روونی کەمەوە.

بۆت ، ئنجا ئەگەر باسەکە خۆش بێت ، وەیان ناخۆش وبێزارکەر بێت بێگومان کارمان تێ دەکات ، چ لە کۆمەلکە ، وەیان لە خۆمان ، وەکو تاکە زەلامێك ، وەئێستا پاشەرۆژمان دەگۆرێ. زۆرکەس بە چاوێکی رێز وپیروزەوە تەماشای رژێمی پارە ، ودارایی لە ناو جیهانی سەرمایەداریدا دەکەن چونکە گەلێك بەکێشەیە ، وئالۆزە ، بە جۆرێك نایانەوێت تێیبگەن بەلکو لێیدەگەرێن بۆ ئەوانەی شارەزان لەکاروباری پارە ودارایییدا ، وەیا ئەوانەی وەکو ئەمانن ، بێگومان ئەم رژێمە تێك هەلکێش وئالوزە ، وە ئەم ئالۆزیە خوی لە خۆیدا شتێکی باش نییە ، بەلام لەگەل ئەمەشدا ، دەبێت بیرورایەکمان لەم رووەوە هەبێت ، ئەگەر بمانەوێت لەم جیهانەی کە تیایدا دەژین تێیبگەن. لەم نامەیەدا هەول نادەم لە رژێمە کە تێکرا بکۆلمەوە ، چونکە ئەمە لەوزەی مندانییە ، وەشارەزا وپسپۆریش نیم تیایدا ، بەلکو لەم باسەدا من قوتابیەکم. کچم هەندی شتی راستەقینەت بۆ دەگێرمەوە ، هیوام وایە لەبەر رۆشنایی ئەمدا بتوانێت لەو کارەسات وهەوالانە تێبگەیت کە لەرۆژنامەکاندا دەیان خوێنێتەوە ، لەوانەیە ئەوی لەپێشدا وتبوم بیگێرمەوە ، ودوبارەی کەمەوە بەلام وابزانم بۆ ئەمە رێم دەدەیت ، بەتایبەتی ئەگەر ئەم دوبارە کردنەوەیە یارمەتیت بدات لەتێ گەیشتندا ، کچم نیرکەرەوە ئەم رژێمەیە رژێمی سەرمایەداری ، بەکۆ میانیە تایبەتیەکانی ، وپشك (السهم)ەکانی و بەبانقەکانی وبازاری پارەکانیەوە (البورصة) ، کەوا پشکەکان (الأسهم) دەکررێن ودەفرۆشرین ، بەلام رژیمی پارە ، وپیشەسازی لە یەکێتی سۆڤێت دا تەواو جیاوازە ، لەوێ کۆمپانیە تایبەتیەکان وەیان بانقە تایبەتیەکان وبازاری پارە (البورصە) نییە ، نزیکەی هەمو شتێك لەوێ هی دەولەتە ، ودەولەت خاوەنێتی ، وەبازرگانی کردن لەگەل دەرەوەدا بەرێبازی گۆرینەوە (المقایضة) دا پێك دێت.

کچم دەزانیت کەوا زۆربەی کاروباری بازرگانی لە هەمو ولاتەکاندا بە هۆی چەکەوە (شیك وەیا صك) وەیا پارەی کاغەزەوە دەکرێ ، زێر ، وزیو

بەدەگمەن بەکاردەهێنرێت ، (لەراستیدا زەحمەتە زێر دەست کەوێت) ئەم پارە کاغەزە بریتیە لەنرخە پارێزراوەکەی برە کاغەزەکە ، بۆ ئەو کەسەی کە ئەم پارە کاغەزەی پێیە ، وە لە بری سکەی مەعدەن بەکاردەهێنرێت ، مادام خەلکی متمانە بە بانقەکان دەکەن ، وەیا حکومەتەکانی کە ئەم پارە کاغەزانەیان لێداوە ، ودروست کردوە. بەلام ئەم کاغەزانە هیچ بەکەڵك نایەن ، و وەرناگیرێت بۆ هەچ پارەدانێك بێت بە دەولەتێکیتر ، چونکە هەر دەولەتێك سکەی تایبەتی خۆیی هەیە ، بۆیە زێرکرا بەدەستوری مامەلەکردن لە نێوان دەولەتاندا ، ئنجا لەهەموکرین و فرۆشتنیکدا لە نێوان دەولەتاندا بەکارهێنانی زێر هەرگیز کارێکی دروست نییە چونکە ئەمە مانای ئیفلیج کردنی بازرگانی ، وپێش نەکەوتنیتی ، شتێکیتریش میقداری زێر کە لە جیهاندا هەیە کەمە ، خۆ ئەگەر لەهەمو کرین وفرۆشتنێکدا بگونجێت مامەلە بە زێر بکرێت ئەمەش وادەگەیەنێت کە بازرگانی لەناودەولەتاندا بە میقداری ئەو زێرەوە بەندە کە هەیە ، ئنجا کە زێر نەما بازرگانیش دەوەستێت تاکۆ جارێکیتر سەرلەنوێ زێرەکە دەگەرایەوە بۆ بازار.

بەلام هەمو ئیشەکان بەم جۆرە ناڕۆن ، ئەو زێرەی کە لە جیهاندا هەیە لە ساڵی ١٩٢٩ دانراوەکە بای یانزە هەزار ملیون دۆلارە ، وەهەر لە هەمان ساڵدا ئەو کەل وپەلانەی کە لە ناو دەولەتاندا ئاڵوگۆر کران بای (٣٢) هەزار ملیون دولاربو ، وە چوار هەزار ملیون دولاری تریش هی پارەدانەوەی دەرەوەبو ، وەکو ئەرکەکانی گەشت کردن ، وەکرێی گواستنەوە ، و ئەو پارانەی کە کۆچ کردوەکان بۆ کەس وکاریانیان دەنارد.. هتد ، بەم جۆرە پارەدانەوە ، ئاڵوگۆر کردنی لە نێوان دەولەتاندا گەیشتە نریکەی چل هەزار ملیون دولار واتە نزیکەی چوار ئەوەندەی نرخی ئەو زێرەی کە هەیە.

کەوابو ئەم پارەیە چۆن دەدرایەوەبە دەرەوە؟ دیارە هەموی بەزێر نەدەدرایەوە بەڵکو بەهۆی چەك (شیك وەیا صك) وەیان حەوالەوە کە بازرگانەکان دەیان نارد بۆ دەرەوە لەجیاتی ئەو پارانەی کە لەسەریانە ، ئەم ناردنە بە هۆی بانقەکانەوە دەبێت کە هەمیشە پەیوەندیان بەکرێکار وفرۆشیارەکانەوە هەیە ، لەولاتە جۆربەجۆرەکاندا ، ئنجا ئەم بانقانە پارە

وەرگرتن ، وپارەدانەوە بەهۆی ئەو حەوالانەوە گەوەریان دەکرێت جێبەجێی دەکات ، ئنجا ئەگەر ئەم حەوالانە لە هەرکاتێکدا تەواوبو ئیتر بانقەکان ئەوی کە لەسەریەتی بەهۆی ئەئمیناتیك کە ئاشکرایە ، وەکو سەنەداتی حوکومەتی ، وەیان قەرز ، یان پشکەکان (الأسهم) کە بانقەکە ، لە کۆمپانیە نێودەلەتیەکاندا هەیەتی ، لەمانە دەیداتەوە ، ئیتر دەتوانێت حەوالەکە بفرۆشێت ، وەیان بیهێنێت ، هەر کە بروسکەیەکیان (برقیة) بەم مانایە بۆکرد ، بەمە ئەوی پێداویستی سەرشانێتی گورج پێی هەڵدەستێ.

بەم جۆرە دەبینین کە پارەدانەوەی راستەقینە لەبازرگانی نێو دەولەتاندا بەهۆی بانقە مەرکەزیەکانەوە جێبەجێ دەکرێت بەهۆی حەوالەی پارە ، وەیا تەئمینانەکانەوە لەبەر ئەمە بانقەکان هەمیشە مشوری ئەوە دەخۆن کە میقدارێکی تەواویان لەم حەوالە وتەئمینانە هەبێت ، تاکو بتوانن کاروباری رۆژانەیان بەرن بەرێوە ، ئنجا هەمو هەفتەیەك لیستەی ئەو زێر وکاغەزی پارەیە (بانك نوت) کە هی بێگانەکانەوە ، لەلایەنی بڵاوی دەکاتەوە ، بەڵام وەکو پەیرەوێك زێر نانێرنە دەرەوە لە جیاتی پێداویستیو ئەرکەکانی سەرشانیان ، مەگەر لەکاتێکدا کەناردنی زێر لە هەمو شتێکیتر هەرزانتربێت.

هەمو کەسێك لەناو ئەو ولاتانەدا کە لەسەر پەیرەوی زێر دەرون بۆیان هەیە کە ئەوەندەی ئەو پارە کاغەزانەی (بانك نوت) کە هەیەتی داوای زێر بکات لەبەر ئەمە نرخی ئەم پارە کاغەزانە لەواقعیدا ناگۆرێت ، بەڵام ئاڵوگۆری پێدەکرێت چونکە بە زێر دەچێت وناگورێتەوە بە زێر لە هەمو کاتێکدا ؛ تاکە جیاوازیەك کە هەیە ئەوەیە کە ئەرکی ناردنی زێر لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکیتر زەحمەتە ، خۆ ئەگەر لەولاتێکدا زێر لە ولاتێکیتر زیاتر هەبێت بازرگانەکان دەتوانن ، پەیدای کەن ، لەو ولاتەوە بیهێنن ، ئەمەیە رژێمی پەیرەوی زێر بەم پێیەسکە ، وپارەی ئەو ولاتانەی کە لەسەر پەیرەوی زێر دەرۆن ناگورێت. بازرگانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا گەشەی کرد بەم جۆرە مایەوە تاکو جەنگی جیهانی ، بەڵام ئەم رژێمە ئێستا تێك چوە ، لە ئەنجامی ئەمەدا پارە توشی رەوشتێکی سەیربو ، وەزۆربەی سکەکان پاریان نەبو ، دەگۆران.

هەر ولاتێك ئەوەی دەی‌نێرێتە دەرەوە (الصادرات) دەبێت نزیکەی ئەوەندەی ئەوەبێت کە لەدەرەوە دەی‌هێنێت (الواردات) ـ واتە بای ئەوەندەبێت کە خۆی هەیەتی ـ لەمە نرخی ئەو کەل وپەلانە دەدات کە لەدەرەوە هێناوێتی ، بەڵام ئەمە کوتومت بە قەدەریەك نابن ، لەبەر ئەمە واهاتوە کە سوکە رەصیدیك بۆ لایەکیان بمێنێتەوە ، بۆ نمونە ، ئەوی لەدەرەوەوە دێت (الواردات) لەوی دەنێررێتە دەرەوە (الصادرات) زیاتربێت بەوەی ماوەتەوە پێ‌ی‌دەڵێن: (رەصیدی ئاوەزو) وەیان رەصیدیك کە لە بەرژەوەندی ئەم وڵاتەنی‌یە ، ئنجا دەبێت ئەم رەصیدەبدانەوە.

بەراستی بازرگانی وئاڵوگۆر کردنی کەل وپەل لە نێوان دەولەتاندا بە جۆرێکی رێك وپێك ناروات ، بەڵکو لە گۆران ولەبەرز ونزم بوونەوە دایە بە گۆرانی بازرگانی مەسەلەی پێشکەش و داواکردن (العرض والطلب) لە سەر حەوالەکانی پارە ودارایی (المالی) دەگۆرێت. زۆر جار روودەدات ، لەلای وڵاتێك لە ولاتان جۆرێك لە حەوالەی پارە ودارایی (المالی) زۆر هەیە کە پێویستی پێ‌نی‌یە ، وە لەهەمان کاتدا جۆرێکی‌تری لە حەوالە لانی‌یە کە خۆی پێویستێتی بۆ نمونە: لەوانەیە فەرەنسا بۆئەلمانیا حەوالەی مارکی ئەلمانی زیاتر هەبێت لەوەی پێویستیتی ، بەڵام بۆ ئەوەی حیساباتەکانی خۆی لای ئەمەریکا پاك کاتەوە دۆلاری ئەمەریکی نی‌یە ، ئنجا فەرەنسە چاوەروانی هەڵدەکات تاکو حەوالە ئەلمانیەکانی بفرۆشێت وەبەنرخەکەی‌حەوالەی دولاری ئەمەریکی بکرێت ، بۆ ئەوەی بەمە هەستێت دەبێت بازارێکی مەرکەزی هەبێت بۆ کرین و فرۆشتنی هەمەجۆر لە حەوالەکانی پارە ودارایی (المالی) ئەم بازارە لە هیچ ولاتێکی‌تردانی یەمەگەر ئەم سێ مەرجەی تێدابێت:ـ

١ـ دەبێت ئەو وڵاتە بازرگانیەکی فراوانی دەرەوەی هەبێت ، هەمو جۆرە شتومەك وکەل وپەلی هەبێت ، تاکو میقدارێکی زۆر لە حەوالەی پارە ودارایی (مالی) جۆر بەجۆر بۆ خۆی‌پەیداکات.

٢ـ پێویستە لە هەمو جەشنێك تەئمیناتی هەبێت ، واتە گەورەترین بازاری پارە ودارایی ببێت.

٣ـ دەبێ گەورەترین بازاری زێری تێدابێت ، تاکو ئەگەر حەوالەی پارە ودارایی (مالی) تەئمنیاتە کەی هاتەکزی بەئاسانی زێری دەست کەوێت.

به درێژایی سەدەی نۆزدەهەم ئینگلتەرە تاکە ولات بو کەوا ئەم مەرجانەی تێدابێت ، سەبارەت بەوەی کە پێشکەوتوبو لەرووی پیشەسازیەوە وە ئیمپراتوریەتێکی فراوانی هەیە ، وئیحتیکاری کردوە بۆ بوسەرفکردنی شتومەکەکانی تیایدا بۆیە بازرگانیەکەی بوبە گەورەترین بازرگانی لەجیهاندا ، وکشتو کالەکەیی خستە پێناوی پیشەسازیەکەیەوە ، گەشیتەکانی شتومەك ، وحەوالەی پارە ودارایی لە هەمو میناکەیەکەوە هەلدەگرت ، لەبەر ئەوەی لە پیشەسازیدا زۆر پێشکەوتوە ، بوبو بەگەورەترین بازاری پارە ودارایی ، جۆرەها تەئمیناتی لاکۆبوتەوە ، هۆیەکی تریش لەمەدا یارمەتیدا ئەوە بو کە لە سێ بەش دوبەش لەکانگای زێری جیهان لەناو ولاتەکانی ئیمپراتوریەتی بەریتانیا دایە ، وەکو ئەفەریقای خواروو ، ئەوسترالیا ، وهیندستان. کانگاکانی زێری ئەو ولاتانە بازاریان هەبو ، وە لە برەودابون. لە(لندن)دا بانقی ئینگلتەرە ئەم هەمو زێرەی کە دەردەهێنرا بەنرخێکی هەرزان دەیکری.

بەم پێیە شاری (لندن)بو بە بازارێکی سەرەکی بو حەوالەکانی پارە ودارایی (المالی) ، وتەئمینات وزێر ، هەروها بو بە بنکە وپایتەختی پارە ودارایی جیهان ، ئیتر حوکومەتەکان ، وە خاوەن پارە وداریەکان کەوا دەیان ویست حیساباتی دەرەوەیان پاك کەنەوە ، وە هیچ هۆیەکیان لەناو ولاتەکانی خۆیاندا دەست ، نەدەکەوت کە بتوانن بەمەهەلسن لەناو ولاتەکانیاندا ، بۆیە دەرژانە (لندن) لەوێ جۆرەها سکەی کاغەز ، وحەوالەی پارە ودارایی(مالی) و ، زێریان دەست دەکەت. بەمە جونەیهی ئیسترلینی بوبە نیشانەیەك بۆ توند وتولی بازرگانی ، ئەگەر دانیمارك ، وەیان سوید بیان ویستایە کەلو وپەل لە ئەمەریکای خواروو بکرێ رێکەوتن نامە کەیان دەنوسی ونرخەکەیان بەجونەیهی ئیسترلینیدا دەنا گەرچیکەل وپەلەکەش هەرگیز بە (لندن)دا تێنە دەپەری.

ئەم مامەلاتە قازانجێکی زۆریان بەئینگلتەرە گەیاند ، لای خەلك بایەخی پەیداکرد چونکە بەم کارگوزاریانە هەلدەستا ، بەلام قازانجەکانیش بریتیبو لەو سودە کە یەکسەر لە ئەنجامی ئەم مامەلانەدادەستی دەکەوت ، سەرەرای ئەوە کە پارە لەبانقەکانی ئینگلتەرەدا دادەنرا ، لەلایەن کومپانیەکان ، وحوکومەتە بێگانەکانەوە وەکو ئەمانەت کە لەپاشەرۆژدا

بدرێتەوە ، وە بانقەکانیش ئەم ئەماناتانەیان بەکاردەهێنا ، وبو ماوەیەکی کورت دەیان دان بەقەرز بەبانقەکانیتر ومەعمیلەکانیان ، وە لەمە سودیان وەردەگرت ، بەهۆی ئەمەوە بانقەکانی ئینگلتەرە توانیان نەهێنیەکانی خاوەن پیشەسازە بێگانەکان بزانن دەیان توانی نرخی ئەو کەل وپەلانەی‌خاوەن فرمانەکانی ئەلمان ، وئەوانیتر وەری دەگرن بزانن سەبارەت بەوەی کە حەوالەی پارە ودارایییەکان بەبەردەستیاندا تێدەپەری ، وە ناوی مەعمیلەکانی ئەوانیان دەزانی لەناو ولاتە بێگانەکانیتردا ، خاوەن پیشەسازە ، ئینگلیزەکان کەلکیان لەم زانین ، وشوناسیە وەرگرت چونکە ئەمە یارمەتی‌دا لەزاڵ بون بەسەر بەربەرەکانی کەرانیان لەدەرەوەدا .

ئنجا بۆ ئەوەی بانقەکانی ئینگلتەرە بتوانن ئەم کاروبارانە زیاترکەن وبتەوبێت گەلێك لق و وەکالەتیان لە هەمولایەکی جیهاندا کردەوە ، ئەم بانقانە توانیان دەولە تەبێگانەکان مل کەچ کەن بۆ دەسەلاتی خاوەن پیشەسازەکانی بەریتانیا سەرەرای ئەمەش خزمەتێکی زۆریان بەبیروڕای ئینگلیزەکان کرد ، لەهەمو ولاتەکاندا لە خاوەی ئیش وفرمان وکۆمپانیەکان دەگەرا ، ودەی دۆزینەوە ، بۆ هەریەکەیان دەفتەرێکی دەکردەوە ، هەمو شتێکی دەربارەیان بەدور ودرێژی تێدابو ، لەبەر ئەمە ئەگەر کۆمپانیەیەك لە کومپانیەکان حەوالەیەکی پارە ، ودارایی (مالی) بناردایە ، بانقی ئینگلتەرە پانقی ئینگلتەرە گورج نرخی‌ئەم حەوالەیەکی دەزانی کە ئایا متمانەی پێدەکری یانەء؟ ئەمە لەمامەلەی پارە ، ودارایدا پێی‌دەلێن (قوبول) چونکە بانقەکە لەسەری دەنوسێت (مقبول) واتە ئەم حەوالەیە پەسندە . تەنها بەقەبول کردنی لەلایەن بانقەکەوە ، ئیتر بۆ ناردن وگورینەوە دەست ، دەدات ، چونکە بانقەکە مەسئول دەبێت لێی ، ودەچێتە ئەستوی بانقەکەوە . بەبێی ئەم قوبول وەیا پەسندکردنە هیچ حەوالەیەك ناکرێت کەوا کۆمپانیەیەکی بێگانەی نەناسراو بینێرێت بۆ بازارە دورەکانی وەکو بازاری (لندن) وهیتر ، بەمە بانقەکەی کە ئەم حەوالەیەی وەرگرتوە خۆی تۆشی گێژاو ، ومەترسیەك دەکات . بەلام وەکو رەوشت وکردەوەیەك بانقەکە بەمە هەلناستێت پێش ئەوەی لە کومپانیەکە نەپرسێت ، بەهۆی لقەکانی خۆیەوە لەو ناوچەیەدا ، بەم رێبازە ئەم

رژێمی (قوبول) وەیا پەسندکردنە یارمەتی دەدا لە ئاسان کردنی ناردنی حەواله(مالیه)کان ، وتەواو کردن وبە ئەنجام گەیاندنی کاروبارەکاندا بەگشتی. وە لەهەمان کاتدا جەنگی شاری (لندن)ی توندتر کرد بەسەربازرگانی جیهاندا ، ئیترهیچ دەولەتێکی‌تر نەی توانی وەکو ئەو بکات ، چونکە ئەم ئیشە پێویستی‌بەوە هەیە کە گەلێك لقی لەدەرەوە هەبێت.

بەم جۆرە (لندن) ماوەی صەد سال بەبنکەی سەرکردایەتی کردنی کاروباری ئابوری مایەوە لەجیهاندا. هەمو سەرەداوەکانی‌بازرگانی جیهانی لەبەر دەستدابو. سەبارەت بەوەی کە پارە ودارایی زۆری تێدابو ، بەمەرجێکی سوك وئاسان دەست دەکەوت بۆیە خاوەن پارە لەهەمولایەکەوە روویان تێدەکرد. پارێزەری بانقی(محافظ بنك) ئینگلتەرە دەربارەی بازرگانی ، وکاروباری پارە ودارایی لە گشت لایەکی جیهاندا هەموشتێکی دەزانی ، لەواقیعدا هەندی جار ئەم لە حوکومەتی ئەو ولاتە شارەزاتری ولاتەکەبو ، وە بەهۆی قەدەغەلی‌کردن ونەهێشتنی کرین وەیا فرۆشتنی تەئمیناتەکانەوە کەوابەرژەوەندی حوکومەتێکی بێگانەی تێدابێت ، وەیا بەهۆی قەرزدان بۆ ماوەیەکی کورت دەتوانێت تین بخاتە سەر ئەو حوکومەتە لەرووی سیاسیەوە ، ئەم جۆرە فرت وفێلە لەکاروباری پارەو ، داراییدا تا ئێستاش بەهێزترین چەکە ، کە دەولەتە ئیستیعماریەکان بۆ تین خستنە سەر دەولەتە کانی‌ترو ، زۆرلێ‌کردنیان بەکاری دێنن.

ئیتر کاروبار لەپێش جەنگە جیهانیەکەدا بەم جۆرەبو ، (لندن) بنکە وپایتەختی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو ، نیشانەو رەمزی هێزو خۆش گوزەرانی‌بو ، بەلام جەنگەکە گەلێك گۆرانکاری هێنایە مەیدان ، بارو وەزعی سەرەوژێر هەلگێرایەوە. ئینگلتەرە لەجەنگەکەدا سەرکەوت کەچی ئەم سەرکەوتنە گەلێك شتی باشی لەکیس ئینگلتەرە ، و (لندن)دا.

بەلام دوای جەنگەکە چی‌رووی‌دا؟ لەنامەیەکی‌دا هاتودا بۆت دەگێرمەوە.

# دۆلار وجونەیهی ئیسترلینی ورۆپی[٢]

## ٢٧/یولیۆ/١٩٣٣

جەنگی (یەکەمی) جیهانی ، جیهانی کرد بە سێ بەشەوە: دوانیان بەکژیەکدا دەچون سێیەمیان بێلایەن بو ، لەنێوان دەولەتە شەرکەرەکاندا هیچ جۆرە بازرگانییەك نەمابو ، مەگەر بازرگانی جاسوسیکردن نەبێت ، ئەگەر جاسوسی بەبازرگانی ناوببرێت ، جەنگەکە یەکسەر بازرگانی نیوجیهانی سەرە وژێر هەڵگیرایەوە ، بەڵام دەولەتە هاوپەیمانەکان توانیان بەشێك لە بازرگانیەکانیان لەگەل دەولە بێلایەنەکان ، وولاتە ژێردەستەکان وەیا موستەعمەرەکاندا بکەن چونکە رێگا دەریاییەکانیان لەژێر دەستدابو ، بەڵام ئەمەش سەبارەت بەجم وجۆلی ژێر دەریاییەکان (الغواصات) ئەلمانیا لە مەترسیدابو .

دەولەتە شەرکەرەکان هەمو داهاتی خۆیانیان بۆ ئاگری جەنگەکە تەرخان کردبو ، وە پارە ودارایيەکی بێشوماریان بۆسەرف دەکرد ، ئینگلتەرە وفەرەنسە لە ساڵ ونیوێك زیاتر پارەیان دەدا بە هاوپەیمانەکانیان کەوا لەخۆیان هەژارتربون ، لەو پارەیەی کە لەخەلکی ، ولەئەمەریکایان قەرزکردبو ، تەنانەت فەرەنسە وەختەبو نابوت ببێ ، ئیتر نەی دەتوانی یارمەتی هیچ لایەك بدات ، ئنجا ئینگلتەرە ئەرکی ئەمی بۆ ماوەی ساڵێك وسێ مانگ هەلگرت بەڵام ئەمیش خەریك بو نابوت ببێ ، لەکاتێکدا ئینگلتەرە لە مارتی ١٩١٧ ز.دا پەنجا ملیون جونەیهی کەوتە سەر کەدەبو بیدایەوە بە ولاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا ، بەلام لەبەختی ئینکلتەرە ، وفەرەنسە وهاوپەیمانەکانیاندا ئەمەریکا لەم کاتە تەنگانەیەدا تێکەڵاو بەجەنگەکە بولەکاتێکدا ، کانگای پارە ودارایی لە هیچ لایەکدا نەمابوەوە ئیتر لەو کاتەوە ، ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا یارمەتی هەمو هاوپەیمانەکانی دەدا تاکو جەنگەکە کۆتایی هات ، وهەمو پێداویستیەکی

پێویستی جەنگەکەی دەدانی ، ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا پارەی لە خەلك قەرز دەکرد بە ناوی قەرزی (ئازادی) وەیا قەرزی (سەرکەوتن)ەوە ، وئەم پارانەی بە تێروتەسەلّی بۆلە شکرەکانی خۆی ، و هاوپەیمانەکانی سەرف دەکرد لەئەنجامی ئەمەدا ئەمەریکا بو بەقەرزدەری هەمو جیهان ، زۆربەی وڵاتان بەپارە ومالّ قەرزاری بون کە جەنگەکە دەستی پێکرد قەرزەکانی ئەمەریکا بەسەر ئەوروپاوە بە پێنج هەزار ملیون دادەنرا.

هەر ئەمە تاکە دەسکەوت نەبو کە ئەمەریکا لە جەنگەکەوە دەستی کەوتبێ سەرەرای ئەمە بازرگانی دەرەوەی خۆی پەرەپێدا لەسەر حیسابی بازرگانی ئینگلیز وئەلمان ، ئێستا بازرگانی ئەمەریکا بەقەدەر بازرگانی ئینگلیزەکانە ، جگە لەمەش ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لەسێ بەش دوو بەش لەزێری هەمو جیهانی کۆکردەوە ، وەبو بە خاوەنی میقدارێکی زۆر لەپشك (الأسهم) وسەنەداتی حوکومەتە بێگانەکان.

بەم جۆرە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ، لەپارە ودارایی‌دا لەوەزع وبارێکی باشدابو ، دەیتوانی هەر وڵاتێکی‌تر نابوت کات تەنها بەوەی کە داوای قەرزەکانی لێبکاتەوە دیارە ئەمەریکا چاوی بریبوە جێوشوینەکۆنەکەی (لندن) کە وە کو پایتەختی پارە، ودارایی جیهان وابو. ئنجا ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا حەزیدەکرد ئەم جێوشوێنە بەرێتە شاری نیۆیۆرك کە دەولەمەندترین شاربو لەجیهاندا ، بەم جۆرە زۆرانبازیەکی بەتین لە نێوان خاوەن بانق وپارەدارەکان لە نیۆیۆرك و لە(لندن) دا دەستی پێکرد ، هەر دەستە وتاقمێك لەمانە حوکومەتەکەیان پشتی دەگرتن لەم زۆرانبازیەدا یارمەتی دەدان.

لەئەنجامی ئەم زۆرانبازیەدا ، ئەمەریکا تینی بو جونەیهی ئینگلیزی هێنا ولەق پۆ ، ئیتر بانقی ئینگلتەرە نەیتوانی. ئەو سکەیەی کەلێ‌یدەدا بەزێر دای‌پۆشێت ، جونەیهی ئیسترلینی شلۆق بو ، نرخی هاتەخوارەوە ، وەفەرنگی فەرەنسیش دوای ئەم کەوت ، وەکو ئەمی لێ‌بەسەر هات. ئیتر لەم جیهانە شلوقەدا ، تەنها دولاری ئەمەریکی ـ بەتوند وتولی وەکو بەرد ـ مایەوە.

رەنگە وابزانین کە ئەم باروزروفە ، پارە ودارایی وزێر ناچار دەکەن کەواز لە(لندن) بێنی وبچێتە (نیۆیۆرك) کەچی ئەمە رووی‌نەدا ، وئەو

زێرەی لەکانگاکان دەردەهێنران لەگەل حەوالەکانـدا هـەر دەچـونـەوە بـۆ (لندن) ، ئەمە لەبەر ئەوە نەبو کە خەلکی جونەیهـی ئـیـسـتـرلـیـنـی پەسنددەکەن بەسەر دولاردا. بەلام ئەمە سەبارەت بەوەبو کە دولار زەحمـەت دەست دەکەوت.

کچم رەنگە لەبیرت بێت کە باسی رێبازی قوبولی حـەوالـەکـانـم بـۆ کردیت کە بانقەکانی بەریتانیا دایان هێـنـا بـەهـۆی لـقـەکـانـیـان ، ووەکالەتەکانیانەوە کە لە هەمولایەکی جیهاندا بـڵاوبـوبـونـەوە ، بـەڵام بانقەکانی ئەمەریکا هیچ لق و ، وەکالەتیکیان نەبو ، چونکە رێبازێـکـی وایان نەبو کە بتوانن حەوالەی بێگانەیان دەست کەوێت و (قوبول وپەسندی بکەن) بۆیە زۆربەی ئەم حەوالانە بەرەو (لندن) دەچـو بـەهـۆی بـانـقـە ئینگلیزیەکانەوە ، کە بانقەکانی ئەمەریکا ئاگاداری ئەم کێشەیەبون گورج دەستیان کرد بەدروست کردنی گەلێك لـق و ، وەکـالـەتـیـان لـە وڵاتـە بێگانەکاندا پێك هێنا وە خانوی جوانی سەرنج راکێشیان بۆ دروست کـردن بەڵام لێرەدا توشی چەند کێشەیەکی نوێ هاتن ، (قوبول) کردنی حـەوالـە ئیشیکە پێویستی بەشارەزایی ، وزەلامی راهاتوی دەوێت کە هەمو شتێـکـی تەواو دەربارەی کاروبارەکانی ناوخۆبزانن ، بانقەکانی ئینـگـلـیـز ئـەم شارەزاییەیان هەبو ، بەماوەی صەد ساڵ ئەم ئیشەدا ئەم زانستـانـانـەیـان لاکوبوبوەوە تارادەیەك لەم مەیدانەدا هەرگیز کەس پێیان نەدەگەیشت.

ئنجا بانقەکانی ئەمەریکا لەگەڵ بانقەکانی فەرەنسە ، وسـویـسـرە ، وهولاندەدا ، بەبەرەبەکدایەکیان کرت دژی (لـنـدن) لـەگـەڵ ئـەمـەشـدا سەرکەوتنێکی وایان دەست نەکەوت. هەر چەندە فەرەنسە زۆر دەولەمەندە ، ومیقدارێکی زۆر لەسەرمایە دەنێرێتە دەرەوە ، بەڵام هەرگیز بایەخی نـەدا بەبازرگانی کردن بەحەوالەوە. بۆیە بەزمەکە بێهودە لەنیـوان نـیـویـۆرك ولندن دا بەردەوام بو. لە سالـی ١٩٢٤ دا هـۆیـەکـی تـازە بـۆ چـاکـە وبەرژەوەندی نیۆیۆرك پەیدابو: (مارك)ی ئەلمانی وەکو جارانی لێهاتەوە ـ پێش سەردەمی پارەزۆریەکە (التضخم المالی) ـ ئنجا سەرمـایـەکـەی کـەوا هەمیشە دەربازدەکرا بو سویسرە ، وهولانـدە لـەکـاتـی پـارەزۆریـەکـەدا گەرایەوە بۆ بانقەکانی ئەلمانیا ، (سەرمایەهەمیشە لەکاتی تەنگوچەلەمـەی

مەترسیەکاندا دەرباز دەکرێت) ئیتر ئـەڵـمـانـیـاش چـوەپـال بـەرەی ،
پارەودارایپەکەی ئەمەریکا دژی (لندن) ، ئنجا تەرازوەکە لاسـەنـك بـۆ ،
ـای (بەرەی پارەودارابیەکە) سەرکەوت چونکە ژمارەیەکی زۆر لـەحـەوالـە
مالیەکانی ئەمەریکا دەکرا بگۆرریتەوە بە حەوالە مالیـەکـانـی ئـەوروپـا
بێئەوەی پێویست کات بە(لندن) دا بروات ، سـەرەرای ئـەمـەش پـارە ،
وسکەیئینگلیز لەبارێکدا خۆی نەدەگرت ـ واتە جونەیهی ئیسترلـیـنـی ،
نرخەکەی بەزێر نەبو چونکە بەدەربولەپەیرەوی زێر.

خاوەن پارەودارابیەکان لە (لندن)دا ترسیان لێنیشت کەدییـان زۆربـەی
مامەڵەی حەوالەبەرە ونیۆیۆرك وهاوپەیمانە ئەورپاییەکانی دەچێت (لـنـدن)
باشخوان نەبێت بۆیەنەماوەنەوە.

یەکەم جار بیریان کردەوە ئەمە راوەستێنن بە هۆی بنەوکـردنـی نـرخـی
جونەیهی ئیسترلین بەنیسبەت زێرەوە.

چونکە ئەمە مامەڵەی حەوالە رادەکێشیت ، ئنـجـا لـە سـالـّی ١٩٢٥ز. دا
بەپێی نرخە کۆنەکەی جونەیهی ئیسترلینیان قـایـم کـرد ئـەمـە بـوبـە
سەرکەوتنێك بۆ خاوەن بانقەکانی ئینگلیز وئەوانەی قـەرزدەدەن چـونـکـە
تانرخی جونەیهی ئیسترلینی بەرزبێتەوە ، ئەوەندە نرخی شتومەکەکانـیـان
زیاددەکات ، بەڵام ئەم بەرزبونەوەیە زیانی گەیاندبە کارگەکانی ئینگلیـز
چونکە نرخی کەلەوپەلەکانی لەدەرەوەدا زیادی کرد ، ئیتر کارگـەکـانـی
ئینگلتەرە زۆر لایان زەحمەت بو کە بەربەرەکانی کارگەکانی ئەمەریکـاو ،
ئەلمانیا وولاتەکانیتر بکات لەبـازارەکـانـی دەرەوەدا ، لـەبـەر ئـەمـە
ئینگلتەرە تارادەیەك شتومەکی پیشەسازیەکانی خۆیـی خـسـتـەپـێـنـاوی
بانقەکانیەوە تاکو پارێزگاری پێشەوایەتی پارە ، ودارابیەکەی (المالیـة)
بکات لەبازاری پارە ودارایی جیهاندا ، ئیتر نرخی جونەیهی ئیسترلیـنـی
زیادیکرد ، وەکو لەبیرتە دوابەدوای ئەم بەرزبونەوە ، وزیادبونی نـرخـی
جونەیهە بشیوی ناوخۆ لەئینگلتەرەدا بەهۆی ئەم جەزرەبەیەوە کـە تـوشـی
کارگەکان بو پەیدابو: بێئیشی پەرەی سەند ، کارگەرانی خەلوز مان یـان
گرت مان گرتنێکی دورودرێژ ، وەمانگرتنێکی گشتیش رووی‌دا.

هەربتەوکردنی نرخی جونەیهی ئیسترلینی بەرووتی کـەلـکـینـەبـو ،
چونکە حوکومەتی ئینگلیز قەرزدارێکی زۆری ئەمەریکابو هەرکاتێـك داوای

بكردايه دەیكرد ، ئەگەر ولاتە يەكگرتوەكانى ئـەمـەريـكـا داواى ئـەم قەرزانەى بكردايەوە بەريتانياى توشى كێشە ومەينەتى دەكرد ، ونـاچـارى دەكرد كە جارێكى تريش نرخى جونەيهى ئيسترلينى بشكێنى ، ئنجا بـۆ ئەوەى ئەمە روونەدات سياسەت شوناسى بەناوبانگى ئينگليـز (سـتـانـلـى بولدوين) خۆى گەياندە نيۆيۆرك تاكو لەگەڵ وڵاتە يـەكـگـرتـوە كـا نـى ئەمەريكا رێك كەوێت لە سەر رێبازێك بۆ دانەوەى ئەم قەرزانە بـەچـەنـد قيستێك لەلايەن ئينگلتەرەوە ، ئنجا لەبەر ئەوەى كـە هـەمـو دەولـەتـە ئەوروپاييەكان قەرزدارى ئەمەريكا بون چاكترين رێباز ئەوەبو كە كۆبنـەوە وە لە ناو خۆياندا راوێژبكەن رێگەيەكى باشتر بدۆزنەوە بۆ گفتـوگـۆكـردن لەگەل ئەمەريكادا ، تاكو چاكتر مەرجى گۆنجاويـان دەسـت كـەوێـت بـۆ دانەوەى ئەم قەرزانە ، بەڵام هەڵبە وتەقەلاى ئينگلتەرە بۆ رزگاركـردنـى جونەيهى ئيسترلينى وئارەزووى بەتينى بۆ پاراستنى پێشەوايـەتـيـەكـەى (لندن) لەپارە ودارابيدا مولەتى نەدا كەراوێژ بە فەرەنسە وئيتاليا بكـات وەحەزى ، دەكرد گورج لەگەل ئەمەريكادا رێك كەوێت بە هەرچى نرخـێـك بێـت ، ئنجا لەگەل ئەمەريكادا رێك كـەوت ، بـەڵام زۆركـەوت لـەسـەرى بەمەرجە سەختەكانى حوكومەتى ئەمەريكا قايل بـو ، كـەچـى دواى ئـەم فەرەنسە وئيتاليا بۆ دانەوەى قەرزەكانيان بەمەرجێكى باشتر رێكەوتن لەگەل ئەمەريكادا ، بەم تەقەلاو تێكۆشانە سەختە ، ولەخوبوردنە زۆرە ئينگلتەرە ئنجا توانى جونەيهى ئيسترلينى و ، بنكەیپارە و دارايى يەكەى (لنـدن) رزگاركات. بەڵام لەهەمو بازارەكانى جيهاندا زۆرانبارى لە نێوان (لنـدن)و (نيۆيۆرك)دا مايەوە ، لەبەر ئەوەى لەنيۆيۆرك پارە وداراييەكى ئێجـگـار زۆرهەبو ، وە بۆ ماوەيەكى دوورودرێژ ، پارەى بەسودێكى كەم دەدا بەقەرز ئيتر هەمو دەولەتەكانى تر كە جاران قەرزيان لە (بورصە)ى لندن دەكرد ، ئنجا روويان كردە نيۆيۆرك (لەو دەولەتانە كندا ، وخوارووى ئـەفـەريـقـا وأستراليا) لندن نەيتوانى شان لەشانى نيۆيۆرك بـدات لـەقـەرزدانـدا بـۆ ماوەيەكى دوورودرێژ لەبەر ئەمە دەستى كرد بەقەرزدان بەبانقەكانى ولاتانى ناوەراستى ئەوروپا بۆ ماوەيەكى كورت. شارەزايى بانقى ئينگلتەرە گەلێك يارمەتى ئەم قەرزانەيدا بۆ ماوەيەكى كورت ، ئەمە بو لـنـدن بـاش بـو چونكە شارەزايى هەبو لە كاروبارى پارە ودارابيدا ، بەم پێيە بانقەكانى

(لندن) پەیوەندایەتیەکی بەتین یان لەگەڵ بانقەکانی (فینا)دا پەیداکـرد. وە بەهۆی ئەمیشەوە پەیوەندایەتیان لەگەڵ بانقە کانی ناوەراست وخـواروی رۆژهەلاتی ئەوروپادا پەیداکرد ((دانوب وناوچەکانی بـەلـقـان) هـەروهـا (نیوّیوّرك)یش لەوی بە هەندی کاروفرمان هەڵدەستا.

لەم ماوەیەدا پارە ودارایی (مالی) خرۆشابو ، یەکەم جار سەبارەت بـە بەربەرەکانیەکەی نێوان (لندن) و (نیـوّیـوّرك)ەوە ، دوەم لـەبـەر زۆری پارەکە رژابوە ئەوروپاوە وەبو بە هۆی ئەوەکە لە ماوەیەکی کورتدا هەندیَ کەس سامانێکی ئیجگار زۆر ، وخەیالیان دەست کەوت ، رێبازی دەولەمەندی وسامان رێگایەکی سوك وئاسان بو ، بۆ نمونە: ئەگەر ئەگەر یەکێك مافـی دروست کردنی هێلێکی ئاسنین وەیا دامەزراندنی شتێکی‌تری لە ولاتـێـکـدا ببوایە ، وەیا (کارتیل) وئیحتکارێکی بۆ پیشەسازی کۆکردو ، فرۆشتنـی دەست کەوتایە ، کۆمپانیەیەکی دروست دەکرد ، تاکو سەرپەرشتی ئەم مافە وەیا کارتیل وئیحتکارە بکات ، ئنجا ئەم کۆمپانیەیـەش دەسـتـی دەکـرد بەدەرهێنانی پشك وەیا (سهم) ، ئنجا لەسەر ئەم پشك وسەهمە بانقەکانـی نیوّیوّرك وەیا لندن ، قەرزێکی پێشەکی زۆریان دەدا ، بەم جـوّرە خـاوەن پارە ودارایی‌ەکان چەندیان دولار پێویست بوایە ، لە نیوّیوّرکیان وەردەگـرت بەقازانجی لە ٢٪ ئنجا ئەم پارانەیان بە قەرز دەدایـەوە بـە (بـرلـیـن) بەقازانجی لە ٦٪ تاکو دەگەیشتەوە (فینا) بەقازانجی لە ٨٪ بەم شێـوازە سامانێکی ئەستوریان دەست دەکەوت بێ‌ئەوەی هیچ ئیشێکیان کـردبـێـت ، تەنها ئەوەنەبێت کە پارەی خەلکی تریان بەکارهێناوە ، بەناوبانگ ترینی ئەمانە (ایفان کروجر)ی سویدی‌بو      بەپاشای کۆکرد بەناوبانگ بو چونکە پیشەسازی کۆکرد وفرۆشتنـی بـەدەسـت ئـەمـەوەبـو ، رۆژێـك لـە رۆژان ناوبانگێکی باشی هەبو ، بەلام لەدواییدا دەرکەوت ، کـە کـابـرایـەکـی ساختە چی‌بوە ، وپارەیەکی زۆری دزیوە هەر کە هەستی کرد ئاشکرا دەبێت خۆی کوشت ، گەلێك لە خاوەن پارە ودەولەمـەنـدەکـان تـوشـی گـەلـێـك سەغلەتی‌بون بەهۆی کردەوەی خوارو خێچیانەوە.

ئەم بەربەرەکانی‌یەی ئەنکلو ئەمەریکی‌یە بو ناوەراست ، ورۆژهـەلاتـی ئەوروپا سودێکی هەبو ، چونکە ئەو پارە داراییانـەی کـە رژانـە ئـەوی یارمەتی بوژانەوەی ئەوروپایان دا بەدرێژایی ساڵەکانی پێش تەنگوچەلەمـە ئابوریەکەی ساڵی ١٩٢٩.

لەم كاتەدا فەرەنسە ، لە ساڵی ١٩٢٦ و ١٩٢٧ ندا دوچاری پارەزۆریەكی بێشوماربو (التضخم المالي) ، نرخی فرەنك هاتەخوارەوە . لەبەر ئەمە ئەو فەرەنسیانەی كە پارەیان هەبو ـ وهەمو بورجوازیەكی فەرنسی كەشتیكی پارە هەبو كەواكەی كردبوەووە ـ پارەكانی نارده دەروە لەترسی ئەوەی نەفەوتی سەربارەت بەشكانی فرەنك ، بەم پارانە میقـ- دارێكی زۆری سەنداتی پارە ، وحەوالەیبێگانەكانیان كڕی. لە ساڵی ١٩٢٧ فرەنك بەنیسبەت زێڕەوە قایم كرا ، بەڵام بە پێنج یەكی نرخەكەی پێشوی لەم كاتەدا هەمو ئەوانەی كە سەنەداتی پارەو ، دارایی بێگانەیان هەبو گۆڕیانەوە بەفرەنك ، زۆریان قازانج كرد چونكە هەریەكێككێان پێنج ئەوەندەی ئەوفرەنگانەی كەپێشتر هەیبو دەستی كەوت ، لەبەر ئەمە پارەزوری (التضخم) هەرگیز كاری تێنەكردن ، ئنجا حوكومەتی فەرنسە بڕیاریدا ماملەیەك بكات سودی لێوەرگرێت ، هات هەمو حەوالەمالیەكانی بێگانەكان لەگەڵ كارغەزیماڵی وسەندات گۆڕیەوە ، و لەجیاتی ئەمانە فرەنگی تازەیدا بەخاوەنەكانی لەبەر ئەمە حوكومەتی فەرەنسە زۆردەولەمەند بوبو ، چونكە بوبە خاوەنی گەلێك حەوالە وكاغەز وسەنەداتی پارەودارایی ، ئیتر نەیویست بەربەرەكانی ئینگلتەرە ، وئەمەریكا بكات لەسەر پێشەوایەتی پارە ودارایی ، هەروها نەشی دەتوانی بەمەهەستێت ، بەڵام كەوتە وەزع وبارێك كە دەیتوانی كاریان تێبكات.

میللەتی فەرەنسە ، میللەتێكی هۆشیارە ، هەروها حوكومەتەكەش ، قازانجێكی كەم ولەگەڵ مسۆگەری وسەلامەتی پارەكانیان لاباشترە لەقازانجێكی زۆر ، وپارەكانیشیان بكەوێتە مەترسیەوە لەبەر ئەمە حوكومەتی فەرەنسە زۆر بەوریایی پارەزیادەكانی كە لەلایبو ، بە قەرزدەیدا بە كۆمپانیە ، وبانقەكانی (لندن) بەقازانجی لە ٢٪ ئەم كۆمپانیەو ، بانقانەی (لندن)یش ، دەیاندایەوە بەكۆمپانیەكانی ئەلمانیا بە قازانجی ٥ ، وەیا ٦٪ ، وەئەمانیش دەیان دایەوە بەبانقەكانی (فینا) بەقازانجی ٨ وەیا ٩٪ وەلەدواییدا دەگەیشتە (مجر) ودەولەتەكانی بالقان بەقازانجی لە ١٢٪ ، قازانجیش لەسەر قەرزی پارەزیادی دەكرد بەپێی ئەو مەترسیانەی كە تۆشی پارەكە دەهات. بەڵام بانقی فەرەنسەوای بەچاك دەزانی كە هەرگیز خۆی نەخانە مەترسی وگێژاوەوە ، وەمامەلە لەگەل

بانقە مسۆگەرەکانی ئینگلتەرە بکات ، بەم رێبازە فەرەنسە میقدارێکی زۆری لەپارە ومال (بەحەوالە مالیە ئیسترلینیەکانەوە کەوا لەلندن کرابوی) ئەمە گەلێك یارمەتی (لندن)ی دا لە زۆرانبازیەکەی لەگەل نیویۆرك دا.

لەم کاتەدا تەنگوچەلەمە ئابوریەکە زیفیسەندبو ، نرخی بەروبومەکانی کشتوکال لە هاتنە خوارەوەدابو ، نرخی گەنم لە بایزی ۱۹۳۰ ئەوەندە هاتەخوارەوە بانقەکانی رۆژهەلاتی ئەوروپا نەیتوانی قەرزەکانی بسێنێتەوە ئەمانیش نەیان توانی ئەوپارانەی کە لە (فینا) بە جونەیهی ئیسترلینی ودولار قەرزیان کردبو بیدەنەوە. ئەمە تەنگانەیەکی کەی لە (فینا)دا دروست کرد نەنانەت گەورەترین بانقە لەوی کە ناوی(کریدیت - انستالت)بو ، ئەمەش دیسانەوە ، کاریکردە سەربانقەکانی ئەلمانیا بەمە (مارك)ی ئەلمانی شکان کەوتنیبو بەشتێکی راست ، ئەمەش مانای وایە کەزیانێکی زۆر توشی سەرمایەکانی ئەمەریکا وئینگلیز ببێت ، تاکو ئەمە روونەدات سەروك (هوفر) مولەتێکی دا بەقەرزدارەکان کە داوای قەرزیان نەنەکرێتەوە جاری ، هەروها بەزیان بژاردنەوەشەوە (التعویضات) کە لەسەریان دانرابو ، خۆ ئەگەر سوربونایە لەسەرداواکردنی بژاردنەوەی زیانی (التعویضات) ئەوا ئەلمانیا لەرووی پارە وداراییەوە (مالیا) دەروخا سەرەرای ئەم کرد وکۆشەش ئەلمانیا نەیتوانی قەرزی ولاتانیتر بدایەوە ئەم ولاتانەش مولەتێکی وەکو مولەتەکەی پێشویادان بە ئەلمانیا.

ئەمە وادەگەیەنێت ئەو بارەزورەی کە درا بە قەرز بۆ ماوەیەکی کورت لە ئەلمانیادا ، وەکو باوە لەکۆڕی پارە وداراییدا لەوی (جەقی) = (تجمید) ، بەمە مەرکەزی بانقەکانی (لندن) شلوق بو ، چونکە دەبو پێداویسیەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات ، وە لەم رووەوە پشتی بەوقەرزانە قایم بو کە لەئەلمانیای دەسەندەوە ، ئیتر فەرەنسە وئەمەریکا باربویان کرد (۱۳۰) ملیون جونەیهی ئیسترلینیان بەبەریتانیادا بەقەرز ، بەلام ئەمە درەنگ هات وفریاینەکەوت چونکە سەغلەتی کەوتبوە ناوچە مالیەکانی (پارەوداراییی) (لندن)ەوە ، تە کێشە وسەغلەتی روودەدات هەمو کەسێك دەیەوێت پارەکەی خۆی بکێشیتەوە (۱۳۰) ملیون جنەیهەکە گورج باکودرا، کچم لەبیرت نەچێت کە جونەیهی ئیسترلینی لەسەر پەیرەوی

زێربو ، واته هەمو کەسێك دەیتوانی داوای زێربکات لە جیهانی ئەو جونەیهانەی کەهەیەتی.

حوکومەتی ئینگلتەرە ، ئەو کاتە حوکومەتێکی کرێکاران بو ، ویستی پارەیتر لە بانقەکانی نیۆیۆرك وپاریس قەرزکات ، ئەمانیش بەچەند مەرجێك قایل بون کە قەرزی بدەنی یەکێك لەم مەرجانە: حوکومەتی ئینگلیز دەبێ لەکاروباری کرێکارانە وکارگوزاری کۆمەلآیەتیدا دەست بگێرێتەوە ، وکەم سەرف بکات... هتد ، هەروها پیشنیاریان کرد کە کرێی کرێکارەکان کەم کەنەوە ، دیارە ئەمە دەست خستنە ناوکاروباری ناوخۆی بەریتانیایە لەلایەن بانقە بێگانەکانەوە هێرشێکی فراوان کرایە سەرحوکومەتەکەی کرێکاران ، لەئەنجامدا (رمزیمکدونالد) کە سەرۆك وەزیران بو وازی لە حیزبەکە هێنا وبەجێی‌هێشت وەزارەتێکی نوێی پێك هێنا زۆربەیان لەنەبیت و ؛ پەروەردەکان (المحافظین)بون بەم وەزارەتەیان دەوت (وەزارەتی نەتەوایەتی) ، تاکو دژی تەنگانەکە بوەستێتەوە ، ئەم کردەوەیەی (رمزی ماکدونالد)ە کەوازهێنان بو لە حیزبەکە شتێکی ترسناك بو کە لەمێژووی بزوتنەوەی کرێکاران لە ئەوروپادا رووی‌دا.

حوکومەتە نەتەوایەتیەکە بۆ رزگارکردنی جونەیهی ئیسترلینی هاتبو ، ئەو قەرزەی کە بەلێنیان پێدابو لەفەرەنسە ، وئەمەریکای وەرگرت ، لەگەل ئەمەشدا نەیتوانی جونەیهی ئیسترلینی رزگارکات ، ئنجا حوکومەتەکە لە ٢٣ سەبتەمبەری ١٩٣١ دا ناچاربو ، واز لە پەیرەوی زێربینی ، ئیتر جونەیهی ئیسترلینی‌بو بەسکەیەکی شلۆق نرخەکەی هاتەخوارەوە بوبە (١٤ شلن)ی زێر واتە لە سێبەش دووبەشی نرخەکەی پێشوی.

ئەم کارەساتە ، وئەم رۆژە زۆر گرنگن چونکە مانایان وایە کەوا ئیمپراتوریەتی بەریتانیا خەریکە بۆگەن بکات ، دوای ئەوەی کۆتایی دەسەلاتی (لندن) بەسەر بازارەکانی جیهانی مادیدا نزیك بۆتەوە بەلآم ئەوەی خەلك بەتەمایەتی هێشتا زووە ، وکاتی نەهاتوە.

شکانی نرخی جونەیهی ئیسترلینی کاری‌کردە سکەی ولآتەکانی‌تر کەوا جونەیهی کاغەزیان هەبو ، کە بەزێردەجو ، چونکە لەپێشدا لە هەر کاتێکدا بوایە دەتوانرا بگوررێتەوە بەزێر ئیتر لەبەر ئەوەی ناتوانرێت

ئیسترلینی بگورێتەوە بەزێر وەنرخەکەی لە ٣٠٪ هاتەخوارەوە هەمان دەستور سکەکانیتریش نرخیان هاتەخوارەوە ، وشکان ، ئەوانیش ناچاربون دیسانەوە واز لە پەیرەوی زێربێنن.

هەڵوێستی فەرەنسا ساغ وسەلیم بو ، ئەو سیاسەتە هۆشیاریانەی کە لەسەری دەرۆیشت بەکەڵکی هات ، لەکاتێکدا ئەمەریکا وئینگلتەرە پارەیان هەبو وەلە ئەلمانیادا چەقیبو ، پێویستیان بەپارەبو ، فەرەنسا پارەیەکی زۆری هەبو کە برینیبو لەحەوالە بێگانەکان ، وفرەنگی زێر ، لەبەر ئەمە هەریەکە لە حوکومەتی ئەمەریکا ولە حوکومەتی ئینگلیز هەوڵیان دەدا: کە خۆیان لای حوکومەتی فەرەنسە خۆشەویست کەن ، تالایەنی یەکێکیان بگرێت دژی ئەویتر ، بەلام فەرەنسەی هۆشیار بەتەلەکەوەنەبو لەسەر هەردو بەتەکە باری دەکرد.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣١ دا هەڵبژاردنی گشتی لە ئینگلتەرە داکرا (وەزارەتە نەتەوایەتیەکە) بەزۆربەیەکی زۆر سەرکەوت ، لەراستیدا ئەمە سەرکەوتنێك بو بۆ حیزبی نەریت پەروەرەکان (حزب المحافظين) ، وەتی شکانێکی خراپ بو بو حیزبی کرێکاران ، یەکێك لەوهۆیانەی کە نەریت پەروەرەکانی سەرخت ، ئەوەبو کە بورجوازیەت ترساکە هەندێ پروپاغەندە کرابو بێتەدی ، کە گوایا حیزبی کرێکاران پارە وماڵیان زەوت دەکەن ، بەتایبەتی دوای یاخی بونەکەی کەشتیەوانەکانی ئینگلیز کەهی لەشکریدەریایی ئەتلەسیبو ، کەوا ماوەیەکی کەمی خایاند ، بۆبە هەمو ئەندامانی پشتیوانی حوکومەتە نەتەوایەتیە نەریت پەروەرەکەبون.

سەرەرای تەنگانە ومەترسیەکان وشکانی نرخی جونەیهی ئیسترلینی ئەم سێدەولەتە گەورەیە ئەمەریکا ، وبەریتانیا وفەرەنسا ، وەیان بانقەکانی ئەم دەولەتانەنەیان توانی یارمەتی یەکتریبدەن ، هەریەکەیان بۆ چاك کردنی مەرکەزی خۆی لەسەر حیسابی ئەوانیتر ئیش دەکرد ، دەیان توانی رێك بکەون وبازارێکی پارەودارایی نیودەولەتان (بورصەدولیە) پێك بێنن لەجیاتی بەزم ورەزم لەسەر پێشەوایەتی پارە ودارایی (مالی) ، کەچی هەریەکەیان رێبازیکی تایبەتیگرت ، ئەوی سەیرە بانقی ئینگلتەرە توانی جێکە فەوتاوەکەی خۆی بگرێتەوە ، وەتاردەیەکی زۆر لەمەدا سەرکەوت ، هەرچەندە جونەیهی ئیسترلینی لەسەرپەیرەوی زێر نەدەرۆیشت.

کە ئینگلتەرە وازی لەپەیرەوی‌زێر هێنا بانقی رەسمی دەولەتەکانی‌تر (ئەم بانقانە پێیان دەوترێت بانقی مەرکەزی) حەوالەمالیە ئیسترلینیەکانیان فرۆشت کەوا هەیان بو ، تاکو لە جیاتی ئەو زێریان دەست کەوێت ، ئەم بانقانە بە درێژایی ئەم ماوەیە ، ئەم حەوالانەیان هەبو چونکە دەیان توانی لە هەج کاتێکدا بێت بەزێر بی‌گۆرنەوە ، لەبەر ئەمە هەموی وەکو زێروابو ، ئنجا کەحەوالەیەکی بێ‌شومار فرۆشرا ، لەپرێکدا نرخی جونەیهی ئیسترلینی خێرا لە ٣٠٪ شکا ، وهاتەخوارەوە ، ئیتر قەرزدارەکان (بەحوکومەت وکۆمپانیە گەورەکانەوە) ئەمەیان بەهەڵ زانی قەرزەکانی خۆیانیان بە زێردایەوە ، چونکە بەمە ئەوی پێویست لەسەریان کەبێ‌دەنەوە لە صەداسی ٣٠٪ کەم دەکات بەم جۆرە زێررژا بەسەر ئینگلتەرەدا .

بەڵام زۆربەی زێرەکەی کەنێررابو ، بۆ ئینگلتەرە لەهیندستاز ومیسرەوەبو ، ئەم دو دەولەتە هەژارە ، زۆریان لێکرا کەبارىوی بەریتانیای دەولەمەند بکەن! داهاتیان بۆ بتەوکردنی مەرکەزی ماڵی ئینگلتەرە بەکارهات ، هیج دەسەلاتێکیان نەبو ، وەنەیان توانی بەرهەڵستی بکەن بەتایبەتی کەئینگلتەرە پێداویستی هەبێت.

بەڵام چیرۆکی رۆپی غەمناك ودورودرێژە هیج نەبێت بەلای هیندستانی‌یەکانەوە ، روپی ناچار دەکرا نرخەکەی زوو ، بگۆررێت لەپێناوی بەرژەوەندی حوکومەتی بەریتانیا ، وپارەدارەکانی ئینگلیزدا . من نامەوێت بەدرێژی باسی کاروباری سکەت بۆ بکەم تاکو بۆت روون کەمەوە ، کە لە سالانی دوای جەنگەکەوە حوکومەتی بەریتانیا توانی پارەیەکی زۆر لەکیس هیندستان بدات. لە ساڵی ١٩٢٧ دا مشتومرێکی گەرم لە هیندستاندا بەرپابو ، دەربارەی چەسپاندنی نرخی روپی بەنیسبەت جونەیهی ئیسترلینی وزێرەوە (ئەوکاتە جونەیهی ئیسترلینی بەپەیرەوی زێرەوەبەندبو) ، هۆی ئەم مشتومرەش ئەوەبو حوکومەت ویستی نرخی روپی بەیەك (شلن) وشەش (بنس) بچەسپێنی ، بەڵام رای‌گشتی هیندستان دەیانەویست نرخەکەی بکرێت بەیەك (شلن) وچوار (بنس) ، ئەم کێشەیە خۆی لە خۆیدا کۆنە ، بریتیە لەوەی: کە ئەگەر روپی بەنرخێکی بەرزتر بچەسپێ خاوەن بانق

وپارەدار ، ئەوانەی قەرز دەدەن قازانج دەکەن ، وەهانی شتومەك هێنان دەدا لەدەرەوەوە. بەڵام ئەگەر بەنرخێکی کەم بچەسپێت باری قەرزارەکان سوك دەبێت ، وەری دەدری بە شتومەك زیاتر بۆ دەرەوەبچێت ، وپیشەسازی ناوخو ، گەشەدەکات ، دیارە حوکومەت راکەی خۆی جێبەجێکرد سەرەرای بەرهەڵستی کردنی لە لایەن هیندستانەوە. ئنجا نرخی روپی‌ی‌بە (شلن) یك ، وشەش (بس) چەسپاند. زۆر کەس ئەم ئیشەیان بەزەبون ، ولاوازبونی پارە ودارای (مالی) دادەنا ، چونکە لە واقیعدا نرخێکی زۆرتری‌دابەروپی لەو نرخەی کەبی‌ی رەوادەبینریت وشایانێتی ، هیچ دەولەتێکی‌تر ئەم زەبونی ولاوازی‌یەی بەسەر سکەی خۆیدا نەهێنا ئینگلتەرە نەبێت ، لە ساڵی ١٩٢٥ دا کاتێك کە جونەیهی ئیسترلینی بەست بەپەیرەوی زێرەوە. بەڵام لەمەدا مەبەسی ئەوە بو کەپێشەوایە تیەکەی خۆی لەمەر پارە ودارایی (مالی) لەجیهاندا بپارێزێت. بۆ ئەمە ئامادەبو گەلێك شت بەخت کات لەپێناویدا ، بەڵام فەرەنسە ، وئەلمانیا ، ودەولەتەکانی‌تر ، پارە زۆریان (النضخم) لاباشتربو لە زەبون وکزبونیەکەی ئەمە لەپێناوی سوك کردنی تەنگانە ئابوریەکەدا.

بەرزکردنەوەی نرخی روپی مانای زیادکردنی سەرمایەی ئینگلیزە کە لەهیندستاندا بەکاردەهێنرێت ، دیسانەوە مانای گرانباریەکی نوێیە بەئەستوی پیشەسازی هیندستانەوە ، چونکە نرخی بەرهەمەکانی بەرزدەبێتەوە ، لەمانە لەهەموی گرنگتر مانای گەلێك گرانباری نوێیە بەئەستوی فەلاحەکان وخاوەن زەویە قەرزدارەکانەوە ، چونکە بەرزبونەوەی نرخی روپی نرخی قەرزەکانیشیان زیاددەکات ، وەجیاوازی لە نێوان ١٨ بنس و ١٦ بنس دا تەنها دوبنسە بەڵام ئەمە بریتیە لە ـــ١٢٪ لەنرخی روبی. گریمان بارەی قەرزی کشتوکاڵ لەهیندستاندا (١٠٫٠٠٠) ملیون روپی‌بێت ، ئنجا زیادی لە ـــ١٢٪ لەسەر ئەوبارەبە مانای زیادی (١٢٥٠) ملیون روپی‌یە ئەمە پارەیەکی کەم نی‌یە.

دیارە پارەی قەرزەکان زیادناکەن بەلکو نرخەکەیانە زیادی‌کردوە ، نرخی راستەقینەی پارەئەوەیە ، کە بتوانێت چەندی گەنم وجل وبەرگ وکەل وپەلی‌تر پێبکرێت ، ئەم نرخە وەکو خۆیی لێدێتەوە ئەگەر رێی ئەمەی بدرێت ، ئنجا ئەگەر هێز وتوانای پارەشکستی هێنا ئەوا

سکەکەیشی دەشکێت ، خۆ ئەگەر نرخی پارەیەك بەبەرزتر دابنرێت لەو نرخەی کە هەیەتی ئەمە مانایوایە هێزی کرینێکی زۆرتری دەدەیتێ لەوەی کە لە توانای دایە ، بەم جۆرە فەلاح ناچاربو بەشێکی زۆر لەداهاتەکەی بداتەوە بەقەرزەکانی ، و قازانجی قەرزەکەیدا ، کەمێك نەبێت بۆی نامێنێتەوە. بۆیە چەسپاندنی ئەم نرخەی روپی ، وکردنی رازەی وەکو: یەك بو شەش بەنیسبەت جونەیهی ئیسترلینیەوە گەورەترین هۆبو لە زیف سەندنی تەنگوچەلەمە ئابوریەکە لەهیندستاندا.

لەکاتێکدا جونەیهی ئیسترلینی لە سەبتەمبەری ١٩٣١ دا لەپەیرەوی زێر جیاکرایەوە ، دیسانەوە روپییشی لێجیاکرایەوە ، وەنیسبەتی لەگەڵ جونەیهدا یەك بو شەش بو هەروەکو جاران ، بەڵام ئەمە مانای میقدارێکی کەمی زیر دەکەیەنیت. روبی هەربە جونەیهی ئیسترلینیەوە بەسترایەوە ، تاکو سەرمایەکانی بەریتانیا کە لەهیندستاندا بەکاردەهێنرێت کاری تێنەکرێت ، چونکە ئەگەر واز لەروپی بهێنرێت وەکو خۆی بێتەخوارەوە ئەمە زیانێکی زۆر بەسەرمایەی ئیسترلینی دەگەیەنێت ، ئیتر کەس لەمەدا زەرەرناکات تەنها بەرژەوەندیە بێگانەکانیتر نەبێت لەناوهیندستاندا وەکو: بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا وژاپۆن ئەمەسەبارەت بەنزم بونەوەی نرخە زێرەکەیەتی. لەمەدا ئینگلتەرە دەست کەوتێکی تریشی لەمانەوەی روپی وبەندبونی بە جونەیهی ئیسترلینیەوە دەست کەوت ، ئەمیش ئەوەبو کە پیشەسازیەکانی ئینگلیز بەهۆی ئەمە وە دەیان توانی ، کەرەسە ، و (موادی خام) بەسکەی ئینگلیزی بکرن ، چونکە هەرچەندە ناوچەی ئیسترلینی گەورە وفراوان بێت ئەوەندە هێزی جونەیهی ئیسترلینی زیاددەکات.

بەشکانی نرخی روپی دوابەدوای جونەیهی ئیسترلینی دیارە نرخی زێر دەکات چونکە یەکێك دەتوانێت روپییەکی زۆربکرێت بەهەمان میقدار لەزێر. بۆیە ئەوانەی کە وا رووبەرووی تەنگوچەلەمە ئابوریەکە دەبنەوە هەرچی زێرێکی هەیان بو ، بەخشلیشەوە فرۆشتیان تاکو روپییەکی زۆرتریان دەست کەوێت وقەرزەکانیانی پێبدەنەوە، بەم جۆرە زێر لە هەمولایەکی ولاتەکەوە دەچوە دەرەوە بو بانقەکان لەوێشەوە بۆ (لندن) ، بەم شێوەیە بەشێکی زۆر لەزێری هیندستان چو بۆ ئینگلتەرە ئێستاش

هەردەچێت ، ئەم زێڕە بەزێڕەکەی کە لەمیسرەوە دەهات ئەمانە بون کەوا بانقی ئینگلتەرە ، ولەگەل مەرکەزی پارەودارایی بەریتانیایان رزگارکرد ، بەهۆی ئەمەوە توانی قەرزەکانی پێبداتەوە کە لەسەبتەمبەری ١٩٣١ دا لەئەمەریکاو فەرەنسەی وەرگرتبو.

بەراستی ئەوی ئەمرۆسەیرە ، هەمو ولاتەکان بە دەولەمەندو هەژاریانەوە تەقەلادەدەن ئەو زێڕەی هەیانە بپارێزن ، کەچی هیندستان بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەمەوەیە ، حوکومەتی ئەمەریکاو فەرەنسە میقدارێکی زۆریان لەزێر لای خۆیان گل داوەتەوە ، دوای ئەوەی کە بەچەند رێبازێکی خواروخێچ دا تێپەری لەووەختەوە کە لە کانگاکانی دەرهێنراوە تاگو لە گەنجینەی ژێرزەوی بانقەکاندا نێژران ، سەرەرای ئەمە گەلێك لەولاتەکان بە ئینگلتەرەشەوە بردنەدەرەوەی زێریان لەهەموکەسێك قەدەغەکرد. ئینگلتەرە لەجیاکردنەوەی جونەیهی ئیسترلینی مەبەسی ئەوەبو کە پارێزگاری زیرەکەی خۆیبکات کەچی هیندستان بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەمەوەیە ، چونکە سیاسەتی پارە ودارایییەکەی (مالی) کەلەسەری دەروات لە پێناوی بەرژەوەندی ئینگلتەرەدایە.

زۆر جارخەلکی باسی ئەو میقدارە زێرو زیوە دەکەن کە لە هیندستاندا هەیە ، ئەمە بو دەولەمەندە کان راستە ، بەلام زۆربەی میللەت ئەوەندە هەژارە ناتوانێت هیچ شتێکی بەنرخ هەلگرێت ، لای هەندی نەفەلاحەکانی کەتۆزێ حالیان لەوانیتر باشتربێت هەندی شتی بەنرخ هەیە کە ئەمە هەمو سامانەکەیانە ، چونکە بۆیان رێنەکەوتوە کەمامەلە لەگەل بانقەکاندابکەن وە هەرکە تەنگوچەلەمە ئابوریەکە پەیدابو ئەم خشلە بچوکانە هیچی نەما وەنرخی زێربەرزبوەوە. ئەگەر لەهیندستاندا حوکومەتێکی نیشتمانی ببوایە نەیدەهێشت زێر لەولاتەکە بچێتەدەرەوە چونکە تاکە هۆی نێودەولەتانە کەلەمامەلەی پارەوداراییدا جێی باوەربێت.

بابگەرێینەوە بۆ چیرۆکی زۆرانبازیەکەی نێوان جونەیهی ئیسترلینی ودولار: بانقی ئینگلتەرە توانی بەم رێبازە وگەلێك رێبازیتر ـ کە پێویست ناکات باسی بکەین ـ جێوشوینی خۆیی بتەوکرد.

لەسەرەتای سالی ١٩٣٢ دا بانقی ئینگلتەرە شانسیکرایەوە ، چونکە تەنگانەیەك لەبانقەکانی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوا رووی‌دا ،

سەبارەت بە چەقینی بەشێك لەپارە وداراییەكانی (مالی) ئەمەریكا لەناو ئەلمانیادا. گەلێك لەئەمەریكاییەكان دولارەكانی خۆیانیان فرۆشت سەنەداتی ئیسترلینیان پێكرد ، بەم جۆرە حوكومەتی بەریتانیا حەوالەی پارە ودارایی (مالی) بێگانەی بەدولار دەست كەوت لەپاشا ناردی بۆ بانقی حوكومەت لە نیۆیۆرك ، وبەزێر گۆریەوە چونكە دولار لەسەرپەیرەوی زێربو. هەر كەسێك بیویستایە دەیتوانی لەجیاتی دولار داوای زێربكات ، بەم شێوەیە رەصیدی زێر لە ئینگلتەرەدا بەرزبوەوە بۆئەوەی دەست بۆ جونەیهی ئیسترلینی بێنی ، وەیا زیانی پێبگەیەنێت ، وەیا نرخەكەی بێنێتە خوارەوە ، ئیتر كە(لندن) بو بە خاوەنی ئەم هەمو زێرو حەوالەمالیانە چوەوە سەردەمی پێشوی وەكو جارانی لێهاتەوە ، وەبوەوە بەبنكەی پارەو دارایی لە مەربازاری جیهانی. كەچی نیۆیۆرك بەزی گەرچی بو ماوەیەكیش بێت بەلای كەمەوە ، سەبارەت بەتەنگانەكەی توشی بانقەكانی هات ، كەوا بەهەزاران بانقی بچكۆلە نابوت بون وەكو لە پێشدا پێم وتیت.

# سەرنەکەوتنی جیهانی سەرمایەداری لە یەکگرتندا

## ٢٨/یولیو/١٩٣٣

کچم ئەو چیرۆکەی کە بۆم گێڕایتەوە دەربارەی بەربەرەکانی ، ومناوەرەکردن چەند دورو درێژە دەترسم سوپاسم نەکەیت لە سەری! ئەم چیرۆکە بریتیە لە تورێکی چنراو لە دەعەلی وموئامەرەی نێودەولەتان بە جۆرێك هاتنەدەرەوە لێی گەلێك زەحمەت ترە لەچونە ناوی‌یەوە ، لەگەل ئەمەشدا هەولم داوە کە چاوپێداخشاندنێکی سەرپێی خێرات پێشکەش بکەم چونکە زۆربەی ئەوەی لەم کۆڕەدا روودەدات بەنەهێنی دەمێنێتەوە وتیشکی رۆژی لێنادات.

خاوەن پارەوداراییی ، وخاوەن بانقەکان لەم جیهانەدا دەورێکی مەزن دەبینن ، تەنانەت پادشایانی پیشەسازی رۆژیان نەماو بەسەرچو ، وەخاوەن بانقەکان بەتەنها خۆیانن کەوا بەسەر پیشەسازی وکشتوکال وشەمەندەفەر وهۆکانی گواستنەوە ، وبەسەر خودی حوکومەتەکانیشدا دەسەلاتیان هەیە ، لەبەر ئەوەی کە پیشەسازی وبازرگانی هەرچەندە پێشکەوتون و گەشەیان کردوە ، پێویستیان بە پارەیەکی زۆر هەیە. بانقەکانیش سەرچاوەی ئەم پارەیەن ، زۆربەی کاروفرمانەکان لەم جیهانەدا بەهۆی قەرزکردنەوە وە ، جێبەجێ دەبی ، ئنجا بانقەکانیش کەوا قەرزدان پەرەپێ دەدەن ، وەیا کەمیان دەکەنەوە ، وبەئارەزووی خۆیان حوکمی تێدادەکەن ، خاوەن کارگەکان وکێلگەکان ناچارن کەبچن بۆ بانقەکان پارەیان لێ‌قەرزکەن ، تابتوانن لەئیشەکانیاندا بەردەوام بن ، ئنجا کاروباری ئەم قەرزدانە ، هەرتەنها بەسودنی‌یە بۆ خاوەن بانقەکان ، بەلکو دەسەلاتیان بەسەر پیشەسازی وکشتوکالدا زیاتر دەکات ، بانقەکان دەتوانن خاوەن ئیش وفرمانەکان پەرێشان کەن وتێکیان شکێنن وەناچاریان کەن بەومەرجانەی کە ئەمان دایدەنێن قایل بن ، هەرتەنها بەوە کە قەرزیان نەدەنی ، وەیا

داوای دانەوەی قەرزەکانیان لێبکەنەوە لەکاتی سەغلەتیدا ، هەبەست بەم جۆرە تین بۆ هێنانە دەکەین لەزیانی ناوخوی هەمو ولاتێکدا هەروها لەزیانی نێودەلەتانیشدا. لەبەر ئەوەی بانقە مەرکەزیە گەورەکان قەرزدەدەن بە حوکومەتی ولاتە جۆربەجۆرەکان ، بەمە دەتوانێت تین یان بۆ بێنێت ، بۆیە دەبینین بانقەکانی نیۆیۆرك زاڵەبەسەر گەلێك لەحوکومەتەکانی ئەمەریکای ناوەراست وئەمەریکای خوارووا.

گەورەترین سفەتی ئەم بانقە گەورانە ئەوەیە کە لەکاتی برەو ، (رواج) و ، بێبازاریدا چۆن یەك قازانج دەکات ، لەکاتی برەودا (رواج) لە خۆش گوزەرانی کردنی گشتیدا بەشدار دەبێت ، پارەودارایی بەسەردا دەرژێت ، بە قازانجێکی باش دەی داتەوە بەقەرز ، بەڵام لەکاتی بێبازاری وتەنگانەدا ، دەست بەپارەکانی خۆیەوە دەگرێت ونایخاتە مەترسیەوە. (بەمەتەنگانە کەزیاتر بەتین دەکات ، چونکە ئیشەکان بەبێ قەرزکردن بەردەوام نابن) بەڵام لەلایەکیترەوە قازانج دەکات چونکە نرخی هەمو شتێك دێتەخوارەوە ـ زەوی وکارگەکان... هتد گەلێك پیشەسازی نابوت دەبن ، ئنجا بانق راست دەبێتەوە ، هەمو شتێك بە هەرزان دەکرێت! بۆیە لە بەرژەوەندی بانقەکانە کە هەمیشە خۆش گوزەرانی ، وبێبازاری بەدوای یەکدابێن.

لەکاتی تەنگوچەلەمە ئابوریەکەی ئێستای جیهاندا ، بانقە گەورەکان سەرکەوتوبون قازانجێکی باشیان دابەش دەکرد ، راستە بەهەزاران بانق لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا نابوت بون ، وە هەندی لەبانقە گەورەکانیش لە نەمسا وئەلمانیادا ، بەڵام زۆربەی بانقەکانی کە نابوت بون لە ئەمەریکادا بانقە بچکۆلەکان بون ، بێگومان وادەردەکەوێت کە خەوشێك (عیب) لە رژێمی بانقەکانی ئەمەریکادا هەیە ، لەگەل ئەمەشدا بانقە گەورەکان لە نیۆیۆرك دا بەکاروباری خۆیان بەچاکی هەڵدەستان ، هەروها لە ئینگلتەرەشدا هیچ بانقیك تیایدا نابوت نەبو.

کەوابو خاوەن بانقەکانن گەورە وسەردار لە جیهانی ئەمرۆی سەرمایەداریدا بۆیە گەلێك کەس بەم سەردەمە دەڵێن: "سەردەمی پارەودارایی (مالی)" تاکو سەردەمی پیشەسازی پێشوی جیاکریتەوە ، گەلێك لە ملیونیر وە یا خاوەن ملیون لەدەولەتە رۆژئاواییەکاندا بە

تایبەتی لە ئەمەریکادا هەیە ، ئەمانە بەدڵی گدلێك كدس. بەلام ئەوی ئاشكرایە ، ئەم "دەولەمەندیە قورسە" سەرابیكی خەلەتێنەرە . لەدژی وساختە چێتی جیاناكرێتەوە ، مەگەر بەوە كە ئدم ددولەمەندیەد لەچوار چیوەیەكی فراواندایە ، (كارتیل) وەیا ئیحتیكارە زلەكان هدمو دامەزراوە بچوكەكان دەهارێت ، كردوكۆشی پارەی زۆر بیستی هەزارەكانی كە هەول دەدەن پارەكانیانی تێدا بەكاربێنن كەول دەكات ودەگۆڕوی. هەندێ لە خاوەن پارە ودارابیە زۆرەكانی ئەوروپا وئەمەریكای لەم نزیكانەدا رسواكرد ئەم سوك و رسواییەش لەو جۆرە نییە كە ئادەمیزاد حەزبكات بیبێنێت.

دیمان كە چۆن زۆرانبازیەكەی نێوان ئینگلتەرە ، وئەمەریكا لەسەر پێشەوایەتی پارەودارایی بەسەركەوتنی شاری (لندن) كۆتایی هات ، بەلام بەرهەرمی ئەم سەركەوتنە چی بو؟ بەرهەمی ئەوسەركەوتنە كە دەسالی زیاتری خایاند لەزۆرانبازیدا خەریكە وردەوردە نامێنی ، بازرگانی نیودەولەتان توشی بێبازاری بو ، ئەو قازانجانەی كە لەرێی پێشەوایەتی پارە ودارابیەوە دەست دەكەوت هاتە كزی لەگەل پەیدابونی بێبازاریەكەدا حەوالەی پارە ودارابیەكان كەم بوەوە ، وە لەهەمان كاتدا نرخەكانی مسۆگەركردن (التأمینات) هاتەخوارەوە ، دەرهێنانی پشكەكان (الأسهم) ومسۆگەركردنی نوێ (التأمینات الجدیدة) كەم بونەوە ، لەگەل ئەمەشدا قازانج كە لەسەر قەرزە گشتیەكان ، تایبەتیەكان دادەنران هەروەكو خۆی مایەوە ، دەولەتە قەرزدارەكان لەبار شانیان زەحمەت بو كە ئەم قازانجە بدەنەوە ، ئنجا لەبەر ئەوەی كە دەبێت پێداویستی نێودەولەتان هەربیرێت بەرێوە ، داواكاری زێر زۆربو ، بەلام لەولانە هەزارەكانەوە بۆ ولاتە دەولەمەندەكات دەچو ، لەوانەی كەوا پارەكانیان نرخی ناگۆرریێت.

بەلام كۆكردنەوەی ئەم زێر وسامانانە ـ بەسەركەوتنی پیشەسازیشەوە ـ كە تەنگانەكەتینی هێنا ، زۆر بەكەلكی ئەمەریكا نەهات بەم جۆرە ئەو ولاتە گەورەیە كە خاوەنی هەل ومەرجێكی باشە ، كە ژن وپیاو لەهەمولایەكەوە روویان تێدەكرد ، بو بەولاتێكی بەست وبێزاری ، بەدكاری خاوەن ئیش وفرمانە گەورەكان كە حوكمرانی ولاتەكەیان دەكرد دەركەوت وئیسپات بو. بروا ، ومتمانەكردن بەپێشەوایانی پارەودارایی وپیشەسازی كەم بوە وە ، وهاتەكزی. سەرۆك (هوفر)ی برادەری خاون ئیش وفرمانە

گەورەکان ، لەلایەن میللەتەوە خۆشەویست نەبو ، لە نۆفەمبەری ساڵی ١٩٣٢ دا کە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی رووی‌دا ، ئەم نوشوستی هێناو سەرنەکەوت ، وە لەجیاتی ئەم (فرنکلین روزفلت) سەرکەوت.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٣ دا ئەمەریکا توشی تەنگانەیەکی پارە ، ودارایی نوێ هات لەئەنجامدا ناچاری کرد کەواز لە پەیرەوی زێربێنی ، وەنرخی دولار کەم کاتەوە هەر چەندە ئەمەریکا لەهەمو دەولەتێکی جیهاز زیاتر زێری هەبو. مەبەس لەم کەم کردنەوەیە سوك کردنی گرانباری‌بو لە سەرشانی پیشەسازی وکشتوکاڵ. وەچاك کردنی وەزع وباری قەرزدارەکان بو لەسەر حیسابی بانقەکان وخاوەن قەرزەکان ، ئەمە بەتەواوی بەپێچەوانەی کردەوەی بەریتانیا وەبو لە هیندستاندا ، سەرەرای بەرهەڵستی کردنی میللەتی هیندستان بەتێکرایی.

دەولەتە سەرمایەدارەکان هەولێکی تریان دا بۆ یارمەت دان لە پێناوی جێبەجێ کردنی کێشەکانیاندا لە یونیوی ١٩٣٣ کۆنگرەیەکی ئابوری نێودەولەتانیان بەست نوێنەرەکان باسی (جیهانیان کرد کە ترس دای پۆشیوە) وەئاگاداری‌یەکی هەرەشە ئامێزیان دەربری کە "ئەگەر کۆنگرەکە سەرنەکەوێت ئەنجامەکەی رژێمی سەرمایەداری سەرجەم دەتەپێ" سەرەرای ئەم هەمو مەترسی ، و وریاکردنەوەیەش دەولەتە گەورەکان نەیان توانی یارمەتی ، وکۆمەك بەیەکتربکەن. وەهەردەولەتێك هەولی دەدا کەبەرێبازی خۆیدا بروات ، بەم جۆرە کۆنگرەکە سەرنەکەوت و ، هەردەولەتێك لەسەرسیاسەتێکی ئابوری نیشتمانی تایبەکاری خۆی دەرۆیشت.

بۆ نمونە: شتێکی نەشیاوبو (مستحیل) کە ئینگلتەرە بتوانێت بەخۆی خۆی بەخێوکات ، مادام خواردەمەنی پێویستی خۆی ، خۆی بەرهەمی ناهێنێت ، وەمادام کە رەسەی پێویست بۆ پیشەسازیەکانی لەدەرەوە بۆی دێت لەپێناوی ئەمەدا ئینگلتەرە سیاسەتێکی ئابوری نیشتمانی گرت لەسەر بنچینەی ئەوەی کەتێکرا هەمو ئیمپراتوریەتەکە بکرێتەوە ، لەمە ، مەبەسی ئەوەبو-کە ئیمپراتوریەتی بەریتانیا ببێتە یەك یەکیتی ئابوری ، وەیا یەك پارچە ئیسترلینی ، لەبەر ئەمە ئینگلتەرە کۆنگرەیەکی ئابوری ئیمپراتوریەتەکەی لە (ئوتاوا)دا بەست لە ساڵی ١٩٣٢ دا ؛ بەڵام ئەم کۆنگرەیە توشی گەلێك زەحمەتی‌بو ، چونکە نەکندا وەنە اُوسترالیا ، و

نەخوارووی ئەفەریقا ئامادەنین کە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بخەنە پێناوی ئینگلتەرەوە چونکە دەبوایە ئینگلتەرە مل کەچی هەندێ لەداخوازیەکانی ئەم دەولەتانە بوایە ، بەلاَم ئینگلتەرە وای لە هیندستان کرد کە بەرەسمی رازی بێت کەل وپەلی ئینگلیزی پەسندبکات ، وبەسەر هەتردا سەرەرای بەرهەلستی کردنی میللەتی هیندستان دژی ئەم بارو وەزعە بەجۆرێکی فروان. ئیتر کارەساتەکانی کە لە دوا جاردا روویان دا دەریان

خست کە رێکەوتن نامەکەی (ئوتاوا) سەری نەگرت وەجیاوازی لە نێوان ولاتەکانی میللەتانی سەربە بەریتانیا (رابطة الشعوب البريطانية] وئینگلتەرە ، وە نێوان هیندستان و ئینگلتەرەدا هەیە.

لەم کاتەدا پێشەنگی مەترسیەکیتر پەیدابو کە هەرەشەی لە پیشەسازی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا ، و بازارەکانی دەکرد ، بەرهەمی هەرزانی ژاپۆن رژایە هەمولایەك ، ئەوەندە هەرزان بو کە هیچ جۆرە باجی گومرکێك نەی دەتوانی قەدەغەی هاتنی بکات ، ئەم هەرزانیەش دەگەرێتەوە بۆ هاتنەخوارەوەی نرخی (ین) لەگەل ئەو کری گەمەی کە دەدرابە کچە کارکەرەکان لە کارگەکانی ژاپۆن دا وە ، بو ئەو باربووی پارە ودارایيە حوکومەت دەیدا بەپیشەسازیەکان ، وکۆمپایەکانی گواستنەوەی دەریایی ژاپون کرێیەکی زۆر وەردەگرت ، وە لەهەمان کاتدا راستیەك هەیە کەناشاررتیەوە ئەویش ئەوەیە کە پیشەسازی ژاپون باش بو ، بەپێچەوانەی گەلێك لەپیشەسازیەکانی ئینگلیزەوە کەوا کۆن بوبو.

ئنجا کە باجەکانی گومرك نەیتوانی قەدەغەی شتومەکی ژاپون بکات ئیتر ئینگلتەرە دەستی کرد بەداخستنی هەندێ لەبازارەکانی داخستنێکی قایم بەرامبەربەم شتومەکانە ، وەیا رێی نەدان بە هاتنە ناوەوە مەگەر بە میقدارێکی کەم ، بەلاَم ئەگەر شتومەکی ژاپۆن لە ولاَتانیتر قەدەغە بکرێت پیشەسازیە مەزنەکانی ژابۆن جی بەسەر دێت؟ یان بون ، وگیانی ئابوری ژابون تێکرا تێك دەشکێت ، وەیان بازاری نوێی بۆ دەدۆزرێتەوە ئەمەش دەبێتە بەربەرەکانیەکی توندی بازرگانی لەواندیە ئەمە ببێتە جەنگ ئەمەبە ئەو قوناغەی کە جیهانی بەربەرەکانی سەرمایەدارێتی بێگومان پیایدا تێدەپەرێت.

هەر بەم جۆرەش ئەگەر بازارەکانی بەریتانیا دابخرێت بەرامبەر ولاتانی‌تری ئەوروپا ئەمە مانای وێران بونی ئەو ولاتانەیە. دەبینین هەر هەنگاوێك هەر ولاتێك بیُ نێت لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا ، ولاتەکەی‌تر وبازرگانی نێودەولەتان توشی زیانی دەبن ئەمە دەبێتە هۆی بەکژدا چون و پشێوی

# شۆڕش لەئەسپانیادا

**٢٩/یولیو/١٩٣٣**

ئێستا لەباس کردنی دورودرێژی وەرس کەری تەنگوچەلەمەی ئابوری وجیهانی ، وبێبازاری بازرگانی دەگوێزمەوە بۆ باس کردنی دوومەسەلەی گرنگ کە لەم دواییەدا روویان دا ئەم دووانەش: شۆڕشە لە ئەسپانیادا وسەرکەوتنی نازێتی‌یە لە ئەلمانیادا.

هەریەکە لە ئەسپانیا ، ولەپورتەغال دەکەونە خوارووی رۆژئاوای ئەوروپاوە ، دەورێکی گرنگیان لەمێژووی ئەوروپا وجیهاندا گێراوە ، وە خۆیانیان ماندو ، وشەکەوت کرد لە چەتونی وسەر گەرمیاندا لەپێناوی بنیات نانی ئیمپراتوریەتدا: لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە دەولەتەکانی رۆژئاوای ئەوروپا لەپیشەسازیدا پێش دەکەوت ، ئەم دووانە بەدواکەوتویی مانەوە کۆنەپەرستی ، وکەنیسەزاڵ بوبو بەسەریاندا. ئەسپانیا بەسەر ناپلیون دا سەرکەوت کەچی لەو بیروباوەڕانەی کە شۆڕشی فەرەنسا بڵاوی کردبوە وەسودی وەرنەگرت ، لەکاتێکدا کە فەرەنسا خۆی لەدەرەبەگێتی رزگارکرد ، رژێمی خاوەندایەتی زەوی وزاری گۆڕی ، ئەسپانیا بەنیمچە دەرەبەگێتی مایەوە ، خانە دانەکان تیایدا زەوی ، وزارێکی فراوان وهەمو جۆرە جیاوازیەکی تایبەتیان هەبو. کەنیسەی کاثولیکی رومایی دەسەلاتێکی تەواوی بەسەر ئاین ، وزەوی‌وزار ، وبازرگانی ، وفێرکردندا (التعلیم) هەبو ، کەنیسە خاوەنی گەورەترین زەوی ، وزاربو ، وە بازرگانیشی بۆ خۆی بەجۆرێکی فراوان دەکرد ، هەروها دەسەلاتێکی تەواوی بەسەر فێرکردندا (التعلیم) هەبو.

ئەفسەرانی سوپا چینێکی تایبەتی بون ، جیاوازی خۆیانیان هەبو رازو ونیسبەتی ئەفسەران لەچاو سەربازاندا زۆر بو: یەك بۆ حەوت!

رۆشنبیران لەپێشکەوتنخوازو ، ئازادەکان پێک هاتبون هەروەها بزوتنەوەی تازە پێگەیشوی کرێکاران دابەش بوبون ، و بریتی بون لەنەفابیەکان ، وسۆشیالیستیەکان ، وئاژاوە کەران بەڵام دەسەلاتی راستەقینە بەدەست کەنیسە ، وسوپا ، وخانەدانەکانەوەبو ، وەبزوتنەوەیەکی بەهێزی جیابونەوە لە(کاتالونیا ، وباسك) لەسەرووی وڵاتەکەدا پەرپابو.

هەریەکە لە حوکومەتی ئەسپانیا ولەپورتەغال ئوتوکراتی ، ومەلیکی بون ، بەرلەمانێکی لاوازیان هەبو ، بەرلەمان لە ئەسپانیادا پێدەڵێن (کورتس) ، لە دوامین چوار یەکی سەدەی نۆزدەهەمدا حوکومەتێکی جمهوری بۆ ماوەیەکی کەم دامەزرا ودوای کۆتایی هاتنی ئەم ، مەلیك بە هەمو ئوتوکراتی یەکیەوە گەرایەوە ، لە ئەنجامی جەنگەکەی نێوان ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وئەسپانیا لە ساڵی ١٨٩٨ دا ئەسپانیا زۆربەی موستەعمەرەکانی خۆی لەکیس چو ، بەشێك نەبێت لە (مراکش) هیچی بۆنەمایەوە.

کەچی پورتەغال لە ئەفەریقادا گەلێك موستەعمەرەی هەبو جگە لە (کووا) کە لەهیندستاندا هەیەتی. لە ساڵی ١٩١٠ دا مەلیك لەسەر تەختی پورتەغال هێنرایە خوارەوە ، وئیعلانی جمهوریەت کرا ، لەو کاتەوە گەلێك شۆڕش رووی‌داوە ، هەبوە. هەوڵی داوە مەلیك بگەرێنەوە هەروها شۆڕشی چەپرەویش هەبوە ، کە هەوڵی داوە لە دیکتاتورەکان و حوکومەتە کۆنەپەرستەکان رزگاری بێت ، بەڵام حوکومەتی جمهوری بەردەوام بو هەرچەندە لەراستیدا ، وزۆرجار بەدەست سەرکردەی سوپاییەوە بوە. لە کاتی جەنگی (یەکەمی) جیهانیدا ، پورتەغال لایەنی هاوپەیمانەکانی گرت ، وە لە جەنگەکەدا بەفەرزداریەکی زۆرەوە رزگاری‌بو ، ئەوەندەی نەمابو جەنگەکە نابوتی بکات ، بەڵام حوکومەتەکەی ئێستای زۆر کۆنەپەرستە بەلای فاشیستیەکاندا دەچێت ، وە ئەم سیاسەتە فاشستیانەیەتی کە لە موستەعمەرەکانی ، و لە دەرەوەدا بەکاری دەهێنی. بۆ نمونە لە (کووا) دا هەمو بزوتنەوەو ، چالاکی‌یەکی گشتی کە هەیە نەی‌هێشت ، وە هەمو جۆرە سەربەستیەکانی لە خەلکەکەی ئەوی قەدەغە کرد.

کەچی ئەسپانیا لە کاتی جەنگە جیهانیەکەدا بەبێ لایەن مایەوە ، نەچوە پال هیچ لایەك ، لەمە گەلێك سودی وەرگرت ، چونکە شتومەك وتفاقی جەنگەبە هەر دو لاشەرکەرەکە دەفرۆشت پیشەسازی تیایدا گەشەیکرد وبڵاوبوەوە ، بەڵام هەر کە جەنگەکە کۆتایی هات تەنگوچەڵەمەیەکی ئابوری تیایدا رووىدا بێئیشی وپشیوی لەگەڵیدا پەرەیسەند. لە ساڵی ١٩٢١ دا شەڕوشۆڕ لەناوچەی (الريف)ی (مراكش) دا رووی دا. کەوا (الأمير عبدالكريم) بەسەر لەشکری ئەسپانیادا سەرکەوتنێکی باش سەرکەوت ، لەشکری فەرەنسا فریای کەوت ، ژمارەیەکی زۆریان هاتن وبەشێك لە (مراكش) یان بۆ ئەسپانیا رزگارکرد ، لەکاتی جەنگەکەی (مراكش)دا (بريمودی رفيرا) پەیدابو و لە ساڵی ١٩٢٣دا بو بەدیکتاتۆر ودەستورەکەی یەك خست ، شەش ساڵ حوکومرانی کرد ، بەڵام لەدواییدا سوپامتمانەی بێنەدەکرد ، ئیتر لە ساڵی ١٩٢٩ دا دوای تەنگانە یەکی پارەودارایی ناچار وازی هێنا ، بەدرێژایی ئەم ماوەیە مەلیك (الفونسو) لەولاتەکەدا بو ، پشتیوانی کۆنەپەرستەکان بو ، وەتەقەلای دەدا جێوشوێنی خۆی بچەسپێنی ، وەدەسەلاتی خۆی قایم کات.

میللەتی ئەسپانیا حەز بەتەنیایی دەکات لەبەر ئەمە دەبینین بەرە وتاقمە جۆربەجۆرەکانی لەناکۆکییەکی هەمیشەییدان ، هەر لەسەردەمی (باکونین)ەوە چینی مسکین (عوام) حەزی بەفەلسەفەی ئاژاوەکەری دەکرد ، نەقابەکانی کرێکارانیان بە دڵ نەبو ، کە ئەو ساڵە ئینگلتەرە ، وئەلمانیادا هەبو ، ئەم ئاژاوەکەرە ـ نەقابیانە رێکخراوێکی بەهێزیان لە (کاتالونیا) پێك هێنا ، لەوێ رێکخراونیکی پێشکەوتن خوازیان هەبو ، وەك هی دیموکراتیە ئازادەکان ، وسۆشیالیستی وشیوعیەکان کەوا لە زیادبوندا بون ، ئەم هەمو رێکخراوانە لایەنگری بیروڕای حوکومەتێکی جمهوری بون ، ئەو جەزرەبە وتەجروبەسەختانەی کە بەدەستی دیکتاتور (بريمودیرفيرا)وە چەشتبویان یەکێك بو لەو هۆیانەی کە یەك دڵیکردن وە وایلێکردن کە یارمەتی یەکتر بدەن لە حیزبێکی جمهوری خوازدا.

لەهەڵبژاردنی شارەوانیەکاندا جمهوری خوازەکان یەکەمین سەرکەوتنی

گەورەیان لە ساڵی ١٩٣١ دا دەست کەوت ، ئەمە بەتەنها بەس بـو بـۆ ترساندنی مەلیك (کەوا لە بنەچەی خێزانــی بـوربـون ، وهـابـبـرك) بۆگورج وڵاتەکەی بەجێهێشت ورایکرد ئنجا ئیعلانی جمهـوریـەت کـرا حوکومەتێکی وەختی دروست بو لە ١٤ نیسـانـی ١٩٣١ دا بـەم جـۆرە شۆرش بەئەنجامی خۆی گەیشت بێ خوێن رشتن.

شۆرشەکەی ئەسپانیا تارادەیەکی زۆر لە شۆرشەکەی روسیا دەچـێـت کە لە مارتی ١٩١٧ دا روویدا ، چونکـە رژێـمـی مـەلـیـکـی وەیـا پادشایەتی لە ئەسپانیادا کەنیبو ، وەکو لە رژێمی روسیای قەیسـەری دا ، بۆ یە روخا بێئەوەی کە دوژمنەکانی هیچ نەقەلایەکی وابـدەن ، لەحالەتی هەردولادا شۆرشەکە بریتیبو لەتەفەلادانێك بو فـەوتـانـدنـی دەرەبەگ وگۆرینی رژێمی خاوەندایەتی زەوی وزار لە حالەتی هەردوولادا لەلایەن فەلاحە هەژارەکانەوە تین هاتبو ، هەروها کەنیسە لەروسـیـادا دەسەلاتێکی فراوانی هەبو ، وەبارێکی گران بـو ، هـەمـان دەسـتـور ئەسپانیاش وهابو ، هەردوو شۆرشەکە ، بارو ، وەزعێکی ناهەموار ، ونا ئاسایشانەیان پێك هێنا ، هەرچینێك بەلای خـۆیـدا رایدەکـێـشـا گەلێك پشیوی روویدا ، کە هـەنـدێ جـار راسـت رەو (الـیـمـیـن) وەجارێکیتر چەپرەوە (الیسار) بەرپایان دەکرد ، ئەم بارەناهەموارو ، نا ئاسا یشیە لەورسیادا شۆرشی نۆفەمبەری دروست کرد ، کـەچـی لـە ئەسپانیادا تا ئێستاش ئەم بارو ، وەزعە نا ئاسایشیە هەربەردەوامە.

لەدەستوری ئەسپانیادا شتیسەیری تێدایە: دەستورەکە دەڵێـت یـەك ئەنحومەن دەبێت هەبێت ئەویش (کورتس)ە هەمو کەسێك مـافـی دەنـگ دان وهەڵبژاردنی هەیە ، سەرۆك بۆینییە کە ئیعلانی جەنگ بکـات ، دوای قایل بونی کۆمەڵی میللەتان نەبێت (عصبة الأمم) هەرچی رێکەوتن نامەیەکی نێودەولەتان هەیە کە لای کۆمەڵی میللەتان (عـصـبـة الأمـم) تۆمار دەکرێت وئەسپانیا پیێ قایلە بەجۆرێکی ئوتوماتێکی بەیاسایەکی ئەسپانیایی دەژمێررێت ، خۆ ئەگەر لەگەل یاساکانی کە لە ئەسپانیادا هەن بەرهەڵستی بکات وناکۆك بێت ، ئەوا ئەم یاسانە لادەبرێن.

حوکومەتە جمهویەتە نوێ کە بەحوکومەتێکی دیمکراتی ، چەپـرەوی مام ناوەندی ئاودەبرا کە شێوەیەکی سوشیالیستیانەی هـەیـە ، سـەرۆك

وەزیڕان وحوکوم فەرمای ڕاستەقینە (مانویل أزانا)بو حوکومەت دەبو بەرەنگاری گەلێك کیشەی قورس ببوایە: زەویوزار ، وکەنیسە ، وسوپا.. (کورتس) بو ئەم هەمو کاروبارانە یاسای دانا هیچیان جێبەجێ نەکران بۆ نمونە: یاسا تازەکە ڕێی نەدەدا کەوا کەس لە ٢٥ فەدان وەیا ڕۆژە جوت زیاتر بەراوی هەبێت ، ئنجا ئەگەر خاوەنەکەی نەی کێڵێت و بەرهەمی نەهێنی ئەوا ئەم ٢٥ فەدانەی نادرێتی ، لەگەڵ ئەمەشدا سەرەرای ئەم یاسادانراوە کێلگە گەورەکان (الأقطاعیات) هەروەکو خۆی مایەوە ، جگە لەماڵ وموڵکی مەلیك و ، هەندێ لە خانەدانەکان کەوا لێیان زەوت کرا.

(کوررتس)ماڵ وموڵکی کەنیسەی خۆماڵی کرد (التأمیم) وەکردی بەموڵکی میللەت لەگەل ئەمەشدا ئەم یاسایە بە ئەنجام نەگەیشت ، جگە لە هەندێ سنور نەبێت کە دانرابو بو کەنیسە دەربارەی فێرکردن (التعلیم) ئیتر سەربەستی وئازادی کەنیسە دەستی بۆ درێژەکرا ، بەلام جیاوازیەکانی ئەفسەرانی سوپا لەغوکرا نەما ، زۆربەیان بەموچەکی زۆر کە نارگیر وتەفاعودکران.

لە ساڵی ١٩٣٢ دا ئاژاوە کەرەنەفابیەکان (کاتالونیا)دا چەند پشیوییەکیان ، بەرپاکرد ، هەروها راست رەوەکانیش (الیمنیون) ئەمانیش لە کۆتایی ئەو ساڵەدا چەند ئاژاوە یەکیتریان بەرپاکرد بەلام سەرنەکەوتن.

حوکومەتەکە هەر لە سەرەتای ساڵیەوە گەلێك کردەوەی باشی کرد بەتایبەتی لە کۆڕی فێرکردندا (التعلیم) هەروها دەستیکرد بە چاك کردنی کرێکارەکان وجێبەجێ کردنی کێشەی زەوی وزار. بەلام پێشکەوتن لە چاك کردنی رژێمی زەویوزاردا سست بو ، بەدڵی فەلاحەکان نەبو ، کۆنەپەرستەکان وخاوەن بەرژەوەندیەکان لەم کاتەدا خۆیان لە بو سەدابو چاوەروانی هەڵیان دەکرد کە حوکومەتە کە توش کەن کەوا بەهێمنی و لەسەرخۆ لەگەلیاندا نەدەجولایەوە.

تێبینی یەك (نۆفەمبەری ١٩٣٨):

ساڵی ١٩٣٣ ئەسپانیا کردبونەوەیەکی کۆنەپەرستانی دی ، بەمە حیزبە راست رەوەکان (الأحزاب الیمنیة) زۆربەی کورسیەکانیان وەرگرت

لە هەڵبژاردنەکەی کە لەو ساڵەدا کرابو. حوکومەتێکی کۆنەپەرست پێك هات ، چاککردنی کشتوکاڵی وەستاند ، وەهێزی کەنیسەی زیاد کـرد ، ئەم حوکومەتە وازی لەگەڵێك شت هێنا کە حوکومەتەکەی پێشو کردبوی ئەمە بو بە هۆی ئەوەی حیزبە چەپرەوەکانی کۆکردەوە (احزاب اليسار) وەکردنی بە یەك تاکو بەرهەڵستی ئەم کۆنەپەرستیتـیـە بـکـەن ، لـە ئۆکتۆ بەری ١٩٣٤ دا لە هەمولایەکی ئەسپانیادا پشیوی بەرپابو ، بەڵام حوکمەت توانی بیکوژێنێتـەوە ، بـەڵام هـێـزە چـەپـرەوەکـان لـە کردبونەوەیاندا بەردەوام بون ، بەرەیەکی میللەتیان دروست کرد کە لە مام وەندیەکان ، وسوشیالیستی ، وئاژاوە کەرەکان وشیوعیەکـان پـێـك هاتبو ئەم بەرەیە لە شوباتی ١٩٣٠ دا توانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنـی (کورتس)دا سەرکەوێت ، وە حوکومەتێکی نوێ دامەزرێنێـت ، هـەمـو کەسێك هەستی کرد کە ئەم حوکومەتە بەهەندی کردەوەی بە جەرگـانـە هەڵدەستێت لە پێناوی جێبەجێکردنی کێشەی زەویزار ، و لەگەڵ سنور دانانێك بو دەسەلاتی کەنیسە ، ولەگـەڵ خـاوەن بـەرژەوەنـدیـەکـانـدا توندوتیژ دەبێت نەك وەکو حوکومەتە مام ناوەندی یەکەی پێشو ، کـە بەنەرمی لەگەڵیاندا دەجولایەوە لەبەر ئەمە ناخۆشی وشەڕوشۆڕ پەیدابـو هێزە کۆنەپەرستەکان بریاریان دا دەستی خـۆیـان بـوەشـێـنـن. داوای یارمەتیان لە (موسولینی) وئەلمانیای نازیکرد ، ئەمان یارمەتیان دان.

لە یولیوی ١٩٣٦ دا شۆڕش دەستی پێکرد بەسەرکردایەتی (جنـرال فرانکو) لە (مراکش)ی ئەسپانیاوە بەیارمەتی سوپای (المغـرب) کـەوا بەڵێنی سەربەستی (مراکش)ی ئەسپانیایان پێدابـون بـەرامـبـەر بـەم یارمەتیە ، ئەفسەرانی سوپای ئەسپانیا زۆربەی سەربازەکانی لایەنگری (فرانکو) بون ولەریزی ئەمدابون ، ئنجا حوکومەتەکـەش کـەس نـەبـو بەرگری لێبکات ، وەبی پارێزێت ، حوکومتەکەش هانـا و ، پـەنـای بردە بەرمیللەت ، وەداوای لێکردن کەبجەنگیت بەهەرچی شتێك بێت ، تەنانەت بە هەر دوو دەستی ئەگەر هیـچـی دەسـت نـەکـەوت شـەری پێبکات. میللەتیش بەجۆرێکی چاك بەبیر داخوازیەکەی حوکـومـەتـەوە هات بەتایبەتی لە (مدرید) و (برشلنـە)دا بـەمـە حـوکـومـەتـەکـە

وجمهوریەتەکەیان رزگارکرد ، بەڵام (فرانکو) توانی پانتاییەکی فراوان لەئەسپانیا دا گیربکات.

لەوساکەوە جەنگ لە نێوانیاندا بەردەوامە ، (فرانکو) یارمەتیەکی زۆر لەئیتالیاو ئەلمانیا وەردەگرێت ، کەوا بە لە شکرێکی بێ شومار وفرۆکە ، فرواکەوان و تفاقی جەنگی باریوی دەگەن وەحوکومەتەکەش پێشمەرکە (المتطوع) لەدەرەوە دەهاتن و کۆمەکیان پێدەکرد ، وە لەهەمان کاتدا حوکومەت توانی سوپایەکی باش دروست کان ، بەڵام حوکومەتی ئینگلیز وفەرەنسە لەسەرسیاسەتی دەست نەخستنە کاروباری ناوەوە (عدم التدخل) دەرۆیشتن ئەمە لەراستیدا وادەگەیەنێت کە سیاسەتەکەیان بریتیە لەیارمەتی (فرانکو).

جەنگەکەی ئەسپانیا پر لەمەینەتیبو گەلێك کەس گوزران لەئەنجامی بۆ مبابارانی فرۆکەکانی ئیتالیا وئەلمانیادا ، کە خزمەتی (فرانکو)یان دەکرد ، وەمێژوو ئەمەی بەمەرکەبی شانازی بو دەنوسێت!! ئێستا (فرانکو) لە چواربەش سێبەشی ئەسپانیای بەدەستەوەیە بەڵام لە سنوری خۆیدا راوەستاوە سەبارەت بە هێز وئازایەتی حوکومەتەکە لەجێیخۆیدا راوەستێنرا ، ئەوی حوکومەتە کە پەرێشانە بۆی کەمێ خواردەمەنییە.

جەنگەکەی ئەسپانیا ناکۆکییەکی ناوخو زیاترە ، بریتییە لە خەباتی نێوان دیموکراتیەت ، و فاشستیەت ، سەرنج وهەستی هەمو کەسێکی بەلای خۆیدا راکێشاوە.

# سەرکەوتنی نازیتی لەئەڵمانیادا

## ٣١/یولیو/١٩٣٣

شۆڕشەکەی ئەسپانیا بەلای هەندێ کەسەوە کوتوپڕبو ، کاتی نەهاتبو ، بەڵام لە راستیدا وانەبو بەڵکو ئەنجامێکی سروشتیبو ، بو دابلکتیکی (منطق) رووداوەکان ، چاودێری کەران پێش بینی ئەمەیان کردبو ، چونکە سێ کوچکەکەی کە بریتیبون لە: مەلیك ، ودەرەبەگ ، وکەنیسە تەواو کۆن وپەرپوت بون ، زۆر کەنیبون ، کە هیچ دەسەڵات وتوانایەکیان نەبو بە هیچ جۆرێك لەگەل بارو ، زروفی نوێدا نەدەگونجان ، بۆیە لە بەرهەمێکی تەواو کەیو دەچون ، هەر کە دەستی بۆ بەرێت خێرا بکەوێتە خوارەوە. لە هیندستاندا پاشماوەی سەردەمێکی دەرەبەگایەتی کەوا کاتی بەسەرچوە ماوەتەوە ، وە گۆمانی تێدانیـیە کە خێرا دەفەوتی ، ئەگەر دەولەتێکی بێگانە پشتی نەگرێت.

بەڵام ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەئەلمانیادا روویان دا لە جۆرێکن بە تەواوەتی جیاواز. گومانی تێدانیـیە کە ئەوروپای هێنایە لەرزە ، لەرزینێکی بەتین وخەڵکی سەرسام کرد ، کەس باوەری نەدەکرد ، کە چۆن میللەتێکی رۆشنبیر وبەهەڵمەتی وەك میللەتی ئەلمان لەکردەوەی درندانەوە دەلکێت.

(هتلر) سەرکەوت ، ونازیتیش لەگەلیدا لەناو ئەلمانیادا سەرکەوت ، بەنازیەکانیان دەوت ، فاشستەکان ، لەراستیدا سەرکەوتنیان سەرکەوتنێك بو ، بو کۆنەپەرستی وەنوشوستیەك بو بۆ شۆرشی ئەلمانیای ساڵی ١٩١٨ وشۆڕشەکانی تری دوای ئەم. بەڵێ کچم: هەمو سەر بەفاشسەکان لە (هتلر) یتیدا دەیان بینیت ، کۆنەپەرستی توندوتیژی تێدا دەبینێت ، هەروها دوژمنایەتی هەمو کەسێکی مام ناوەندی وبەتایبەتی کارگەرانی تێدا دەبینێت لەگەل ئەمەشدا هەر کۆنەپەرستی رووتی نیـیە بەڵکو لە

کۆنەپەرستی زیاترە ، ئەم پشت بەهەستەکانی جەماوەر دەبەستێت زیاتر لە فاشستەکانی ئیتالیا ، وەخاوەنی ئەم هەستانە کرێکارەکان نەبون ، بەڵکو چینە ناوەراستە برسیەکەبو ، کە مولك ومالیان زەوت کرابو ، کەوا هەڵگەرابونەوەو ، بوبونە چینێکی شۆڕشگێر.

لەنامەیەکی پێشودا باسی فاشستیەتی ئیتالیام بۆ کردیت ، وەبوم روون کردیتەوە ئەم فاشستیتیە لەکاتێکدا پەیدابو کە دەولەتێکی سەرمایەداری توشی تەنگوچەلەمەیەکی ئابوریانە هات کە تەنگوچەلەمە کە بگۆڕێت وببێتە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی ، ئنجا چینە سەرمایەدارەکان ویستیان خۆیان بپارێزن بۆ ئەمە بزوتنەوەیەکی شەعبیان دروست کرد ، کە ناوەرۆکەکەی چینی مام ناوەندی هەژاربو ، ئیتر بو چاوبەست وگومراکردن دروشمی دژی سەرمایەداریان بەکاردەهێنا تاکو سەرنجی فەلاحەکان وکرێکارە نەشارەزاکان راکێشن ، ئنجا هەر کە سەرمایەدارەگان جڵەوی دەسەلاتیان لە دەولەتەکە دا گرتەدەست هەمو رێکخراوە دیموکراتیەکان هەڵدەوەشێنن ، وهەرچی رێکخراوی کارگەرانە هەیە ، دەیفەوتێنن . بەم جۆرە حوکومرانیان بەزۆرە ملی وزۆرداریەوەد بەند دەبێت ، لەپاشاندا هەندێ فەرمانیەرایەتی لە دەولەتە نوێکددا دەدەن بەلایەنگرانی چینی مام ناوەندی ، هەروها شتێك لە ئاراستەکردن (التوجیە) دەخەنە سەرپیشەسازیەکان.

هەروەکو چاوەروان دەکرا دەبینین ئەم کێشانە لەئەلمانیادا روویان دا ، بەڵام ئەوی چاوەروان نەدەکرا لەو لایەنگرتنە زۆرەدا ئەو ژمارە زۆرەی خەلکەبو کە لەگەل (هتلر)دا رۆیشتن ودوایکەوتن وچونە رێزەکانیەوە.

نازیتی کۆنەپەرست لە مارتی ١٩٣٣دا سەرکەوت بەڵام من تۆزێك دەگەرێمە دواوە تاکو نەختێك باسی مێژووی بزووتنەوەکەت بۆ بکەم ، وەچۆن دەستی پێکرد.

شۆڕشەکەی ئەلمانیا لە ساڵی ١٩١٨ دەدا ، زۆر دوربو لە شۆڕشەوە ، چونکە قەیسەر رۆیشت ، وئیعلانی جمهوریەت کرا ، بەڵام دام ودەزگای سیاسی وکۆمەڵایەتی وئابوری کە لەپێشدا هەبو نەگۆررا ، وەدیموکراتی وسوشیالیستەکان چەند ساڵێك دەسەلاتداربون بەسەر حوکومەتەکەدا ، ئەوی زۆر جێی ترس بو کۆنەپەرستە کۆنەکان وخاوەن بەرژەوەندیەکان بون ، لەبەر ئەمە هەمیشە ناچاردەبون کە لەگەلیاندا لەسەر چەند جێبەجێ

کردنێکی مام ناوەندیانە رێك کەون ، حیزبەکەیان زۆر بەهێزبو لە بەرێوەبردن ورێك وپێکیدا ، ملیونەها ئەندامی هەبو ، سەرەرای نەقابەکانی کرێکاران وگەلێکیتر ، بەلام سیاسەتەکەی هەمیشە خۆپاراستن بو بەرامبەر بە کۆنەپەرستەکان ، وەهێرش بردن بو بەرامبەر بەرەی توخ وخوێن گەرم (المتطرف) لەحیزبەکەیاندا ، هەروها بەرامبەر بەحیزبی شیوعی. کردەوەیان ئەوەندە خراپ بو تارادەیەك زۆر لەلایەنگرانیان لێیان تەکینەوە ، زۆر لە کرێکاران خۆیان لە حیزبەکەیان کێشایەوە ، و چونە ناو حیزبی شیوعیەوە ، کەوا زۆر بەهێزبوبو ، وەچەند ملیونێك ئەندامی هەبو ، بەلام لایەنگرانیان لەچینەکانی ناوەراست ، خۆیان کوتایەپال حیزبە کۆنەپەرستەکان ، وەناکۆکی لەنێوان حیزبی شیوعی ، وحیزبی دیموکراتی سوشیالیستدا بەردەوام بو ، تاکو هەردوکیان لاوازبون.

لە سالانی دوای جەنگەکەدا کە پارە لەئەلمانیادا زۆربو ، ئەمە تەنها لە بەرژەوەندی خاوەن مولك وزەوی وزارو ، خاوەن کارگەکان بو ، خاوەن مولك وزەوی ، وزارەکان لە قەرزدا نوقوم بوبون ، وە مولکەکانیان رەهن کرابو ، توانیان بەلام پارە زۆرە کە لەواقیعدا هیچ ناکات مولکەکانیان سەندەوە ، وەخاوەن کارگەکان کارگەکانیان چاك کردەوە ئنجا (تروست) یان پێك هێنا ، ئیتر کەل وپەلی ئەلمانی زۆر هەرزان بو ، کە بو بەهۆی ئەوەی کە لەهەمولایەکدا بازاری هەبێت ، ئیتر بێئیشی نەما ، چینی کرێکاران لەنەقابەکانی کرێکاراندا رێکخرابون سەرکەوتن لەپاراستنی رادەیەکی بەرزی کریدا سەرەرای هاتنە خوارەوەی نرخی (مارك). بەلام چینی ناوەراست لە هەمو چینێك زیاتر بەم پارەزوریە زەرەرمەندبو ، بەم بۆنەیەوە زۆر هەژاربو ، وە هەر ئەم چینەش بو کە لە سالانی ١٩٢٣ و ١٩٢٤ دا پشتیوانی (هتلر) بون. ئنجا کە تەنگوچەلەمە ئابوریەکە زیاتر بەتین بو ، لە ئەنجامی نابوت بونی بانقەکان ، وبلاوبونەوەی بێئیشیدا گەلێك کەس چونەپال (هتلر) لەبەر ئەمە (هتلر) بو بە ساوپەنایەك بۆ داخ لەدڵ وتورەبوەکان ، دیسانەوە ئەفسەرە کۆنەکانی سوپا چونەپالی چونکە سوپا ، بەپێی پەیماننامەی (فرسایل) بەرەلاو بای دوس لێکرابو هەزارەها ئەفسەر بێئیش بون ، وچوبونە ناو لەشکرە تایبەتیەکانەوە کە لەو کاتەدا پێدەگەیست ودروست دەبو وەکو "بەلی تیبی بروسکە" (فرقة

الصاعقة)ی نازی كە ناوی وابو وە(كلاو بولاین)ە نیشتمانیەكانەوە ، كە ئەمانە لە نەریت پەروەرەكان بون (المحافظین) ، حەزیان دەكرد قەیسەر بگەرێتەوە سەرتەخت.

ئەدولف هتلر كێیە؟ هەرچەندە ئەوی دەی لێم لەسەرەتاوە زۆرسەیرە بەڵام راستە ، (هتلر) هاونیشتمانییەكی ئەلمان نەبو ، تا دوای یەك دوو ساڵ كە بەسەر حوكومرانی كردنێدا تێپەری. ئەلمانی - نەمسایی‌بو ، لەسوپادا پلەیەكی‌نزم ، وروتبەیەكی بچوكی هەبو ، دژی جمهوریەتی ئەلمانیا هاوكاری لە شۆرشێكی سەرنەكەوتوداكرد ، حوكوم درا بەسەریدا ، وخرایە بەندیخانەوە. بەلام حوكومەكەی سوك كرا. ئنجا حیزبەكەبی كە پێی‌دەوترا : "حیزبی نیشتمانی سوشیالیست" دروست كرد بۆ بەرهەڵستی كردنی دیموكراتیە سوشیالیستەكان. وشەی (نازی) لەیەكەمین پیتی هەردوو وشە ئەلمانیەكەیەوە هاتوە كە "نیشتمانی سوشیالیستی" یە هەرچەندە حیزبە كە ناوی (سوشیالیستە) وئەم ناوەی پێوەیە ، بەڵام لەسوشیالیستیەوە زۆردورە ، (هتلر) ئەوسا وئێستاش بەدوژمنێكی سەرسەختی سوشیالیستی ناسراوە ، حیزبەكە سەلیبی جەماوەی كرد بەدروشمی خۆی ، ئەم دروشمە لە زۆركۆنەوە هەیە لەهەمو لایەكی جیهاندا ناسراوە. لەهیندستاندا نیشانەی گەورە وسەرردارەكانە. نازیەكان هێزێكی جەنگاوەریان پێك هێنا كە "بەڵی بروسكە" یەئەندامەكانی كراسی قاوەیی‌یان لەبەر دەكرد ، بۆیە گەلێك جار بەنازیەكانیان دەوت "كراس قاوەییەكان" هەروەك چۆن بەفاشستەكانی ئیتالیایان دەوت: "كراس رەشەكان".

بەرنامەی نازیەكان روون وئاشكرا وباش نەبو ، ئامانجی نیشتمان پەروەریەكی كویرانە و بەپیرۆز زانین وپەسندكردنی ئەلمانیا ومیللەتی ئەلمان بو. ئیتر ئەوی دەمایەوە بریتی‌بو لە كۆمەڵێك رق و كینە ؛ دژی پەیماننامەی (فرسایل) بو كە بەسوكایەتیەكی دادەنا بو ئەلمانیا ، بەمە گەلێك كەس چونە ریزی نازیەكانەوە ، دژی ماركسیە - شیوعیە - سوشیالیستەكان بۆ ، بەرهەڵستی نەقابەی كرێكاران ولەم بابەتانەیان دەكرد دوژمنی جولەكەبون ، جولەكەیان بەرەسەنێكی بێگانە دادەنا كەرەسەنی جەرمەنی (ئاری) خراپ وسوك دەكات ، بەجۆرێكی نەهێنی ونارەوان دژی

سەرمایەداریێتی‌بون بەڵام بەرهەڵستی کردنەکەیان بۆ سەرمایەداریتی ، تەنها جوێن دان بو بەچەوسینەرەوان ، ودەولەمەندەکان وهیچی‌تر. بەڵام ئەو تاکە لایەنەیان کە پەیوەندی بەسوشیالیستیەوە هەبو کە لە بەرنامەی نازبەکاندا هەبو گەرچی بە جۆرێکی کەمتەرخەمانەش بو ، بریتی‌بو لە چاودێری ئابوری ولات لەلایەن دەولەتەوە.

لەپشت ئەمانەوە هەووی فەلسەفە ، وبیرورای زۆرەملی وتوندوتیژی وهێز خۆی شاردبوەوە. نازیەکان هەر بەهاندان ، وستایشی زۆرەملی‌یەوە (العنف) نەوەستان بەلکو بەپیرۆزترین پێداویستی ئادەمیزادیان دادەنا. فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەلمانیا (اوسولدشبنکلر) ئەم بو ئەو فەلسەفەیەی شیتەڵ کردەوە ، ووەسفی ئادەمیزاد دەکات ودەڵێت کە ئادەمیزاد (درندەیە کە بۆ ڕاوکردنی نیچیر) ، دیسانەوە وتویەتی: (بیرورا بەرزەکان ئامانجی ترسنوکەکانن). و (ئەو درندانەی کە نێچیرەکانیان راودەکەن ودەگرن لەم جیهانەدا لە هەمو شتێکی‌تر پایە بەرزترن) ، باسی هەستی مرۆڤایەتی وحەز بە ئاسایش کردن دەکات ودەڵێت: (هەستێکی بی‌ددانە) ، باسی رق وکینەی دەکرد ، ودەی وت: کەوا "هەستێکی راستەقینەن لای درندەکان کە نێچیرەکانیان راودەگەن" دەیان وت: ئادەمیزاد دەبێت وەك شیروابێت ، نەهێڵێت هیج درندەیەکی کە لە ئەشکەوتەکەیدا بێت. پێویستە وەکو مانگای لاواز نەبێت کە لەناو کاکەڵێکی زۆردا دەژی ، لەگەل کاکەلەکە دادێت ودەچێت ، بەپێی ئارەزووی شوانەکە ، لەبەر ئەمە چاکتر پیشە بۆ ئادەمیزاد وئەوەی زیاتر دڵخۆشی دەکات دیارە جەنگە!"

(أوسولد شبنکلر) کە لە زانا بەناوبانگەکانی ئەم سەردەمەیە کتێبەکانی برن لە شتی‌وا کەوا دەتوانێت ئادەمیزاد فێری ببێت وکەڵکی لێوەرگرێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەنی زانیاریەکی فراوان بو ، ئەمە بەرە وئەوەی برد کە ئەم ئەنجامە ساماناك وناخوشانە ، وەدەست بێنێت وپێشکەشی‌کات. هەندێ لەوتەکانی دەهێنمەوە تاکو یارمەتیمان بدات لەتێگەیشتنی بیرورای (هتلر) یتیدا ، وەئەو زۆرەملی ودرندەیەتیەمان بوروون کاتەوەکەلە رژێمی نازیتیدا هەیە ، دیارە دەبێت وانەزانین کە هەمو نازی‌یەك بەم جۆرە بیردەکاتەوە ، بەڵام پێشەوایانی نازی ، ونازیە توخ وبەدەمارەکانیان بێگومان بەم جۆرە بیردەکەنەوە ، ودەبنە نمونە بۆ

ئەوانیتریان ، تا پەیرەویان بکەن ، رەنگە لەراستیە وەنزیك بێت ، کە نازیەکی عادەتی ، وساویلکە هەرگیز لەوانەنیە کە بیربکاتەوە ، بەلکو لە ئەنجامی کوێرەوەری تایبەتی خۆی رقی هەڵدەستا ، و توره وکرزدەبو ، لەو سوکایەتیەی کە توشی ولاتەکەی بوە لەکاتێکدا کە فەرەنسە ناوچەی (رور)ی داگیرکرد. (هتلر) وتارویژێکی بەتوانابو ، توانی یاریبە هەستی جەماوەربکات وەهەمو حەتاکە بخاتە ئەستوی مارکسیە جولەکەکان ، ئەگەر فەرەنسە ، ودەولەتەکانی تر لەگەل ئەلمانیادا کردەوەیەکی خراپیان بوبێت ، ئەمە خەلکی هان دەدات کە بچنە ناو حیزبی نازیەوە چونکە ئەم حیزبەیەکەوا شەرەفی ئەلمانیا دەپارێزیت. ئنجا ئەگەر باری ئابوری خراپ وتوشی تەنگانە بهاتایە ، ئەوا ئەمەش زۆرکەسی هان دەدا کە بچنە ریزەکانی حیزبەکەوە ، چونکە هەرئەمە کەوا تەنگانەکە لادەبات.

ئیتر خێرا حیزبی دیموکراتی سوشیالیست دەسەلاتی بەسەر حوکومەکەدا نەما ، حیزبێکی تردروست بۆ پیدەوترا: حیزبی کاثولیکی مام ناوەندی وحوکمرانی وەرگرت ، چونکە حیزبەکانیتر لەناو خۆیاندا بەبەربەرەکانی یەکتریەوە خەریك بون. لە رایخشتاغ (بەرلەمان) یشدا حیزبێك نەبو هێزی لەهێزی حیزبەکانیتر زیاتربێت ، لەبەر ئەمە گەلێك جار کە هەلبژاردن دەکرا ، دەسیسە ، وموئامەرە ، و موناوەرەی حیزبەکانیتر زیاد دەبون. ئنجا حیزبی دیموکراتی سوشیالیست زۆر ترسی لێنیشت لە زیادبونی هێزی حیزبی نازی ، ناچار بو پشتگیری "حیزبی مام ناوەندی" سەرمایەداری بکات ، وە (جنرال هندنبرغ) هەلبژیرن بۆ سەرۆکایەتی ، بەلام سەرەرای زیادبونی هێزی حیزبینازی ، کەچی هەردو حیزبەکەی کرێکاران کە حیزبی دیموکراتی سوشیالیست بو لەگەل حیزبی شیوعیدا زۆر بەهێزبون ، هەریەکەیان ملیونەها ئەندامی هەبو ، کەچی ئەم دووانە نەیان توانی تێکۆشانی خۆیان بکەن بەیەك بەرامبەر مەترسی نازێتی کە بۆ هەر دووکیان بو ، شیوعیەکان ئەو ئەشکنج و جەزرەبەیەیان لە بیربوکەوا حیزبی دیموکراتی سوشیالیست بەسەری هێنان هەر لە سالی ١٩١٨ دەوە ، تەنانەت دوای ئەو سالەش کە حیزبی دیموکراتی سوشیالیست حوکومرانی گرتە دەست: کەوا چۆن پشتگیری کۆنەپەرستەکانی دەکرد لەکاتی تەنگانەکەدا ، لەلایەکیترەوە حیزبی دیموکراتی سوشیالیست کە لە حیزبی

کرێکارانی بەریتانیا دەچێت ، دەسەلاتێکی گەورە ، وبەڕێوەبەرایەتی ، وسەرپەرشتی کردنێکی باشی هەیە نەیدەویست جۆشوێنی خۆی بحاتە مەترسییەوە ، وەهەرگیز نەی دەوێرا کارێك بکات کە پێچەوانەی یاساوەبێت بەلکو زۆربەی چالاکییەکانی خۆی تەرخان کردبو بۆ لەناوبردنی شیوعیەکان هەرچەندە هەردوو حیزبەکەش سەر بە مارکسی دادەنرێن.

بەم جۆرە ئەلمانیا بۆ بەسەر بازکەیەکی چەکدار کەوا هێزە جەنگاوەرکان تیادا چۆن یەك بون. گەلێك جار پشێوی روویدەدا ، زۆر جار نازیەکان بە تاوانی کوشتنی کرێکارە شیوعیەکان هەڵدەستان ، هەندێ جاریش کرێکارەکان تولەی خۆیانیان دەکردەوە. (هتلر) زۆر بەچاکی سەرکەوت لە هێشتنەوەی ئەم هەمو تەوژمانەدا (التیارات) بەدەست خۆیەوە سەرەرای ئەو هەمو ناکۆکیانەی کە تیایاندابو ، توانی چینە ناوەراستە هەژارەکە بکات بەهاوپەیمان لەگەل خاوەن کارگەکان وخاوەن زەوی وزارە گەورەکاندا ، وەئەو نەهێنیبەش (السّر) لەمەدا ئەوەبو کە خاوەن کارگەکان ، بشتی (هتلر)یان گرت وپارەیان دەدایە چونکە (هتلر) جنێوی بە سوشیالیست دەدا و گەورەترین کۆسپ بو لەرێبازی ماکسیەت و شیوعیتیدا ، بەلام چینە ناوەراستە هەژارەکە وخاوەن مولکەکان بۆیە لانگری (هتلر)یان دەکرد لەبەر ئەوەبو دورشمەکانی کە (هتلر)جاری بو دەدا دژی سەرمایەدارێتیبو کەوا بەئارەزو ، ووبەدلی ئەوان بو.

لە ٣٠ کانونی دووەمی ١٩٣٣ دا سەرۆك هندنبرغ (ئەوسا تەمەنی هەشتا وشەش ساڵ بو) (هتلر)ی کرد بەراوێژ بیکەری (المستشار)خۆی ئەمەش بەرزترین مەنسەبی بە ئەنجام گەیاندن (تنفیذي)بو لەئەلمانیادا ، وەکو مەنسەبی سەرەك وەزیران وایە ، نازیەکان ونیشتمان پەروەرەکان ماوەیەك هەوپەیمان بون بەلام لەدواییدا دەرکەوت کە نازیەکان بەتەنها خۆیان دەسەلاتیان بەسەر حوکومەتدا هەیە ، لەپاشانداهەڵبژاردنی گشتی بو رایخشتاغ کرا نازیەکان و نیشتمانیەکان بەزۆربەیەکی کەم نەبێت سەرنەکەتن. تەنانەت ئەگەر ئەم دوو حیزبە زۆربەیەکیکەمیشیان نەبوایە ، ئەمە کاری لەرێرەوی کاروباریان نەدەکرد ، بەتایبەتی دوای ئەوەی نازیەکان دوژمن ، ناوحەز ، وبەرهەڵست کەرانی خۆیانیان لەناو رایخ (بەرلەمان) داگرت لە بەندیخانەیان توندکردن ، لەناو ئەمانەدا هەمو

ئەندامە شیوعیەکان ، لەگەل زۆربەی ئەندامانی حـیـزبـی دیـمـوکـراتـی سوشیالیست ، لەم کاتەدا ئاگرێکی گەورە لەبینای رایخشـتـاغ بـەربـو ، وێرانی کرد نازیەکان شیوعیەکانیان لەم ئیشـەوا تـاوانـبـاراکـرد ، بـو تەگەرەدان لەکاروباری دەولەت ، وەبەسەر ئەوانـیـانـدا هـێـنـا ، بـەلام شیوعیەکان ئەم تو مەتەیان بەرپەرچ دایەوە ، ئنجا ئەمان پێـشـەوایـانـی نازیەکانیان بەدەسیەی ئەم ئاگر تێبەردانە تـاوانـبـار کـرد بـۆ ئـەوەی بیانویەك بدۆزنەوە ، وپەلاماریان بدەن.

ئیتر لەوساوە لەهەمولایەکی ئەلمانیادا سەردەمـی تـۆقـانـدن لـەلایـەن نازیەکانەوە دەستی پێکرد ، کە ناو دەبرایە (ترسی قاوەیـی). ئـنـجـا یەکەمین ئیشێك کە نازیەکان کردیان ئەوەبو بارلەمانیان هـەڵـوەشـانـدەوە (هەرچەندە خۆیان تیادا زۆربەبون) ئیتر (هتلر)و ، وەزیرەکـانـی هـەمـو دەسەلاتەکانیان لەئەلمانیادا داگیرکرد ، ئـنـجـا هـەربـاسـایـەك ، وەیـا هەرئیشێك بیان ویستایە دەیان توانی بیکەن ، دەستوریان پەك خـسـت ، هەمو جۆرە دیموکراتیەتیکیان فەوتاند ، ئەلمانـیـا بریتیبو لە چـەنـد جمهوریەتێك لە یەکێتـیـەکی فیدرالیدا ئەم یەکێتیەیان کۆتایی پێ هێنا ، هەمو دەسەڵاتەکانیان لە (برلین)دا کۆکـردەوە ، وەدیـکـتـاتـۆریـان بـۆ هەمولایەك داناوە هەر دیکباتوریکیش لـەمـانـە لێپرسراوبو بەرامبەر دیکباتۆرەکەی سەرووخوی ، ئیتر بەم جۆرە دیـارە (هـتـلـر) خـۆیـشـی دیکتاتورە بەرزەکەبو.

لەم کاتەدا (بەلی بروسکە) (الفرقـة الـصـاعـقـة)ی نـازیـەکـان لـە هەمولایەکی ئەلمانیادا بە گەورەترین هێرشی زۆرەملی (العنف) وتۆقـانـدن هەستا ئەم هێرشە بێوێنەبو ، گەلێك هێرشی تۆقاندن لەپێشـدا روویدابـو کە پێیان دەوت (ترسی سور) وەیا ترسی سپی بەلام ئەم هێرشانە ئـەو ولات وناوچانە پێیهەڵدەستا بۆ بەرگری لە خۆی کەبکەتایە جەنگەوە وەیـا لەناو جەرگەی شەرێکی ناو خۆدا بوایە ، بەلام نازیەکان هیچ مەترسـیـەك رووی تێنەکردبون.

چونکە دەسەلاتیان بەسەر حوکومەتەکەدا هەبو ، وە هیچ بەرهەڵستـیـەکـی چەکدارانەشیان ، بەرامبەر نەبو ، بۆیە ئەو هێرشە تۆقاندنەی کە کردیـان لە وروژاندن وترسیکەوە نەبو ، بەلکو لە ئەنجامی دەسیسەیەکی رێك وپێك

ولەبارو ، وزعێکی هێمنی دابو ، مەبەس لەمەش ئەودبو کد بد جۆرێـکـی درندانە ، کە بەعەقل دا نایەت ، تاکو هەمو ئەو کەسانـەی کـدلایـەنـی حیزبی نازی ناکرێت بیان فەوتێنن.

بەباشی نازانم لەم نامانەدا ئەو کارە ناهەموار وناشیرینانە بژمێرم کە نازیەکان کردویانە لەئەلمانیادا لەو کاتەوە کە حوکومراتیان وەرگرتوە ، وەتا ئێستاش هەر بەردەوامن تیایدا ، لەلێدانـێـکـی بـێ ئـەنـدازەوە ، ئازاردان وکوشتن بەجۆرێکی فراوان کەوا لەم کارانەدا ژن وپیاویـان لـێـك جیانە دەکردەوە ، گەلێك کەسیان خستە بەندیخانە وگرتوخانەکانەوە. وەزۆر خراپ لەگەلیاندا دەچولانەوە ، بەڵام توندوتیژترین هـێـرش ئـاراسـتـەی شیوعیەکان کرابو ، تۆزێك لەمان سوك تر ئاراستە ودژی دیـمـوکـراتـیـد سوشیالیستەکان کرابوەوە. بەلام لەهێرشەکـانـیـانـدا زیـاتـر دەسـتـیـان لەجولەکەکان دا دەگرت وەکەسیان لەم هێرشانە رزگاریان نەبو: نەکـەسـاس وبێلایەنیان*، نە مام ناوەندی ، ونەنەقـابـیـان ، نـەئـەوانـەیـان کـە بەناوبانگن لەناودەولەتاندا. نازیەکانی ئیعلانی جەنگیکی فراوانیـان کـرد بۆ فەوتان وریشەکیش کردنی مارکسیەت ومارکسیەکان ، وەهەمو ئەوانەی کە لەبەرەیەکی (جەبرەوان)دان هەروها بلاویان کردەوە کەدەبێت جولـەکـەکـان لەفەرمانبەرایەتی و کاردا نەمێنن ، لـەبـەر ئـەمـە هـەزارەهـا لـەزانـا وماموستایانی موسیقا ، وپارێزەر (المحامی) ، وحاکم وپزیشك نەخۆشەوانی ئافرەت (الممرضة) لەجولەکە ، ئەمانەیان هەمو دەکرد ، هەروها شتومەکیان لەدوکانداره جولەکەکان نەدەکری وموقاتەعـەیـان کـردن ، کـرێـکـارانـی جولەکەیان لەکارگەکاندا دەرکرد ، لەپاشاندا بەجۆرێکی ئاشکرا دەسـتـیـان کرد بەسوتاندنی کتێب بەتایبەتی ئەوەی کە خۆیان حـەزی پـێـنـاکـەن ، رێیان نەدەدا بە هیچ رۆژنامەیەك کە بلاوبکرێتەوە ئـەگـەر سـوکـتـریـن بەرهەڵستیان بکات ، وەیان رەخنە بگرێـت ، هـەروهـا رێـیـان نـەدا کـە هەوالەکانی و ، دەنگ وباسی هێرشە توقاندنەکە بلاوبکرێتەوە ، خۆ ئەگەر یەکێك بـیوێرایە ، وشتێکی دەربارەی بلاوبکردایەوە بەتوندی سزایان دەدا.

هەمو حیزب رێکخراوەکان فەوتێنران ، دیارە تەنها حیزبی نازی نەبێت حیزبی شیوعی لەپێشەوە فەوتێنران ، دوابەدوای ئەو حیزبی دیـمـوکـراتـی سوشیالیست ، ئنجا حیزبی کاثولیکی مام ناوەندی ، لەدواییـدا حـیـزبـی

نیشتمانی کەوا هاوپەیمانی حیزبی نازیبو. لەپاشاندا نەقابە مەزنەکانی کرێکاران ، کە وێنە ونمونەی کردار ، و خۆبەخت کردن ، کۆکردنەوەکانی چەند پشتێك بون ؛ نەقابەکان هەڵوەشێنران ، موڵك وماڵیان زەوت کرا ، نازیەکان نەیان ویست هیچ حیزبێك بمێنێتەوە ، مەگەر تەنها حیزبێك نەبێت لە ئەویش حیزبی نازیبو.

خەلکی ناچارکران کە بەفەلسەفە سەیرەکەی نازی قایل بن ، کەس نەیدەوێرا سەری بێزاری دەربرین بەرزکاتەوە ، هەمو شتێك شێوەی نازێتی گرت ، وەچوە چوار چیوەی نازێتیەوە ـ پەروەردە وفێرکردن ، شانۆ ، وفەن وزانیاریەکان ـ (هرمان کورنیك) کە یەکێکە لە پێشەوایانی ئەلمان وتی: "ئەلمانی وەیا جەرمەنیەکی راستەقینە بیر لەخوێنەکەی خۆی دەکاتەوە" وە پێشەوایەکی تری ئەلمان ووتی: "سەردەمی رەوان کۆیی (المنطق) ساغ وسەلیم وزانیاری بەتی تێپەری" منداڵانیان فێردەکرد کە "هتلر" (حەزرەتی عیسی)ی دووەمە ، بەلام لەیەکەمە گەورەترە ، حوکومەتی نازیەکان حەزیبە خوێندەواری وفێربون نەدەکرد لەناو خەلکدا بلاوبێتەوە بەتایبەتی لەناو ئافرەتدا ، بیرو رایان بەرامبەر بەئافرەت ئەوەبو کە جێگەی ئافرەت: ماڵ وچیشتخانەیە ، وەفەرمانیشی ، منداڵ بونە بۆ شەر وکوشتن لەپێناوی دەولەتدا. دوکتۆر جوزیف کوبلز کە یەکێکە لەپێشەوا نازیەکان ، و وەزیری رامیار ، وئاموژگاری نەتەوایەتیە (الأرث والقومي) وتی: "جێگەی ئافرەت ناوماڵە ، وەفەرمانی راستەقینەی ئەوەیە منداڵی ببێت بۆ ولات ومیللەتەکەی ، وەئازادبونی ئافرەت مەترسی هەیە بۆ دەولەت ، دەبێ ئافرەت وازبێنێت لەو ئیشانەی دەیکات ، تاکو پیاوبیکات" هەر ئەم دوکتۆر کوبلزەبو کە باسی شێوازی خۆی دەکات لەئاموژگاری نەتەوایەنیدا (الأرشاد القومي) ودەڵێت: "دەمەوێت رۆژنامەگەری بەهەمان ئاسانی ئاراستەبکەم وبەرم بەرێوە هەورەکو چۆن بیانو لیدەدەم".

بەلام لەناو ئەم درندەیەتی و ، ترسەدا هەزاری ، ونەبونی بەجۆرێکی ترسناك لە ناو چینە ناوەراسەکاندا خۆی مەلاس دابو ، لەواقعیدا ئەم درندەییە ، جەنگی پەیداکردنی نان و ، ئیش فرمان بو. پزیشك ، وپارێزەر ، و (المحامي) ومامۆستا و ، نەخۆشەوانی ئافرەت(الممرضة)

لەجولەکەکان دەرکران ، چونکە لەراستیدا ئەلمانە لائاریەکان نەیان دەتوانی بەربەرەکانیان بکەن دەیان ویست جێی ئەمان بگرنەوە لەو کاروفرمانانەدا ، دوکانی بازرگانی جولەکەکانیان داخست چونکە سەرکەوتوبون وزەحمەت بو بەربەرەکانیان بگرێت ، هەروها دوکانێکی زۆری تریش کەهی جولەکە نەبون ، داخران ، وەخاوەنەکانیان گیران بەبیانوی ئەوەی کە شتومەکیان بەنرخێکی نارەوا ، وگران فرۆشتوە ، بەڵام ئەو فەلاحانەی کە پشتی نازیەکانیان دەگرت چونکە بەتەمای کێڵەکە گەورەکان بون کە لە رۆژ هەڵاتی (بروسیا)دا بۆ داگیری کەن ولەناو خۆیاندا دابەشی کەن.

ئەوی بەرنامە ئەسلیەکەی نازیەکان دایناب‌و ، دانانی سنورێك بو بۆ موچەو مەعاش بە جۆرێك کە ساڵانە لە ١٢٠٠٠ مارکی ئەلمانی زیاتر نەبێت (ئەمیش دەکاتە (٨٠٠) جونەیهی ئیسترلینی) نازانم ئەمە بەئەنجام گەیشت یانەء ، بەڵام ئەوەندە دەزانم موچەی ساڵانەی راوێژپێکراوی (المستشار) ئێستا (٢٦٠٠٠) مارکە ، هەروها پێشنیارکرا کە موچە ومەعاشی بەرێوەبەرانی کۆمپانیەکانی کە حوکومەت یارمەتیان دەدات لە (١٨٠٠٠) مارك کەمتر نەبێت ، ئنجا گەلێك جار مەعاش وموچە لەم بارانە زۆرتربوە کچم بەراوردێکی ئەم ژمارانە بکە لەگەڵ ئەو موچەو مەعاشانەدا کە هیندستانی هەژاردەی دات بەفەرمانبەرانی خۆی حیزبی کۆنگرەکە (المؤتمر) لەم رووەوە پێسنباری کرد لە کۆبونەوەیەکدا کە لە (کراجی) کرد بوی ، کە موچە ومەعاش مانگی‌بە (٥٠٠) روپی‌دابنرێت واتە نزیکەی (٥٠ جونەیهی ئیسترلینی).

کچم وانەزانی کە بزوننەوەی نازێتی تەنها پشت بەدرندەیەتی وترس دەبەستێت گەرچی ئەم دوانەش پشتیوانێکی بەهێزن ، بەڵکو لەناو ئەلمانەکاندا بەپەرۆشی وخوێن گەرمیەکی تەواو بەرامبەر بە(هتلر) هەبو ، جکە لەژمارەیەکی زۆری کرێکاران نەبێت ئەگەر رێنمایی بەئەنجامی هەڵبژاردەنەکانی ئەم دواییە بکەن دەبینین لە ٥٢٪ دانیشتوان لایەنگریانن ئەمە مانای وایە کە ئەم لە ٥٢٪ وە ئەوانی‌تر کە لە ٤٨٪تە دەیان تۆقێنن ودەیان ترسێنن. (هتلر) لەناو لایەنگرانیدا ناوبانگێکی باشی هەیە ، هەر کەسێك بچێت بۆ ئەلمانیا باسی ئەوبارو ، وەزعە دەرونیە دەکات کە

ئەلمانەکان تیایدا دەژین ، بەجورێك لەبەدەماری وتەعـەصوبی شـایـنـی دادەنێن. ئەلمانەکان هەست دەکەن ئەو سوکایەتییەی کە توشیان بوبـو لـە (فرسایل)دا شورایەوە ، وەئیتر دەتوانن بەئازادی هەناسەبدەن.

بەڵام نیوەکەی تری ئەلمان هەستێکی تریان هەیە ؛ چینی کرێکاران رق وتورەیی باڵی بەسەردا کێشاون ، لەترسی تولـە ، وجـەزرەبـەی تـونـدی نازیەکان ئەم هەستەیان شاردوتەوە ، کرێکارەکان هەمویان مل کەچ بون بـو هێز وتوقاندن ، غەمباری ، وەرسی هەمویانی کرتەوە ، چونکە دەبـیـنـن ئەوی پێکیان هێناوە بەتێکۆشان و ، لەخۆبوردنیان وێران وکاول بـو ، لـە هەمو شتێك سەیرتر ، کە لەماوەی ئەم چەند مانگـەی رابـوردوودا رووی‌دا لەئەلمانیادا روخانی حیزبی دیموکراتی سوشیالیست بو ، روخانێکی تـەواو بێ‌ئەوەی هیچ بەرگرییەك بکات ، هەرچەندە گەورەترین وکون ورێك وپێـك ترین حیزبی چینی کرێکاران بو لەئـەوروپـادا ، وشـادەمـاری کـۆنـگـرە دەولەتیەکەی لەمەر حیزبەکانی کرێکارانبو ، بەڵام روخا ومـل کـەچ کـرا بێ‌ئەوەی کە هیچ بێزاری یەك دەربرێت ، گەرچی بێزاری دەبرینیش هیـچ سودێکی نەدەبو ، بەشێنەیی پێشەوا دیموکراتیە سوشیالیستەکان ، بەسـوك ورسوایی مل کەچی نازیەکان بون ، بەئومێدی ئەوەی کە بەم‌ مـل کـەچـی وگرنۆش کردنەیان هەندی دەسکەوتیان بێتەدەست. بەڵام ئەم مل کەچی‌یەیان چەکێك بۆ بەدەست نازیەکانەوە ، وبەکاریان هێنا ، بەکرێکـارەکـانـیـان رادەگەیاند کە چۆن پێشەواکانیان کزی‌یان لێ‌کردن هەر کەئۆشی مـەتـرسـی هاتن. مێژووی تێکۆشانی دورودرێژی چینی گەلێك سەرکەوتن ونوشـوسـتـی تێدایە ، بەڵام هەرگیز رووی نەداوە کە بەبێ بەرگری بەرهەڵستی کردن بەم جۆرە فێڵ لەکرێکاران بکریت ، وەوازیان لێ‌بهێنرێت هەروەکو لەئەلمانـیـادا رووی‌دا. بەڵام حیزبی شیوعی هەوڵی دا کە بەرگری و بەرهەڵستی بکـات ، داوای مان گرتنێکی گشتی‌کرد بەڵام دیموکراتیە سوشیالیستەکان پـشـتـیـان نەگرتن ومان گرتنە کە سەرنەکەوت ، هەرچەندە بزوتنەوەی کرێکاران فەوتا بەڵام ـ وەکو دەردەکەوێت ـ لەژێرەوە ، لەرێکخراوی گشتیدا لەکاردایە ، رۆژنامەی نهێنی بلاودەکاتەوە ، بەصەد هەزارانی لێ‌بـلاودەکـریـتـەوە ، سەرەرای تورەکانی جاسوسیەتی نازیەکان. هەروها هەندێ لەپێشـەوایـانـی حیزبی دیموکراتی سوشیالیست توانیان بگەنە دەرەوەی ئەلمانیا، بـەچـەنـد جۆرێکی نهێنی دەستیان کرد بەهێرشێکی پروپاغەندە.

چینی کرێکاران له هەمو چینەکانیتر ، زیاتر بەر هێرشی توقاندنی نازیەکان کەوتن ، کرداری بەدو ، خراپ کە دەربارەی جولەکەکان دەکرا رایگشتی جیهانی شلەقاند ، ئەوروپا راهاتبو بەبینینی چەوساندنەوە ، و جەزرەبەی چینێك له چینێکیتر ، هەستی خەلکی بەڵای ئەو چینەدا دەچو ، کە خۆیان لەون ، بەڵام جەزرەبەدانی جولەکە لەسەر بنچینەیەکی رەگەزپەرستیبو (العنصرية) لەوە دەچو کە لە چەرخەکانی ناوەراستدا لەولاتە دواکەوتوە کانی وەکو روسیای قەیسەری رووی دەدا ، ئەم تیسرەوان وجەزرەبەدانە ، ئەوروپاو ئەمەریکای بەتوندی شلەقاند ، ئەوی ئەم شلەقاندنەی خراپ تر کرد ئەوە بولەوجولەکانەی کەوا جەزرەبە دەدران لەپیاوە بەناوبانگەکان بون لە هەمو جیهاندا ، وەکو زانا ، وپزیشك ، وپارێزەر ، موسیقار ونوسەرەکان بون لەسەروو هەمویانەوە (البرت انشتاين) ئەمانە ئەلمانیایان بەنیشتمانی خۆیان دەزانی ، هەروها خەلکیتریش وایان دەزانی ، جیهان لەپێشوازی کردنیاندا پێش برکێ یان دەکرد بەڵام نازیەکان ـ لەم شێتگیر بونەیاندا ـ دەستیان کرد بەگرتنیان ئەمە بو بەهۆی وروژانی رایگشتی ، لەمەسەیرتر نازیەکان بڵاویان کردەوە کە بازرگانی کای جولەکەکان موقاتەعە بکرێت وکەس نەچێت بەلایدا وەلە هەمان کاتدا رێیان نەدان کە لەئەلمانیا بچنە دەرەوە ، تاکە ئەنجامی ئەمەش برسی کردنی جولەکەکان بو ، رایگشتی جیهانی ، کاری لەنازیەکان کرد ، وای لێکردن کە لەتوندوتیژیان کەم کەنەوە ، بەڵام سیاسەتی چەوساندنەوە ، وجەزرەبە وتێسرەوان لەلایەن نازیەکانەوە هەروەك خۆیمایەوە .

جولەکەکانی نێوجیهان کەوا لەهەمولایەکدا بڵاوبوبونەوە کە ئەمەیان دی بێدەنگ نەبون ، بڵاویان کردەوە کە شتومەکی ئەلمانیا نەکررێت وموقاتەعە بکرێت بەتایبەتی ئەم جولەکانە لەناو مەڵبەندەکانی پارە ، وئابوریدا دەسەلاتێکی بەهێزیان هەبو ، ئنجا جولەکایەتی نێوجیهان ، لەکۆبونەوەیەکدا کە لە مایسی ١٩٣٣ دا کە لەنیۆیۆرك بەستیان بریاریان دا : "هەمو شتومەك وکەرەسە ومەوادەکان ، وهەمو بەرهەمەکان کە دروست دەکرین وەیان بەرهەم دێت ، وەیان چاك دەکرێن لەئەلمانیادا ئەمانە موقاتەعە بکەن وەبەلایدا نەچن ونەیکرن ، وەهەروها موقاتەعەی هەمو

دەزگای گواستنەوە کەهی ئەلمانیایەوە هاوینە هەوار ، وهەواری زستانە ، وخەستەخانەکانی ئەلمانیا بکەن وبەلایدا نەچن بەکورتی بەرهەڵستی هەمو کردارێك یکەن کە لەوانەبێت یارمەتی ئەم سەردەمەی ئێستای ئەلمانیا بدات".

ئەم بریارە بەرپەرچی کردەوەکانی (هتلر) بو. مەسەلەکە بەمەوە نەوەستا بەڵکو بەرپەرچ دانەوەیەکیتریش پەیدابو: نازیەکان هێرشیان بردە سەرپەیماننامەی (فرسایل) وە داوایان کرد کە دەستکاری بکەن ، وراستیکەنەوە ، بەتایبەتی ئەوەیانی کە پەیوەندی هەیە بەسنوری رۆژهەلاتەوە چونکە پەیماننامەکە دەڵێت: کە رێبازێك بو پۆلندە لە (دانزیخ) دا کە لە خاکی ئەلمانیادایە دروست بکرێت ، هەروها داوای یەکسانی تەواویان دەکرد لەچەکداربوندا. (بێگومان لەبیرتە بەپێی پەیماننامەی ئاسایش (معاهدة الصلح) چەکیان لەئەلمانیا قەدەغە کرد). وتارە ئاگرینەکانی (هتلر) و هەرەشە وگورەشەی بۆ چەکدار کردنەوەی ئەلمانیا ، بو بە هۆی ترساندنی ئەوروپا بەتایبەتی فەرەنسا کەوا زۆر دەترسا لەزیادبونی هێزی ئەلمانیا لەئەنجامی ئەم ترسەدا دەولەتەکانی ئەوروپا خۆیان کۆکردەوە ، فەرەنسا دەستیکرد بەخۆ ، خۆشەویست کردن لای یەکێتی سۆڤیت ، دیسانەوە ئەو ولاتانەی کەوا لەپەیماننامەی (فرسایل) سودمەندبون وەکو: پولندە ، جیکوسلۆفاکیا ، یوغوسلافیا ، ورومانیا دەستیان کرد بە نزیك بونەوە لەیەکتری ، وە هەمویان دەیان ویست خۆیان لای روسیا خۆشەویست کەن. بارو ، وەزعێکی سەیر لەنەمسادا رووی‌دا ، راوێژ پێکراوێکی (المستشار) فاشستی کەناوی (دولفوس) بو ، پەیدابو ، زاڵ بو بەسەر حوکومەتەکەدا. بەڵام فاشستیەتەکەی جیاوازبو لە فاشستیەتەکەی هتلر ، (دولفوس) دەستی کردبە ، بەربەرەکانی وبەرهەڵستی کردنی ئەو کەسانەی کە نازین لەنەمسادا ، سەرەرای ئەوەی کە بەهێزبون بەڵام ئیتالیا پێشوازی سەرکەوتنی هتلری کرد ، گەرچی چاوچنۆکی وتەماعەکەیی پێخوش نەبو ئنجا لەناو ئینگلتەرەدا میللەت بەزەیی وهەستی بەلای ئەلمانەکاندابو ، بەلام دزیان وەستایەوە ، وباسی دەکردن و لەگەل (هو ن)[1] ، کاندا بەراوردیان دەکردن ، لەبەر ئەمە ئەلمانیا لەدەولەتەکانیتری ئەوروپا دورکەوتەوە. ئاشکرایە فەرەنسەی

پرچەك دەیتوانی ئەلمانیای بنچەك بفەوتێنی بەئاسانی ، بۆیە (هتلر) شێوازەکەی خۆیی گۆڕی ، وەدەستیکرد بەباس کردنی ئاشتی ، (موسولینی) فریای کەوت بەوەی کەپێشنیاریکرد ، کە هاوپەیمانییەکی چوارقولی لەفەرەنسە ، ئینگلتەرە ، وئەلمانیا وئیتالیا پێك بێت.

ئەم پەیمانە لە یونیوی ١٩٣٣ دا ، دوای تۆزێك دوودڵی لەلایەن فەرەنسەوە ئنجا ئیمزاکرا ، پەیمانەکە هیچی وایتێدا نەبو کە زیانی هەبێت! لەواقیعدا هەرچیەکی لەو پەیمانەدا هەبو بریتیبو لەوەی کە چوار دەولەتەکە لە هەندێ کاروباری نیودەولەتاندا لەناوخویاندا .راوێژ بکەن بەتایبەتی لەوکارو بارانەدا کە پەیوەندی بەدەستکاری ، وراست کردنەوەی پەیماننامەی (فرسایل) ەوە هەیە ، زۆرکەس وایان دەزانی کە: مەبەس لەبەستنی ئەم پەیمانە دروست کردنی بەرەیەکی یەکگرتوی دژی سۆڤیتە ، دیسانەوە وادەردەکەوێت کە فەرەنسا دوای دوودڵییەك ئنجا ئیمزای کرد ، سۆڤیتیش بو بەرپەرج دانەوەی ئەمە پەیمانێکی دەست درێژی نەکردن ، لەنێوان خۆیان دراوسێکانیاندا لە (لندن) لە ١ یولیوی ١٩٣٣ دا بەست . ئەوی شایانی باسە .فەرەنسە ڕەزامەندی ، وهەستی خۆیی بەرامبەر پەیمانەکەی یەکێتی سۆڤیت دەربری.

بنەرەتی بەرنامەکەی (هتلر) ـ کە بەرنامەی سەرمایەدارێتی ئەلمانیابو ـ ئەوەبو کە ببێتە هێزێکی ئەستور بەرامبەر یەکێتی سۆڤیت ، خۆ ئەگەر ئەلمانیا بیەوێت پەرەبسێنی وفراوان بێت بەراستی دەبێت لە رۆژهەلاتی ئەوروپادا ولەسەر حیسابی یەکێتی سۆڤیت بێت ، ئنجا تاکو بتوانێت ئەمەبکات ، دەبێت خۆی چەکدارکاتەوە ، بۆیە پێویستە پەیماننامەی (فرسایل) بەلایکەمەوە لەم رووەوە دەبێت ئەم پەیماننامەیە ، دەستکاری وراست کرێتەوە ، تاکو مسۆگەربیت کە دەست ناخرێتە کاروبارییەوە. (هتلر) پشتی بەیارمەتدانی ئیتالیا بەستبو ، وای دەزانی کە ئەگەر ئینگلتەرە بەمە قایل کات ئەوسا فەرەنسە دوورە بەرێز دەبێت ، وەقایل بونی ئاسانە لە هەر گفت وگۆیەکی چوارقولیدا.

ئنجا بۆ ئەوەی ئینگلتەرە پشتیوانی (هتلر) بکات ، ئەم بە ئاشکرا دەریبری ، وازهێنان لە ئیستیعمارکردنی هیندستان لەلایەن ئینگلتەرەوە ، مەینەتیەکی گەورەیە ، ئیتر دوژمنایەتی کردنی سۆڤیت لەلایەن هتلرەوە ،

ئەمە بەتەنها بەس بو ، بۆ ئەوەی حوکومەتی ئینگلتەرە بۆ لای خۆی راکێشێت چونکە ئیستیعماری ئینگلیزی ـ وەکو لەپێشدا پێم وتیت ـ رقبی لەکەس نەبو ئەوەندەی رقی لەیەکێتی سۆڤیت بو ، بەلام میللەتی ئینگلیز هێرشە توقاندنەکان لەلایەن نازیەکانەوە ، سلەماندییەوە ، لەبەر ئەمە پێویستی بەماوەیەك هەبو تاکو هەرپێشیاریك کە بو قایل بون بەبیروڕای نازێتی و (هتلر) ێتی دەکرێت تێی بکات.

بەم پێیە ئەلمانیا بو بە بنکەی وەی شومە لە ئەورووپا دا تاکو ، کوێرەوەریەکانی ئەم جیهانە زیاترکات ، لەناو خودی ئەلمانیادا چی روودەدات؟ ئایا رژێمی نازی تیایدا تەمەنی درێژ دەبێت؟ لەراستیدا نازیەکان لەناو ئەلمانیادا خۆشەویست نین و زۆر بەیان دزین ، بەلام لەگەل ئەمەشدا نازیەکان توانیان هەمو بەرهەلستیەکی رێك وپێکی دژی خۆیان ببلیشیننەوە هیچ حیزبێك وەیا رێکخراوێکی تریان نەهێشت لەحیزبەکەیان بەولاوە وا دەردەکەوێت کە حیزبی نازیش لەناوخۆیاندا دووبەرەن: بەرەی راست رەو (الجناح الأيمن) کە لە سەرمایەدارەکان و خاوەن فرمانە گەورەکان پێك هاتبو ، وەبەرەی چەپرەو (الجناح الأيسر) بریتی بون لە زۆربەی ئەندامانی حیزبەکەوە بەشێکی زۆر لە کرێکاران کە چوبونە ناویانەوە. بەلام ئەو ئەندامانەی کە پەبوبەی شۆرشگێری و کودەتایی (انقلابیة) حیزبەکەیان رەنگ کرد بۆ ئەوانە بون کەناحەزی سەرمایەدارێتی بون ، بەتایبەتی سوشیالیستی و مارکسیەکان کە لە حیزبەکەدا وەرگیرابون ، ئیتر لەنێوان بەرەی راست رەو ، و بەرەی چەپرەو ، و دا هیچ پەیوەندیکیان بەیەکەوە نەبو ، وە سەرکەوتنی (هتلر)یش لەوەدابو ، کە توانی ئەم دووبەرەیە بکات بە کژیەکدا ، چونکە مەترسیەکی ناوکۆیی ، و هاوبەش هەبو هەردەبو ئەمە رووی بدایە ، ئنجا کە دوژمنی هەردولا بلیشانەوە ، و هیچ بەرگرییەکی نەما ، بێگومان رۆزانبازی لەنێویاندا بەرپا دەبێت.

هەر لە ئێستاوە حەریکە گوێمان لەچپە چپ دەبێت ، بەرەی چەپرەو دەلێن: لەبەر ئەوەی شۆرشی یەکەم سەرکەوت تەواو بو ، وە بەجێی خۆی گەیشت ، پێویستە دەست "بەشۆرشی دووەم" بکریت کەبریتیە لە فەوتاندنی سەرمایەدارێتی و دەرەبەگایەتی بەلام (هتلر) هەرەشەی لە "شۆرشی دووەم" کرد بەفەوتاندنی بێ بەزەیی. بەم جۆرە (هتلر) چوە

پاڵ بەرەی راستی رەوی سەرمایەداری ، لەبەر ئەوەی کە زۆربەی لایەنگرانی ئەم بەرەیە جێگەی گرنکیان هەبو ، بۆیە هیچ کامێکیان حەزیان بە هیچ گۆڕانێك نەدەکرد.

باسەکانم دەربارەی رژێمی (هتلر) باسێکی درێژە. کچم بێگومان لەگەڵمدایت کەسەرکەوتنی نازیێتی ، وە ئەو کاروبارانەی کە بەمەوەبەندن لەگەڵ ئامانجەکانیدا گەلیك کار لەئەوروپا ، و جیهان دەکەن بەتەواوی ، وە ئەنجامەکانی ماوە دوورن گومانی تێدانییە نازیێتی جورێکە لە فاشستێتی ، وە (هتلر) بەراستی نوێنەری فاشستێتی بو ، بەڵام بزوتنەوەی نازیێتی لەفا شتێتی ئیتالیا فراوانترە ، واتە گەلێك کەسی مام ناوەندی تێدایە لە فاشستیتی ئیتالیا زیاتر ، بەڵام لەنازیتیدا ئەم مام ناوەندیانە دەتوانن لەپاشەرۆژدا کار لەحیزبەکە بکەن ، وەیان وەکو ئەوانی تر دەبلیشینەوە؟

بزوتنەوەی نازێتی خراپەی بەبیروڕای مارکیسەت گەیاند ، چونکە مارکیسەکان لەو باوەرەدان کە چینی شۆڕشگێڕی راستەقینە چینی کرێکارانە ئنجا هەر چەندە باری ئابوری خراپ ببێت ، ئەوەندە ئەم چینە کەسانی داخ لە دڵ و هەژار لە چینی ناوەراست لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە ، تاکو دەبێتە هێزێکی ئەستور ، ئیتر ئەمە شۆڕش بەرپا دەکات. کەچی ئەوی لە ئەلمانیادا قەوما زۆر جیاواز نرە لەمە ، کە: تەنگانەکە پەیدایو کرێکارەکان زۆر لەشۆڕشگیریيەوە دور بون ، بۆیە چینێکی شۆرشگێڕی تازە کورە لەکەسانی رق هەلساو ، و داغ لەدڵ و ، هەژار لە چینی ناوەراستەوە بەیدابو ، ئەمە هەرگیز لەگەڵ بیروباوەری مارکسیەتدا ناگونجێت. بەڵام مارکسیەکانی تر دەڵێن: نابێت تەماشای مارکسیەت بکەن هەوەکو بیرورایەکی وشك ، وەیا ئاینێك ، وەیان بیرو باودرێك کە بەجۆرێکی ببرای ببر راستە نەمرە کە روون دەکاتەوە، هەروەکو لە ئاینەکاندا هەیە بەڵکو مارکسیەت فەلسەفەیە کە بو مێژوو ، وە شێوازێکیشە بۆ لیکۆڵینەوە وە شیتەل کردنەوەی مێژوو ، ئنجا مێژوو ، دەبێتە شتێکی راست و دروستی بەزنجیرە دیسانەوە مارکسیەت رێبارێکە بۆ گەیشتن بە سوشیالیستی وەیان یەکسانی ، و چۆن یەکی کۆمەلایەتی ، ئنجا بیرو باوەرەکانی بەگەلێك چەش بە ئەنجام دەگەیەنرێت و جێبەجێ دەکرێت ، تاکو لەگەڵ

حالەتی گۆڕراوی وڵاتە جۆر بە جۆرەکاندا ، لەکات و ، وەختی جیاوازدا پێکەوە بەجوت شان بە شانی یەکتری برون.

تێبینی‌یەك (نوفەمبەرَی ١٩٣٨)

لەو کاتەوە پێش پێنج ساڵ و سێ مانگ ئەم نامەیەم بۆ نوسیویت هیچ کارەساتێك رووی نەداوە ئەوەندەی پەرەسەندنی هێزی ئەلمانیای نازی بوبێت ، وەیا وەکو زیاد بونی کاریگەری نازیێتی بێت لە سایەی (هتلر)دا. (هتلر) ئەمرۆ زاڵە بەسەر ئەوروپادا ، دەولەتە گەورەکان ودیان ئەو دەولەتانەی گەورە بون ، ئەمرۆ کرنۆشی بو دەبەن ، وە ئەندامیان لە هەرەشەکانی هاتۆتە لەرزین ، ئەلمانیا پێش بیست ساڵ لەمەوبەر بەزیو ، ولارەمل بو بەڵام ئەمرۆ هتلر ــ دەولەتێکی سەرکەوتوی بەهێزی لێ دروست کرد هەروەها پەیماننامەی (فرسایل) مردار بوەوە ، و نێژرا ــ بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکی سوپایی دەست کەوێت ، وەیان جەنگێك بکات.

لە کاتێکدا کە (هتلر) لە ئەلمانیادا بو بە حوکوم فەرما ، ئەوی زۆر هتلری خەریك کردبو ئەوە بو ناحەزانی خۆی لەناو ئەلمانیادا تەفرو توناکات وە حیزبی نازی بەهێزکات ، ئنجا دوای ئەوەی کە ئەلمانیای بەبوبەی نازێتی رەنگ کرد بریاری دا کە خواستەکانی چەپرەوی لەریزەکانی حیزبی نازیدا بفەوتێنی کەوا بە هیوای بەرپاکردنی (شۆرشێکی دووەم) بون بو فەوتاندنی سەرمایەدارێتی. ئیتر رێکخراوی کراس قاوەییەکانی هەلوەشاندەوە لە ٣٠ یونیوی ١٩٣٤ داپێشەواکانی کوشتن ، هەروەها گەلێکی تریشی کوشت لەوانە (جنرال شلیشر) کە رۆژێك لەرۆژان راوێژ پێکراوێك (المستشار) بو.

سەرۆك هندنبرغ لەئابی ١٩٣٤ دا مرد هتلر جێی ئەویشی گرت بەمە سەرۆکایەتی و راوێژ پێکراوی لەدەستی خوێدا کۆکردەوە ، ئێستا هەرچی هێزەکان هەیە بەدەست خۆیەوە یە ، بە (فوهرر) وەیا سەرکردەی میللەتی ئەلمانی ناوی دەبەن ؛ کوێرەوەری لەناو دانیشتواندا پەرەی سەند ، خێر و سواڵ بەجۆرێکی فراوان کۆ دەکرایەوە بۆ سوك کردنی ئەم کوێرەوەریە. هەروەها سەربازگەی ئیش کردنی بەزۆر دروست کرا ، کرێکارە بێئیشەکان دەنێرران بۆ ئەوی ، ئەلمانەکان جێی گەلێك لە جولەکەکانیان گرتەوە کە لەئیشەکانیان دەرکرابون ، بەڵام باری ئابوری لە ئەلمانیا چاکتر نەبو ،

بەڵكو زۆر خراپتر بو ، بەڵام بێئیش نەما. لەم كاتەدا ئەڵمانیا بەدزی‌یەوە خۆی پرچەك دەكردەوە ، ئەمە مەترسی لە دەولەتەكانی تردا پەیدا كرد.

لە ساڵی ١٩٣٥ دا لێپرسینێك (استفتاء) لەدولی (سار) دا كرا خەلكەكە نێكرا چونە پاڵ ئەلمانیایان هەڵبژارد ، هەر لەمایسی ئەو ساڵەدا ئەو بەندە تایبەتیانەی لە پەیماننامەی (فرسایل) دابو دەربارەی بێچەكی ئەلمانیا ، بە جۆرێكی ئاشكرا (هتلر) لای برد ، هەروەها جاری‌دا بو خزمەت كردنی سەربازی بەزۆر لەپاشاندا دەستی‌كرد بە جێبەجێ كردنی گەورەترین پرۆژەی چەكداركردن ، كۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) بەرامبەر بەم كردەوانە هیچی نەكرد. ئەندامانی ئەم كۆمەلە ترسیان لێنیشت بەتایبەتی فەرەنسە لەبەر ئەمە لەگەڵ یەكێتی سۆڤیتدا كەوتە گفتوگۆ بۆ بەستنی پەیماننامەیەك لەنێوان هەردوكیاندا. بەڵام حوكومەتی بەریتانیا چونە پاڵ ئەلمانیای نازی پەسند كرد پەیماننامەیەكی دەریایی لە یونیوی ساڵی ١٩٣٥دا لەگەلدا بەست.

ئەنجامەكانی ئەمە سەیر بون: فەرەنسە هەستی كرد كە ئینگلتەرە وازی لێدێنی ، دەستی كرد بە نزیك بونەوە لە ئیتالیا ، ئەمیش وای‌زانی كە هەلی بۆ هەڵكەوتوە ، پەلاماری حەبەشە (اثیوبیا)ی دا.

لە مارتی ١٩٣٨ تدا هتلر نەمسای داگیر كرد ، لەگەل ئەلمانیادا كردنی بەیەك ئەمجارەش دیسانەوە كۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم) فزەی نەكرد ، ئنجا نازیەكان لەنەمسادا هێرشێكی توندو تیژی توقاندنیان دەست پێكرد.

ئنجا جیكوسلوفاكیا بو بەنیشانكەی دووەمی دەست درێژی نازیەكان كە چاوەروان دەكرا. كێشەی ئەلمانەكانی (سودیت) چەند مانگێك ئەوروپای خەریك كرد. بەراستی سیاسەتی ئینگلیزەكان زۆر یارمەتی نازیەكانی دا ، فەرەنسەش نەیوێرا بەرهەڵستی ئەم سیاسەتە بكات ، لەدواییدا فەرەنسە هەستی كرد مەترسی جەنگ لە ئەلمانیاوە دێت ، ئەگەر بەردەوام بێت لە هاوپەیمانێتی لەگەل جیكوسلوفاكیادا ، لەبەر ئەمە فەرەنسە وازی لەم هێنا هەروها ئینگلتدرەش وازی لێهێنا ، بەم جۆرە چارەنوسی جیكوسلوفاكیا لە (میونیخ)دا لە ٢٩ سەبتەمبەری ١٩٣٨ دا بریار درا لەنێوان ئەلمانیا ، و

ئینگلتەرە ، و فەرەنسە ، و ئیتالیادا ، ناوچەی (سودیت) چوە پال ئەلمانیا ، ئنجا پولندە ، و مجرا ، ئەمەیان بەھەڵ زانی ھەریەکەیان پارچەیەکی لە جیکوسلوفاکیا دابڕی.

بەم جەشنە سەر لەنوێ دەست کرابەوە بە دابەش کردنی ئەوروپا ، ئینگلتەرە ، و فەرەنسە ھەردوکیان لە دەولەتە گەورەکان بون ، چونە پلەی دووەم ، وە ئەلمانیای نازی لە سایەی (ھتلر) دا چوە ڕیزی پێشەوە.

---

(١) ھون:ـ لە میللەتەکانی ئاسیا بون کە لە سیبریاوە ، وەیا لەناوەراستی قارەکەوە (منغولیا)وە ھاتون لە روباری (فولکا) و (دون)ەوە بەرینەوە ، گەلێك میللەتی تری نیمچە سرك و دریان پێش خۆیان دا ، تا گەیشتنە قەراغەکانی روباری دانوب سالی (٤٠٥) زاینی پەلاماری ئیمپراتۆریەتی رومایان داو تالانیان کرد ، ھەندێکیان تیایدا مانەوە تێکەلاوی میللەتەکانی تر بون.

وەرگێڕی کوردی

# تەقەلادانی (روزفلت) بۆ چارەسەرو رزگارکردنی بارو ، وەزعەکە

## ٤/ئابی/١٩٣٣

کچم دەمەویت چاوێکی تر بە ولآتە یەکگرتودکانی ئەمەریکادا بگێڕێت پێش ئەوەی ئەم چیرۆکە کۆتایی پێ بێنم (وە کۆتایی پێهێنا نیشی نابێت زۆردوا بکەوێت) لەم ولآتەدا تەجروبە ، و تاقی کردنەودیەکی سەرسام هێنەر لەکاردایە ئێستا ، جیهان زۆر بەپەرۆشدوە چاودروانیێنی چونکە چارەنوسی خودی سەرمایەداری بە ئەنجامەکانی ئەم تەجروبەیەدود بەندە. ئەمەریکا لە هەمو دەولەتەکانی جیهان زیاتر پێشکەوتوترو دەولەمەندتر ، وە هەمویشیان لەپێشترە لە زانستییە پیشەسازیەکاندا: قەرزداری کەس نییە ، مەگەر هی هاونیشتمانیەکانی خۆی نەبێت ، ئەوی دەی نێریتە دەرەوە پەیتا پەیتا لەپەرەسەندندایە ، گەرچی لەچاو بازرگانیەکەی ناوخۆیدا کەمە کە لە ١٥٪ ئەو بازرگانییەیە ، پانتاییەکەی نزیك پانتایی ئەوروپایە ، بەلآم جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ئەوروپادا هەیە. ئەوروپا دابەش بوە بە چەند ولآتێکی جیاواز جیاوازەوە ، هەریەکەیان سنور و گومرکی تایبەتی خۆیی هەیە ، بەلآم ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکایەك ددولەتن. هیچ کۆسپێکی بازرگانی کردنی تێدا نییە ، لەبەر ئەمە پێشکەوتنی ناوخو لەناویدا زۆر ئاسان ترە ، تا لەپەرەسەندن ، و پێشکەوتنی ئەم بازرگانیید لە ئەوروپادا ، بەم جۆرە ئەمەریکا چەند چاکە و جیاوازیەکی هەیە کە لەئەوروپای گرانبار لەقەرزداریدا ، نییە ، سەرەرای ئەمە لەئەمەریکادا میقدارێکی بێشوماری زێرو پارە ، و کەل وپەل هەیە..

لەگەڵ ئەم هەموەشدا تەنگوچەڵەی سەرمایەداری باڵی بەسەردا کێشاو قورتمی گرت. ئینر ئەو خەلکەی کە چالاکی ، و زیندەگیان لێدەباری ، وایان لێهات بروایان بەفەزاو قەدەر دەکرد ، کچم هەرگیز بەبیرت دا

ندیـەت کەولاتەکە هەزاربو. نەء هەر بەدەوڵەمەندی مایەوە بـەلام سـامـان لەچەند شوێنێکی کەمدا کۆبوبوەوە ، بەملیونەها سامان لەنیوێوڕکنادا هەبو خاوەن پارەو دارایی مەزن (چ بیربونت مورکان) ، لە گەشـتە رەنگینەکـەی خۆیدا کە دەڵێن شەش ملیون جونەیهی تێچوە ، لـەگـەشـتـەکـانـی خـۆی نەدەکەوت ، لەگەل ئەمەشدا تا ئەم نزیکانەش بەنیوێوركـا یـان دەوت: (شاری برسێتی). بەلام شارەوانیەکانی شارەکانی تر وەکـو (شـیـکـاغـو) لەوانە بو نابوت ببێت. نەی توانی موچە ، و مەعـاشـی بـەهـەزاران لـە فەرمانبەرەکانی بدات لەگەل ئەمەشدا هەر ئەم (شیکـاغـو)یـە ئـەمـسـاڵ پیشانگایەکی دەولەتانی مەزنی پێك هێنا پێیان دەوت: "صـەدەی پێشکەوتن".

ئەم شتە سەیرانە ، هەر لە ئەمەریکادا بەتەنها رووی نەدەدا بۆ نمونە لە (لندن)دا کێ سامانی لێ دەرژێت ، خۆش گوزەرانـی ، و دەسـت بـلاوی لەناو چینە دەوڵەمەندەکانی بەریتانیادا لەهەمو لایەکدا هەیە ، مەگەر هەر لەناو زنجەکانی هەژارەکاندا نەبێت. ئەگەر بۆ رێکەوت بچیتە لانکشیـر ، وەیان سەروو ، وەیان ناوەراستی ئینگلتەرە ، وەیان بەشێك لەبەشەکـانـی ویلز ، وەیان ئیسکوتلاندە ، کچم ئەوسا گەلێك رێزی درێژ لە بێئیشـان ، و چروچاو دەبینێت کە کوێرەوەری شەکدتی کردوە لەگەل ئەمەشدا گەلـێـك باری ناگوزەرانی ، پڕ مەینەتی دەبینێت.

لەئەنجامەکانی تەنگانەکەی ئەمڕۆی ئەمەریکا تەشەنەکردنی تاوان بو ، بەتایبەتی بەهۆی (جەردەکانەوە) ئەوانەی کەوا پشتیوانی تاوانبارەکـانـی هەڵیان دەسورێنن ، و ئیشیان لەناو دادەکـەن هـەر کـەسـێـك دەسـتـیـان بینێتەبەر دەی کوژن ، دەڵێن: تاوان کـردن لـەو کـاتـەوە کـە یـاسـای قەدەغەکردنی مـەی (الـخـمـور) دانـراوە زیـادی کـردوە ئـەم یـاسـای (قـەدەغـەکردنـە) دوای جەنگـە جیهانیـەکـەدا دانـرا لەبـەر چـەنـد هـۆیـەك یـەکێـك لـەو هۆیـانـە: خـاوەن کـارگـەگـەوردەکـان دەیـانـویـست کـرێکـارەکـانیـان لـەمـەی خـواردنـەوە دور خـەنـەوە تـاکو زۆر بـە چاکی ئیش بکەن ، بەلام دەولەمەندەکان خۆیـان گـوێـیـان نەدایـە ئەم یـاسەیە ، هەمیشـە مەیـان دەست دەکـەوت ، و لـە

ددرودوه بەرێبازێکی نادروست دا (غیر مشروع) دەستیان دەکەوت ، ئیتر وردە وردە ئەم بازرگانیە پەرەی سەند ، کە بریتی بو لە هێنانی مەی (الخمور) لەدەرەوە بە قاچاغی ، وە لەناوەوەدا بە نەهێنی دروستیان دەکردوەوە ، دیارە ئەوەی بە نەهێنی دروست بکرێت گەلێك خراپترە لەوەی کە بە ئاشکرا دەهێنرێت ، وە زۆر زیانیش بە لەش و تەندروستی دەگەیەنێت ، ئەو جێگایانەی کە مەی‌یان تێدا دەفرۆشت پێیان دەووت: "بە هێمنی بدوێ" ، بە هەزاران لەم شوێنانە لەهەمو شارە گەورەکاندا بڵاوبوبوەوە ، هەرکەسێك دەیتوانی جێ ئارەروو بکات بەنرخێکی گران بێگرێت ،دیارە ئەمە بەجۆرێکی نا دروست و بەپێچەوانەی یاساوە بو ، ئنجا تاکو خاوەنی ئەم مەیخانانە بتوانن لەئیشەکانیاندا بەردەوام بن بەرتیلیان بە پۆلیس وپیاوە سیاسیەکان دەدا. ئەگەربەرتیل دان سودی نەبوایە بۆ جێبەجێ کردنەمەبەسەکەیان ، ئنجا هەرەشەیان دەکرد ، ئەم گوێ نەدان بەیاسایە (جەردەکانی) هێنایەکابەوە ودروستی‌کردن. بەم چەشنە دەبینین (قەدەغە)کردنەکە لەلایەکەوە کەڵکی بۆ کرێکارو فەلاحەکان هەبو وە لەلایەکی تریشدود گەلێك زیانی گەیاند وەکو بڵاوبونەوەی بازرگانی نادروست (التجارة المحرفة) ولاتەکە بو بو بەدووبەرە بەرەیەکیان داوای قەدەغەکردنی مەی‌یان دەکرد ، پێیان دەوتن "وشکەکان ئەوی تریان داوای دەکرد مەی ئازاد کرێت ورێی بدرێت ، پێان دەوتن "تەرەکان".

نەنگ و ناشیرین ترین کردەوە کە ئەم جەردانەدەیان کرد ، ئەوەبو کە منداڵی خیزانە دەوڵەمەندە کانیان دەفراند ، وەلای خۆیان بەبارمتەگلیان دەدایەوە ، لەم ماوە کورتەی دواییدا کوڕی (لندنبرغ)یان فراند وەبە جۆرێکی ناشیرین بەگوزراوی دۆزیانەوە کە هەستی جیهانی تێکرا چوڵاند.

سەرەرای ئەم هەمو شتانەنەنگوچەلەمە ئابوریەکە دێت لەگەڵ بەدیەو ، نا نەواوی کاربەدەستە گەورەکان وە خاوەن ئیش و فرمانەکاندا پێکەوە میللەتی ئەمەریکایان تەواو پەرێشان کردبو. لەبەر ئەمە زۆربەیان لە هەڵبژاردنەکەی نوفەمبەری ۱۹۳۲دا ددنگیان بو (روزفلت)دا بە ئومێدی ئەوەی کە بتوانێت ئازاریانسوك کات. (روزفلت) لە (تەرەکان) بو ، وە لەگەورەو دەرکەوتودکانی حیزبی دیموکراتیش بو ، کە چەند جارێکی زۆر کەم نەبێت نەبوە بە سەرۆکی جمهوریەتەکە.

سەیرە لەنێوان دوو وڵاتی جیاوازدا بەراورد بکەن ،وە با پەخ و جیاوازیەکانی هەریەکەیان کە هەیانە ، بەگرنگی بزانین و بیخەینە پێش چاو ، بۆیە دەم ببنیت بەراوردی کارەساتە تازە کیەکانی ، ناو ولاتە یەکگرتوەکانی دەکەم لەگەل کارەساتەکانی کە لەئەلمانیاو ئینگلتەرەدا روویان داوە ، بەراوردکردن لەگەل ئەلمانیادا نزیکمە چونکە لەهەردوو وڵاتەکەدا رازەو نیسبەتێکی زۆر لەفەلاح هەیە ، سەرەرای پێشکەوتوویيان لەپیشەسازیدا ، فەلاح لە ئەلمانیادا لە ٢٥٪ هەمو دا نیشتوانە لە ولاتە یەککگرتوەکاندا لە ٤٠٪ جلە ، فەلاحەکان لە لە نەخشەکێشان ، و دانانی سیاسەتی دەولەتەکەدا گرنگی ، بەلام بەسەر ئینگلتەرە ، و لەویدا ناکونجێت و دروست نیيە ، فەلاحەکان خۆیان خراونەتە پشت گوێ ، هەرچەندە ئێستا هەندی تەقەلا دە دریت لە پێناوی چاککردنی بارو وەزعیان دا.

لەو هۆیانەی کەوا بزوتنەوەی نازێتی لەناو ئەلمانیادا لەسەر بنیات نرا زیاد بونی کەسانی هەژار بو لە چینی ناوەراستدا لەدوای پارەودارایيە زۆر بونەکەتیایدا. ئەو زیاد بونە خێراو پەیتا پەیتا لە زۆر بۆندا بو ، ئەو چینە بو لەناو ئەلمانیادا دەستی دایە شۆرش ، وە هەر هەمان چینە لەناو ئەمەریکاشدا دەستی کردەوە بە پەرەسەندن ، کە پێیان دەڵێن: (پرۆلیتاریای بەخەسبی) تاکو لەپرۆلیتاریای کرێکاران جیا بکرێنەوە کە بە دەگمەن یەخەی سپیان هەیە.

دیسانەوە چەند لایەنێکی تر هەیە بۆ بەراوردکردن وەکو کێشەی سکەو پارە ، وە جیابونەوەی مارك و جونەیهی ئیسترلینی و دولار لەپەیرەوی زێر وە پارە زۆری و نابوت بونی بانقەکان ، بانقەکان لە ئینگلتەرەدا نابوت نەبون چونکە بانقی بچکۆلەی تێدا نیيە ، بەڵکو هەندێ لە بانقە گەورەکان سەرپەرشتی بانقەکان تێکرا دەکەن ، ئیتر جگە لەمان هەمو کارەساتەکان لە هەر یەکێك لەم سێ ولاتانەدا لەیەك دەچن. ئەگەر تەنگانە باڵی بەسەر ئەلمانیا داکێشا لەپێشەوە ، ئنجا ئینگلتەرە دەکرێتەوە ، لە پاشاندا ولاتە یەککگرتوەکانیش ، دیسانەوە هەمان چین لە هەر یەکێك لەم ولاتانەدا پشتیوانی حوکومەتی نازی بو لە ئەلمانیادا ، وە پشتیوانی حوکومەتە نەتەوایەتیەکەی لەمەر هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٣١ بون

لەبەریتانیادا ، هەروەها پشتیوانی سەرۆك (روزفلت) بون لە هەڵبژاردنەکانی نوفەمبەری ساڵی ۱۹۳۲ لەئەمەریکادا ، ئەم چینەش هەژارەکانی چینی ناوەراست بون کەوا گەلێکیان ئەندام بون لە حیزبە جۆر بەجۆرەکاندا دەبێت زۆر لەسەر ئەم بەراوردکردنە نەروین ، لەبەر جیاوازی نەتەوایەتی ، بەڵام سەبارەت بەوەی کە بارو ، وەزعەکان لەناو ئینگلتەرە ، و ئەمەریکادا نەگۆررا وەکو لە ئەلمانیادا گۆررا. گەرچی ئەوی گرنگە ، هۆ ئابوریە کاریگەرەکانن کە لە یەك دەچن لەم وڵاتە پێشکەوتوانەدا لەرووی پیشەسازییەوە ، بۆیە گومانی تێدا نییە کە ئەنجامەکانیش لەیەك دەچن ، تا هەمان سنور ئەمە بۆ فەرەنسە ، و وڵاتەکانی‌تر ناگونجێت چونکە فەرەنسە هێشتا وڵاتێکی بەکشتوکاڵە ، و پیشەسازیەکەی کەمتر پێشکەوتوە.

کە سەرەك (روزفلت) لەسەردتای ساڵی ۱۹۳۳دا چوە جێگەکەی خۆی و دەستی کرد بە فەرمان رەوایی توشی کێشەیەکی مەزنی پارەو دارایی هات سەرەرای نەهاتی ، و بێ بازارییەکی زۆر کە ئەوسا هەبو. ئنجا دوای چەند هەفتەیەك کە حوکومرانی وەرگرت ، باسی بارو ، وەزعی وڵاتەکە دەکات و دەڵێت ـ وردە وردە دەمرێت.

(روزفلت) دەستی کرد بەکردو کوشیکی خێراو بنەبر ، داوای لە کۆنگرس کرد کە دەسەڵاتێکی فراوانی بداتی بۆ ئەوەی لەگەڵ بانقەکان ، و کارگەو کێلگەکاندا بەکاری بهێنێت ، کۆنگرس رازی بو ئەو دەسەلاتانەی بداتی ، دوای ئەوەی ئەم کێشەو تەنگانەیە خەو ، و خۆراکی لێهەڵگرتبو وە بینی کەوا روزفلت لەناو چەو مەڵبەندی میللەتدا چەندە لایەنگری هەیە بەمە (روزفلت) وەکو دیکتاتوری لێهات ، خەڵکی ملی بۆ قوت دەکردەوە داوای کردارێکی خێرای لێدەکرد کە لە مەینەتیەکی راستەقینە رزگاری کات ، وە (روزفلت) ئیسپانی کرد کە خەلکەکە لەم دا بە هەڵە نەچون ، زۆر بەجوست وچالاکی و دەست وبرد کەوتە کار لەماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا توانی هەمو ولاتە یەککگرتوەکان بشلەقینی بەهۆی گەلێك جۆری چالاکییەوە کە پێی هەڵدەستاو دەیکرد لەو بریارانەی کە روزفلت دەیدا ئەمانەن:ـ

١ـ وازهێنان له پەیرەوی زێڕ ، نرخی دولار هاته خوارەوه بەمه باری شانی قەرزدارەکان سوك بو.
٢ـ بەپارەو ماڵ باربوی فەلاحەکان کرا ، بۆ ئەم مەبەسە داوای فەرزێکی یەك هەزار ملیون دولاری کرد.
٣ـ گەلێك فرمانی تازەی دروست کرد هەر له ناشتنی درەختی دارستانەوه ، تاکو له ناوبردنی لافاوه ، بەمه ٢٥٠٫٠٠٠ کرێکار کەوتنه ئیشەوه ، وەله توندو تیژی بێئیشی سوك کرد.
٤ـ سەرۆك (روزفلت) داوای ٨٠٠ ملیون دۆلاری لەکۆنگرس کرد بۆ یارمەتدانی کرێکارە ، بێئیشەکان. کۆنگرەس داخوازیەکەیی سەڵماندو موافەقەتی لەسەر کرد.
٥ـ سی هەزار ملیون دولاری تەرخان کرد بۆ ئیش و فرمانی گشتی له پێناوی ئەوەدا که کرێکارەکان بکەونه ئیش.
٦ـ (قەدەغەکردن) و نەهێنان ، وەیا دروست کردنی مەیی (الخمور) گورج لابرد.

ئەم هەمو پارە زۆرانەی له دەولەمەندە قورسەکان قەرز دەکرا ، چونکە سیاسەتی روزفلت لەسەر زیادکردنی توانای شت کرین لەلایەن میللەتەوه بنیات نرابو ، چونکه ئەگەر میللەت پارەی هەبێت دەتوانێت شتومەك بکرێت بەمە بێ باراری له بازرگانیدا کەم دەبێتەوه ، له پێناوی ئەم مەبەسەدا گەلێك پرۆژەی دروست کردنی کردەوه تاکو کرێکارەکانی بخاتە ئیشەوه ، و پارەیان دەست کەوێت. هەروها بەم بۆنەیەوه هەوڵیدا کرێی کرێکارەکان زیادکات ، وه سەعاتی ئیش کردنیش کەم کاتەوه چونکە ئەم کەم کردنەوەیە مانای دۆزینەوەی ئیشه بۆ کرێکارە تازەکان.

ئەم سیاسەتە بەتەواوەتی ، بە پێچەوانەی سیاسەتی خاوەن ئیش و فرمانەکانەوه بو ، له کاتی تەنگوچەڵەمە ، و بێ بازاریەکەدا ، چونکە ئەمانە هەوڵیان دەدا که سەعاتی ئیش کردن زیادکەن وه کرێی کرێکارەکان کەم کەنەوه ، تاکو ئەرك و مەسرەفی بەرهەم هێنانی شتومەك کەم کەنەوه. بەڵام (روزفلت) لەگەڵ ئەو بیروڕایەدا بو کە دەڵێت: ئەگەر بمانەوێت دەست بە بەرهەم هێنانی کەل وپەل بکەینەوه بەکۆمەل و بەزۆری (بالجملة) دەبێت توانا بدرێت بەجەماوەر تاکو ئەو کەل وپەلانە بکرێت

لەبەر ئەوە دەبێت کرێیەکی باشیان بدرێتی.
لەپاشا حوکومەتی (روزفلت) قەرزێکیدا بە یەکێتی سۆڤیت تاکو لۆکەی ئەمەریکای پێبکرێت ، ئێستا هەردوو حوکومەتەکە باسی تواناای فراوان کردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەکەن لەناوخۆیاندا.
ئەمەریکا تا ئەم کاتەش دەولەتێکی سەرمایەداری ، خاوەن رژێمێکی بە بەربەرەکانی بێ سنورە ، سیاسەتی روزفلت بە پێچەوانەی ئەم رژێمەوە بو چونکە بەگەلێك رێباز دەست دەخاتە هەمو ئیشەکانەوە ، ئەمە مانای وایە کە دەوڵەت تا رادەیەکی زۆر تەقەلادەدات سەرپەرشتی پیشەسازی بکات گەرچی ئەمەش ئاشکرا ناکات ، ئەم سیاسەتە لەراستیدا جۆرێکە لە سوشیالیستی لەمەر دەولەت کە بەبیی ئەمە سەعات و مەرجی ئیش کردن سنوری بۆ دادەنرێت ، وە چاودێری پیشەسازی دەکرێت ، ئیتر بەربەرەکانی توندو تیژ ناهێڵێت ، ئەم سیاسەتە بەم جۆرە باسکراوە:
"هاوکاریە لەحشەکیشاندا ، وە مسۆگەرکردنی بەئەنجام گەیاندنی ئەم نەخشەیە".
ئێستا ئەمەریکاییەکان ، بەو چوست و چالاکیەی کە پێی بەناوبانگن پەیرەوی ئەم سیاسەتە دەکەن و لەسەری ددرون ، ئیش کردن بە منداڵ نەما (ئەم یاسایە ری نادات بە هیچ مندالیك کە لە شانزە سال کەمتر بیت ئیش بکات). دروشمی ئەمرۆ ئەوەبە: کرێیەکی زۆر ، و سەعاتێکی کەمی ئیش کردن ، ئەم هەڵمەتە دروشمەکەی (لەپێناوی خۆش گوزەرانیدابو) ؛ دەڵێن ولاتەکە سەرانسەر هەموی بو بە دوروشم و بانگەوازێکی زڵ بۆ سەرکەوتنی ئەم هێرش و هەڵمەتە بە فرۆکە بەیاننامە بڵاودەکرایەوە، خاوەن ئیشەکانیان هان دەدا کە کرێی کرێکارەکانیان زیادکەن وەپەیرەوێکی تایبەتی دابنێن ، و بەڵێن بدەن لەسەری برۆن ، خۆ ئەگەر ئەم شێوازانە لەگەل خاوەن ئیش و فرمانەکاندا بێسود بو ، ئنجا حوکومەت سوکە هەرەشەیەکی دەکرد کە خۆی ئەم شتانە دەکات. وە داوای لەخاوەن ئیشەکان کرد کە بەلێنێك ئیمزا کەن بەپێی ئەو بەڵێنە بریار بدەن کرێ زیادکەن وە سەعاتی ئیش کردنی فەرمان بەران کەم کەنەوە ، ئنجا حوکومەتیش باداشی ئەو خاوەن ئیشانەی دەدایەوە کە لەم رووەوە پێش هەتر دەکەون بەوەی کە نیشانەی شەرەفیان پێدەبەخشین ، وە ناویان لەپۆستەخانەی هەمو

ولآت و مەلبەندیکدا بلآو دەکردەوە ، بەلآم دواکەوتوەکان رسوابونـیـان بـۆ دەمایەوە.

لەئەنجامی ئەم هەمو کردو کۆشانەدا ، نرخ دانان و بازرگـانـی کـردن تۆزێك چاك بون ، بەلآم چاك بونی راستەقینە لەدڵ و دەروونی (النفسیـة) کرێکارو خاوەن ئیش و فرمانەکاندا بو ، ئیتر هەست کردنیان بە بەزیـن و شکستی نەما ، باوەر ، و راپەرمونیان بە تایبەتـی چـیـنـی نـاوەراسـت بەسەرۆك روزفلت زیادی کرد. خەڵکی ناوی ئەویان لەگـەڵ نـاوی (سـەروك لنکون)ی قارەمانی مەزنی ئەمەریکادا دەکرد بەهاوشان ، ئەو پیاوەی کـەوا ئەرکی فەرمان رەوایی هەلگرت لە کاتی تەنگانە گەورەکەدا ، واتە لەکاتی شەرو شۆرە ناو خوکەدا.

دیسانەوە خەلکیش لە ئەوروپادا چاویان تێبریبو ، وە بەندمای ئەودبون کە پێشەوایەتی جیهان بکات بۆ بەگژداچونی ، و فەوتاندنـی بـێ بـازاری بازرگانی کردن ، کۆنگرەیەکی ئابوری نێو دەولەتان بەسترا بۆ لێ دوانـی ئەم مەسەلانە ، بەلآم روزفلت نوێنەرەکانی ئەمەریکای ئاگـادار کـرد کـە نەهێلن دولار بچێتەوە سەرپەیرەوی زێر ، وەبدرهەلستی هەمو کردو کوشێـك بکەن کە ناگونجێت لەگەل بروژەکانی ئەمدا لەناو ولاتە یەکگرتوەکـانـدا. لەبەر ئەم هەلویستەی ، نوێنەرانی دەولەتەکانی تر رقیان لێی بو.

بێچەندو چون سیاسەتی (رورفلت) سیاسەتێکی ئابوری نیشتمانیانە بـو کە بریتی بو لە چاککردنی بارو ، وەزع لەناو ئەمەریکادا ، لەبەر ئەمـە هەندێ لە حوکومەتەکانی ئەوروپاو خاوەن بانقەکان تیایدا ئەم سیاسەتەیـان بە دڵ نەبو ، بەتایبەتی ئینگلتەرە هەرگیز بەسیاسـەتـە پـێـشـکـەوتـو خوارانەکەی رورفلت قایل نەبو ، چونکە ئەم سیاسەتە بـوژانـەوەی خـاوەن فرمانە گەورەکانی پەسند دەکرد بەسەر هەمو شتێکیکەدا.

لەگەل ئەمەشدا ئێستا (روزفلت) زیاتر لە پێشینەکەی ، بەشـدارێـکـی بەکارە لەکاروباری نێو دەولەتاندا ، لە ئینگلنەرد زیاتر هەلویسـتـێـکـی پێشکەوتنخوازانەی هەبو لەمەسەلەی چەك داماڵین وهەندێك لەمەسەلەکـانـی تری نیو دەولەتاندا. هەرەشەی نەرم و ناسکی کارێکی گـەورەی کـرد لـە سوك کردنی دەم و دوی (هتلر) ، هەروها دەستی کرد بە دامـەزرانـدنـی

بەیوەندایەتی‌یەکی دۆستانە لەگەل یەکێتی سۆڤیێتدا.

بەڵام ئەو پرسیارە گرنگەی ئەمرۆ لەئەمەریکا ، و تەسانەت لەهەمولایەکی تردا هەیە! ئایا روزفلت سەردەکەوێت؟ زۆر ئازاو ، زۆر بەجەرگی لەکاردایە بۆ مانەوەی رژێمی سەرمایەداری ، بەڵام لەواقیعدا سەرکەوتنی مانای کەوتنە خوارەوەی خاوەن فرمانە گەورەکانە لەسەر تەختەکانیان (عروشهم). ئنجا ئایا ئەمانە رێی دەدەن سەرکەوێت؟ بەراستی ئەمانە بەهێزترین بەرژەوەندیان هەیە لەجیهانی مەددنیەت و شارستانێتیدا تواناو جیاوازیەکانی خۆیان (امتیازات) نادەن بەدەستەوە هەر تەنها بەوەی کە سەروك روزفلت فەرمانیان پێ‌دەکا بو ئەمە ، ئەمرۆ هێمن و لەسەرخۆ دیارن چونکە رای گشتی‌و خۆشەویستی سەرۆك روزفلت لای میللەت هەموشتێکی کردوە بەژێر لێوەوە ، و دای‌پوشیوە ، بەڵام ئەوان لەهەلێکی گونجاو دەگەرێن ، ئەگەر لەماوەی چەند مانگێکی‌کەمدا ، وەزع و بار زۆر چاك نەبو ، ئەوسا خاوەن ئیش و فرمانە گەورەکان سەر بەرزدەکەنەوە ، و لێی دەکەونە فاك و فیك دەست بەئازاوە دەکەن.

زۆر لە چاودێری‌کەران لەو باوەردان کە سەرۆك روزفلت توشی گەلێك کاری گران دەبێت و ، مەحالە سەرکەوێت ، خۆ ئەگەر سەرنەکەوت خاون ئیش و فرمانە گەورەکان توانا پەیدا دەکەنەوە بەڵکو لەجاران زیاتر بەهێزتر دەبن ، چونکە دام و دەزگا سوشیالیستیانەکەی کەوا سەرۆك روزفلت دروستی کردوە بەکاری دێنن لەپێناوی سودی تایبەتی خۆیاندا ، ئنجا بزوتنەوەی کرێکاران لەئەمەریکادا دەفەوتێنن ، بەتایبەتی ئەم بزوتنەوە بە لەوی بەهێز نی‌یە.

تێبینی‌یەك:

ئەو رەنجەو ئەو کۆششە گەورەیەی کە سەرۆك روزفلت کردی تاکو بەسەر تەنگاندا زاڵ ببێت ، و سەرومایەداری دەستکاری بکات ، و بێ‌گونجینێ لەگەڵ بارو ، وەزعە نوێ‌کەدا توزێك سەرکەوت ، هەر چەندە لە بنەرەتدا گۆرانکاری رووی نەما ، لەگەڵ ئەمەشدا وەزع نەختێك باش بو ئەو کۆشناندش پشتی بە پرۆژە گەورەکان دەبەست ، بۆ یارمەتدان ، و بە خاوەن کارگەکان بسەلمێنرێت ، کە بەشێك لەو قازانجەی پێیان دەکات و ، وەری دەگرن لەوەگرێبەکی زۆر بدرێت کرێکارەکان ، وە سەعاتێکی کەمیش

ئیشیان پێبکرێت. خاوەن کارگەکان بەرهەڵستیان کرد بەتایبەتی (فورد). ئەم سیاسەتەیان بەدەست خستنە ناو کاروبار ، وە بە ناتەواوی و کەمو کوڕی ئازادی خۆیانیان دادەنا. بۆیە رژێمە نوێ کانی کە بۆ بوژانەوە پیشەسازی ، و کشتوکاڵ دانرا بۆ سەری نەگرت ، گەلێك مان گرتن رووی‌دا. بەڵام بزوتنەوەی کرێکارانی ئەمەریکا پێگەیشت و پەرەی‌سەندو هێزی زیادی کرد ، لەبارو وەزعی خۆی داشارەزا بو ، وە گیانێکی نوێی تێ‌هاتەوە ، ئەندامانی نەقابەکانی کرێکاران زیادیان کرد.

لەو کاتەدا کە بوژانەوەی ئابوری لەگەشەکردندا بەردەوام بو ، خاوەن ئیش و فرمانە گەورەکان درتر دەبون ، وە زیاتر بەرهەڵستی (روزفلت)یان ددکرد ، دادگای بەرزی ئەمەریکا (المحکمة العلیا) بڕیاری‌دا کە زۆربەی ئەومادانەو ، بەنداتەی کەلە دوو باساکەدا کە(روزفلت) دای‌ناوە یەکێکیان (باسای بوژاندنەوەی نیشتمانی)یە ، و ئەوی‌تریان (باسای راست کردنەوەی کشت وکاڵ)ە ئەم دووانە بە پێچەوانەی دەستورە وەن ، وە یاسایی نین (غیر قانوني) ، بەم جۆرە دەبینین کە سیاسەتە تازەگەی ، (روزفلت) لەبنچینەوە تێك قۆپا ، و تەپی.

لەساڵی ١٩٣٦ دا دووبارە (رورفلت) هەڵبژێررایەوە بەسەرۆك ، بە زۆربەیەکی زۆر ، هێشتا مشتومڕی لەگەڵ خاوەن کارو فرمانەکاندا بەردەوامەو هەرماوە وە دەسەلاتی بەسەر کۆنگرس دا نەماوە ، لەواقیعدا لە گەلێك مەسەلە دا توشی کێشەو بەرە بود.

# دوا پیدا ڕوانین بەدەوروبەری جیهاندا

## ٧/ئاب/١٩٣٣

ئەگەر بمەوێت بەردەوام بم لە نوسینی ئەم نامانەدا ، دەربارەی باری جیهان هەرگیز لێی نابمەوە ، و کۆتایی پێ ناهێنم مادام کاغەزو پێنوسم پێیە ، چونکە کاردساتەکانی جیهان دوایی نایەت ، وە جیهان خۆیشی بەرەو پێشەوە دەچێت ، پیاو ، و ئافرەت منداڵی نێدایە کاە کاە پێدەکەنن ، و کاە کاە دەگرین ، خۆشدویستی و رق و قینیان ، هەیە ، و هەمیشە بەگژ یەکدا دەچن ، ئەمە چیرۆکێکە کۆتایی نایەت ، لەمرۆماندا ژیان هەروەکو لەرابوردو خێراتر بڕوات واید ، گۆڕانکاریەکان بەدوای یەکتردا دین ، و یەخەی یەکتری دەگرن ، بۆیە ئەوەی ئەمرۆ دەینوسم بۆ سبەینێ کۆن دەبێت ، و دوور دەکەویتەوە ، و لەئاییندەدا بێ جێنگەیە ، روباری ژیان هێمنی نازانێت. هەمیشە دەڕوات ، و لەبزوتنەوەدایە ، هەندی جار خێرا بێ بەرەیی زۆر بەنوندی دەردەبەرین وە گوێ ناداتە ئارەزووەکانمان پێمان پێدەکەنێت ، و نورمان دەداتە قەڵبەزی ئاودشلەقاوە کەیە وە ، کە هەر بۆ پێشەوە دەچێت ، بەڵام بۆکوێ ـ بۆ شێوێکی قول کە ئاودکەی بە هەمولایەکدا بڵاو ، و پەخشان دەکاتەوە ، ودیا بو دەریایەکی فراوانی نەناسراو دەچێت کە بەردەوام لەگۆڕاندایە بەڵام روبارەکە هەر لەجێی خۆیدایە ، و بە هیچ لایەکدا ناڕوات.

گەلێك شتم بۆ نوسیت زیاتر لەوەی کەنیارم بو ، بۆت بنوسم ، چونکە پێنوسەکەم بەفسدی نەدەکردم ، هەر بەرێبازەکەیدا لەسەر کاغەزەکە بەردەوام بو کۆتاییمان بەکەسنەکانمان هێنا بەدەوری جیهاندا ، ئەمرۆ گەیشتینە بەر دەرگای سبەینی ، ئێمە ئێستا پرسیار دەکەین ئەم سبەینییەمان چۆن دەبێت ، کاتێك کەئەمیش دەبێتە ئەمرۆ؟! کچم با تۆزێك بوەستین و تەماشای دەوروبەری جیهان بکەن تاکو بیبینین لەچ بارێکدایە ئێستا ، لە رۆژی حەوتی مانگی ئابی ساڵی هەزار ، و نوصەدو سیوسێدا :

له هیندستاندا دوباره (غاندی) گیرایەوە ، و خرایە بەندیخانەی (یرفادا) دەست کرایەوە بەیاخی بونی شارستانیانە ، گەرچی لەچوار چیوەیەکی تەسکیش دابیت ، هاوریکانمان بران بۆ بەندیخانە ، هاوریەکی خۆشەویستی بەجەرگم هەیە ناوی (جاندرا موهان سن جوبتا) یە لە هەوەلەوە پێش بیستو پێنج ساڵ لەمەبەر لە (کمبرج) دا توشی بوم ، بەڵام بەجێی هێشتین چونکە لە بەندیخانەکانی حوکومەتی بەریتانیادا مرد. ژیان و مردن چۆن یەکن ، بەڵام کارو فرمانە مەزن و پیرۆزەکان کە میللەتی هیندستان پێی هەڵدەستێت بایەخ ونرخێکی گەورە دەدەن بەژیانی ئەم پیاوە ، و ئەم ژیانەشی ڕێڕەوی خۆیی گرتوە. ئێستا لەبەندیخانەکان و گرتوخانەکاندا بە هەزارەها لەرۆڵەکانی هیندستان لەکور ، و لە کچ تێدایە کە نیشتمان پەروەرییان لێ دەدرەوشێتەوە ، لاوی ، و ژیندەکی خۆیانیان کردوە بە قوربانی ، لەزۆرانبازیاندا دژی رژێمەکەی ، ئێستا هیندستانی کردوە بە بەندەو کویلە ، دەبوایە ئەم لاوی ، و ژینددکییە لەکرداری دروست کەرانە و بەفەر دا بەکار بهاتایە ، گەلێك شت هەیە کە لەم جیهانەدا دەبێت بکرێت ، بەڵام پێش ئەوەی دەست بەخانو بکرێت ، دەبێت لەپێشەوە روخاندن دەست پێبکرێت بۆ ئەوەی زەوییەکە تەخت بکرێت ، تاکو خانوە تازەکەی لەسەر بنیان بنرێت ، ناتوانین خانویەکی جوان لەسەر دیواری قورینەی زنجێك دروست کەین ، دەتوانین بیر لە حالەتی ئەمرۆی هیندستان بکەینەوە ، ئەگەر بزانین لە هەندێك لە بەشەکانیدا وەکو (بنغال) جل وبەرگی خەلکیش رژێمی حوکومەتەکە زاڵە بەسەریدا وە هەر کەسی سەرپچی بکات دەخرێتە بەندیخانەوە لە (شتاجونج) دا ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە دوانزە ساڵ زیاترە (تەنانەت کچەکانیش) بۆ هەرلایەك بچن دەبێت پێناسیان (الهویة) پێ بێت ، نازانم ئەم رژێمە سەیرە لەهیچ لایەکی تردا حێبەجێ دەکرێت مەگەر! لە ئەلمانیای نازیدا ، وەیا لە ناوچەکانی جەنگدا کە وڵاتەکە سەربازی دوژمن داگیری دەکات. ئێمە ئەمرۆ میللەتێکین مل کەچی حوکومڕانی بەریتانیاین ، بەدرێژایی سنوری سەرووی رۆژئاوامان ، دراوسێکانمان لەژێر بۆمبابارانی فرۆکەکانی بەریتانیادان.

هیندیەکان لەولاتانی تردا ، بەدەگمەن ڕێزیان لێ‌ئەنرێت ، وەیا بەخێرهاتن بکرێت ئەمە شتێکی سەیر نییە ، چۆن لەددەرەوددا ڕێزیان

لێدەنرێت ، لەکاتێکدا لەناو وڵاتەکەی خۆیاندا سوك و بێ رێزین؟ ئێستا لەخوارووی ئەفەریقادا دەردەکرێن ، کە لەوی لە دایك بون و ژیاون ، وەبەئارەقی ناوچەوانیان هەندێ لەبەشەکانی وڵاتەکە ، وەکو (ناتال)یان ئاوەدان کردوتەوە ، و دروستیان کردوە ، ئنجا جیاکرنەوەی ئەمان لەهی‌تر وبە چاوێك سەیر نەکردن یان ، سەبارەت بەرەنگی پێست سەرەرای رق و کینەی رەگەزایەتی ، و زۆرانبازی ئابوری ئەمانە هەموی کۆبونەتەوە ئەو هیندیانەیان لە خوارووی ئەفەریقادا کردوە بە ئافەروز کراو (المنبوذ) کە نەخانویان هەیە ، ونەساو پەنا ، وە حوکومەتی خوارووی ئەفەریقاش سورە لەسەر ناردنی ئەمانە بۆ هەرلایەکی تر بێت ، وەکو (غینیای بەریتانیا) وەیان هیندستان ، ئەمە بێ‌چەندو چون مانای ئەوەیە لە برساندا بمرن ، ئەم حوکومەتەش هیچ بەلایەوە گرنگ نیە تەنها رۆیشتنی ئەمانە نەبێت بێ زیاد ، کەم.

لەرۆژهەڵاتی ئەفەریقادا هیندیەکان دەورێکی مەزنیان گێرا لەدروست کردنی (کینیا) و ولاتانی دەروبەریدا بەڵام لەوێشدا حەزیان لێناکەن ، نەك لەبەرئەوەی ئەفەریقاییەکان بەرهەڵستی‌مانەوەیان دەکەن ، بەڵکو لەبەرئەوەی مشتێك لەئەوروپاییەکان نایانەوێن. ئەم ئەوروپاییانە ، باشترین ناوچەیان بۆ خۆیان داگیرکرد، وە نەیان هێشت نە ئەفەریقاسی ، و هیندیەکان هیچ زەویەکیان تیایدا هەبێت ، بەڵام باری ئەفەریقاییەکان زۆر ناهەموارەو کولۆڵن ،لەبنەرەتدا ئەمان خاوەنی ئەو زەویانە بون،و وە داهانی (الدخل) خۆیانیان لێدەست دەکەوت ، ئنجا حوکومەت پانتاییەکی زۆری زەوی زەوت کرد ، و وەبەخۆرایی دای بە ئەوروپاییەکان ، ئەمان بون بەخاوەن زەویەکی زۆر ، و دەرەبەگێکی گەورەو داوای باجی داهاتیان (ضریبة الدخل) ، وەیا هیچ باجێکی تریان ناکرێت ، بەڵام گرانباری ئەم باجانە بە هەمو قورسی‌یەکیەوە دەکەوێتەسەر ئەفەریقاییە بەسەزمانەکان ، هەرگیز دانانی باج لەسەر ئەفەریقاییەك شتێکی ئاسان نەبو چونکە خاوەنی هیچ نەبون،لەبەر ئەمە حوکومەت باجی لابەلای (ضرائب غیر مباشرة) خستبوە سەر پێداویستیەکانی کە زۆرپێویستن ، وازیان لێناهێنرێت ، وەکو ئاردو جل و بەرگ ئیتر ئەفەرقاییەك ئەمان بکرێت ، باجەکەی لەبەشێك لەنرخەکەی دەدات ، و دەیخاتە سەر ئەو پێداویستیەی

گەدەی گرێت ، بەڵام سەیرترین باج ئەوەبو کە سەرانە خرابوە سەر هەمو تێرنبەیەك کە لە شانزە ساڵ زیاتربێت ، وەیا هەمو خێزانەکەی بەنافردتیشەوە ، کچم وەکو تۆ دەزانیت کە بنچینەی باج لەسەر دەسکەوتی حەلکە ، وەیان ئەوی هەیان دادەنرێت ، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەفەریقایی هیچی دەست ناکەوێت و هیچی نییە ، بۆیە باج لەسەر تەن وەیا لەشی دانراوە! بەڵام ئایا چۆن ئەم دەدات کە ساڵانە (دوانزەشلن)ە لەکاتێکدا ئەفەریقایی هیچی نییە؟ ، لێرەدا، فیل و بیبسی یاسا خۆی دەشاریتەوە ، یاسا ئەفەریقایی ناچار دەکات کە هەندێ پارەی دەستکەوێت بە ئیش کردن لە کێلگەی ئەوروپاییەکاندا ، ئەمە شێوازێکە نەك بۆ پارە پەیداکردن ، بەڵکو بۆ ئیش کردن بە کرێکاربەکرییەکیەکەم ، بەم جۆرە ئەم ئەفەریقاییە کولولانە ناچار دەبون ماوەیەکی ٧٠٠ وەیا ٨٠٠ میل درێژی لە ناوچەکەیانەوە بەرەو کەناری دەریا برۆن کەواکتیلگەکان لەوێدان (لە ناوەوەی ولاتەکەدا شەمەندەفەر نەبو ، بەڵکو تا ماوەیەکی کورتی نزیك دەریا هەبو) ، تاکو پارەیان دەست کەوێت وەسەرانەی خۆیان و خێزانەکانیان بدەن.

دەربارەی ئەو ئەفەریقاییە هەژارو چەوساوانەی کە نازانن دەنگی خۆیان چۆن بە جیهانی دەرەوە بگەیەنن گەلێك شتی‌تر هەیە بۆ باس کردن دەشێت چیرۆکی کولولیان دورو درێژە هەمو ژیانیان بەبێ دەنگی لەکوێرە وەریدا رادەبوێرن ، لە چاکترین زەوی وزاریان دەرکران ، ئێستا دینەوە لای ئەو روپاییەکانی کە زەویەکانیان بە خۆرایی لێسەندون بەکرێ ئیش بکەن ، ئەم ئەوروپاییانە چینێکی نیمچە دەرەبەگ پێك دێنن ، هەر بزوتنەوەیەك بەدڵیان نەبێت دەی کوژێننەوە ، ئەفەریقاییەکان مافی ئەوەیان نییە هیچ کۆمەڵێك دروست کەن ، بامەبەسی ئەو کۆمەڵەش چاکخوازی (اصلاحي) بێت هەروەها مافی ئەوەیان نییە کە لە ناوخۆیاندا هیچ پارەیەك کۆبکەنەوە بێ مانایی ئەوروپاییەکان گەیشتە رادەیەك یاسایەکیان دانا ، سەما ، و هەڵپەرکێیان لە ئەفەریقاییەکان قەدەغەکرد ، چونکە ئەمان گەلێك جار بەگا لێتە ، و لافریتی‌یەوە لاسایی ئەوروپاییەکانیان دەکردوە! فەلاحەکان زۆر هەژار بون مافی ئەوەیان نەبو کەقاوە ، چا بچێنن ، چونکە بە مەبەربەرەکانی ئەوروپاییەکان دەکەن.

پێش سی سال حوکومەتی بەریتانیا بە جۆرێکی ڕەسمی بڵاوی کـردەوە ئینگلیزەکان حەقدارن (اوصیاء) بەسەر ئەفەریقانەوە ، وە لـەپـاشـە ڕۆژدا زەویەکانیان لێ زەوت ناکەن ، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەفەریقاییەکان ساڵـی پار زێڕ لە (کینیا) دۆزرایەوە ، ئینگلیزەکان بەڵێنەکانیان لەبیر چووە ، و وە ئەو زەویانەیان داگیرکرد کەزێڕی تێـدا دۆزرابـووەوە ، خـاوەنـە ئەفەریقاییەکانیان لێ دەرکرد ، ئنجا دەستیان کرد بەهەڵکۆڵین بۆ زێڕ ، کچم بەم جۆرە دەبینیت پەیمانی ئینگلیزەکان چونە! ئەوان بە ئێمەمانان دەڵێن: هەرچیەکی کردویانە بۆ چاکەو بەرژەوەندی ئەفەریقاییەکـان بـوە، ئەفەریقاییەکان زۆر پێخوشحالن کە زەویە کانیان لەکیس چوە!!.

ئەم شێوازە سەرمایەداریانە لەسود وەرگرتندا، لەناوچەیەکی پڕ لە زێڕدا شێوازێکی سامناکە. بەم پێیە خەڵکی بە پەلەبەرەو ناوچەکـە دەچـن ، وە هەریەکەیان دەست دەکات بە هەڵکۆڵیـن بـو زێـر ، ئـەگـەر هـەرچـیـەك بدۆزیتەوە ددبێت بەهی خۆی ، ئەم شێوازە نمونەیەکە بۆ سەرمایەدارێتـی چونکە ڕێبازی زێرو ماقولانە بۆ سود وەرگرتن لەکانگای زێڕ ئـەوەیـە کـە بەهۆی حوکومەتەوە بێت ، کە ئەم دەستی بەسەردا بـگـرێـت بـۆ سـودی تێکرای میللەت بەکاری دێنێت ، هەر بەم جۆرە یەکێتی سۆڤیت لەکانـگـا زێڕەکانی تاجیکستان و شوێنەکانی تردا کەوتەکارەوە.

ئێستا باسی (کینیا) م لەکۆتایی ئەم نـامـانـە داگـرد ، چـونـکـە ئەفەریقامان گەلێك خستە پشت گوێ.. لەبیرت نەچێت ئەفەریقا قارەیـەکـی فراوانە پڕە لەگەلێك ڕەگەزی ئەفەریقایی کەوا بە صەدەها ساڵە بێگانەکـان بەوپەڕی درندەییەوە دەیان چەوسێننەوە ، چەوساندنـەوەیـەکـی خـراپ. ئەفەریقاییەکان میللەتێکـی زۆر دواکـەوتـون ، مـاوەیـەکـی دورو درێـژ لەژێردەستدا ماوەتەوە ، وە ڕێی پێشکەوتنی نەدراوە ، ئیـتـر کـە ئـەم هەڵەیان بۆ هەل کەویێت ، وڕێیان بدرێت هەروەکو بەم نزیکـانـە ڕووی دا کە زانکۆیەك لەقەراغی دەریـای ڕۆژئـاوای ئـەفـەریـقـادا دروسـت کـرا پێشکەوتنێکی ئاشکرا پێش دەکەون.

دەربارەی وڵاتەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا ئەوەندەم بۆ باس کردویت کە بەس بێت ، لەپێناوی ئازادیدا میسر تێکۆشانی هەر بەردەوامە بەهـەمـە جـۆرر قوناغێکیەوە ، هەروها لەخوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا لە: هیندسـتـان ، و

ئەندنوسیا ، و سیام و هیندی چینی(١) ، و چاوە ، و سومەترە ، و دورگەکانی هیندی رۆژهەڵات ، و فلیبین ، بێجگە لە (سیام) کە سەربەخۆیە ، تێکۆشان تیایاندا دوو ڕێبازی گرتوە یەکەمیان: تێکۆشانی نیشتمان بە تێکرایی دژی دەسەڵاتی بێگانە ، دووەم تێکۆشانی چینە هەژارەکانە لە پێناوی یەکسانی کۆمەڵایەتیدا ، وبەلای کەمەوە ، و باری هیچ نەبێت بۆ چاککردنی بارو ، وەزعی ئابوریان.

(چین) لەوبەری رۆژهەڵاتی ئاسیادایە ، هیچ هێزو توانایەکی نییە ، بەرامبەر دەست درێژ کەران ، وە لەناوەوەشدا ، شەڕو شۆڕو فرە جۆر ئاراستی تێدایە (الأتجاهات) ، ئاراستێکیان بەرەو شیوعێتییە ، ئەوی تریان دژێتی ، لەم کاتەدا ژاپۆن بەردەوامە لە چونە پێشەوەدیدا بێ هیچ بەربەستێك ، وە پانتایەکی فراوانی لە خاکی (چین) داگیر کردو ، بەڵام (چین) بە درێژایی مێژووی هەر لەدێرینەوە بەسەر داگیرکردن ، و گەلێك مەترسیدا زاڵ بوە ، گۆمانی تێدا نییە ئەم جارەش دیسانەوە زاڵ دەبێت بەسەر داگیرکردنەدا لەلایەن (ژاپۆن)ەوە.

بەڵام (ژاپۆن)ی داگیرکەری نیمچە دەرەبەگایەتی ، کەوا پیاوە سوپاییەکان حوکومرانی دەکەن ، وە لەپیشەسازیشدا پێشکەتوە ، ئاویندیەکە لە رابوردوو ، و ئەمرۆ هەمیشە بەبنیات نانی ئیمپراتۆریەتێکی جیهانییەوە خەو دەبینێت ، بەڵام لەپشت ئەم خەوبینین ، و ئارەزووەوە مەترسی روخانێکی ئابوری ، و کوێرەوەریەکی ترسناك خۆی شاردوتەوە کە توشی دانیشتوانی دەبێت کەوا هەمیشە لەزیاد بوندان ، کە ناتوانن نە بو ئەمەریکا ، وەیان نە بۆ ئەو پانتاییە فراوانانەی کە لە ئاوسترالیادا چولە کۆچ و ڕەو بکەن ، هەروها ئەمەریکا کە گەورەترین ، و بەهێزترین دەولەتە ، و دوژمنایەتی ژاپۆن دەکات گەورەترین کۆسپە لە ڕێبازی هاتنە دی ئاوات ، و ئارەزوورەکانی ژاپۆندا سەرەرای ئەمەش یەکێتی سۆڤیت کۆسپێکە لەبەر دەمی پەرەسەندن ، و تەشەنەکردنی (ژاپۆن) لەئاسیادا ، چاودێری کەران لە (منشوریا) و دەریای باسفێکی دا تارمایی جەنگێکی گەورە بەدی دەکەن کە نزیك دەبێتەوە.

هەمو سەرووی ئاسیا بەشێکە لە یەکێتی سۆڤیت کە ئێستا خەریکە جیهانێك ، و رژێمێکی کۆمەڵایەتی نوێ دروست کات ، زۆر سەرسام هێنەرە

که ئەو وڵاتە دواکەوتوانە لە کۆڕی شارستانێتیدا ، کە دەرەبەگـایـەتـی تیایدا فەرمـان رەوابـو ، بـۆ پـێـشـەوە بـازیدا ، وە لـەگـەل وڵاتـە پێشکەوتوەکانی رۆژئاوادا چۆن یەك وەستایەوە ، ئەمرۆ یەکێتی سۆفیـت چ لەئەوروپا ، وچ لەئەسیادا وەستاوە سەرپێچی لە سەرمایـەدارێـتـی روخـاو دەکات لەجیهانی رۆژ ئاوادا ، ئنجا لەکاتێکدا بێ بازاری بازرگـانـی ، و تەنگوچەڵەمەی ئابوری و بێئیشی دەبینین کە هاکاسەرمایە دارێتی کـۆچ و ئیفلیج کات ، وەسەرمایەدارتییش هەوڵ دەدات هەرچۆنێك بێت کە هەناسـە بدات پێش ئەوەی کەبجنگێت ، کەچی یەکێتی سۆقیت دەبینین نیشتمانێکـە پڕ لە هیوا ، و چوست و چالاکی ، و هەوڵ دەدات کە رژێمی سوشیالیستـی بنیات بنێت. ئەو سەرکەوتن و پێشکەوتنەی سۆڤیت ، کە وە دەستی هێناوە و پەیدای کردوە ، و ئەو چالاکی وزیندەکی‌یەی هەیانە بەراستی سەرنجـی جیهانی پێکرا راکێشاوە.

بەڵام وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا کە ولاتێکی زۆر فراوانە لەراستیـا نمونەی سەرنەکەوتن و نوشوستی سەرمایەدارێتی‌یە. بەڵام ئێستـا سـەرەرای هەمو تەنگانە ، و کێشەوبەرەکان ، و مان گرتنەکـانـی کـرێـکـاران ، و بێئیشیان کە هەرگیز بەم جۆرە پێشتر رووی نەداوە ، و بـێوێـنـەیـە ، ئەمەریکا هەوڵ دەدات رژێمی سەرمایەداری رزگار کات ، و بی‌پارێـزێـت ، بەڵام نازانین ئەنجامی ئەم تەجروبەو تاقی‌کردنەوەیە بەچی دەکات ، هـەر چۆنێك بێت ئەو جیاوازیە گەورانەی کە ئەمەریکا هەیەتـی لـەنـاو ولاتـە فراوانە دەوڵەمەندەکەی خۆیدا ، لەو هەموشتانەی کە ئادەمیزاد پێویستیتی هەر لەکان ، و سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی‌یەوە کە لە هەمو شـتـێـکـی تـر زیاترە ، تاکو شارەزایی خەلکەکەی کەس ناتوانێت ئەمانەی لێبسێنـێـت و زەوتی کات. بێگومان وڵاتە یەککگرتوە کان ، و یەکێتی سۆفیت پـێـکـەوە بەجوت دەبێت بەدەورێکی گرنگ هەستن لەکاروباری ئایندەی نێوجیهاندا.

بەڵام قارەی ئەمەریکای خواروو ، زۆر جیاواز ترە لەئەمەریکای سـەروو لە ئەمەریکای خوارووڕا میللەتە لاتینیەکانی تێدا دا دەنیـشـن ، لـێـرەدا وەکو ئەمەریکای سەروو جیاوازی رەگەزی تێدانی‌یە ، چونکە هەرەمەیـدکـە لەگەلێك رەگەز ، ئەورویایی ، و ئەسپانی ، و پورتەغالی ، و ئیتالی ، و نولەرەش ، و هیندیەسورەکانی تێدایە ، ئەم هیندیە سورانە دانیشتـوانـی

ئەصلی هەردوو قارەکەن واتە ئەمەریکای سەروو ، وە ئەمەریکـای خـواروو. ئەم هیـدیە سورانە لە (کندا) و ، ولاتە یەکگرتوەکاندا ، ئـەوەنـددیـان نەماوە کە بەنەواوەتی ون ببن ، و بنوێـەوە ، بەڵام هێشـنـا لـەخـوارووداو بەتایبەتی لە (فنزویلا) دا ژمارەیەکی زۆریان ماوە ، تێکرا دور لـەشـارە گەورەکان دەژین ، کچم لەوانەیە لات سەیر بێت ئەگەر پێت بڵێم هـەنـدێ لەشارەکانی ئەمەریکای خواروو ، وەکو (بونس ئایرس) و (ریودو جانیـرو) زۆر جوان و فراوانن ، شەقام و جادەی پان و درێژی تێـدایـە ، (بـونـس ئایرس) دانیشتوانی نزیکەی دوو ملیون و نیوە ، و پایتەختی (أرجنتیـن) هەروها (ریودو جانیرو) ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی دوو مـلـیـونـە ، و پایتەختی (برازیل)ە.

جگە لەتێکەڵ بونی رەگەزەکان لەئەمەریکای خوارووداو ، بەڵام چـیـنـە فەرمان رەواکان بریتین لە ئەرستوکراتیەیەی سپی پیستەکان هەروەکو لە پێشـدا پێم وتیت ، ئیتر ئەو دەستەو تاقمانەی کە بەسەر سوپادا حوکوم فـەرمـان هەر ئەمانیش فەرمان رەوا لە ولاتەکەدا ، گەلێك شۆڕش تیایـانـدا رووی‌دا کە ئامانجیان دەمەو نوخون کردنەوەی حوکومـەتـەکـە بـو ، وڵاتـەکـانـی ئەمەریکای خواروو مەعدەنێکی زۆری تێدایە ، هەروها توانای دەوڵەمـەنـد بونیان هەیە ، لەگەل ئەمەشدا هەمویان لە قەرزداریدا نوقوم بون ، پـێـش چوار ساڵ لەمەوبەر وڵاتە یەکگرتوەکان کەوازی هێنا لەقەرزپیدانیان ئنجـا توشی گەلێك کێشەو بەرەهاتن ، وە لە هەمولایەکدا گەلێك کودەتا (انقلاب) بەرپابو ، ئیتر سێ دەولەتە سەرەکیە کەلە ئـەمـەریـکـای خـوارووداو کـە پێیان دەلین (أ.ب.ت) واتە (ارجنتین ، برازیل و تشـیـلـی) سـەبـارەت بەکێشەو بەرەی پارەو دارایی گەلێك کودەتا ، و(انقـلاب) لـەنـاویـانـدا روویان دا.

لە هاوینی ساڵی ١٩٣٣ لە ئەمەریکـای خـوارووداو دوو ، وردە جـەنـگ روویان دا گەرچی وەکو جەنگەکەی ژاپۆن لە(منشوریادا) بەردسـمـی نـاوی جەنگیان لێ نەنرا ، لەسەر بنچینەی ئەم ناسین و تەعریفە لەو ساکەوە کە پەیماننامەی کۆمەلی میللەتان (عصبة‌الأمم) وەیا پەیمانـنـامـەی ئـاشـتـی (کلوج)(٢) لەلایەن دەولەتەکانەوە سەلمێنراوە هیچ جەنگێك نەقەوماوە ئەگەر دەولەتێك لەدەولەتەکان پەلاماری دەولەتێکی تر بدات بێ ئەوەی ئیعـلانـی

جەنگی لەگەلدا بکات بەجۆرێکی رەسمی ، و دانیشتوانی بکوژێت بەم کردەویە دەلێن (ناخۆشی) ، ئنجا لەبەر ئەوەی کە (ناخۆشی) قەدەغە نییە ، هەمو کەسێك پێی قایلە ، بۆیە ئەم دوو وردە جەنگە ئەوەندەی جەنگەکەی (منشوريا) لەنێو دەولەتاندا گرنگ نییە ، بەلام ئەم دو جەنگە بۆ دەلەیی کۆمەلی میللەتان (عصبةالأمم) روون دەکەنەوە ، لەگەل سەرنەکەوتنی لە پاراستنی ئاشتیدا. بۆیە دەبینین ئەندامێك لە ئەندامەکانی کۆمەلەکە ، کە پەلاماری ئەندامێکی تر دەدات لەشکر دەنێرێت بۆ داگیرکردنی ولاتەکەی لەگەل ئەمەشدا ئەم کۆمەلە دانیشتوە ، ورتەی لە دەم نایەتە دەری ، وە هیچ دەسەلاتێکی نییە ، وەیان هەندێ تەقەلای لاواز ، و بێکەلك دەدات بۆ جێبەجێکردنی ناخۆشیەکە.

یەکێك لەم دو جەنگە وەیا (دوو ناخۆشیە) لەئەمەریکای خوارووودا بو لە نێوان (بولیفیا)و (برغوای) دا لەسەر پارچە زەوییەکی دەوەناوی پێی دەلێن (شاکو) یەکێك لە فەرەنسەییەکان دەربارەی ئەمە دەلێت: "زۆرانبازیەکەی نێوان بولیفیا ، وبرغوای کە لەسەر شاکو یە ، شەرو شۆری دوو پیاوی سەرروتاوەم دێنێتەوە یاد کە لەسەر شانەیەك بەگژیەکدا دەچن". هەر چەندە هۆی شەرەکەیان تا ئەم رادەیە بێ مانانییە ، چونکە لەو ناوچە دەوەناوییەدا ، بەرژەوەندیە نەوتینەکان هەیە ، هەروها روباری (برغوای) پیایدا تێپەردەبێت کە بولیفیا بە دەریای ئەتلەسیەوە دەبەستێت ئەم دوو دەولەتە بە جێبەجێ کردنێکی مام ناوەندی قایل نەبون ، وایان بەچاك زانی کە بە هەزاران لەرۆلەکانیان بکەن بەقوربانی.

بەلام "ناخۆشی" دووەم لەنێوان (کولومبیا) و (بیرو) دا بو لەسەر دێبەکی بچوك کە ناوی "لاتشیا" بو کە (بیرو) بەناهەق داگیری کرد ، لەو باودرەدام کە کۆمەلی میللەتان (عصبة الأمم) زۆر بەتوندی سەرزەنشتی (بیرو)یان کرد لەسەر ئەم کردەوەیە.

ئاینی ئەمەریکای لاتینی (بەمەکسیکیشەوە) کاثولیکییە ، گەلێك ناکۆکی توندو تیژ لەمەکسیکدا لەنێوان دەولەت ، و پیاوە ئاینییەکانی کاثولیکدا رووی‌دا ، هەروەکو لەئەسپانیادا رووی‌دا ، حوکومەتی مەکسیك دەیەویست کە لەدەسەلاتی کەنیسەی رومانی لە کاروباری پەروەردە ، و فێرکردن ، و کارو بارەکانی تردا کەم کاتەوە.

زمانی ئەمەریکای خواروو ، ئەسپانی‌یە بێجگە لە (برازیل) کە لەوێدا زمانی ڕەسمی پورتەغالیە ، لەبەر ئەوەی ئەمەریکای خواروو پان و بەرینە بۆیە دەبینین کە زمانی ئەسپانی ئەمڕۆ لەزمانە مەزنەکانی جیهانە ، زمانێکی ، جوان ، بەئاوازە ، وێژەیەکی نوێی بەرزی هەیە ، ئەمڕۆ بەهۆی ئەمەریکای خوارووەوە ـ بوە بە زمانێکی گرنگی بازرگانی.

---

(١) هیندی چینی: نیمچە دورگەیەکە لە خوارووی ڕۆژئاوای ئاسیادا یە لەنێوان هیندستان و چین دا. کە بریتیە لەم ناوچانە: بورما ، تایلاند ، مالیزیا ، فیتنامی سەروو ، وفیتنامی خواروو لەگەل لاوس و کمبودیا.

(٢) کلوج ، وەیا کلوغ: پارێزەر (محامی) و سیاسەت شوناسێکی ئەمەریکاییە ، وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بو ، ساڵی ١٩٢٨ لە پەیماننامەی (پاریس)دا ناوبانگی پەیدا کرد ، کە بریتی بو لەبروانامەو ، پەیماننامەیەك ، کە دەولەتەکان بۆ جێبەجێکردنی ناکۆکیەکانیان نەیکەن بەجەنگ ، ئەم پەیماننامەیە (٦٣) دەولەت ئیمزای کرد ، ئەم پیاوە لە ساڵی ١٩٢٩دا خەڵاتی (نوبل)ی بۆ ئاشی وەرگرت.

وەرگێڕی کوردی

# تارمایی جەنگ

## ٨/ئابی/١٩٣٣

لەدوا نامەم دا قارەی ئاسیا ، و ئەفەریقا و ، هەر دوو ئەمەریکام پیشاندایت ، مایەوە ئەوروپای خاوەن چاکە ، و بزیو !

دەولەتە مەزنەکەی ئینگلتەرە دەسەلانەکەی پێشوی نەما ، ئێستا لەتەقەلادا ندایە ئەوی ماویتیەوە لە کیسی نەچێت ، بەلام لەشکرە دەریاییەکەی کە لەپێشدا ئاسایشی بۆ مسۆگەر کردبو ، وە دەسەڵاتی بەسەر هەتردا پێبەخشی ، و توانای بنیات نانی ئیمپراتوریەتەکەیی دابویە ، ئەو لەشکرە دەریاییە بەهێزەی جاران نەما. ئەوکاتە بەسەر چو کە لەشکرە دەریاییەکەی ، لە لەشکری دەریایی دوو دەولەت پێکەوە بەهێز تربێت ، ئێستا ئەم لەشکرە دەریاییەی لەگەل لەشکری دەریایی ولاتە یەکگرتوەکاندا چۆن یەکە. گەرچی ولاتە یەکگرتوەکان سدبارەت بەو توانا مەزنەی کە هەیەتی ، دەتوانێت پێش ئەو بکەویت لەم رووەوە ، ئەمرۆ هێزی ئاسمانی لە لەشکری دەریایی گرنگترە ، لەم بارەیەوە ئینگلتەرە لەوانیتر زۆر دواکەتوترە ، هەندی لە دەولەتەکان لە ئینگلتەرە زۆرتر فرۆکەی جەنگیان هەیە. هەروها گەورەیی ، وسەرداریێتی بازرگانی نەما بێ ئەوەی هیوای ئەوەی ببی کە بچێتەوە دۆخی جارانی ئەوی دەینێرێتە دەرەوە (الصادرات) وردە وردە لەکەم بونەوە دایە ، ئێستا ئینگلتەرە هەول دەدات کە بازارەکانی ئیمپراتۆریەتەکە ، بەتەنیا بۆ شتومەکەکانی خۆیی تەرخان کات ، لەرێی دانانی باجێکی زۆری گومرگەوە. ئەم کردو کۆشانەی وا دەگەیەنێت لە سنوری ئیمپراتۆریەتەکەی بەولاوە وازی هێناوە لەچاو جنۆکیو تەماعکاری ، بۆ دەسەلاتداری دەست رویشتوویی لەنێو دەولەتاندا تەنانەت ئەگەر لەم مەبەسەشدا سەرنەکەویت ، بەلام ناتوانێت گەورەیی وسەرداریێتی پیشوی دەستکەوێتەوە ، چونکە ئەمەیان رویشت نایەتەوە

تەنانەت سەرکەوتنیشی لە ناو ئیمپراتۆریەتەکەیدا گومانی تێدایە.

ئینگلتەرە دوای زۆرانبازیەکی بەتین لەگەڵ ئەمەریکادا توانی جێگەو مەرکەزی بازرگانی کردنی نێو جیهانی بپارێزێت (لندن) هەر بەگرنگترین مەڵبەندی کاغەزی پارەو دارایی مایەوە ، بەڵام ئەم سەرکەوتنەش خەریکە چاکەو جیاوازیەکانی نامێنێ ، ئینگلتەرە خۆیشی لەگەڵ وڵاتەکانی تردا پارمەتی خراپ بون ، و نوشوستی بازرگانی دەدات سەبارەت بەسیاسەتی ئابوری نیشتمانی کە لەسەریدەڕوات لەگەڵ زۆری باجی گومرگ کە دای دەنێت ، تەنانەت ئەگەر بەشتێکی زۆر لە بازرگانی نێو دەولەتان بمێنێتەوە وە رژێمی سەرمایەداریش بتوانێت بژی ئەوساش گومانی نیە کە پێشەوایەکی کردنی پارەو دارایی لە (لندن)ەوە دەچێت رووەدەکاتە (نیۆیۆرك). بەڵام ئەوی چاوەڕوان دەکرێت گەلێك گۆرانکاری فراوان رووەدات لە رژێمی سەرمایەداریدا پێش ئەوەی ئەمە بقەومێت.

ئەوی ناسراوەو ئاشکرایە دەربارەی ئینگلتەرە ، ئەوەیە کەوا توانای خۆگۆرینی هەیە ، بەپێی بارو زروف ، ئەمە شتێکی راستە مادام بنچینە کومەلایەتیەکەی کاری تێناکریت ، وە جینە دەولەمەندەکانی مەرکەزو ، جیاوازیەکانی خۆیانیان پاراستوە. دیسانەوە نازانین توانای لە خۆگورینـدا لەپاشەرۆژدا ، پالێ پێوە دەنێت کە بنچینە کۆمەڵایەتیەکەیشی بگۆرێت یا نە؟! من گومانم هەیە کە ئەم گۆرینە بە هێمنیو ئاشتی پێك نایەت چونکە ئەوانەی کەجیاوازیان هەیە ، ودەسەلاتیان بەدەستەوەیە ، بە خۆشی خۆیان وازی لێ ناهێنن.

ئەمرۆ دەسەڵاتی ئینگلیز لە جیهاندا لەکزبوندایە ، تەنیا لە سنوری ئیمپراتۆریەکەیدا ماوەتەوە ئیتر ئینگلتەرە بدمە ، و بەرووودانی چەند گۆرانکاریەکی گرنگ لەناو ئیمپراتوریەتەکەیدا قایل بو ، ولاتەکانی میللەتانی سەر بە بەریتانیا (١) ئیستا سەر بەخۆن ، گەرچی بەرژێمی پارەو دارایی لەمەر بەریتانیاوە بەندن ، بەریتانیا گەلێك شتی کرد بەقوربانی لەپێناوی رەزامەندی ئەم ولاتانەدا ، لەگەل ئەمەشدا گەلێك ناکۆکی لەناویاندا ؛ پەیدابو، بەلام ئەوسترالیا بەتەواوەتی لەژێر دەسەلاتی بانقی ئینگلتەرەدا یە ، لەبەر ئەوەی کە ژاپۆن دەترسێت ، بۆیە هەوڵ دەدات کە زۆر لەبەریتانیا نزیك بێتەوە ، بەلام (کندا) کەوا

پیشەسازیەکەی گەشەی کردوە ، و بەربەرەکانی ئینگلتەرە دەکات ، قایل نابێت واز لە هیچ مافێك لەمافەکانی بێنێت ، دیسانەوە زۆر بەتوندی بەندە وبەستراوە بە ولاتە یەکگرتوەکانی دراوسێیەوە ، بەلام لە خوارووی ئەفەریقادا ئیمپراتۆریەتەکەیان خۆش ناوێت ، و رقیان لێیەتی ، گەرچی لەچاو جاراندا لە توندو تیژی ئەم رقەیان کەمتر بۆتەوە. ئیرلاندە بەتاقی تەنیا راوەستاوە ، هێشتا لەگەڵ ئینگلتەرەدا هەر لە شەرو شۆردان.

ئینگلیزەکان باجێکی گومرکی زۆربان خستە سەر شتومەکەکانی ئیرلاندە تاکو مل کەچی کەن ، بەلام ئەمەبو بەهۆی چەند ئەنجامێکی بێچەوانە ، چونکە لەئیرلاندەدا هانی پیشەسازیو کشت وکاڵیدا ، وە ئیرلاندە سەرکەوت لەوەدا کەخۆی بەشی خۆی پەیداکات: گەلێك کارگەی نوێی بینا نا ، لەوەرگاو پاوانەکانی کرد بەکێلگەی چاندنی گەنم ، ئەو خواردەمەنییەی کە دەنارد بۆ ئینگلتەرە لەناو ولاتەکەی خۆیدا سەرفی دەکردو بە کاریدەهێنا ، بەمە رادەی ژیان گوزەرانی میللەتەکەی بەرزبووەوە. بەم جۆرە (دیڤالیرا) لەسیاسەتە سەربەخۆییەکەیدا سەرکەوت ، ئیتر ئیرلاندە بو بەجقلێك لەقەپرغەی سیاسەتی ئیستیعمارکەری بەریتانیادا ، هەروها ئیرلاندە بو بە ئازا وسەرپێچیکەر ، ئنجا بارو ، وەزعی هەرگیز لەگەڵ پەیمانەکەی (أوتاوا)دا نە دەگونجا.

بۆیە ئینگلتەرە لەسەر ئەم بناغەیە زۆر قازانج لە ولاتانی میللەتەکانی سەر بەبەریتانیا ناکات بەلام دەتوانێت زۆر لەهنیدستان سود وەرگرێت چونکە ئەم بازارێکی گەورەیە بۆ شتومەکی بەریتانیا ، بەلام باری سیاسی لە هیندستاندا ــ سەرەرای تەنگانە ئابوریە تاسینەرەکە ــ یارمەتی بەرەوی بازاری بازرگانی بەریتانیا نادات ، چونکە کەس ناتوانێت خەلك لە بەندیخانە توندکات وزۆریان لێبکات شتومەکەکانی بکرین. ستانلی بولدوین: ماوەیەکی نزیك لەمەوبەر لە (مانشستر) دا وتی:ــ "ئەو رۆژە نەما کەوا فەرمان مان دەدا بەهیندستان بۆ کرینی شتومەکە کانمان ، ئیتر مسۆگەرکردنی بازرگانی بە بونی نیازێکی باشەوە دەبێت لەبەر ئەمە ناتوانین شتومەکەکانمان بەهیندیەکان بفرۆشین بەهەرەشەکردنمان لێیان بەرزەیری سونکی". ئنجا لەسەر ئینگلتەرە پێویستە سەرەرای ئەوەی بەرەو رووی بارو ، وەزعی ناو هیندستان دەبێتەوە هەروها دەبێت بەرامبەر

بەربەرەکانی بدبنی ژاپۆنیش بوەستێتەوە چ لەهیندستان وەیان لەناو وڵاتەکانی تری رۆژهەڵاندا ، و لەناو هەندی لە ولاتانی میللەتەکان سەر بە بەریتانیاشدا .

بەم جۆرە دەبینین کە ئینگلتەرە هەوڵ دەدات ، ئەوی بەدەستیەوەیەتی بی پارێزێت بۆ دروست کردنی یەکێتی‌یەکی ئابوری لەئیمپراتۆریەتەکەی و ئەو دەولەتانەی کە کەلەگەلیدا رێك دەکەوێت، وەیان خاتە پاڵ ئەم یەکێتی‌یە وەکو دانیمارك ، و ولاتەکانی ئەسکەندنافیا(٢) ، ئەمە تاکە سیاسەتیکە کە بەریتانیا دەتوانێت لەسەدری بروات ، لەمە بەولاوە سیاسەتێکی کە ، نی‌یە ، تاکو بەریتانیا خۆی بپارێزیت لەکاتی شەر وشۆردا دەبێت خۆی ، خۆی بەخێوکات لەبەر ئەمە دەبێت بایەخ بدات بەپێشخستنی کشتوکاڵەکەی ، ئیتر کەس نازانێت ئەم سیاسەتە ئابوریە نیشتمانیا نەیەی سەردەکەوێت یا نە ، لەپێشدا باسی هەندێ کێشەو بەرەم بۆ کردیت کە دێتە رێی ، خۆ ئەگەر سەرنەکەوت ئیمپراتۆریەتەکە هەمووی دەرو خێت ، ئیتر میللەتی بەریتانیا ناچار دەبێت کە لەرادەی ژیان و گوزەرانی کەم کاتەوە ، مەگەرر ژێمە ئابوریەکەی بگۆرێت و لەسەر بنچینەیەکی سوشیالیستیانە دای مەزرێنی گریمان بەریتانیا سەرکەوت سەرکەوتنەکەی دەکەوێتە مەترسی‌یەوە ، چونکە دەبێتە ماڵ و یرانی بۆگەلێك لەدەولەتە ئەوروپاییەکان ، کەوا دەرفەتی بازرگانیان نامێنێ ، کە بەمە ئەوانەی‌قەرزداری ئینگلتەرەن نابوت دەبن ، وە ئەم نابوت بونەشیان ، دووچاری خراپترین ئەنجامیان دەکات.

دیسانەوە وا چاوەروان دەکرێت زۆرانبازیەکی ئابوری لەنێوان ئینگلتەرەو ژاپون ، و ئەمەریکادا بەرپا ببێت لەگەڵیك کۆرو مەڵبەندا هەر لەئێستاوە ئەگەر کاروبار بەم جۆرە بروات گومانی تێدا نی‌یە ولاتە یەکگرتوەکان دێتە پێشەوە ، و ئینگلتەرە دەگەرێتە دواوە ، ئەم بەربەرەکانیەش ئەنجامەکەی دوو شتە :ـ یان ئینگلتەرە بەم بارو ، وەزعە بەبێ دەنگی وبەهێمن رازی دەبێت ، و دان بەبەزینیدا دەنێت لەم زۆرانبازیەدا ، وەیا جەنگێکی جیهانی بەرپا دەکات پێش ئەوەی هەڵەکەی لەکیس بچێت و ، ئەوەندە کزو لاواز ببێت کە ئیتر نەتوانێت بەرەنگاری بەربەرەکانی کەرانی بوەستێتەوە .

ئنجا بەربەرەكانی كەرتێكی تری مەزنی ئینگلتەرە هەیە كە یەكێتی سۆڤیتە هەردوو ولاتەكە سیاسەتێكی تەواو جیاواز لەیەكتری جێبەجێ دەكەن وە زۆر بە وریاییەوە سەیری یەكتری دەكەن ، لە هەمو ولاتەكانی ئاسیاو ئەوروپادا موئامەرە لەیەكتری دەكەن ، ئەم دوانە دەتوانن بۆ ماوەیەكی كورت بە ئاشتی بژین بەلام بێگومان بەكژیەكدا دەچن چونكە هەریەكەیان بەرهەلستی سیاسەتی ئەوی تریان دەكات ، وە ئامانجیشیان تەواو جیاوازە.

ئەمرۆ ئینگلتەرە دەتوانێت بە خۆی ، خۆی بەخێوكات ، چونكە هەرچیەكی بیەوێت هەیەتی. بەلام لەوە دەترسێت كە ئەمەی لەكیس بچێت. وە ترسەكەیشی لەجێی خویدایە ، بۆیە بەهەمو توانایەوە هەول دەدات ئەم وەزع و بارەی ئێستای هەر بمێنێتەوە ، ئنجا كۆمەلی میللەتان بۆ هێنانەدی ئەم مەبەسانەی خۆی بەكاردێنێت ، بێگومان ئێستا زۆر بە هێزە بەلام بێگومان دیسانەوە دەستی كردوە بەكزی ولاوازی ، و بوكانەوە وەكو دەولەتێكی خاوەن موستەعمەرە ؛ ئێستا ئاوابونی رۆژ لەئیمپراتۆریە تە مەزنەكەی بەدی دەكەین.

ئەگەر واز لە ئینگلتەرە بێنین لەدەریا بپەرینەوە بۆ قارەی ئەوروپا ، فەرەنسە دەبینین كە دەولەتێكی ئیستیعمارییە ، دەسەلاتی بەسەر ئیمپراتۆریەتێكی گەورەدا هەیە لەئەفەریقا ، و ئاسیادا ، فەرەنسە لەرووی سوپاو لەشكرەوە لەدەولەتە بەهێزەكانی ئەوروپا[1] بە ، لەشكرو سوپایەكی زۆری هەیە وەپێشەوای هەندی لە دەولەتانی ترە وەكو پولندە ، چیكوسلوفاكیا ، بلچیكا ، رۆمانیا ، و یوكوسلافیا ، لەگەل ئەمەشدا ، ترسی لەگیانی سوپایی ئەلمانیا هەیە بەتایبەتی لەسایەی نازیتیدا ، (هتلر) هۆیەك بو لە گۆرانی پەیوەندایەتی ، و هەست لەنێوانی فەرەنسەی سەرمایەداریو یەكێتی سۆڤیتدا ، ئنجا بونی ئەم دوژمنە ناوكییە (المشترك) هەردوكیانی لەیەك نزیك كردەوە.

---

(١) ئەمە راست نیە دوای ئەوەی ئەلمانیا خۆی چەكدار كردەوە لە سەبتەمبەری ١٩٣٨ دا دوای پەیمانەكەی (میونیخ) فەرەنسە بو بە دەولەتێك لە پلەی دووەمدا ، هەروها ، هاوپەیمانەكانی لەدەولەتەكانی ناوەراستی ئەوروپا وازیان لێهێنا.

بەڵام لەئەلمانیادا تۆقاندن لەلایەن نازیەکانەوە بەردەوامە ، هەمو ڕۆژێك ڕاپۆرتی ئەو تاوان ، و ستەمەمان دەگاتی کەلەویّ دەکرێن ، بەڵام نازانین تاکەی ئەم درندە ییەتیە دەمێنێتەوە ، چەند مانگیا، دەبێت دەستی پیّکردوە ، و تا ئێستاش توندوتیژی هەرماوە ، ئەم تۆقاندن ، و

تین بۆ هێنانە نابێتە بەڵگەیەك بۆ قایمی و چەسپاوی مەرکەزی حوکومەت . زۆر لەوانەیە کە ئەگەر ئەلمانیا لەئێستای بەهێز تربوایە ، زۆر لەمێژە جەنگی بەرپا دەکرد ، لەگەل ئەمەشدا جەنگ هەردەقەومێت. (هتلر) هەمیشە دەیڵێتەوە کە هدر خوێەتی ، دوابەنا ، و دەرمانی دەردی شیوعیتی رەنگە ئەمە راست بێت ، چونکە ئەگەر نازیّتی لە ئەلمانیادا سەرنەکەوێت وبشکێت شیوعیتی نەبێت هیچی تر جیّی ناکرێتەوە.

بەڵام ئیتالیا لەژێر فەرمان رەوایی (موسولینی) دا سیاسەتی نێو دەولەتانی ئاشکرایە ، و نایشارێتەوە بە وشەی ڕێك وپێك دەربارەی ئاشتی و نیازپاکی ، وەکو دەولەتەکانی تر دەیکەن ، و خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکات ، چونکە لەو باوەردایە کەبیّ چەندو چون دوای ماوەیەکی کورت جەنگ دەقەومێت ، بۆیە لەئێستاوە هەوڵ دەدات کە خۆی قایم کات ، ئیتالیا ـ لەبەرئەوەی کە فاشستیە ـ پێشوازی فاشستێتی دەکات لەئەلمانیادا ، و هەوڵ دەدات پەیوەندایەتی چاکی خۆی لەگەل (هتلر) دا بەرەپیّبدات لەگەل ئەمەشدا بەرهەڵستی سیاسەتی فراوان بونی ئەلمانیا دەکات ـ وانە نەمسا خستنە سەر ئەلمانیا چونکە ئەم داگیرکردن و خستنەسەرە ، مانای وایە ئەلمانیا لەسنوری ئیتالیا نزیك دەبێتەوە. موسولینی چاوی بەرایی نادات کە برا فاشستیەکانی خۆی ببینێت لەسەر سنورەکەی (١) .

ناوەراستی ئەوروپا لەچەند دەولەتێکی بچوك پێك هاتوە تەنگوچەلەمەی ئابوری تاساندونی ، هەروەها لەگەل گەلێك مەینەتی تردا کە جەنگە

---

(١) لە مارتی ١٩٣٨ دا ئەلمانیا نەمسای داگیر کردوە خستیە سەر خاکی ئەلمانیا. بارو ، وەزعی نێو دەولەتان موسولینیان ناچار کرد کە بەمە قایل بێت ، بەڵام لەهەمان کاتدا تورە بوبو ، وەرقی هەڵسابو.

جیهانەکە توشی کردن ، ئێستا ئەمانە لە ترسی (هتلر) و نازیەکان دەلەرزن ، وە حیزبە نازیەکانیش لەناو ئەم دەلەتانەدا تادێت بەهێز دەبن بەتاییەتی لە شوێنێکدا کە ئەلمان هەبێت. لەهەمان کاتدا هەستی دوژمنایەتی کردنی نازێتی پەرەدەکات و پەرەدەسێنی ، لەبەر ئەمە گومانی تێدا نی یە کە بەکۆیەکدا دەچن ئێستا نەمسا مەلبەندی ئەمڕۆی ئەم کێچەڵ و بەکۆزدا چونەیە.

سێدەولەتە هاوپەیمانەکەی فەرەنسە کە لەناوەراستی ئەوروپا و دەوروبەری روباری (دانوب) دان کە بریتین لەچیکوسلوفاکیا ، رومانیا ، و یوکوسلافیا ، وابزانم لە ساڵی ١٩٣٢ هاوپەیمانی وەیا یەکێتیەکان لەناوخۆیاندا پێك هێنا ، ئەم سێ دەولەتە لەو ررێکەوتنەی کەدوای جەنگد جیهانی‌یەکە پێك هات سودمەندبون ، وە هەر یەکێکیان دەیەویست ، ئەوی دەستی کەوتوە بی پارێزێت ، بۆیە لەپێناوی ئەم مەبەسەدا لەگەڵ یەکتریدا کۆبونەوە ، هاوپەیمانیەکی جەنگیان پێك هێنا ، بەم هاوپەیمانیە دەوترا (هاوپەیمانی بچوك) ئەمە هێزێکی نوێی لەئەوروپا دادروست کرد ، ئەمان سەر بە فەرەنسە بون ، دوژمنایەتی ئەلمانیاو ، بەرهەڵستی سیاسەتی ئیتالیایان دەکرد.

سەرکەوتنی نازێتی لەئەلمانیادا لەلێدانی زەنگی مەترسی دەچو ، بو ئەم (هاوپەیمانیە بچوکە)

دیسانەوە بۆ پولندەش ، هەروها چاوچنۆکی نازیەکان هەر بەراست کردنەوەی پەیماننامەی (فرسایل)ەوە نەوەستا ، چونکە (هەمو ئەلمانەکان حەزیان بەمە دەکرد) ، بەلام دەم و دوویان بێ‌چەندو چون بوونی جەنگێکی نزیکی لێدەهات ،ئەم دەم و دووەیان ئەوەندە توندو تیژ بو (فەرەنسا ، ونەمسا) هاتبونە لەرزە ، گەرچی حەزیان بەراست کردنەوەی پەیماننامەکەش دەکرد. لە ئەنجامی ئەم مەترسیانەدا کە (هتلریتی) پەیدای کرد ،هەر لەبەر ئەمە مەبەس ، وئامانجەکانی هەمو دەولەتەکانی ناوەراستی ئەوروپا ، لەگەل دەولەتەکانی رۆژهەلاتیدا بەیەك گەیشتن لە (هاوپەیمانیە بچوك)ەکەدا ، ئنجا (پولندە ، و نەمساو ، مجر) و دەولەتەکانی بالقان ، هەر چەندە یەکتریان خۆش نەدەویست بیروورایان نزیك بو بوە وە ئەم دەولەتانە بەتایبەتی پولندە و جیکوسلوفاکیا دەستیان کرد

بەنزیك بونەوە لە یەكێتی سۆڤیت هەر لەوكاتەوە كە مەترسی نازیێتی پەیدابو ، لەئەنجامی ئەم نزیك بوونەوەیەدا پێش چەند هەفتەیەك پەیماننامەیەكی دەست درێژنەكردن لەنێوان ئەمان ، و یەكێتی سۆڤیتدا ئیمزا كرا.

چیرۆكی شۆڕشەكەی ئەسپانیام بۆ گێڕایتەوە ، ئەم شۆڕشە ناتوانێت خۆی راگرێت ، وادەردەكەوێت جارێكی تریش ئەسپانیا لەكەلێنی بوركانێكدا راوەستاوە.

بەم جۆرە دەبینین دەولەتە سەیرەكانی ئەوروپا ، بەناكۆكی ، و رق و بەربەرەكانیانەوە هەمیشە باسی كەم كردنەوەی چەك دەكەن ،لەگەڵ ئەمەشدا[1] بەشەو ، و بەرۆژ خۆیان چەكدار دەكەن وە چەكی وێرانكەری ستەمناك دا دەهێنن تاكو لەكاتی جەنگە ئایندەكەدا بەكاریان بهێنن ، هەروها باسی یارمەتدان دەكەن لەنێوان دەولەتەكاندا ، بێسود بو ئەم مەبەسە گەلێك كۆنگرە دەبەستن ، تەنانەت خودی كۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) بەجۆرێك شكستی هێنا ، شایانی شیوەنە وە هەرچی تەقەلایەك درا ، بۆ رزگاركردنی كۆنگرە جیهانیەكە بە فیرۆچو ،پێشنیارێك هەیە كەوا: ولاتەكانی ئەوروپا ، جگە لە روسیا یەكێتی‌یەك دروست كەن بەناوی "دەولەتە یەكگرتوەكانی ئەوروپاوە" لەراستیدا مەبەس لەم جم و جولە دروست كردنی بەرەیەكە دژی یەكێتی سۆڤیت ، و هەول دانە بۆ زاڵ بون بەسەر ئەو كێشە وبەرانەدا كەوا دێتە رێی ئەم دەولەتانە ،بەلاّم لەبەر ئەوەی كە رقیان لە یەكتریە هەرگیز ناتوانن ئەم پێشنیارە جێبەجێ بكەن.

لەواقیعدا هەر دەولەتێك ئێستا لەوی‌تر دور دەكەوێتەوە ، بێ بازاری بازرگانی ، و تەنگو چەلەمە ئابوریەكە یارمەتی ئەم دوركەوتنەوە یەدەدەن ئنجا هەمو دەولەتێك ئاموژگاری ئابوریە نیشتمانیەكەی دەكات لەبەر ئەمە دەبینین هەریەكەیان لەپشت گەلێك شورەی بەرز لەپاراستی گومركی (الحماية الكمركية) وە راوەستاوە ، وەتا لەتوانایدا بێت ناهێلێت شتومەكی بێگانە بێنە ولاتەكەیەوە دیسانەوە ناتوانێت هەمو شتومەكێك قەدەغە بكات. چونكە هیچ دەولەتێك نی‌یە خۆی هەمو شتێكی هەبێت ، لەگەل ئەمەشدا ئەم دەولەتانە نیازیان وایە ، هەر چیەكی پێویستیانە خۆیان بیچێنن ، و دروستی كەن ، بەلاّم ناتوانن هەندێ بابەتی سەرەكی

بچێنن ، چونکە ئاو ، و هەوای وڵاتەکە یارمەتی ئەمە نادات ، بۆ نمونە: ئینگلتەرە ناتوانێت لۆکە ، وەیا کوش ، وەیا چایی ، وەیا قاوە ، و گەلێك شتی‌تر بروێنێت کە ئاوهەوایەکی گەرمی دەوێت ، ئەمە مانای وایە لەپاشەرۆژ و داهاتودا ، بازرگانی کردن لەنێوان ئەو دەولەتانەدا دەمێنێتەوە کە ئاو ، هەوای (المناخ) جۆربە جۆریان هەیە ، کەوا شتومەکی جۆربەجۆریش دەچێنن و دروست دەکەن بەڵام ئەو ولاتانەی کەوا هەمان بابەت بەرهەم دێنن ، و وڵاتەکانی تریش هەر ئەم بابەتەیان هەبێت ناردنی شتومەکەکانی بو ئەوی دەست نادات ، لەبەر ئەمە بازرگانی کردن لەنێوان سەروو ، وە خوارووداا دەبێت ، بوو نموونە وڵاتە ئیستیوائیەکانن لەگەل ولاتە ساردەکان ، وەیا وڵاتە فینکەکاندا بازرگانی دەکەن ، بەڵام ولاتە ئیستیوائیەکان ناتوانن بازرگانی لەگەل ولاتێکی تری ئیستیوائی دا بکەن ، هەروەها ولاتێکی فینکیش لەگەل ولاتێکی تردا کە هەمان ئاو ، و هەوای هەیە ناتوانێت بازرگانی بکات ، دیارە ناوچە ئیستیوائیەکان هەندێ جیاوازیان هەیە کە دەبێت بایەخی پێبدرێت ،و بخرێتە بەرچاوو، وەکو بونی گەلێك لەمەعدەن تیایدا ، بەلام بازرگانی تێکرا لەنێوان سەروو ، و خوارووداا دەبێت.

وا دیارە ئەم ئاراست و شێوازەیە کە ئەمرۆ دەولەتەکان گرتویانە تەبدر ئەمد بیِّی دەڵێن: دوا ئاراست لە شۆرشی پیشەسازیدا ، لەکاتێکدا کە هەموو دەولەتێك لە رووی پیشەسازیەوە دەتوانێت خۆی بەخۆی بەخێوکان ، راستە ئاسیا ، و ئەفەریقا زۆر درون لەپیشەسازی کردنەوە ، ئەفەریقا زۆر دواکەوتوە ، وزۆر هەژارە ، کەل وپەل ، وشتومەکە دروست کراوەکان میقداریان هەرچەندێك بێت ناتوانن بیکرن و لای خۆیان گلی دەنەوە ، بەڵام سێ ناوچەکانی تر کە تواناى گلَ دانەوە ، و کرینی کەل ، و پەل و شتومەکی بێگانەیان هەیە بریتین لە:ـ هیندستان ، و(چین) ، و سیبریا بۆیە دەولەتە بێگانە خاوەن پیشەسازیەکان. مل بۆ ئەم بازارە گەورانە قوت دەکەنەوە ، دوای ئەوەی بازارەکانی تر بەرامبەریان داخران ، ئیتر دەستیان کرد بەبیرکردنەوە لە (داگیرکردنی ئاسیا) تاکو لەزیادی شتومەك و کەل وپەلەکانیان رزگاریان بیت ، وەسەرمایەداریتی بەشەق و شرەکەیان رزگار کەن. بەڵام ئێستا چەوساندنەوە ، و سود وەرگرتن لەئاسیا ئاسان نیبە

لەبەر دوو هۆ:ـ یەکەمیان لەبەر پێشکەوتنی پیشەسازیەکانی خودی ئاسیا ، دووەمیان لەبەر ، بەربەرەکانی نێو دەولەتان. ئینگلتەرە دەیەوێت هیندستان بۆ خۆی بێت ، وەکو بازارێکی تایبەتی بۆ شتومەکەکانی ئینگلتەرە بە تەنیا کەچی هەریەکە لەژاپۆن و ، ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، و ئەلمانیا دەیانەوێت بەشێکیان لەم بازارەدا هەبێت ، هەروها بەنیسبەت (چین)یشەوە،سەرەرای ئەم بەربەرەکانییە بارو،وەزعی ناوخوی ولاتەکە ، کەمی رێگاوبان تەگەرە لەبازرگانی دەدەن ، بەلام یەکێتی سۆڤیت ئامادەیە میقدارێکی زۆری شتومەکی دروست کراو لەدەرەوە بکرێت بەمەرجێك دەولەتەکەی کە شتومەکەکە دەنێرێت ، دان بەخۆیدا بگرێت زوو داوای نرخەکەی لێ نەکات ، بەلام یەکێتی سۆڤیت بەم زوانە دەتوانێت هەرچیەکی پێویستێتی خۆی دروستی بکات.

ئاراستی دەولەتان و بیرورایان لەرابوردوودا ، و ئێستاش هەروایە بەرەو ئەوە دەچێت کە پشت بەیەکتری دەبەستن ، گەرچی دەولەتەکان هەریەکەیان سەربەخۆیە ، بەلام پەیوەندایەتیەکی تێك هەلکێش و بازرگانیەکی فراوان لەناوباندا پێگەیشتوە پەرەی سەندوە ، ئەم پەیوەندایەتیە گەیشتوتە رادەیەك ناگونجێت لەگەل ددولدتە سەربەخۆکان ، و سەربەخۆیی خویشیاندا ، بەلام هەنگاوی ئاینده بریتە لە دروست کردنی کۆمەلگەدیەکی سوشیالیستی نێو دەولەتان. سەرمایەدارێتی دەوری خۆی بینی وەختی هاتوە کەلاچێت ، وە ری بۆ سورشیالیستی بکاتەوە ، کەچی بدداخەوە بەخۆشی خۆی لاناچێت. دیمان کە چۆن تەنگوچەلەمە ئابوریەکان هەرەشەیان لەسەرمایەداری دەکرد لە ئەنجامی ئەمەدا ئەوەندەی نەما بو سەرمایەدارێتی بروخێت ، ئەوەبو دەستی کرد بەخۆ کردکردنەوە لە هەلوێستەکانیدا ، ئنجا هەولی دا ئاراستی پیشو بینێتەوەکایە ، بە رێبازی پشت بە یەکتری بەستن دا بروات لەناو دەولەتەکان دا ، بەم جۆرە سیاسەتی ئابوری نیشتمانی پەیدا بو بەلام ئەو پرسیارەی کە دەکرێت ئەمەیە: ئایا ئەم سیاسەتە سەردەکەوێت؟ خۆ ئەگەر سەرکەوت تاکەی بەردەوام دەبێت؟

جیهان خەرەمەیەکی سەبرە ، زۆرانبازی ، وبەغیلی چنگیان داوەتدیەك ئاراست وبیرورا نوێکان ئەم زۆرانبازی ، و بەغیلییەیان توندو کردوە ،

ئێمە دەبینین لەهەمو قارەیەك لەقارەکاندا ، ودیا لە هەمو ولاتێــك لــە ولاتەکاندا ، بێنەوا ، و مەزلومەکان هەوڵ دەدەن کە خۆیان بەشدارکەن لەو شتەچاکانە ، کە لەم جیهانەدا ، کەوا هەر ئەمان خۆیان بەرهەمیان هێناوە دروستیان کردوە. ئەوان داوای قەرزێکی کۆن دەکەنەوە کە دەبوایە ددمێــك بو بدرایەوە ، ئەم داخوازیانە لە هەندێ شوێندا شێوازێکی سەختی دەکرد ، وە گەنێك شوینی تردا شێوازێکی هێمنی ، و ناسك ، ئیتر ئایــا دەبــێــت ئەم هەزارو بێنەوایانە سەرزەنشت کە پیشەمــان وابــێــت ، دوای ئــەوەی سەغلەت دەکرێن ، ئنجا دەبن و رقیان هەڵدەستێت لەوانەی کەوا خراپترین کرداریان دەربارە کردون وە بەجۆرێکی ناشیرین لە دێرزەمانەوە خراپ دەیان چەوسێنەوە؟ و ماوەیەکی زۆر دورو درێژە کەوا خراونەتە پشت کــوی ، وە بە سوکی تەماشایان دەکرێت ، وە کەسیش خۆی پێوە ماندو نــەکــردون کــە فێری وێل و رەوشتیان بکات لەخزمەت پاشایاندا!.

لە هەمو لایەکدا شۆرشی ، هەژار بێنەوایان چینە دەوڵەمەنــدەکــانــی هەراسان کردوە بۆیە چینە دەولەمەندەکان ، کەلە کۆمەکیان لێ دەکەن ، تا ئەم شۆرشە بفەوتێنن ، ئنجا لێرەدا ، وتەرەنگاو ، رەنگە بریقەدارەکــان کە دەربارەی دیموکراتیەت ، و بەرژەوەندیەکانــی مــیــلــلــەت دەوتــرێــت دەشارنێتەوە ، ئیتر چینە دەولەمەندە کان بەردە لــەرووی خــۆیــان لادەدەن رووی خویان دەردەخەن ، وا دیارە لەگەلێك شوێندا سەرکەوتون ، ئــەمــرو لەئاسووە رۆژە سەختەکان دیارن ، ئەو رۆژانەی کە پرن لە ئاگرو ئــاســن ، چونکە کوشتار لە هەمولایەکدا دەبێتە مەسەلەیەکی مان و مردن لــە نــێــوان دوو رژێمەکەدا وانە رژێمە کۆنەکەو رژێمــە نــوێکــە ، لەهەمو لایەکــدا چارەنوسێك ، چ لەئەوروپا چ لە ئەمەریکاو چ لە هیندساندا کــە بــێگــومــان روودەدات دەی بینین ، رژێمە کۆنەکە خەریکە دەفــەوتــی ، گــەرچــی بــە روالەت وا دەردەکەوێت قایم و بەهێــزە. ئیتر چاککردنێکی کــەم و دەســت کارییەك (اصلاحات جزئية) هیچ دایەك نادات ، و کێشەو بەرەکان جێبەجێ ناکەن ، چونکە رژێمی سەرمایەداریئیستیعماری سەرجەم لە بنچیەوە شلۆق بوە ، و ناتوانێت پێداویستەکانی سەر شانی جێبەجێ کــات و بدرێــت بەرێوە.

ئەم هەمو زۆرانبازیانە چ سیاسی بێت و چ ئابوری وەیا رەگەز پەرستی بێت سێبەرێکی تاریك بەسەر جیهاندا دێنێت کە تارمایی جەنگی لیوە دیارە ، دەلین کەورەترینی ئەم زورانبازیە ، و لە هەمویان کرنك تر ئەوەیاند ، کە لە نێوان ئیستیعمارو ، فاشستیەت لەلایەك ، و شیوعیتی دایە لەلایەکی ترەوە ، ئەم دوو بەرەیە لە هەمولایەکی جیهاندا بەرامبەری یەکترین ، و هیچ رێیەك بۆ حەل کردن و جێبەجێ کردنێکی مام ناوەندی لە نێوانیاندا نەماوەتەوە.

ئەمرۆ لە جیهاندا دەرەبەگایەتی ، سەرمایەدارێتی سەشیالیستی ، نەقابەیەتی ، وئاژاوەکەری ، و شیوعیتی.. و گەلێك بیروباوەر هەن ، سدرباری ئەمانەش هەڵپەرستێتی! بەڵام دیسانەوە ئایدیالیزمیش (المثالیة) هەیە بۆ ئەوانەی حەزی لێدەکەن ئەمیش ئایدیالیزمی (المثالیة) خەیالو بوچەل نیە ، بەڵکو ئایدیالیزمی (المثالیة) کردو کۆشە ، لەپێناوی ئامانجێکی پاکی ئادەمیزادانەدا ، و هەمویان تێدەکوشین بۆ هێنەدی "جۆرج برناردشو" لەلایەکدا و تویەتی: "خۆشی راستەقیتە لەژیاندا ئەوە کە خزمەتی ئامانجێك بکەیت کە بروات بەگەورەیی ، و بوزوکی ئەو ئامانجە هەیە! ئەویش ئەوەیە خۆت نەخەیتە لاوە ، و دورە پەرێز بوەستیت. تاکو بەوپەری تێکۆشانەوە لەکاردا بیت ، وە تەمەنی خۆتت تێدا براندبێنەوە ، بۆ ئەوەی کە ببیتە هێزێك لە هێزەکانی سروشت ، نەك ببێت بە پارچەیەك لەدەرد ، و خەم وبەژارە ، هەمیشە بکەوێتە سکاڵا لەم جیهانەی کە هەمو توانایەکی بو بەختیار بونیت تەرخان نەکردوە!"

مێژوو پیشانی داوین کە چۆن ئەم جیهانە بەشەکانی لەیەکتر نزیك بۆتەوە ، سەردرای ناخۆشی و ناکۆکیش هەمو بەشەکانی پشت بەیەکتری دەبەستن ، جیهان بەراستی یەك پارچەی تەواوە ، و جیا نابێتەوە ، وە هەمو بەشێکی کار لەیەکتری دەکەن ، ئێستا زۆر زەحمەتە هەمو میللەتێك مێژوویەکی تایبەکاری خۆیی هەبێت ، ئەم قوناغەمان بری.. ئیتر مێژوو کارەساتەکانی جیهان سەرجەم باس دەکات ، داوە دەزووەکانی کۆ دەکاتەوە و بەیەکانەوە دەبەستێت ، و هەوڵ دەدات هیزە راستەقینەکانی کە دەی جولێنێت بیان دۆزێتەوە ، ئەوسا مێژوو دەی‌نوسێت ، ئەمە ئەگەر بمانەوێت مێژوو مەبەسی خۆی بدات بەدەستەوە.

دیمان چۆن ، هێزو تواناکانی نێو دەولەتان ، و تێك هەلكێشی بەرژەوەندیەکان کار لە دەولەتد جۆر بەجۆرەکان دەکەن ، تەنانەت لە جەرخەکانی د ێرینیشدا کە کۆسپە سروشتیەکان دەولەتەکانی لەیەکتری جیا دەکردەوە هەروەها پیاوە گەورەکانیش لە مێژوودا کاریان لە مێژوو کردوە ، چونکە کردو کۆشی ئادەمیزاد زۆر گرنگە لە چۆنێتی چارەنوس ، و پاشەرۆژی میللەتاندا ، بەلام ئەو هێزە مەزنانەی کە لەکاردان ، وە چاویان توندنو قاوە ، جار جار بەلای راستدا ، و جار جار بەلای چەپدا تورمان دەدەن ، ئەم هێزەش لە وانەی کە لەپێشەوە باسکران لە هەمویان گرنگترە.

ئەمرۆ دەبینین ئەم هێزە زلەی کەوا بەملیونە ها ئادەمیزادی خستۆتە جوولە ، هەروەکو بوومەلەرزەیەکی گەورە رێرەوی خۆیی گرتوە ، رووبەرو دیمەنی زەوی دەگۆرێت ئیمەش هەرچیەك بکەین ناتوانین پێوەستینین ، لەگەل ئەمەشدا ئێمە مانانیش لەم قوژبنە بچوکەی جیهانەوە ، سوکە کارێك لە خێراییەکەی ،و ئاراستەکەی دەکەین ،هەرکەسێك لە ئێمەیش بە پێی رەوشت وسروشتی خۆی ،بەرەنگاری دەبێت و بەرامبەری دەوەستێتەوە ، هەمانە: بەسلەمینەوە ، و ترسەوە ، هەمانە بەروو خۆشیەوە بەپیریەوە دەچێت.. ، هەمانە زۆرانی لەگەلدا دەکرێت ، هەمانە مل کەچی دەبێت و کرنۆشی بۆ دەبات ، و خۆی دەداتە دەست ئاهی نەکرفنە ، وە هەمانە سواری گەرداوەکە دەبێت و زال دەبێت بەسەریدا ، بە هەوسی خۆی لێی دەخورێت ، بەمە خۆی دەخاتە مەترسیەوە ، بەوە پێخوشحالە چونکە لەو باوەرەدایە ، وادەزانێت ، کە لەم کردەوە مەزنەدا بەشدارە.

ئاشتی لەم سەدەی بیستەمە شێواو ، و شلەقاوەدا نابینین ، کەوا سێیەکی تێپەریوە کە بەشی خۆیی بەتەواوی بێزیادو کەم لەشۆرش و جەنگدا برد. (موسولینی) ووتی: "جیهان تێکرا لە شۆرشدایە ، کارەساتەکان خۆیان بۆ کویێان بوێت دەمان رەتێنن بێئەوەی گوێ بداتە ئارەزووی ئێمە". هەروەها پێشەوا شیوعیە مەزن کە ، (تروتسکی) وشیاری کردینەوە کەئاشتیو ئاسایش لەم سەدەیەدا نابینین ، ووتی: "شتێکی ئاشکرایە سەدەی بیستەم لە هەمو وسەدەکانی تر کە بەسەر ئادەمیزاددا تێپەریون زۆر شێواو ترە ، ئەوی لەم سەدەیە دابژی ، و لەپێش هەمو شتێکدا ئاشتیو ئاسایشی بوێت "بەراستی خراپترین کاتی هەلبژاردوە کە تیایدا لەدایك ببێت!!"

جیهان تێکرا ژان دەی گرێت ، تارمایی جەنگ ر شۆڕشەکانی بەسەردا کشاوە ، ئەگەر نەتوانین لە چارەنوسی خۆمان دەرباز بین ، ئەی چی بکەین؟ ئایا وەکو حوشتر مرخ (النعامة) سەرمان لەچارە نوسی خۆمان بشارینەوە ، وەیان ئازایانە بە دەوری خۆمان هەستین لەکار تێکردنی کارەساتەکاندا؟! ئەگەر پێویست بێت بەرەور رووی مەترسیەکان ببینەوە ، وە کەیف و خۆشیمان لەبەشداربونمان لەم کارە پیرۆز مەزنەدا ، وەرگرین و لەهەست کردنمان کەوا: "کردەوەکانمان شان بە شانی مێژوو دەروات"؟!

هەمو کەسێك لەئێمە ، وەیان باری هیچ نەبێت هەمو کەسێکی رۆشنبیر سەیری "باشە رۆژ" دەکات تاکو بزانێت ئەو پاشەروزە بۆ ئەو چی تێدایە پاشە رۆژێك کە دەبێتەوە بە "ئێستا" هەمانە چاوەروانی ئەنجامەکەی دەکات ، و چاوەروانی چاکەیە ، هەمانە بەترس ، و لەرزەوە چاوەروانی دەکات. ئایا جیهان لەپاشەروزدا جیهانێکی بەختیار ، و جوانە ، و هەمو خەلکی لە خێرو بێریدا بەشدار دەبن ، نەك ئەم خێرو بێرە هەر تەنها بۆ کەمەکێك لەو خەلکە بێت و بەسەریاندا رژا بێت؟! وەیا جیهانێك دەبێت لەمرۆ پر کوێرەوەری ، و کولۆڵی تر ، دوای ئەوەی کە جەنگەکان فەوتاندویەتی ، و شارستانێتی ئێستای وێران و خاپور کردوە؟!.. نەخێر هەردوو نوقلانەو بەتەما بونەکە دوورن ، لەوانە یە پاشەرۆژ مام ناوەندییەك بێت لە نێوان هەردووکیاندا.

لەو کاتەوە کە چاوەروانی پاشەرۆژین و بەتەمای هاتنی ئەوین ، دەبێت تێبکۆشین بۆ بنیات نانی جیهانەکەی کە ددمانەوێت چۆن بێت ، لەسەردەمی سرکی ، و کیویلەییەوە ، تاکو شارستانێتی ئێستا بەمل کەج کردن ، و کورنۆش بردن بۆ سروشت ئادەمیزاد پێش نەکەوتوە ، بەڵکو بەسەربێچی کردنی ، و ، ئارەزووی تەواوی بۆ زاڵ بون بەسەر سروشتدا ، وە بەکارهێنانی بۆ چاکە و سودی خۆی پێشکەوتوە.

ئەمە بریتیە لە "ئێستا". بەلام "پاشە رۆژ" ئەوانەی کە لە سەردەمی تودان کچم دروستی دەکەن پاشەرۆژ دەستکردی ملیونەها کچ و کورە هەمولایەکی جیهاندا ، ئەوانەی کەوا ئێستا گەورە دەبن و ئامادە دەبن بۆ هاوکاری ، و هاوبەش بون لە دروست کردنی ئەم "پاشەرۆژە"دا.

(١) كومنويلث: كۆمەڵێکە لەناوچوو ، ولاتەکانی سەربە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بەپێ‌بە بریاری (وستمنستر) لە ساڵی ١٩٣١دا دروست بو بریتیە لە دەولەتە سەربەخۆکان ، و پارێزراوەکان ، و وڵاتانی دومنیوتی پێشو لەگەل وڵاتە ژێر دەستەکاندا کەوا دان بە سەرۆکایەتی مەلیکی بەریتانیا دا دەنێن.

وەرگێڕی کوردی

(٢) ئەسکندنافیا:ـ ئەو وڵاتانەیە کە کەوتۆنەتە سەرووی رۆژئاوای ئەوروپاوە کە بریتین لە سوید ، و نرویج ، و فلندە.

وەرگێڕی کوردی

# دوا نامـــه

## ٣/ئایی/١٩٣٣

ئەوا ئێمە کچە شیرینەکەم گەیشتینە کۆتایی چیرۆکەکە ، ئێستا هیچم پێنییە بی لێم بەڵام لەبەر ئەوەی حەز دەکەم نامەکانی کە بۆ دەنێرم ، بە خۆشی کۆتایی بێنم سەبارەت بەمە ئەم دوانامەیەت بۆ دەنوسم.

لەکانی خۆیدا بو لە نوسینی ئەم نامانە بونـیـەوە ، چونـکـە ئـەو ماوەیەی کە حوکوم درا بۆم ـ دو ساڵ بو ـ نزیکە کۆتایی بـێـت ، دوای سێوسێ رۆژی تر بەردەبم ، ئەمە ئەگە رێپێشتر بەرم نـەدەن ، هـەروەکـو وەردیانەکە هەندی جار هەرەشەم لێدەکات! ئەو دووساڵەی کە حوکـوم درام ماوەیان هێشتا ماوە ، سێ مانگ و نیویان لە مـاوەی گـرتـنـەکـەم کـەم کردوتەوە،هەروەکو چۆن لەگەل حەپسەکانی تردا رەفتار دەکەن کە رەوشتیان لە بەندیخانەدا باشە، من بەحەپسێکی بە ئەدەب، دا دەنین، گەرچی هیچی وام نەکردوە کەشایانی ئەم ناوەبم بەم جۆرە شەشەم جاری گرتنم کۆتـابـی دێت دوای ئەمە دێمە جیهانی پان و بەرینەوە ، بەلام لەبەر چ مەبەسێـك؟ زۆربەی برادەر ، و هاورێکانم دابەش بون بەسەر بەندیخـانـەکـانـدا ، و ولاتەکەم هەموی وەکو بەندیخانەیەکی گەورەوایە.

ئەم نامانەی نوسیو من چەند زۆرن ، چەندم مـەرەکـەب ، و کـاغـەزی دروستکراوی پیشەسازی نیشتمانیم بەکارهێناوە! ئایا ئەم هەموە بـەهـیـچ دەچێت؟ ئایا ئەوەی ئەم هەمو مەرەکەب و کاغەزە بۆیان هێناویت شتێکـی تێدایە بەلاتەوە گرنگ بێت؟ کچم بێگومان دەڵێیت بەڵێ ، چونکە دەزانێت هەچ وەلامێکی تر بدەیتەوە لەوانە یە پێم ناخۆش بێـت ، کـچـم لـەبـەر ئەوەی کە منت خۆش دەوێت بۆیە ناتوانیت لەم مەترسیەدا برکێشی بکەیـت کچم ئیتر ئەوی بۆم نوسیویت بە دڵت بێت یان نەء ، هەرگیز ناتوانیت ، ئاوات بەو بەختیاری وکەیف وخۆشیە بخوازیت کەوا من هەستم پێ دەکرد لە کاتێکدا کە ئەم نامانەم رۆژ بەرۆژ لە ماوەی دوو سـاڵـی رەبـەقـی دورو درێژدا دەنوسی.

زستان بو هاتمە ئێرە ، ئنجا ئەوەندەی پێ نەچو زستان جێی خۆی چۆل کرد بو بو بەهاری کورتمان کە گورج لە گەرمان هاوینّدا خنکا. کە زەوی وشك بوەوە ، و قلیشی برد ، ئادەمیزاد و گیان لەبەر چۆن یەك کەوتنە هەنگی هەنگ بۆ شنەی بایەك کە هەناسەی پێ بدمن ، ئنجا وەرزی باران هات ، بە ئاوی ساردی فێنکدوە ، ئیتر دوای ئەم ، پایز بەسەردا هات ، ئاسمان شین و روون بوەوە ، و شەوگاریش زۆر جوان بو ، بەم جۆرە دەورانی ساڵ کۆتایی هات ، تا سەر لەنوێ دەست پێبکاتەوە: زستان ، بەهار لەپاشاندا هاوین ئنجا وەرزی باران ، ئەمە هەموی و من لێرە دانیشتوم ، و بۆت دە نوسم ، و بیر لەتو دەکەمەوە ، چاوەروانی وەرزەکان دەکەم تێپەرن ، و گوێ لە دلۆپی باران دەگرم کە دەی دات بەو شوێنەدا کە تیایدا دانیشتوم.

چەند خۆشە دەنگی باران
بەسەر زەوی بەسەربانەکاندا
چەند خۆشە گۆرانی باران
بۆ دڵی تەنگ و خەفەت بار

سیاسەت شوناسی بەناوبانگی ئینگلیز (بنیامین دزرائیلی) لە سەدەی نۆردەهەمدا دەڵێت "کابرایەکی ساویلکە ئەگەر حوکوم بدرێت بە دورخستنەوە ، وەیان گرتن عەقلی لای خۆی نامێنی! بەڵام وێژەوان و ئەدیب رۆژانی بەند یخانە ، بە بەختیارترین رۆژانی ژیانی خۆیی دادەنێت (دزرائیلی) ئەم قسەیەی کردوە ، کە لەبابەت "هوجوجروشیوس"ەوە نوسیویەتی ، کە حاکم ، و فەیلەسوفی هۆلندەبی بوە ، و لە سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە کە حوکمی ئەبەدی درابو ، بەڵام دوای دوو ساڵ لە بەندنحانەدا رای کرد ، ئەم دوو ساڵە بە نوسینی گەلێك کتێبی وێژەیی ، و فەلسەفیەوە رای بوارد ، بەم بۆنەیەوە ناوی چوە ناو نەمرانەوە ، مێژوو ناوی گەلێك بلبل دەبات کە لە پشت شیشی بەندیخانەوە خوێندیانە وەکو (سرفانتس)ی ئەسپانی کە دانەری کێتبی (دون کیشوت)ە وە (جون بنیان)ی ئینگلیزی کە دانەری کێتبی "هاتنە پێشەوەی حاجیەکە"یە.

بەڵام بەش بەچاکی خۆم وێژەوان نیم ، وە نالێم ئەو ماوە ساڵە زۆرانەی کە لە بەندیخانە دابوم ، خۆشترین رۆژانی ژیانم بون ، بەڵام

ئەوی دەبێت بیڵێم ئەویە کە نوسین و خوێندنەوە یارمەتیەکی باشیان دام لەتێپەڕبون و بەسەر بردنی ئەم ساڵانەدا ، بەڵێ من نەوێژەوان ، و نەمێژوونوسم ، کەوا بو من چیم؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر زەحمەتە ، زۆر شتم تاقیکردەوە ددستم کرد بەخوێندنی زانیاریەکان لە کولێجدا ، ئنجا رووم کردە یاسا ، دوای ئەوەی گەلێك تەجروبەو تاقیکردنەوەی ژیانم دی. ئنجا ئیتر رووم کردە پیشە فروانەکەی میللەت کە لە هیندستاندا پەرەی سەندووە کە ئەمیش هامشۆی بەندیخانەیە.

کچم نەکەی شتێك لەمانەی کە باسم کردوە بۆت لەم نامانەدا بە مەسەلەیەکی دوروست سەلمێنراوی دابنێیت ، وەیان وتەی شارەزا و پسپۆریکد. پیاوێکی سیاسی دیارە لە هەمو باس و بابەتێکدا دەبێت بیروڕای خۆی دەرخات ، وە خۆی بەزانین و شاردزاییەکی زۆر تردوە پیشان دەدات لەوەی کە بەراستی ددی زانێت ، بۆیە ددبێت زۆر بەووردی چاودێری بکرێت ، ئەم نامانەی کە بۆم ناردویت چەند نوسراوێکی زەق ، و ئاشکران دەزوویەکی باریك پێکیانەوە دەبەستێت. چونکە من کە مێژووی جیهانم دەردەخست و پیشان دەدا ، بەسەر چەند چەرخێك و چەند کارەساتێکدا کە زۆر گرنگن بازم دەدا ، وە کە بگەیشتمایە رووداوێك کە بەلای منەوە گرنگ بوایە خیوەتەکەمم هەڵ دەدا ، و ماوەیەکی دورو درێژ لای دەمامەوە کچم ئەم نامانە بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکران بۆ ئەو شتانەی حەزیان لێ دەکەم وەیان حەزیان لێ ناکەم. دیسانەوە جارو بار نیشانەی چونێتی سۆزی دەرونمە (الحالة النفسية) لە بەندیخانەدا. بۆیە حەز ناکەم ئەوی لێرەدا باسم بۆ کردویت بەمە سەلەیەکی دوروست و سەلمێنراوی دابنیت. لەوانەیە لە هەندی لەوانەدا کەوتومە ، و باسم کردوە هەلەیدکی زۆری تێدا بێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بەندیخانە ، کە نەکتێبخانەی تێدایە ، و نە سەرچاوەیەك کە لە بەردەستدا بێت ، بەندیخانە جێگەیەکی باش نی یە بۆ نوسین لە بابەتەکانی مێژوودا لەبەر ئەمە دەبوایە تارادەیەکی زۆر پشتم بەو تێبینیانە ببەستایە کە دوانزە ساڵ لەمەبەر ، راهاتبوم دەم نوسین - واتە لەو کاتەوە کە هامشوی بەندیخانەم دەکرد دەم توانی گەلێك کتێب بخوێنمەوە ، بەڵام کتێبانە ئەم دەهاتن و دەرۆیشتن چونکە مەحال بو لەم شوێنەدا کتێبخانەیەکم هەبێت ، ئیتر لەم کتێبانەوە گەلێك زانست و

بیرورام وەرگرتوە ، ئەوی نوسیدمە هیچی خۆم دام نەهێناوە ، رەنگی هەندی جار توشی زەحمەتی ببێت لە خوێندنەوەو ، پیاچونەوەی نامەکانمدا وازیان لێبێنە و گوێیان مەدەری ، چونکە گەلێك جار جیاوازی نێوان تەمەنی هەردووکمانم لەبیر دەچوەوە ، بۆیە کەدەم نوسی هەروەکو بۆ یەکێکی وەکو خۆمی بنوسم وابو.

من لەم نامانەدا مێژوویەکت پێشکەش ناکەم بەڵکو تەنیا چەند نیشانەوە بەڵگەیەکی زەق و ئاشکرا ، و چاو پێداخشاندنێکی کورتو پڕو سەرپێی لەرابوردووی دوورو درێژمانت پێشکەش دەکەم ، کەوا خۆم خوێندنەوەیم بە دڵ بوە ، بەڵام ئەوی تو مەبەست بێت لە کتێبە زۆرەکانی مێژوو دا دەی دۆزیتەوە ، چونکە یارمەتیت دەدەن لە تێگەیشتنی سەردەمە دێرینەکاندا ، بەڵام خوێندنەوەی کتێبەکان بە تەنیا سودێکی نییە ، ئیتر بۆ ئەوەی شارەزای رابوردوو ببیت پیویستە لەسەرت کە بە چاوێکی پڕ سۆزو تێگەیشتن و ، وردییەوە سەیری رابوردو بکەیت ، بۆ ئەوەی لە مروڤێك بگەیت کە لەزەمانێکی پێش ئێستا دا ژیاوە ، دەبێت شارەزای ئەو ناوچە و مەڵبەندە ببیت کە دەوری داوە لەگەل ئەو زروفەدا کە تیایدا ژیاوە ، و ئەو بیروباوەراندی کە لە مێشکیدا بوە ، چونکە شتێکی بێ مانایە کە حوکوم بدەین بەسەر پێشینانماندا ، هەروەکو لەم زەمانەماندا ژیاین ، وە هەمان بیرکردنەوەی ئەم سەردەمەمان کە ئێستا ئێمە دەیکەینەوە ئەوان هەیان بوبێت. بۆ نمونە ئێستا نابینین کەسێك بەرگری لە بەندایەتیو کۆیلەیەتی بکات، کەچی رۆشنبیرێك، و فەیلەسوفێکی وەکو(أفلاطون) بونی بەندایەتیو کۆیلەیەتی بەمەسەلەیەکی بەلگە نەویست دادەنا ، تا ئەم ساڵە نزیکانەی رابوردووش هەزاران لەولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکادا گوزران لە پێناوی پاراستنی کۆیلەیەتیو بەندایەتیدا. هەمو کەسێك دەی سەلمێنی کە مەحالە بەپێوەرەکانی (المقاييس) ئێستا حوکوم بەسەر رابوردودا بدرێت ، بەلام بەرامبەر بەمەیش هەیە ئەو بێمانایيە ناسەلمێنی کە: حوکوم دانە بەسەر ئیستادا بەپێوەرەکانی رابوردو ، ئاینە جۆر بەجۆرەکان یارمەتی چەسپاندنی باوەر ، و نەریت و رەوشتە کۆنەکانیان داوە ، ئەو باوەر ، نەریت و رەوشتانە کە بەراستی لە جێگەو کاتی خۆیاندا بە کەلك بون ، بەڵام ناگونجێت و بەکەڵکی پێشکەوتنی ئەم سەردەمە ، و ئەم رۆژانە نایەت.

کچم ئەگەر بە چاویکی دڵسوزانە تەماشای مێژووی کۆن بکەیت دەبینیت کە ئیسقانە وشکەوەبوەکانی کە تیایدا بوە ، بونەتە لەش و لاریێکی بر جولەی شانازی لەگۆشت و خوێن ئنجا رێزێك نەقەلەبالغیو گیان لەبەرانی پیاو ، و ئافرەت ، و منداڵان دەبینێت ، لە هەمە تەمەن و مەڵبەندێکدا کەوا جیاوازن لە ئێمە ، گەر چی لە ئێمە دەچن لە هەمو سفەتێکی ئادەمیزاددا ، لە چاکەو خراپە ، و لە هێزو ، لە لاوازیدا. مێژوو پیشاندانێکی ئەفسوناوی نییە ، بەڵام بۆ ئەوانەی دەی بینین گەلێك ئەفسونی تێدایە.

مێشکمان پرە لە وێنە هەڵواسراوەکان لە گەورەیی ، و مەزنی مێژوو: میسر ، بابل ، نینوی ، و شارستانێتی کۆنی هیندستان ، و هاتنی ئاریەکان بۆ هیندستان ، و بڵاو بونەوەیان لە ئەوروپا ، و ئاسپادا ، رۆشنبیر بە سەرسام هێنەرەکانی چین ، کنسوس ، و ئیغریق ، ئیمپراتۆریەتی رومانی ، و بیریطنی ، داگیرکردنی سەرکەوتوانەی عەرەبەکان لەهەردوو قارەکەدا ، راپەرینی رۆشنبیری هیندیەکان ، و بوکانەوەی ، شارستانێتی (مایا ، و ئەزتك)ی نەناسراو لە ئەمەریکادا ، ولات داگیرکردن لەلایەن مەغەلەکانەوە بە جۆرێکی فراوان ، چەرخەکانی ناوەراست لەئەوروپادا کەنیسە جوانەکانی (قوطی)یەکان ، هاتنی ئیسلام بۆ هیندستان ، ئیمپراتۆریەتی مەغول ، راپەرین و راست بونەوەی زانیاری وهونەر لە رۆژئاوای ئەوروپادا ، دۆزینەوەی ئەمەریکا ، ورێگە دەریاییەکان بۆ رۆژهەڵات ، داگیرکردنی وڵات لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە ، پەیدابونی ئامێرە زلە کان ، پێگەیشتنی سەرمایەداری ، پەرەسەندنی پیشەسازی ، و دەسەڵاتی ئەوروپاو ئیستیعمار گشت سەرسام هێنەرەکانی زانیاری لە سەردەمی نوێدا.

گەلێك ئیمپراتوریەت پەیدابون وفەوقان ، هەزارەها ساڵە ئادەمیزاد لە بیری چۆتەوە ، بەم جۆرە دەمێنێتەوە تاکو زانایەکی شوێنەوارناسی (عالم اثری) بەسەبر ، جارێکیتر دێت دەی دوزێتەوە لەژێرلەمدا ، کەوا ئەم ئیمپراتۆریەتە گەلێك ئاوات و بیرورای زۆری هەبوە ، ودئیسپاتی کردوە کە بە هێزترین ئیمپراتۆریەت بوە.

ماری کولرج ئەم هەڵبەستەی وتوە:
شارستانێتی میسر فەوتا
یونان و طروادەنەمان
رۆما ناجەکەی فەوتاو لەکیس چو
فینیسیا (بندقیة) فیزەکەی نەما
بەڵام ئەو ئاواتانەی کە بە بیری منداڵەکانیدا دەهات
سەرەرای ئەوەی کە ئەم ئاواتانە سەرپێیی، ونەدیوبون
بەڵام هەر ئەم بۆ مایەوە.

بەراستی رابوردو، ودێرین گەلێك شتمان پێ دەبەخشن، هەمو رۆشنبیری، و شارستانێتی وزانیاریەکی کە ئەمرۆ هەمانە بەخشندەی رابوردوویەکی دور وەیا نزیکی، ئیتر زۆر رەوا، وبەجێ یە ئەگەر دان بەقەرزداریماندا بنیین بۆ ئەم رابوردوە.

بەڵام نابێت هەمو ستایشیکمان هەر بو رابوردوو بێت، چونکە بەرامبەر بە پاشەرۆژ ئەرك و پێداویستیەکمان لە ئەستۆدایە ئەگەر لە قەرزداری ئەو رابوردوەمان زیاتر نەبێت کەمترنی‌یە. ئەوی تێپەری وبەسەرچو مرد، مەحالە بیگۆرین، بەڵام پاشەرۆژ هێشتا نەهاتوە لەوانەیە بتوانین لە دروست بونیدا بە شداربین، خۆ ئەگەر رابوردوو لابەن وبەشێکی لە راستی (الحقیقة) پێشکەش کردبن، بەڵام پاشەرۆژ گەلێك بەش، ولابەنی تری لەو راستیە شاردۆتەوە، وداوامان لێدەکات کە بۆی بگەرێین. بەڵام رابوردوو هەمیشە رقی لە پاشەرۆژە، بەچنگە بە هێزەکانی هەمیشە دەمان گرێت، ئنجا ئێمەش پێویستە لەسەرمان لەگەڵیدا بکەوینە زۆرانبازی بۆ ئەوەی ئازاد بین، ئەو سا بەرەو رووی پاشەرۆژ دەبینەوە، بەرەو پیری دەچین.

لەو وتە نەستەفانەی کە هەیە: مێژوو گەلێك وانە، ودەرسمان فێردەکات، دیسانەوە مێژوو هەرگیز دووبارە نابێتەوە، ئەم دوو، وتەیە راستە، چونکە ئێمە لە مێژووە وەهیچ فێر نابین، ئەگەر هەوڵ بدەین تەنیا لاسایی بکەوینەوە، وەیا چاوەروانی ئەوەبین لێی کە دووبارە بێتەوە، وەیان هەروەکو خۆی بمێنێتەوە بەڵام بەهۆی رێنمایی کردنی مێژووەوە وەبە تێکۆشان دۆرینەوەی ئەو هێزانەی کە دەی‌جولێنن ئنجا لێوەی فێر دەبین، تەنانەت لەم رووەشەوە، وڵامی راستەو خۆمان لێی

دەست ناکەویت کارل مارکس وتویەتی: "مێژوو شێوازێکی نییە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارە کۆنەکان ، مەگەر بەدانانی پرسیاری نوێ نەبێت".

ڕۆژانی رابوردوو ، ڕۆژانی پێدا راپەرمون ، و باوەرێکی کوێرانەبون ، نەگومان ، وند لێپرسێتن تێدا نەبوە ، ئەم پەرستگەو مزگەوت ، وکەنیسە جوانانە مەحال بو دروست بکرانایە ئەگەر بەباوەرێکی پر بە دڵ نەبوایە لەلایەن ئەندازیار ، وبەنا ، و خەلکەکانەوە نەبوایە بە تێکرایی ئەو (بەر داندی) ، کە بەرد سەر بەرد دادەنران ، وەیان وێنە جوانەکانیان لەسەر هەڵدەکەندرا ئەمانە هەموی ئاگادار کردنێکی ئیمەیە لە بابەت لەم باوەرەوە ، تەنانەت تا ئێستاش بورجی پەرستگەکان ، منارەی مزگەوتەکان و کاندرائیە بەرزەکان کە روویان کردوتە ئاسمان هەروەکو لە دڵسوزی نوێژێکی بێدەنگدا بپارێتەوە وایە ، ئەماند ئێستاش کارمان تێدەکەن ودەمان جولێنن ، گەرچی ئێمە ئەو باوەرەمان نییە کەوا ئەمانەی دروست کردوە ، بەلام ڕۆژانی ئەم باوەرە بەراستی تێپەری ، وە لەگەل خۆیدا ئەفسونی ئەم بەردانەی برد ، هەزارەها لە پەرستگە ، ومزگەوت وکەنیسە وکندرائی تا ئەمرۆ هەر دروست دەکرێن ، بەلام ئەو گیاندی نییە کەوا زامنی مانەوە ، وژیانی شوێنەوارە دێرینەکان بۆ هەر لە چەرخەکانی ناوەراستەوە. پەرستگەکانی ئەمرۆ زۆر جیاوازی نییە لە پێنای دامەزراوە بازرگانیەکان کەوا چاکترین نمونەی ئەم سەردەمەمانە.

سەردەمی ئێستامان سەردەمی وەهم وخەیالە ، سەردەمی گومان ، ودوو دڵی ، و پرسینەوەیە ، ئێمەش رۆڵی ئەم سەردەمەین بە گەلێك لە باوەرو رەوشتە کۆنەکان قایل نابین ، وبروایان پێناکەین ، ئەمە چ لە ئاسیا ، وەیا ئەوروپا ، وەیان ئەمەریکادا بێت ، لەبەر ئەمەیە ئێمە لەرێیازی نوێ ولایەتەکانی تری راستی (الحقیقة) دەگەریین کە زیاتر بگونجێت لەگەڵ ئەو باروزروفەدا کەوا دەوری داوین. ئەمرۆ ئێمە هەر پرسیار دەکەین ، وەیان لە مشتومرو زۆرانبازی ، وە دەم لە گەلێك بیروباوەرو ، فەلسەفەوە دەدەین ، ئێمە ئێستا لە سەردەمێك دادەژین لە سەردەمی (سقراط) دەچێت سەردەمی پرسیارکردنێکی بەردەوام بۆ بەلام پرسیارکردنەکەمای لە چوارچێوەی شارێکی وەکو (أثینا)دا نییە ، بەڵکو سەرتەم تەمەهان دەگرێتەوە ، گەلێك جار روودەدات ئەو ستەم وکوێرەوەری ، ودڵەراوکێیەی

که له جیهاندا دەبینین بێ ی سەغلەت دەبین وەجیهانمان لەبەر چاو تاریک دەبێت وەرێبازێکی رزگاری نابینین ، وە وەها هەست دەکەین کە هەرگیز هیچ ئومێدێك لەم جیهانەدا نی یە.

ئەم جیهانە بۆ ئێمە ، وەکو زەوی پڕ لە ئاواتە
هەمە جۆر ئاواتی جوان ونوێ
لە خاکێکدا کە رووناکی ، وخۆشی ، وخۆشەویستی تێدانی یە
نەداد ، ونەئاشتی ونەئاسایش
وە ئێمە لەم دەشتە تاریکەدا
کەوا پڕە لە تێکۆشان وخەبات
لەشەوە زەنگدا سوپایەکی بێشومار ونەفام یەخەی دەگرێت.

لەگەل ئەمەشدا خۆبەدەستەوەدان بەم بیروباوەڕە تاریکە لەڕاستیدا مانای وایە لەو دەرس و ، وانەیە تێنەگەیشتوین کە مێژوو لەگەل ژیاندا پێکەوە فێریان کردوین ، مێژوو: فێری پێگەیشتن وپێشکەوتن ، و توانای پێشکەوتنی ئادەمیزادی کردوین لە پێشکەوتن وبەرزبونەوەدا. ژیان سەختە گەلێك قوورولیتە ، و زەلکاو ، و وگۆمی تێدایە ، بەلام دیسانەوە دەریای مەزن وچیا وبەفر وپرشنگی ئەستێرەی درەشاوەی تێدایە لە تاریکی شەودا (بەتایبەتی لەناو بەندیخانەدا). خۆشەویستیش هەیە خۆشەویستی خزم وکەس وکار ، هەروەها دەردی یەك کەوتوان لە پێناوی یەك مەبەسدا هەیە دیسانەوە موسیقی ، وکتێب وتێکرا جیهانی بیروراش هەیە ، وا لە هەریەکێك لە ئێمە دەکەن کە لەگەل بوێژەکە دا بلێین:

"ئەی خواوەندا من لەسەر ئەم خاکە دوروست بوم و دەژیم
دیسانەوە من لە ئاسماندام کە ئەستێرەکان دەدەرەوشێتەوە"

ئاسانە کە ئادەمیزاد هەمیشە هەرچی جوانیەکی لەم گەردونە دایە (الکون) خۆشی بوین ، و لەجیهانی بیرکردنەوە ، وخەیالدا بەسەر گەردانی بژی ، بەتەقدلادانی هەلاتن ، وراکردنی لە مدینەتی خەلکیتر ، بەم شێوەیە ، وگوێ نەدانە شەرمەزاربونیان ، وئەنگ وناخۆشیان هیچ ئازایەتی نی یە.. بیر کردنەوە تاکو بێتەدی دەبێت خاوەنەکەی بەرە وئیش وتێکۆشان بەرێت. رومان رولاند وتویەتی: "ئیش کردن وتێکۆشان بریتین لە ئەنجامی بیرکردنەوە ، وە هەر بیرورایەك ئەنجامەکەی تێکۆشان نەبێت ، ئەو

بیرورایە ددبێتە دەغەلی ، وحیانەت کـاری ، ئـەگـەر خـزمـەت گـوزاری بیرورابین ، دەبێت خزمەت گوزاری تێکۆشانیش بین".

خەلکی خۆیان لە تێکۆشان دور دەخەنەوە لە ترسی ئەنجامەکانی ، چونکـە تێکۆشان مانای خۆ خستنە مەترسیەوەیە ، مەترسیش لە دورەوە ، بەراستـی شتێکی سامناکە بەلام کچم ئەگەر لە نزیکەوە سەیری بـکـەیـت تـا ئـەو رادەیە سامناك وبەترسی نابینیت ، گەلێك جار هاورێیەکی باشە ، خۆشـی ژیان زیاتر دەکات.

ژیانێکی رێك وپێکی ، وئاسایی زۆر جار بەست ، بێـزارو ودیـارە و ئەو شتانەی کە تیایدایە بە کاروبارێکی سروشتی دادەنیین ، کە شایـانـی کەیف وخۆشی نییە ، بەلام ئەو شتانە چەندبە نرخن ، و حەزیان لێدەکەین کە ئەگەر ماوەیەکی کەم بێ ئەو بژین. گەلێك کەس ژیانی خۆیان دەخەنـە مەترسیەوە کە بە جیاکاندا سەردەکەون بـۆ رابـواردن وکـەیـف ،کـە لـەو سەرکەوتنەدا دەیبینین ، ئەو مەستییەی کە هەیانە لەکاتێکدا کە خـۆیـان دەخەنە مەترسیەکەوە ، وتەماشای مەترسیە کـە دەکـەن کـە دەوری داون ، وئنجا بەسەریدا زاڵ دەبن ، هەستیان ناسك ددبێت ، ونرخی ژیان باشـتـر دەزانن ئەو ژیانەی کە بەداوە دەزوویەکی باریکەوە پێودی بەندن.

هەمو یەکێك لە ئێمە دەتوانێت نیشتەجێی خۆی بریار بدات چ لـەنـاو شێوێکی نزمی پر لە تۆزو گەرد وتەمی خراپ بۆ تەن دروستی تەنها لەبـەر ئەوەی کە تۆزێك سەلامەت بێت ، وەیا نیشتەجێکەی لەسەر چیابـەرزەکـان بریار بدات ، بەو مەترسیانەشەوە کە لەم چیابەرزانە داید تاکو هەوایەکی پاك هەلمژێت ، وبیر لەو دیمەنە دوورانە بکاتەوە ، وپێسوازی هەلهاتنـی رۆژ بکات.

لەم نامەیەدا گەلێك نیشانە وبەلگەم هێنایەوە ، کە لە هەلبەستەکانەوە وەرم گرتبون ، بەلام حەز دەکەم ئەمانە کۆتایی پێبێنم لە هەلبەستێکـەوە کە لەنزاو نوێژ دەچێت کەوا "رابـنـدرنـات طاغـور" لـە جـیـتـنـجـالـی نوسیویەتی:ـ

"لە جێیەك عەقل ناترسێت ، سەربەرز وبلندە..

لە جێیەك زانستت ئازادە....

لە شوێنێك نەفامی دیوارەکانی جیهانی شر نەکردوە...

له شوێنێك ووشه له ناخی راستیەوه دێتەدەرەوه....
له جێیەك تێكۆشانی بەردەوام باڵی بۆ تەواوی (الكمال) راكێشاوه..
له جێیەك جۆگەڵەی عەقل وژیری ، رێرەوی له بیابانی نەریته مردوەكاندا بزر نابێت..
له جێیەك عەقل وژیری بەرەوسات وكاتێكی زۆر فراوان دەچێت له بیر وكردەوەدا...
ئەی خوداوەند لەژێر ئاسمانی ئەم ئازادیەدا ، نیشتمانەكەم ئاگادار كەیتەوه...!
كچی خۆشەویستم لێبوتیەوه ، بەڵێ بونەوەی ئەم دوانامەیەم ، ئـايـا راسته دوانامەیه..!
بێگومان نەء ، چونكه لەداهاتو ، وپاشەرۆژدا زۆرترت بۆ دەنــوسـم ، بەڵام ئەم زنجیرەیەیه كەوا بە تەنها كۆتایی هاتوه ، ئیتر بۆ شادبون بــه یەكتر.

# پاشکۆ

دەریای عەرەب

١٤/ نۆڤەمبەری ١٩٣٨

پێش پێنج ساڵ وسێ مانگ لەمەوبەر لەم زنجیرەیەدا دوو نامەم نوسیبو کە ئەوسا لە بەندیخانەی (دهرادن)ی مەرکەزیدا بوم ، ماوەی حوکمەکەم کە دوو ساڵ بو لە بەندیخانەدا خەریك بو تەواو دەبو ، ئەو بەدەستەکەوتنی نامانەی کە بۆم نوسیبویت لە رۆژانی تەنیایم دا خستمنە لاوە (بەلام هەمیشە هاورێم بویت لە خەیالمادا) ، ئیتر خۆم ئامادەکرد بۆ چونە دەرەوە ، بۆ جیهانی دەرەوە جیهانی بزوتنەوە ، وئیش کردن ، لەم کاتەدا بو بەرەڵا کرام ، بەڵام پێنج مانگ نەیخایاند بەسەرمدا هەمیسان جارێکیتر گەڕانمیانەوە بۆ جێگەکەی پێشوم لەبەندیخانەکەدا ، دوای ئەوە دیسانەوە دوو ساڵیان حوکوم دام ، ئەمجارە پێنوسم گرت بە دەستەوە ، دەستم کرد بە نوسینی چیرۆکی ژیانم

ئنجا جارێکی تر یش بەرەڵاکرام وهاتمە دەرەوە ، هاوبەشی غەمتانم کرد ، کەوا لەو کاتەوە تارماییەکیان بەسەر ژیانمدا هێنا ، بەڵام بەدبەختییەك کە توشی ئادەمیزاد دەبێت لەم ژیانە پڕ لە ماندوێتی ، وغەم وبەزارەدا نابێت گوێی بدرێتێ وبەهیچ دابنرێت ، چونکە ژیان لە هەر یەکێك لە ئێمە هێز وتوانای دەوێت ، تاکو زاڵ بیت بەسەریدا ، بەم جۆرە جیابونیەوە: کچم ئیتر تۆ چویت بۆ پوڵی هێمن ، و خوێندن ، ومنیش کەوتمە بەزمی تێکۆشان وکۆڕی حەباتەوە.

پێنج ساڵ تێپەر بو ، پڕ بو لە گەلێك ئێش وئازار ، ئنجا هەر چەندە تەمەنمان بۆ پێشەوە بچێت ئەوەندە جیاوازیەکانی نێوان ئەو جیهانەی تیایدا دەژین ، وجیهانی ئاواتەکانمان گەورە ، وفراوان دەبێت ، هیواو ئومێد ئەوەندەی نەماوە لەبەر جنگی خراپەدا بتاسێت لەگەل ئەمەشدا کە لەم کاتەدا ، کە بۆت دەنوسم ، لەبەردەممدا دەریای عەرەب دەبینم بە

خاموشی درێژ بونەوە بەهێز وتواناوە ، هەر وەك خەو بینێنێك بێت ، لە خەو بینینەکان ، وە لەبەر تریفەی مانگە شەودا دەدرەوشێتەوە.

پێویستە لە سەرم لەم پاشکۆیەدا چیرۆکی ئەم پێنج ساڵەت بۆ بنوسم ، چونکە ئەم نا مانە دەبن بە کتێبێك ، ئنجا ئەوی بڵاوی دەکاتە ، سورە لە سەر تەواو کردنی چیرۆکە کە ، وبیگەیەنمە ئەمرۆمان ، کارێکی زەحمەتە چونکە گەلێك کارەسات لەم ماوەیەی دوابیەدا روویان داوە ، بە جۆرێك ئەگەر وەختی تەواوم هەبێت کتێبێکی ترم دەنوسی ، تەنانەت گێڕانەوەی خودی کارەساتەکان بە تەنیا ئیشێکی دور ودرێژ وماندوکەررە ، بۆیە تەنها کورتە باسێکی ئەو کارەساتانە دەکەم کە روویان داوە ، هەندی تێبینیم خستۆتە سەر هەندی لەنامەکانی کە نوسیومن ،ئێستا بە کورتی باسی ئەو کارەساتە گرنکانە دەکەم کە لەم ساڵانەدا روویان داوە.

کچم لە نامەکانی پێشومدا باسی گفتوگو ، وبەربەرەکانیم بۆ کردیت لەم سەردەمە تازەیەدا ، هەروها دەربارەی پێکەیشتنی فاشستێنی ، و نازێتی ، مەترسی جەنگ ، ئەم ناخۆشی وبەربەرەکانیانە لە ماوەی پێنج ساڵی رابوردودا بە راستی زیادیان کردوە گەر چی تا ئێستا جەنگێکی جیهانی رووی نەداوە ، مەگەر چەند وردە جەنگێك نەبێت کە لە ئەفەریقا وئەوروپا وڕۆژهەڵاتی دور لە ئاسیادا روویان داوە. هەمو ساڵێك کە تێدەپەرێت نەء بەڵکو هەمو مانگێك کە تێدەپەرێت بەدوای خۆیدا دەست درێژیەکی نوێ ، ونرسێك دێنێت وبەرپا ددکات. لە پەیوەندایەتی نێو دەولەتاندا ئاژاوە بەرەی سەندوە. کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) و هەمو تەقەلایەك بۆ یارمەتیدان لە نێو ددولەتاندا سڕی نەگرت. مەسەلەی داماڵینی چەك مرداربووەوە. هەمو دەولەتێك بدیێی توانای خۆی ، شەو ، ورۆژ خۆی چەکدار دەکات. نرس باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە ، دوای سەرکەوتنی نازێتی وفاشستینی ئەوروپا بە گورچی بە رێبازی دڕندەیەتیدا دەروات.

لە نامەکانی پێشومدا ئەو هۆیانەم دەرخست کەوا لە پشت بەرپابونی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە نێوان ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨ خۆیان شاردبووەوە ، جەنگەکە هەڵگیرساو ، کوژایەوە ، وکۆتایی هات ، لە ئەنجامیدا پەیماننامەی (فرسایل) و بروانامەی کۆمەلی میللەتان (عصبة

الأمم) پەیدابون ، بەلاّم کێشە کۆنەکان جێبەجێ وحەل نەکران بەلکو کێشە وبەرەی نوێیان هاتە سەر وەکو بژاردنەوەی زیانی ، وقەرزەکانی جەنگ وداماڵینی چەك ، وئاسایشی گشتی وتەنگو چەلەمەی ئابوری ، وبلاّویونەوەی بێئیشی بە جۆرێکی فراوان ،سەرەرای کێشە وبەرەکانی ئاشتی لەگەڵ بونی کێشە وبەرەکانی کۆمەلاّیەتی ،کەلەتەرازوی جیهان ویەکسانی یەکەیی لاسەنك کرد. لە یەکێتی سۆڤیتدا هێزە کۆمەلاّیەتیە نوێکان کە سەرکەوتون ، لە کاردان بو دروست کردنی جیهانێکی نوێ سەرەرای ئەو هەمو زەحمەتیە زلاّنە ، بەرهەلّستیەکی جیهانیش ئاو قایان بوە. لە شوێنەکانی تریشدا گەلێك گۆرانکاری قوڵی کۆمەلاّیەتی روویان داوە. لەبەر ئەوەی ، ئەم گۆڕانکاریانە رێی دەریا زبونیان نەبو ، بە چەسپاوی لەجێی خۆیاندا مانەوە ، سەبارەت بەبونی گیانێکی سیاسی ئابوریان.
بەرهەم هێنان لە جیهاندا زیادی کردو پەرەیسەند ، ئاواتەکانی ، نەوەکانی پێشین هاتەدی ، بەلاّم ئادەمیزاد کە بەندەیەتی گۆش کراوە ، وراهاتوە ناتوانێت لە هەژاری ، ونەبونی بەولاوە بیر لە هیچی تر بکاتەوە ، چونکە ئەم دوانە خەریکی کردون. بەم جۆرە سامانە نوێکان ، بەبێ مەبەس ، وبەبێ بەرنامەیەك ، دەگیران وبلاّو دەکرانەود بۆ یە بێئیشی وکوێرەوەری لەگەلیدا پەرەیان سەند.
گەلێك کۆنگرە بەستران ، دەولەتەکانی جیهان کۆدەبونەوە تەقەلایان دەدا کە ئەم ناکۆکیە سەرسام هێنەرانە جێبەجێ بکەن ، وبکەنە ئاشتیەکی بەردەوام ، ئیتر گەلێك بروانامەو ، پەیماننامە ، وهاوپەیمانی دەبەستران وەکو پەیماننامەی (واشنطن) و (لوکارنو) وبروانامەی (کلوچ) وبروانامەکانی دەست درێژی نەکردن ، کەچی بەلاّی کێشە سەرەکیەکاندا نەدەچون ، ئنجا تەنها هەر بەوەی کە توشی واقیعێکی تاڵ ئەوسا هەمو ئەم پەیماننامەو ، بروانامانە دەبونە هەلّم ونەدەمان ، ئەنجامکەشی دەبوە شمشیرێك لەسەر ملی ئەوروپا ، پەیماننامەی (فرسایل) مردار بوەوە ، نەخشەی ئەوروپا جارێکیتر سەر لە دروست کرایەوە ، جیهان دابەش کرایەوە بە چەند پارچەیەکی نوێوە ، مەسەلەی قەرزەکانی جەنگ کە پوکایەوە ، و لە بیرچوەوە ، تەنانەت ، دەولەمەندترینی دەولەتدکان بریاری نەدانەوەی قەرزەکانیدا.

بەم جۆرە هاتیەوە بۆ سەردەمی پێش جەنگەکە واتە ساڵی ١٩١٤ ، و پێش ئەم ، بە هەمو کێشە وبەرە ناکۆکیەکانی‌یەوە ، بەڵام ئێستا صەد ئەوەندەی جارانی ئاڵوزتر وبەتین تر بوە سەربارەت بەوانەی کە لەم دوایەدا رووبان دا. ئیتر رژێمی سەرمایەدار - لە روخانیدا - دەستی کرد بە بە هێتر کردنی ئابوری نیشتمانی ، لەگەل پەروەردە کردنی ئیحتیکارەزلەکان (تروست) ، پەنا دەباتە بەر توند وتیژی ، وزۆرە ملی ، رژێمی سەرمایەداری تاقەتی هیچ شتێکی نەماوە تەنانەت دیموکراتی بار لە مانیش ، فاشستیەت ، ونازیتی بە هەمو دڵرەقی ، ودرندەییەتی گیانەوە پەیدابون ، جەنگیان کردیە مەبەس ، وئامانجی خۆیان ، وە لە هەمان کاتدا لە یەکێتی سۆڤیت دا دەولەتێکی مەزنی نوێ پەیدابو ، هەستایە سەرپێ ، ونمونەی سەرپێچی‌یەکی بەردەوامە لە رژێمەکونەکان ، و ئەمێکەرێکی سەر سەختە بۆ ئیستیعمار و فاشستیەت چۆن یەك.

ئێمە لە سەردەمی شۆرشەکاندا دەژین ئەم شۆرشانە کە جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤ دادەستی پێکرد پەیدابون ، ساڵ بە ساڵ بەردەوامە ، جیهانیان فرێ داوەتە باوەشی ناکۆکیەکانەوە ، شۆرشی فەرەنسە (١٥٠) ساڵ لەمەو بەر رووی‌دا بو بە هۆی پەیدابونی یەکسانیەکی سیاسی ، بەڵام زەمان گۆرراوە ، ئەم یەکسانیانەش ، بەش ناکات ، سنوری دیموکراتێتی دەبێت فراوان بێت تاکو یەکسانی ئابوریش بکرێتەوە ، ئەمەیە ئەو شۆرشە مەزنەی کە پیایدا تێ دەپەرین ، بەراستی ئەو شۆرشەیە کە یەکسانی ئابوری دێنێتە دێ ، وە دیموکراتیەت دەبەخشێ بەپێی مانا راستەقینەکەی لە پێشکەوتنی زانیاری ، و ئەنجامەکانی نزیکمان دەخاتەوە.

ئەم یەکسانی‌یە هەرگیز لەگەڵ ئیستیعمار ، وسەرمایەداریتیدا ناگونجێ وبۆیان دەست نادات چونکە هەردوکیان لە پلەی یەکەمدا پشت بە نەبونی یەکسانی. وچەوساندنەوەی میللەتان وچینەکان دەبەستن بۆیە ئەم شۆرشانە توشی بەرهەڵستیەکی بەتین دەبن لەلایەن ئەوانەوە کە لەم چەوساندنەوەیەوە سودمەند دەبن ، هەر چەندێك ئەم بەرهەڵستیە زیاد بکات ، و زۆرانبازی پێبکات ئەوەندە بیروراى یەکسانی سیاسی ، وە دیموکراتی بەرلەمانی دوور دەکەوێتەوە ، ئا ئەوەتە فاشستیەت لە گەلێك رووەوە دەمان گێرێتەوە بۆ چەرخە کانی ناوەراست ، رەگەز پەرستی دەکات ، وحوکومرانی مەلیکی

ئوتوكراتی خواوەندایەتی دەكۆرێت بە فەرمان رەوایی پێشەوایەك كە هەمــو دەسەلاتەكانی بەدەستەوەیە. پێگەیشتن وپەیدابونی فاشستیتی لە ماوەی ئەم پێنج سالەی رابوردودا ، پەلاماردان لەلایەن فاشستیەتەوە بۆ سەر هەمو بیر ویاودرەكانی دیموكراتێتی ، لەگەل تێگەیشتنی فاشستـێـتـی دەربــارەی ئازادی وشارستانێتی كارێكی وای كردوە ، كە پاراستن ، وبـەرگـری لــە دیموكراتیەت بونەتە كێشەو ، بەرەی ئەمرۆ ، ئیتر زۆرانبــازی ئـەمـرۆی جیهان لە نێوان شیوعیتی ، وسوشیالیستی لەلایەك ، وەفاشستێتــی نــیـیـە لەلایەكی تر دا. بەلكو زۆرانبازیەكە لە نێوان دیموكراتیەت ، وفاشستێتــی داید . هەمو هێزە دیموكراتیە راستەقینە كان بەرامبەر بە فاشستـێـتــی رادوەستاون نەسیانیا باشترین نمونەیە بۆ ئەمە.

بەلام بیروراى دیموكراتێتی بەگومان فراوان ودرێژ دەبێتەوە لەبەر ئەمە ئەو كاسانەی كە سەر بەكۆنەپەرستین لە هەمولایــەكــدا لــێی دەتــرســن ، گەرچی ئەو كەسانە بەروالەت حەز بە دیموكراتێتی دەكات بەلام لەواقیعــدا هەمو مەیل ، وئارەووی بەلای فاشستێتــی دایــە. سـیــاسـەتـی دەولــەتــە فاشستیەكان ئاشكروا دیارە هیچ گومانێك لە ئامانجەكانیاندا نیـیە ، بەلام ئەوی سەرسور هێنەرە ئەو سیاسەتەیە كە دەولەتە دیكوكراتیەكان لــەســەری دەرون ، بەتایبەتی ئینگلتەرە ، حوكومەتی ئینگلیز لە ئاسیا ئەفەریقــا ، وئەوروپادا دەورێكی كۆنەپەرستانەی بینی ودەستی دا بەپشتی نازیەكانـــیو فاشستیەكاندا ، وهانی دەدان ، بەراستی ئەوی سەیرە ئینگـلـتـدرە بـەم دەورەش هەلدەستا ، كەچی دەشی زانی كە ئەم سیاسەتــەی بــەشـێـك لــە ئیمپراتۆریەتە كەیی لەكیس دەدات ، چونكە لەگەشە كردنی دیموكراتیەتـــی راستەقینە دەترسا ، ودەمەیلی بە لای پێشەوا فاشستیەكانــدا هــەبــو ، گەشەكردنی فاشستیتی ودەست كردنیان بەداگیر كردنی ولاتان ، لــەچــاكـی حوكومەتی ئینگلیزە وە بو! بەلام ولاتە یەك گرتودكانی ئەمەریكا كــە لــە ئینگلتەرە زیاتر پەرۆشی دیموكراتیەتە گەلێك جار هەولی داوە كە لەگــەل حوكومەتەكانی‌تر دا هاوكاری لە جلەوگیری سەركیشی دەست درێژكردنەكانی فاشستیە كاندابكات ، كەچی ئینگلتەرە هەمیشە لەگەل ئەمەدا نەبو ، بەلام فەرەنسا بە تەواوەتی پشتی بە (لندن) وسیاسەتی دەردودی ئینـگـلـتـدرە دەبەست تا رادەیەك نەی دەوێرا سیاسەتێكی سەربەخۆیانەی خۆیی هەبـێـت

ئینگلتەرە بە جۆرێکی هەمیشەیی ، و بەردەوام لە کۆنگرەکانی ئیش وکاردا ، کە لە نێودەولەتاندایە (مؤتمرات العمل الدولية) سیاسەتێکی کۆنەپەرستانەی گرتەبەر ، لە یونیوی ١٩٣٧ تدا ، کۆنگرەکەی نێودەولەتان لە مەر ئیش وکار بریاریدا کە سەعاتی ئیش کردن لە هەفتەیەکدا بۆ کرێکارانی چنین (عمال النسيج) بکرێت بە چل سەعات سەرەرای بەرهەڵستی کردنی بەردەوام لەلایەن ئینگلتەرەوە ، تەنانەت ولاتەکانی سەر بە میللەتانی بەریتانیا (کومنویلث) وازیان لە ئینگلتەرە هێنا ، ودەنگیان دا بە پێشنیارەکە ، بەلام نوێنەری هیندستان کە حوکومەتی ئینگلیز دای نابو دیارە دژ بە پێشنیارەکە دەنگ دەدات ئەندامانی نوێنەری ولاتە یەکگرتوەکان ، کە بریتی بون لە خاوەن ئیش وفرمانەکان ، ونوێنەرانی حوکومەت ، بە ئاشکرا وتیان: "پێش هاتنمان بو جنیف نەمان دەزانی کە حوکومەتی ئینگلیز بەم جۆرە کۆنەپەرستە" یەکێکیان دوویاتی کردەوە وتی:ـ "ئینگلتەرە بوە بە ئیمام وپێشەوای کۆنەپەرستی لەم جیهانەدا".

بەلام کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) سەرەرای هەمو لایەنە لاوازەکانی نوێنەریتی بیرورای نێودەولەتانی دەکرد ، بروانامەکەی سزا دانی تێدابو بۆ دەست درێژکەران وستەمکار ، کەچی نەی توانی هیچ بکات بەرامبەر بە ژابون کە (منشوريا)ی داگیرکرد (جگە لەدانانی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە نەبێت بۆ تاوانبارکردنی دەست درێژکەر). ئینگلتەرەبو کە زبونی هان دا لەم سەرجلی وسەرکێشی پەیدا ، ئیتر هەر لەو کاتەوە ئینگلتەرە لەسەر لاوازکردنی کۆمەلەکە دەرۆیشت مەگەر بە دەگمەن لە چەندحالەتێکدا نەبێت پەیدابونی فاشستێتی کە پربو ، لە سیاسەتێکی دەست درێژی ودوژمنکاری کە ئەمە سەرپێچی‌یەکی ئاشکرابو لە کۆمەلەکە ، وەتا رادەیەك فەرەنسە ، وئینگلتەرە ملیان شۆر کرد بۆ ئەم سەرپێچی بە بوو بە لە دەسەلاتی کۆمەلەکەیان کەم کردەوە ، وبڕ هێزیان کرد ، دەولەتە فاشستدکان لەکۆمەلەکە هاتنە دەرەوە: ئەلمانیا لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٣دا ، لە دوای ئەم ژابون وئیتالیا. ئنجا لە سەبتەمبەری ١٩٣٤دا یەکێتی سۆڤیت بو لە ئەندام تیایدا ، بەم خوێنێکی نوێی تێکرا ، و بوژاندیەوە ، فەرەنسە لەبەر ئەوەی لەئەلمانیای نازی دەترسا ، ناچاربو لەگەل یەکێتی

سۆڤیتدا هاوپەیمانی ببەستێت ، کەچی ئینگلتەرە وای بەچاك زانی لەگەڵ ئەلمانیادا هاوپەیمان بێت نەك لەگەڵ یەکێتی سۆڤیتدا گەرچی ئەم هاوپەیمانیە لەسەر حیسابی بڕوانامەکەی کۆمەڵی میللەتان بێت. هەر چەندە دەولەتە فاشستەکان لە دەست درێژیەکی نوێدا سەربکەوتنایە ، ئەوەندە زیاتر بە خۆیاندا رادە پەرمو کە دەتوانن سەرپێچی کۆمەڵی میللەتان بکەن بێئەوەی توشی هیچ زیانێك ببن ، دوای ئەوەی کە لایان ئاشکرابو وەدەرکەوت کە حوکومەتی ئینگلیز دەست ناهێنێتە بەریان.

ئەو یارمەتیانەی کە حوکومەتی ئینگلیز پێشکەش بە دەولەتە فاشستیەکانی دەکرد هەر ئەمە کارەساتەکانی: (چین) ، حەبەشە ، ئەسپانیا ، وناوەراستی ئەوروپایان روون دەکردەوە ، بەراستی هەر ئەم کارەساتانە روون یان کردەوە کە دامەزراوە کەی کۆمەڵی میللەتان کەوا نوێنەری ئاواتی ئادەمیزادێتی‌بو چۆن وێران وکاول بو.

دیمان کە ژاپۆن چۆن سەرپێچی لە لەکۆمەڵەکەو جیهان تێکراکرد وە (منشوکو)ی بەروالەت کرد بە سەرەکی حوکومەتەکەی ئەوی ، گەر چی ژابون بە ردبری سوپا (منشوریا) ی داگیرکرد بێ ئەوەی بە شێوەیەکی ردسمی ئیعلانی جەنگی لەگەڵدا بکات ، بەڵام ژاپۆن ئاشوبی لەناو ولاتەکەدا بەرپاکرد .وەکردی بە بیانو بۆ دەست خستنە ناو کاروباری ولاتەکەوە. هەر یەکە لە ئیتالیا ، وئەلمانیای نازی هەمان رێبازیان گرت ، وە میقدارێکی زۆر پرو پاغەندەشیان نایە بانی ئێستا وەکو جاران دەولەتەکان ئیعلانی جەنگ ناکەن. (هتلر) لە نورمبرغ دا ساڵی ١٩٣٧ لەو تارێکیدا ووتی: "ئەگەر بمەوێت پەلاماری دوژمنەکەم بدەم ، من پەنانایەمە بەر گفتۆگوکردن ، وەوەخت بە فیرۆدان وچەند مانگێك بەم جۆرە بمێنمەوە ، بەڵام من ئەوی هەمیشە کردومە وادەکەم ، کە تاریك دا هات وەك بروسکە خۆمی پێدا دەدەم".

ئەلمانیا دۆڵی (السار)ی لە کانونی دووەمی ١٩٣٥ دا داگیرکرد ، دوای لێپرسینەکەی کەلەوێکرا ، هەر لە مایسی ئەو ساڵەدا (هتلر) گوێی نەدایە مەرجەکانی چەکداربون ، وبێچەکی کە لە پەیمانی (فرسایل) دا هەبو ، وە خزمەت کردنی سەربازی بەزۆر ، بلاوکردەوە ، فەرەنسا ترس ، ولەرزگرتی ، کەچی ئینگلتەرە نەك هەر بەم کردەوانە قایل بو بەڵکو

گەلێکی‌تری تابە پانی‌بدودی کە پدیماننامەیەکی نەهێنی دەریایی لەگەڵ ئەلمانیادا ئیمزاکرد ئەم پەیماننامەیە خۆی لە خۆیدا ئاش بەتاڵێك بو بۆ پەیماننامەی (فرسایل) بەم جۆرە دەبینین ئینگلتەرە لە پەیماننامە ئاشتیەکە خۆی گێل کرد ، ئەوی لەم کارەدا سەیرە ، ئینگلتەرە ئەم هەمو ئیشانەی دەکرد بێ‌ئەوەی راوێژ بەفەرەنسەی هاوپەیمانی بکات لەکاتێکدا ئەلمانیا خۆی چەکدار دەکردەوە بە جۆرێك هەمو ئەوروپای ترساند.کە فەرەنسەی ئینگلتەرە چی پێدەکا گورج هەوڵیدا هاوپەیمانی لەگەڵ (موسولینی) دا ببەستێت ، تاکو بەمە ، مەترسی ئیتالیا لەسەر سنورەکەی کەم کاتەوە.

حەبەشە وەیا "ئەثیوبیا":

ئەم هاوپەیمانیە هەڵێکی زێرینی بو (موسولینی) رەخساند کە دەمێك بو چاودروانی دەکرد ، چەند ساڵێك بو ، خۆی ئامادە دەکرد بۆ داگیرکردنی حەبەشە بەڵام لەمەدا دوو دڵ بو چونکە لە هەڵوێستی ئینگلتەرە وفەرەنسە دڵنیانەبو ، پەیوەندی لەگەڵ فەرەنسەدا کرژ وناخۆش بو ، دوای ئەوی لە ئوکتۆبەری ١٩٣٤ دا کابرایەکی ئیتالیایی (مەلیك تەسکەندەر) ی مەلیکی یو کوسلافیای کوشت لەگەڵ وەزیری دەرەوەی فەرەنسەدا (لویس بارتو) ، بەڵام ئێستا (موسولینی) هەستی کرد ، ئەگەر حەبەشە داگیرکات فەرەنسە وئینگلتەرە بەرهەڵستی ناکەن بۆیە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٥ لەشکری خستەری وحەبەشەی داگیرکرد ، وە لەم کاتەشدا کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) کۆبوبووەوە وەحەبەشەش ئەندام بو لە کۆمەڵی میللەتاندا ، ئەمە جەزرەبەیەکی بەتین بو هەمو جیهانی سەراتاپا گرتەوە. ئنجا کۆمەڵەکە بریاریدا ئیتالیا دەست درێژ کەرو ، تاوانبارە. پاش ماوەیەکی دور ودرێژ سزای ئابوریان خستە سەر ئیتالیا ، واتە ئەندامەکان پێویستە لەسەریان مامەلە لەگەڵ ئیتالیا دانەکەن لە هەندێ جۆری کەل وپەل وشتومەکدا ، بەڵام شتومەکی گرنگ بۆ پێداویستی جەنگ لەناو لیستەی شتومەکە قەدەغە کراوەکاندا نەبو! وەکو نەوت ، وئاسن ، وپۆلا ، وخەڵوزی بەرد. ئیتر کۆمپانی‌یەی نەوتی (ئەنکلو ئیرانی) ئەم هەڵەی بەکارهێنا ، بەرهەمی زیاد کردو ، ئەو نەوتەی ئیتالیا پێویستی‌بو بۆی نارد ، لەبەر ئەمە ئیتالیا ئەم سزا دانە زۆرکاری تێنەکرد گەرچی

هەندی سەغلەتی هێنایە رێی ئیتالیا. ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا پێشنیاری کرد کە فرۆشتنی نەوت بە ئیتالیا بوەستێنرێت ، بەلام ئینگلتەرە بەم پێشنیارە رازی نەبو.

دوای ئەمە وەزیری دەردوەی بەریتانیا (سیرسموئیل هور) لەگەل وەزیری دەرەوەی فەرەنسادا (مسیولافال) رێك کەوتن کە بەشێکی زۆر لە حەبەشە بدەن بە ئیتالیا ، بەلام ورووژانی رایگشتی لەبەریتانیادا (سیرسموئیل هور) یان ناچار کرد وازبێنی وئیستیقالە بکات. لەم کاتەدا حەبەشەییەکان بەئازایانە دەجەنگین وشەریان دەکرد ، بەلام ئەو هێزەیان نەبو کە بتوانن بەرهەلستی دوژمنێکی زل بکەن کە گەلێك فرۆکە وبۆمبای هەبید. وەئیتالیا ییەکانیش دەستیان نەدەپاراست لە فڕێدانی بۆمبای سوتێنەر ، وغازی ژەهراویدا بەسەر دانیشتوە بەسەرزمانەکاندا لە ئافرەت ومندال ، وئوتوموبیلی خەستەخانە وخەستەخانەکاندا ، سەردرای ئەمە ستەمترین کوشتاریان کرد کە مێژوو دبیبێتی. لە مایس ١٩٣٦ لەشکری ئیتالیا چوە (ئەدیس ئەبابا) ی پایتەختەوە دوای ئەوە بەشێکی گەورەی لەولاتەکە داگیرکرد. ئیتالیاییەکان لەحەبەشەدا دوو سال ونیویان بەسەردا تێپەری ، تا ئێستاش بەرگری کردن لەناوچە دورەکانی حەبەشەدا بەردەوامە بەم جۆرە دەبینین ئیتالیاییەکان نەیان توانی هەمو حەبەشە داگیر بکەن گەرچی فەرەنسە ، وئینگلەنرە دانیان نا بە داگیرکردنیدا ، وسەلماندیان.

ئەم مەینەتیە لە حەبەشەدا رووی‌دا بەو جۆرە کەوا ئینگلتەرە وفەرەنسا وازیان لە حەبەشە هێنا ، ئیسپات بو کە کۆمەلەکە بێهێزە وهیچی بەدەست نیە ، وبێی ناکرێت بۆیە (هتلر) هەستی کرد کە دەتوانێت سەرپێچی لێبکات وبەبێترس سەرکردەیی لەشکرەکەی کرد و لەمارتی ١٩٣٦ دا ناوچەی بێچەکی (راین) ی گرت ، ئەم کردەوەیەی (هتلر) بەرهەلستیەك وبایەخ بێنەدانێکی نری پەیماننامەی (فرسایل)بو.

ئەسپانیا:

لە سالی ١٩٣٦ دا فاشستەکان تەقەلایەکی نوێیان دا بو داگیرکردنی ئەوروپا ، بەلام هەر ئەم سالە جیاوازییەکی هەبو ، چونکە بوبو بە مەلبەندی تێکۆشان لەپێناوی دیموکراتیەت وئازادیدا ، بەراستی دیمان چۆن

هێزەکان بەربەردکانیان دەکرد بۆ داگیرکردنی ئەسپانیا. وەجمهوریەتە ساواکە بەرهەڵستی کۆنەپەرستێتی ئاینی ودەردبدگی دەکرد. ئینجا لە شوباتی ١٩٣٦ دا حیزبە پێشکەوتنخوازە کان بون بەیەك ، وبەرەیەکی میللیان پێك هێنا ، وە لە پێش ئەمەشدا لە فەرەنسەدا بەرەیەکی میللیان پێك هێنا بۆ بەرهەڵستی فاشستێتی تازە پەیدابو کەوا دەستی کرد بو بە هەرەشەکردن لە جمهوریەتی فەرەنسە ، تەنانەت لەوی فاشستەکان تەقەلایەکیان دا بۆ ئینقلاب وکۆ دەتا بەڵام سەری نەگرت. میللەتی فەرەنسە زۆر بە گەرمی پێشوازی ئەم بەرە میللیەیان کرد ، ئەم بەرەیە لە هەڵبژاردنەکانی ناوخۆدا سەرکەوت ، وە حوکومەتێکیان پێك هێنا بۆ چاکە وبەرژەوەندی کارگەران گەلێك یاسای بریاردا.

هەروها بەرەی میللی لە ئەسپانیادا لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی (کورتس) دا سەرکەوت ، وە حوکومەتێکیان پێك هێنا ، لەکاتی هەڵبژاردنەکەدا بەڵێنیدا کە رژێمی زەوی ، وزار چاك کات ، وە سنوریش بۆ دەسەلاتی کەنیسە دابنێت ، ئەوانەی سەر بەکۆنەپەرستین ، هەر کە هەستیان کرد ئەم ئەم ئیصلاحاتانە نزیك بۆنەوە زۆر ترسان ، پشتی یەکتریان گرت بریاریان دا دەستی خۆیان بوەشینن ، داوای یارمەتیان لە ئیتالیا ، وئەلمانیاکرد ، ئەمانیش فریایان کەوتن لە ١٨ یولیوی ١٩٣٦ دا (جنرال فرانکو) دەستی کرد بە شۆرش بەیارمەتی سوپای مەغریب ، پێش ئەوەی ئەم بچێتەپاڵ شۆرشەکە ، گەلێك بەڵێنی درایە بەدەسدربەخۆیی (مراکش) (فرانکو) وای دەزانی کە بە ئاسانی ، وگورج سەردەکەوێت بەتایبەتی کەوا سوپای لەگەڵدایە ،سەرەرای یارمەتیەکانی کە لە دوو دەولەتە بەهێزە کەوە بۆی دەهات ، وا بو خەلکی دەردەکەوت کە جمهوریەتە کە هەر دەکەوێت ، بەڵام جمهوریەتەکە مەردایەتی ودڵێری جەماوەری جوڵاندکە دی مەترسی دەوری داوە چەکی بەسەردا دابەش کردن ، داوای لە جەماوەر کرد کە بجەنگن لە پێناوی ئازادیاندا ، جەماوەریش وەڵامی داواکەی حوکومەتەکەیان دایەوە هاتن بە بیریەوە ، گەلێك بەئازایەتی ، وبەجەرگانە بەو چەکە کەمەی کە هەیانبو کەوتنە جەنگەوە دژی نۆپ وفرۆکەکان ، وەتوانیان فرانکو لە سنوری خۆیدا بوەستێنن. گەلێك پێشمەرکە (المتطوعون) لە هەندەرانەوە رژانە ئەسپانیاوە تاکو لە پێناوی

دیموکراتیەندا بجەنگن ، پەلێکی نێو دەولەتانیان دوروست کرد گەورەترین یارمەتی ئەسپانیایان دا لەو کاتەوا کە زۆر پیویستی بەیارمەتی بو لە کاتێکدا کە پێشمەرکە (المتطوع) لەهەمو دەولەتەکانەوە دەهاتن و دەچونە رێزەکانی حوکومەتەکە وە. سوپای حوکومەتی ئیتالیا هات بۆ یارمەتی فرانکو ، ئنجا ئیتالیا وئەلمانیا فرۆکە ، وفرۆکەوان ، فەنی‌یان نارد بۆ یارمەتی فرانکو. (فرانکو)ش پشتی بە ئەفسەر وسەربازە مەشق پێکراوەکانی (المدربین) ئەم دوو دەولەتە بەستبو کە بۆی هاتبو. سەر بە جمهوریەکانی ئەسپانیاش پشتیان بە خوێن گەرمی ، وئازایەتی ، ولەخۆبوردن بەستبو ، شۆرش گیرەکان (تاقمی فرانکو - وەرگێری کوردی) ئەمانە لە نۆفەمبەری ١٩٣٧ دا لە دەروازەکانی (مدرید) نزیک بونەوە. بەلام ئازایەتیەکی نوێ لە بەرەنگاربونی‌یاندا وەستاندنی ، چونکە خەلکەکە ، وسەر بە جمهوریەکان هاواریان دەکرد:- "تێپەر نابن" ئەم دوو وشەیەیان کرد بە دروشمی خۆیان. (مدرید) هەمو رۆژێك دوو جاری بۆ-مباران ، وگولەی سوتێنەری تویەکان دەبو ، خانوەکانی (مدرید) ی روخان ، ئاگری تێپەربو ، هەزاران لە لاوانی کوژران لەپێناوی بەرگری کردن لە (مدرید). بەلام (مدرید) خۆی راگرتو ، و بەسەرکەوتویی مایەوە. دوو ساڵ بەسەر شۆرشگێرکاندا (تاقمەکەی فرانکو - وەرگێری کوردی) تێپەری وهێشتا نەچونەتە ناو (مدرید)دوە ، ودورروشمی "تێ‌بەرنابن" مایەوە لەو شارەدا کەوامەبینەتی ، وکوێرەوەری تیایدا پەردەی سەندبو ، بەلام لەگەل ئەمەشدا بە شانازیەوە سەربەرزە ، تەنانەت بۆ بەنیشانەو ، رەمزێك بۆ ئیانی بەرزی میللەتی ئەسپانیا.

دەبێت لەم تێکۆشانەی ئەسپانیا ئاگاداربین ، وتێی بگەین ، چونکە بێگومان لە تێکۆشانێکی ناوخو ، ومەحەلی زیاترە. چونکە بە ، بەگزاد چونی بەرلەمانێك دەستی پێکرد کە بە شێوەیەکی دیموکرانیانە هەڵبژێرابو. کۆنەپەرستەکان هاواریان کرد شیوعیەتی لە ولاتەکەدا پەرەی‌سەندوە ، وە مەترسی ئابلوقەی ئابنی‌داوە ، بەلام لە واقیعدا ئەمەیان درۆبو ، چونکە زمارەیەکی کەم لە نوێنەری شیوعیەکان لەبەرەی میللی‌یەکە دابو زۆرەیان لە سوشیالیستەکان وسەر بە جمهوری بون. بەلام لەبابەت ئاینەوە ئازاترین جەنگاوەر لە رێزی جمهوریەکاندا لەکاتولیکەکان

بون. رژێمی جمهوری ئازادی ئاینی مسۆگەر کردبو. بە پێچەوانەی (هتلر)ەوە لە ئەلمانیادا ، بەلام جمهوریەتی ئەسپانیا دەیویست سنورێك بۆ هێزی خاوەن بەرژەوەندی وکێلگەکان ، وسەر بەررشتیارانی خوێندن وفێرکردن لە کەنیسەدا دابنێت. شۆڕشەکە ئاراستەی دیموکراتیەت کرابو ، لەکاتێکدا کە کۆنە پەرستەکان ترسان کە دیموکراتیەت پەلاماری کێلگەکان و کۆنەپەرستیەیان بدات وسنورێکیان بۆ دابنێت ، کە ئەم شتەش روویدات ئیتر کۆنەپەرستەکان خۆیان ماندوو ناکەن بە جێبەجێ کردنی بیروڕای دیموکراتیەتەوە وەیان بیروڕای خۆیان بەوانە بسەلمێنن کە هەڵیان دەبژێرن بەلکو دەست دەدەنە چەك و تەقەڵا دەدەن خواست وئارەزووی خۆیان بەسەر جەماوەری میللەتدا بە ئەنجام بگەیەنن بە رەبری زۆرە ملی ، و تۆ قاندن.

شۆڕشگێڕەکان وەیا تاقمەکەی فرانکو کە لە سوپاییەکان وپیاوانی کەنیسە پێك هاتبو هەردوو دەولەتە فاشستیەکە ئەلمانیا وئیتالیا بەجوت پشتیوانیان بون کە دەیانویست بەسەر ئەسپانیادا زاڵ بن ، تاکو بتوانن دەسەڵاتیان بەسەر دەریای سپی ناوەراستدا هەبێت ، وبنکەی دەریایی تێدابنیات بنێن. لەبەر ئەمە کچم دەبینێت کە جەنگەکەی ئەسپانیا جەنگێکی ناوخونەبو بەپێی مانا راستەقینەکەی ، بەڵکو جەنگێکی سیاسی ئەوروپابو ، بو بەی دەست کردنی فەرەنسە ولاوازکردنی ئینگلتەرە وچەسپاندنی دەسەڵاتی فاشستیتی لەناو ئەوروپادا ، گەرچی بەرژەوەندی ئەلمانیا بە پێچەوانەی بەرژدوەندی ئیتالیاوەیە بەلام بۆ ماوەیەکی کەم رێك کەوتن تاکو هەردوو دەولەتەکە لە دوژمنە ناوکوییەکەیان رزگاریان دەبێت.

ئەگەر ئەسپانیا ببێت بە فاشستی فەرەنسە دەفەوتێنی ، هەردەشە لە رێگا دەریاییەکانی بەریتانیا دەکات کە لە رێی (رأس الرجاء الصالح)ەوە بۆ رۆژهەلات دەچێت ، لێرەدا (جبل طارق) ونۆکەندی (سویس) بێکەڵك دەبن ، بەم جۆرە دەبینین کە ئەگەر بەریتانیا وفەرەنسە بیانەوێ ئاگاداری بەرژەوەندی خۆیان بکەن ، جگە لەوەی کە حەز لە دیموکراتیەت ددکەن وەیان ناکەن ، پێویستە لە سەر ئەم دوانە بەریتانیا وفەرەنسە ـ یارمەتی حوکومەتی جمهوری ئەسپانیا بدەن بۆ شکاندن وسەرپێ شۆڕکردن بدشۆڕشدکەی تاقمی فرانکو. کەچی لێرەدا دەبینین بەرژەوەندیەکانی

چینێکی تایبەتی زاڵە بەسەر حوکومەتەکاندا گەرچی لەسەر حیسابی بەرژەوەندی ولاتەکەش بێت. حوکومەتی بەریتانیا پیلانی دەست نەخستنە ناو کاروباری ناوخووە داهێنا ئەمە گەورەترین داهاتویە کە (البدعة) کە ئەم سەردەمە نوێیە دیبێتی ، ئەلمانیا وئیتالیا هەردوکیان ئەندام بون لەلێژنەی دەست نەخستنە ناو کاروبارەوە ، بەڵام یارمەتی شۆڕشگێرە کانی تاقمی فرانکویان دەدا بە ئاشکرا ، وەدانیان بەمان دا دەنا کە گوایا حوکومەتیکی شەرعی ، و دوروستن ، لەشکرەکانیان لە ریزی فرانکودا دەجەنگین ، فرۆکەوانەکانیان شارەکانی ئەسپانیایان بۆ مباباران ددکرد ، لە راستیدا پیلان ، وسیاسەتی دەست نەخستنە ناو کاروبارەوە مانای یارمەت دانی لابەن ، وبدرەیەکە ئەویش بەرەی شۆڕشگێڕەکانی سەر بە فرانکویە سەرەرای ئەمە حوکومەتی فەرەنسە بەدەسیسەی ئینگلیزەکان سنورەکەی خۆیی لای چیاکانی (برانیس) داخست تاکو نەهێڵێت هیچ یارمەتی‌یەك بکات بە حوکومەتە جمهوریەکە.

فرۆکەکانی فرانکو کە شتیەکانی ئینگلیزیان نوقوم کرد کەوا ئازوقەیان بۆ حوکومەتە جمهوریەکە دەهێنا ، لەگەڵ ئەمەشدا مستر (جمبرلن) ی سەرەك وەزیرانی ئینگلتەرە بەرگری لەم کردەوانەی فرانکو دەکرد وپاکانەی بۆ دەکرد. کچم ئنجا بیرکەرەوە کە حوکومەتی بەریتانیا تا چ رادەیەك لەبڵاوبونەوەی دیموکراتیەت دەترسێت پێش چەند رۆژێکی کەم لەمەوپێش ، بەریتانیا رێکدوتنامەیەکی لەگەڵ ئیتالیادا بەست بەمە هەنگاوێکی تری نابەرە وئیعتیراف کردن ودان بیانان بەفرانکودا ، ئیتالیای سەربەست کرد لە دەست خستند ناو کاروباری ئەسپانیاوە بە ئارەزووی خۆی. لە راستیدا ئەگەر جمهوریەتی ئەسپانیا گوێی لە ئاموژگاریەکانی بەریتانیا وفەرەنسە بگرتایە زۆر لە مێژە دەمرد. بەڵام میللەتی ئەسپانیا سەرەرای سیاسەتی بەریتانیا وفەرەنسە سەری بۆ فاشستیەت شۆڕ نەکرد ، وە تێکۆشانەکەی لەپێناوی سەربەخۆییدا دژی داگیرکەرە بێگانەکان لەگەڵ ئەو ئازایەتی ، وخۆ راگرتنەی کە نواندیان بو بە جۆرێك لەداستانی قارەمانیتی کەوا جیهانی سەرسام کرد ، وە ئەو بۆمبا بارانەی کە فرۆکەکانی ئیتالیا ، وئەلمانیا دەیان کردە سەر شار ودێهات ، ودانیشتوە بەسەزمانەکانی لەستەمترین کردارە درندەییەکان بون.

جمهوریەتی ئەسپانیا لە ماوەی دوو ساڵی رابوردودا توانی لەشکرێکی باش دروست کات مەشقی پێ بکات ، و راهاتو ، مودەرەبی بکات ، وە واز لە خزمەت گوزاری پێشمەرکە بێگانەکان بێنێت. لە کاتێکدا کە (فرانکو) نزیکەی لە چوار بەش سێ بەشی ئەسپانیای داگیرا کردوە ، دوای ئەوەی کە (مدرید) و (فلنسیای) لە کاتالونیا دابری سوپای جمهوری توانی (فرانکو) بوەستێنێ لە سنور ، و ئاستی خۆیدا لە شەرە مەزنەکەی (ئیبرو)دا ئیسپاتی توانای خۆیی کرد ، ئەم شەرە چەند مانگێك بەردەوام بو. ئاشکرایە فرانکو ناتوانێت ئەم سوپایە بشکێنی ، ئەگەر هێزە گەورەکانی بێگانە یارمەتی نەدەن.

بەڵام گەورەترین کێشە کە ئێستا توشی سەر بە جەمهوریەکان هاتوە ، کەمی خواردەمەنی یە ، بەتایبەتی لە مانگەکانی زستاندا جمهوریەتەکە دەبێت گرانباری ئازوقە بۆ سوپا ، و دانیشتوەکانی کە لەناوچەکەی خۆیدان هەڵگرێت سەرەرای پەنابەرەکان کە لەدەست فرانکو رایان کردوە.

چین:

با ئێستا لە کوێرەوەرییەکەی ئەسپانیاوە بێینەوە بۆ کوێرەوەریەکەی (چین) ، ژاپۆن بەردەوام دەست درێژی لە (منشوریا) دەکرد ، بەریتانیاش پیرۆزبایی ئەم دەست درێژیانەی دەکرد ، تەنانەت ئەو پێشنیارانەی قوبول نەکرد کە ئەمەریکا پێشکەشی دەکرد بۆ یارمەتیدان لە نێوان هەردوو دەولەتەکەدا بۆ بەربەست کردنی دەست درێژی کردنی ژاپۆن. بۆچی بەریتانیا بەم جۆرە دەست دەدا بەپشتی ژاپوندا ، وە مەترسی هێزی بەربەرەکانی کەرێکی تر بو خۆی زیاد دەکات؟ هەر لەسەرەتاکانی سەدەدەی بیستەمەوە ، ژاپۆن بەدەسیسەو هاندانی ئینگلیزەکان بوە بە دەولەتێکی ئیستیعماری ، لە سەرەتای کاردا ئینگلیزەکان لە مەمەبەسیان ئەوە بو کە ژاپۆن بەکاربێنێت دژی روسیای قەیسەری ، ئنجا دوای جەنگە جیهانییە (یەکەمەکە) وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ، و یەکێتی سۆڤیت هەردوکیان بەجوت تاکە دەولەتن کەوا بەربەرەکانی ئینگلتەرەیان دەکرد ، لەبەر ئەمە سیاسەتە کۆنەکەی بەریتانیا چوەوە دۆخی جارانی لەبەهێزکردنی ژاپۆندا لەگەل ئەوەشدا کە ژاپۆن خۆی ، هەرەشەی لە بەرژەوەند یەگرنگەکانی

بەریتانیا دەکرد. ئنجا یەکێك لەو هۆیانەی کە پالی نا بە ئەمەریکاوە کە لە ساڵی ١٩٣٣دا ، دان بنێت بە یەکێتی سۆڤیت دا بەربەرەکانی نێوان ئەمەریکا ، و ژاپۆن بو.

لە ساڵی ١٩٣٣ وە چەند حوحومەتێك لە (چین)دا دوروست بو: حوکومەتی نیشتمانی هەبو کە (شیان کای شیك) سەرۆکی بو، وە دەولەتە بێگانەکان دانیان پێدا نابو ، حوکومەتی (کانتون) هەبو لە خواروی (چین)دا ، دەیوت کەگوایا سەر بە (کومنتانك)ە ، ناوچەیەکی گەورەی سۆڤیتیش هەبو لە ناوەوەی (چین)دا سەرەرای ئەمانە هەموی ژمارەیەك لە سەرکردد ، و پێشەوا نیمچە سەربەخۆکان هەبون ، ژاپۆن لەسەروی (پکین)ەوە پەلاماری (چین)ی دەدا. ئنجا (شیان کای شیك) لە جیاتی ئەوەی بەربەستی دەست درێژیەکانی ژاپۆن بکات ، هەمو هێزە سوپاییەکانی دەنارد بۆ هێرش بردنە سەرناوچە سۆڤیتیەکان و فەوتاندنیان زۆربەی ئەم هێرشانە سەرنەدەکەوتن ، تەنانەت ئەگەر بیتوانیایە ئەم ناوچانە داگیرکات ، لەشکرەکانی سەر بە (چین)ی سۆڤێتی ، رایدەکردو هەڵدەهاتو لە ناوەوەی وڵاتەکەدا خۆیان دەچەسپان و قایم دەکرد ، رویشتنە (٨٠٠٠) میلەکەی سوپای هەشتەمی سۆڤیت (واتەشیوعیەکانی چین - وەرگێری کوردی) بەم بەر ، و ئەوبەری (چین) دا بۆتە ئەفسانە ، و داستانێك لە ئەفسانە ، و داستانی هونەرە جەنگیەکان.

بەم جۆرە ساڵ بەساڵ زۆرانبازی لە نێوانیاندا بەردەوام بو سەرەرای پیشنیارە زۆرەکانی کە (چینی) سۆڤێتی پێشکەش بە (شیان کای شیك)ی دەکرد ، بۆ یارمەتدان ، و کۆمەك بە یەکتری کردن لەبەرەنگارر بونی دەست درریژیەکانی ژاپون دا. لەساڵی١٩٣٧تدا ژاپۆن هێرشێکی زۆر توندی هێنا ، هەردووبەرەکەی ناچار کرد کە بین بە یەك و بەرەنگاری ببن ، وبەربەستی بکەن ، هەروها چین) دەستی کرد بەنزیك بونەوە لە یەکێتی سۆڤێت ، پەیماننامەیەك دەسات درێژندکردنی لە نۆڤەمبەری ١٩٣٧تدا لەگەل دا ئیمزا کرد.

ژاپونیەکان لەپەلاماردانیاندا ، توشی بەرەنگار بونێکی بەتین بون ، دەستیان کرد بە کۆشتارێکی زۆر گەورە ، بەکارهێنانی ناشیرین ترین شێوازی درندانە کە جێی باوەر نیە بۆ تێك شکاندنی

خەلکی (چین). لەم کاتەدا (چین)ی نوێ لەو خەوەی کە گرتبوی تلی دەدا و خەریك بو خەبەری دەبوەوە. گەلێك لە شارە مەزنەکانی (چین) بەهۆی بۆمبا بارانی ژاپۆنیەکانەوە بو بون بە کەلاوە ، گەلێك کەس کوژران ، ناهەمواری و کرژی لە ئابوری و پارە ، دارابیدا توشی ژاپۆن هات. دیارە میللەتی هیندستان سۆز ، و مەیلی بەلای میللەتی (چین) دابو هەروەکو چۆن ، سوزو مەیلی بەلای تێکۆشانی جمهوریەتی ئەسپانیادا هەبو ، ئنجا لە هیندستان ، و ئەمەریکا ، و ولاتەکانی تردا بزوتنەوەیەکی میللی گەورە بو نەکرین و موقاتەعە کردنی کەل و پەلی ژاپۆن بەرپا بو.

سەرەرای ئەمە پێشکەوتنی رەورەوەی جەنگی ژابون لە خاکی (چین)دا بەردەوامە ، میللەتی (چین) پەنای بردەبەر جەتەگەری ، وەزیانێکی زۆری دا لەدەست درێژکەران. ژاپۆنیەکان (شتغهای) و (نانکین)یان داگیرکرد ، وە کە لە (کانتون ، و هانکو) نزیك بونەوە (چین)یەکان ئاگریان لەم دوو شارە بەردا ، لەشکری ژاپۆنیش هات ، ئەو خۆلە مێشەی مابوەوە داگیری کرد ، هەروەکو چۆن (ناپلیون) پێش ئەمان (مۆسکۆ)ی داگیر کرد. بەرگری کردنی (چین)یەکان هێشتا بەردەوامە ، هەرچەندە مەینەتیەکانیان توندو تیژ بێت ئەوەندە بەرگری کردنەکەیان بەتین دەبێت.

نەمسا:

با بگەرێینەوە بۆ ئەوروپا ، لەسەر چیرۆکی نەمسا برۆین تا دەگاتە کۆتاییە بە ئەشکنجەکەی ، ئەم جمهوریەتە بچکۆلەیە نابوت ، ولەناو خۆیدا ، پارچە پارچە بو ، لەلایەکەوە ئەلمانیای نازی ، لەلایەکی کەوە ئیتالیای فاشستی تینیان بۆ دەهێنا هەر چەندە شارەوانی‌یەکەی (فینا) سۆشیالیستی وپێشکەوتنخوازبو ، بەلام ولاتەکە تێکرا لە ژێر دەسەلاتێکی ئاینی ، وفاشستیتیدا دەی نالاند ، کە بە سەرۆکایەتی (دولفوس)ی راوێژ پێکراو بو ، کەوا بالی دابو بە (موسولینی)یەوە ، تا لە دەست درێژی نازیەکان بیپارێزێت. ئیتالیا چەکێکی زۆری بۆ نارد ، بەمە سەرپێچی لە پەیماننامەی (فرسایل) کرد ، (موسولینی) ئامۆژگاری (دولفوس)ی کرد کە سوشیالیستیەکان بفەوتێنی ، بەپێی ئەم ئامۆژگاریە (دولفوس) بریاریدا کە چەك لە کرێکارە سوشیالیستەکانی (فینا) بسێنێتەوە ، ئەمە بۆ بە

هۆی بەرپابونی شۆرشێکی ئاوەزوو شوباتی ساڵی ١٩٣٤دا لە (فیـنـا)دا ، کوشتار چوار ساڵ لە سەریەك دەوامی کرد ، خانوی کرێکارە نـێـراوەکـان روخێنران (دولفوس) سەرکەوت ، بەڵام ئەم سەرکەوتنە زۆر کەوت لە سـەری ئەویش فەوتان نەمانی تاکە رێکخراوێکی بە هێز وبەتوانابو کەوا بەرەنگـار وبەرهەڵستی دەست درێژکردنەکانی دەرەوەی دەکرد.

لەم کاتەدا پیلان ودەغەلی نازیەکان لەسەر پێبو (دولفوس) لە یونیـوی ١٩٣٤دا هاتنی سوپای نازیەکان ، (هتلر) خەریك بـو لـە شـکـری خـۆی بنێرێت و لەسنور بپەرێتەوە ، (موسولینی) هەرەشەی لێکرد ، کە ئەمیـش لەشکری خۆی دەنێرێت بۆ بەرگری کردن لە نەمسا بەرامبەر ئەلـمـانـەکـان (موسولینی) حەزی نەدەکرد ئەلمانیا نەمسا قوت بدات کە بـەمـە سـنـوری ئەلمانیا ئەوەندە فراوان دەبێت تا دەگاتە ئیتالیا. لەم کاتەدا (هتلر) بـە جۆرێکی رەسمی لە ساڵی ١٩٣٥دا ئاشکرای کردو ، وتی! نـیـازی نـیـیـە نەمسا بخاتە سەر ئەلمانیا ، وەیان یەکێتی نەمسا لەگەڵ ئەلمانیادا ئیعلان بکات.

بەڵام جەنگەکەی کە ئیتالیا کردی لەگەل حەبەشەدا بە راستی ئیتالیای لاوازکرد ، ئنجا گە لێك کەوتن وتوند وتیژی لە نێوان ئیتالیا لەلایـەك ، وە ئینگلتەرە ، وفەرەنسەوە لەلایەکی ترەوە زیادی کرد (مـوسـولـیـنـی) ناچاربو لەگەل (هتلر)دا رێکەوێت ئیتر بەمە (هـتـلـر) ئـازدبـو ، کـە هەرچیەکی بیەوێت لە نەمسا ، بیکات ، ئنجا جم وجوڵی نـازیـەکـان لـە نەمسادا زیادی کرد لە سەرەتای سالـی ١٩٣٨تـدا (جـمـبـرلـن)ی سـەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ئاشکرا کردو ، وتی: ئینگلتەرە هـیـچ نـاکـات بـۆ رزگاربونی نەمسا. کارەساتەکان خێرا بە دوای یەکدا دەهاتن:ـ کـە راوێـژ پێکراوی نەمسایی (شوشنج) بریاریدا لێپرسینێك لە وڵاتـەکـە دا بـکـات (هتلر) بەرهەرڵستی کرد ، دوا بە دوای بەرهەڵستـیـەکـەی لـە مـارتـی ١٩٣٨تدا نەمسای داگیرکرد توشی هیچ بەرگرییەك نەبو ، ئیتر (هـتـلـر) بڵاوی کردەوە کە نەمسای خستۆتە سەر ئەلمانیا ، بـەم جـۆرە ئـەم وڵاتـە لەسەر نـەخـشـە (خـریـطة) سـررایـەوە ؛ دوای ئـەوەی کـە بـنـکـەی ئیمپراتوریەتێکی مەزن بو ، بەڵام (شوشنج) کە دوا راوێژپێکروان نەمسابو بە یەخسیری جەنگ درایە قەلەم وهەرەشەی لێکرا کـە دەدەرێت بـە دادگـا

ئەگەر خواستی ئەلمانەکان جێبەجێ نەکات ، ئەم تا ئێستاش بەخەسبەرد لایان.

ئنجا هاتنی ئەلما نەنازیەکان بۆ نەمسا وەکو نیشانەیەك وابو بۆ بەرپابونی هێرشێکی زلی تۆقاندن بەرامبەر بە میللەت ، تەنانەت لە سەرەتای فەرمان رەوایی نازیەکاندا لە خودی ئەلمانیادا رووی نەدابو ، ئەوانەی زۆرتر دوو چاری ئەم تۆقاندنە هاتن جولەکەکان بون ، وە تا ئێستاش هەر بە دەستیەوە دەناڵێنن ، کچم ئێستاش دەبینیت کە (فینا) رۆژێك لە رۆژان لە جوانترین ولاتان بوە کەچی لەژێر دەسەلاتی درندەبەتی وترس ، ولەرزدایە.

جیکوسلوفاکیا :ـ

ئەوروپا حەپەسا کە سەرکەوتنی نازیەکانی لە نەمسادا دی. بەلام جیکوسلوفاکیا لە هەمو ولاتەکانی ئەوروپا زۆرتر پەشۆکابو ، چونکە ئێستا لە سێ لاوە ئەلمانیای نازی دەوری داوە بۆیە زۆر کەس لەو باوەرەدابون کە نۆبەی داگیرکردنی ئەم ولاتە هاتوە بەتایبەتی لەکاتێکدا کە نازیە کان دەستیان کرد بدرێکخستنی پیلان ، وبەرپاکردنی پشێوی لەناوچەکانی سەر سنوردا بەپێی نەخشە دێرینە کەی لە مەر فاشستیەکان.

دانیشتوانی ناوچەی (سودیت) کە لەپێشدا پێیان دەوت: (بوهیمیا) بە زمانی ئەلمانی قسەیان دەکرد ، ئەو زمانەی کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی نەمساوی ـ مجریدا بەکار دەهات ، ئەمانە حەزیان لە دەولەتی (جین) نەدەکرد ، بەلکو دەیانویست لێی جیا ببنەوە ، بەشێکی تایبەتی بۆ خویان پێك بینن ، لە هەمان کاتدا حەزیان نەدەکرد کە بچنە پاڵ ئەلمانیاش ، چونکە گەلێك ئەلمانی یان تێدابو کە زۆر بە گەرمی بەرهەلستی نازیتی‌یان دەکرد. (بوهیمیا) رۆژێك لە رۆژان بەشێك نەبوە لە ئەلمانیا. کە نەمسا لە سەر نەخشە سررایەوە ، خەلکی چاوەروان بون کە (هتلر) جیکوسلوفاکیا داگیربکات لەبەر گەلێکیان چونە ناو حیزبی نازی‌یەوە لە ترسی مانەوەیان دور لەرێزەکانی ئەم حیزبەو ، بۆ مسۆگەرکردنی ژیانی خۆیان.

مەرکەزو ، جێ وشوێنی جیکوسلوفاکیا لەناو دەولەتاندا زۆر بەهێزبو ، دەولەتێکی خاوەن پیشەسازی پێشکەوتوبو ، لەشکرێکی بەمەشق ، ومودەرەب

و ، بەهێزی هەبو لەگەڵ فەرەنسە ، ویەکێتی سۆڤیت دا بە گەڵێک هاوپەیمانی‌یەوە پەیوەندداربو ، هەروەها پێویست بو لەسەر ئینگلتەرە لەوەزع وبارێکی ناهەمواریا چەکداردا کە توشی جیکوسلوفاکیا دەبێت ئینگلتەرە دەبێ پشتی ئەم بگرێت. لەبەر ئەوەی کە جیکوسلوفاکیا دەولەتێك بو بە تاقی تەنیا لەناوەراستی ئەوروپادا مابوەوە ، لەبەر ئەوە سەرنج وهەستی دیموکراتیەکان لە هەمولایەکی جیهان دا بەلای ئەودا چوبو بە ئەمە رێگایشەوە ، هیچ گومانی نەبو ئەگەر جەنگ رووی بدایە ، وهێزە دیموکراتیەکان یەکیان بگرتایە ، دەولەتە فاشستیەکە خراپ دەشکا.

بەڵام ئەو کێشەیەی کە بویە بە هانە بو دەست خستنە ناو کاروبارەوە مەسەلەی کەمایەتیەکان بو لە (سودیت)دا ، دەیوایە شتێك بکرایە بۆ چارەسەری سکاڵاکانیان لەویدا ، هەرچەندە کە مایەتیەکان لەناو جیکوسلوفاکیادا ، کردارێکی باشیان لەگەڵدا دەکردن لە چاو کەمایەتیەکانی تری ناوەراستی ئەوروپا ، بەڵام مەسەلە راستەقینەکە ، مەسەلەی کەمایەتیەکان نەبو ، بەڵکو مەسەلەکە ، ئارەزووی (هتلر)بو لە داگیرکردنی خوارووی رۆژهەڵاتی ئەوروپادا ، وەسەپاندنی خواستی (هتلر)بو بەسەریدا بە زۆرەملی وهەرەشە.

حوکومەتی (چین) هەمو تەقەلایەکی‌دا لەپێناوی جێبەجێ کردنی کێشەی کەمایەتیەکاندا. هەمو داخوازیەکانی کە پێشکەش کرابو قویولی کرد وسەڵماندی ، بەڵام تا حوکومەت وەڵامی داخوازیەکی دەدایەوە ، داخوازیەکی نوێی پێشکەش دەکرایەوە ، کە نوشوستی ، ویی یابەخی پێك دەهێناو ، تێدابو بو حوکومەت ، تاکو یوتی خودی دەولەتەکە کەوتە مەترسی‌یەوە دیسانەوە مەبەسی (هتلر) ئاشکرابو ، فەوتاندنی ئەم دەولەتە دیموکراتیەبو کە وەکو درکێك وابو لەگازەرای پشتیدا. بەڵام سیاسەتی ئینگلیز (هتلر)ی هان دەدا بۆ دەست درێژی لە جیکوسلوفاکیا ، بەرواڵەتیش خۆی واپیشان دەدا کە لەپێناوی پەیدابونی ئەنجامێکی ئاشیتانەدا تێدەکۆشێت ، لەبەر ئەمە حوکومەتی بەریتانیا (لوردنسمان)ی نارد بو (براغ) (بەناوە بژی کەر) ، بەڵام لەواقعیدا هەمیشە تینی حوکومەتی (چیك) دەهێنا کە داخوازی نازیەکان قوبول بکات ، ئەنجا (چیك) یەکان پشنیارەکانی (لوردنسمان)یان قوبول کرد ، سەرەرای ئەوەی کە زۆر زیانی هەبو بۆیان ، بەڵام هەر ئەوەندەی بەم داخوازی یەیان قایل

دەبون ، نازیەکان چەند داخوازیەکی‌تری نوێیان لێداوا دەکردن بەڵکو هەر بەمەشەوە ، نە وەستان جاری خۆ کۆکردنەوەد گشتی‌یان (التعبئة العامة)دا لەم کاتەدا (مسترجمبرلن) خۆی چو لە (برختیسگاردن)دا (هتلر)ی دی لەوێ بە هەرەشەکەی (هتلر) رازی‌بو ، کە داوای پانتاییەکی فراوانی لە جیکوسلوفاکیا کردبو کە بدرێت بە ئەلمانیا ، ئیتر ئینگلتەرە ، و فەرەنسەش هەرەشەیان لە جیکوسلوفاکیای هاوری، وهاوپەیمانی خۆیان دەکرد کە دەبێت بە هەردشە ، ومەرجەکانی (هتلر) قایل بێت ، ئەگینا بە تەواوی وازی لێدێنن. کە میللەتی (چیك) بەم ناپاکی‌یەی زانی سەرسام بو ، حەپەسا ، ئیتر حوکومەتەکە ناچاربو بە هەرەشەو مەرجەکانی (هتلر)رازی بێت ، خەم وبەزارە هەمو کەسێکی داگرت. ئنجا (جمبرلن)جارێکی‌ترچو (هتلر)ی بینی لە (جودسبرج) لەسەر روباری (راین لەوی دیکتاتوری دیکە ئێستا زیاتری دەوێت لەوەی کە وەری‌گرتوە ، ئنجا (جمبرلن) بەمەرازی نەبو ،بەم جۆرە لە کۆتایی سەبتەمبەری ١٩٣٨تدا تارمایی جەنگ نزیك بوه ود ، ئاسمانی ئەوروپای داگیرکرد. ئیتر خەلکی لەکرینی دەمەلبین (کمامە)ی پارێزەر لە غازی ژەهراوی ، و هەڵکەندنی سەنگەر لە باخچەکان ومەیدانە گشتی‌یەکاندا لەترسی‌بۆمبا باران پێشبرکی‌یان دەکرد ، ئنجا جاریکی‌تریش (جمبرلن) جوهوەبو (میونیخ) لەوێ چاوی بە(هتلر) کەوتەوە ، لەوکۆبونەوەیەدا ، (مسیو دلادیە ، وە سنیور موسولینی ئامادەبون ، روسیا بۆ ئەم کۆبونەوەیە بانگ نەکرا ، گەرچی هاوپەیمانی فەرەنسە وجیکوسلوفاکیاش بو ، هەروها جیکوسلوفاکیاش بانگ نەکرا بۆ کۆبونەوەکە کەوا چارەنوسی ئەوی تێدا بریاردەدرا ، تەنانەت پرسیشیان پێ‌نەکرد. هەمو داخوازیەکانی (هتلر) قوبول کران لەم کۆبونەوەیەدا ، دوای ئەوەی هەرەشەی لەکۆبوەوەکان کرد ، کەوا قبول نەکردنی داخوازیەکانی مانای هەڵگیرسانی جەنگە ، ئیتر هەر چوار دەولەتەکە رێکەوتنامەی (میوینخ)یان لە ٢٩ سەبتەمبەر دائیمزاکرد.

بەم رێکەوتنە دەلەتەکان توانیان بو ماوەیەك لە جەنگ دورکە ونەوە ، ئیتر لەناو دانیشتوانی هەمو ولاتەکاندا هەست کردن بە شاری ، ودڵنیایی بلاوبوەوە ، بەڵام ئەو نرخەی کە پێشکەشکرا لەپێناوی نەفەومانی جەنگدا زۆربو. هەروها ئینگلتەرە ، وفەرەنسەش شەرمەزار ، و رسوابون ،

وەجەزرەیەیەکی پشت شکێن بو بۆ دیموکراتیەت لە ئەوروپادا ، وەشەقوپەق کردنی جیکوسلوفاکیا ، وکۆتایی هێنان بۆ بە کۆمەڵی میللەتان (عصبة الأمم) وەك دام ودەزگایەك بۆ پاراستنی ئاشتی ، وە دەنگ دانەوەیەك بو بۆ سەرکەوتنی نازیەکان لەناوەراست وخوارووی رۆژهەلاتی ئەوروپادا دیسانەوە ئەوی بەم نرخانەش کررابو شتێکی راستەقینە نەبو ، بەڵکو راگرتنی جەنگ بو ، هەمو دەولەتەکان سودیان لێوەرگرت. دەستیان کرد بە خۆ ئامادەکردن ، بۆ جەنگێکی تێك شکێن.

رێکەوتنامەی (میونیخ) لەمێژووی ئەوروپا وجیهاندا تێکرا گۆرانکاریەك بو. چونکە سەر لەنوێ نەخشەی ئەوروپا دوروست کرایەوە ، بەئاشکرا دەرکەوت حوکومەتی ئینگلیز وفەرەنسە چونەپال بەرەی نازی وفاشستەکان ، بەریتانیا خێرا دەستی کرد بەئیمزاکردنی پەیماننامەکەی نێوان ئینگلیز وئیتالیا کەوا بەپێی ئەم پەیماننامەیە بەریتانیادان دەنێت بەداگیرکردنی حەبەشە لەلایەن ئیتالیاوە هەروها ئیتالیا سەربەست دەکات لەدەست خستنە ناوکاروباری ئەسپانیاوە. ئنجا بروانامەیەکی چوار قولی لە نێوان ئینگلتەرە ، وفەرەنسە ، وئیتالیا ، وئەلمانیادا پەیدابو ، بو دوروست بونی بەرەیەك دژی روسیا ، ودژی هێزە دیموکراتیەکان لەئەسپانیا ولەولاتەکانی تردا.

روسیا :-

ئەوی سەرنج راکێشە لە ماوەی ئەم هەمو سالانەدا کە پربو لە پیلان ، وپاش گەزبونەوەی دەولەتە گەورەکان لەگەلێك بەلێن وبروانامە ، هەر یەکێتی سۆڤیت مایەوە کەوا رێزی ئەرك ، و پێداویستیەکانی سەرشانی خۆیی دەگرت لەناو دەولەتاندا وجێبەجێی دەکردن ، وەئاشتی دەپاراست ، وە لەگەڵ دەست درێژی کردندا دەجەنگی ، وەوازی لە جیکوسلفاکیای هاوپەیمانی نەهێنا ، تادوایی ، بەلام ئینگلتەرە ، وفەرەنسە خۆیان لێگێل کرد ، وە لەگەل دەست درێژ کەراندا هاورێیان بەست ، تدنانەت جیکوسلوفاکیا خۆیشی کەوتە ناوچەی دەسەلاتی نازیەکانەوە ، وەهاوپەیمانی خۆیی لەگەل یەکێتی سۆفیتدا براندەوە ، دوای ئەوەی کە ئینگلتەرە ، وفەرەنسە خیانەت ، وناپاکیان لەگەلدا کرد ، دەولەتەکانی تریش هەلی پارچە پارچە کردنی جیکوسلوفاکیایان بەکارهێنا. (مجر ، وپۆلەنە)

هدروەکو سەگی برسییەکی پارچەیەکیان لە جیکوسلوفاکیا پچڕی ، سەرەرای ئەمەش گەلێك گۆڕانکاری تریش روویان دا. وەجیکوسلوفاکیا داوای کرد کە لە وڵاتەکە جیابیتەوە ، پاش وەی جیکوسلوفاکیا ئێستا وەکو موستعمەرەیەکی ئەلمانیاوایە.

بەم جۆرە سیاسەتی یەکێتی سۆڤیت توشی جەزردیەیەکی بەتین هات ، لەگەل ئەمەشدا هێشتا تا کە دەولەتێکی بەهێزە لەئەوروپا وئاسیادا کە لەم رۆژانەدا بتوانێت بەزۆر نەهێڵێت فاشستیەت ، وبیروڕای دژ بە دیموکراتیەت پەرەپسێنی ، روسیا ئەمڕۆ دەولەتە ، سەرەرای ئەوەی کە ئینگلیزو فەرەنسە خۆیان لێ‌گێل کرد ، لە ماوەی ئەم چەند مانگە نزیکانەی پێشودا ، برۆژە پێنج ساڵیەکەی سەرجەم سەرکەوت ، بێجگە لەسەر نەکەوتنی لە هەندێ لەلقەکانیدا بەتایبەتی لەوەدا کە پەیوەندی هەیە بە جۆری کەل ، وپەل ، وشتومەکی بەرهەم هاتوەرە. سۆڤیت میکانیکی لێهاتو ، وشارەزایان نەبو لەبەر ئەمە پرۆژەی گواستنەوەیان نوشوستی هێنا لەبەر ئەوەی کە زۆر بایەخیان دەدا بەپیشەسازی قورس ، ئەمە بو بە هۆی ناتەواوی لە کەل وپەلی ئیستهلاکی ، وشتومەکی بەکارهێناندا ، لەگەل نزم بونەوەی رادەی گوزەران ، وژیان ، بەڵام پرۆژە پێنج ساڵیەکە بناغەی پێشکەوتنی لەداهاتو ، وپاشەرۆژدا دا کو تا کە روسیا ببێت بە خاوەن پیشەسازی بەگورجی ، وەکشتوکاڵەکەیشی ببیت بە هدرەوەزی ، پرۆژەی پێنج ساڵی دوەمیش (۱۹۳۳ تا ۱۹۳۷) مەبەسی ئەوەبو کە بایەخ پێدانیان لە پیشە سازی قورسەوە پدەن بە پیشەسازی سوکە. وەرزگاربون لەو هەلاندیکە لە پرۆژەی یەکەمدا کرابون ، لەگەڵ بەرهەم هێنانی کەل وپەلی بەکارهێنان ، وئیستیهلاکی ، ئیتر لەم رووەوە پێشکەوتنێکی باشیان وەدەست هێنا رادەی ژیان بەرزبوەوە ، وەتا ئێستاش هەر لە بەرزبونەوەدا بەردەوامە ، بەڵام لەبابەت رۆشنبیری وفێرکردن ، وپەروەردەوە ، بەراستی لە یەکێتی سۆڤیت دا چاك پێشکەوتن ، لەبەر ئەوەی یەکێتی سۆڤیت حەزی لەپێشکەوتن ، وچەسپ ، وپتەوبونی ، بابەکانی ئابوری سوشیالیستی دەکرد ، هەمیشە ، وبەردەوام سیاسەتێکی ئاشتی خوازانەی دەکرد لە هەمو کاروبارێکی نێودەولەتاندا. لە کۆمەڵی میللەتاندا (عصبة الأمم) هەستا ، وداوای کەم کردنەوەی چەکی دەکرد ،

لەگەڵ بەرپابونی ئاسایشی گشتیدا ، و هاوکاری کردن دژی هەمو دەست درێژییەك. ئنجا هەوڵیدا کە لەگەڵ دەولەتە سەرمایەدارییە گەوردکاندا پێکەوە یژین ، ئنجا حیزبە شیوعیەکان چونە ناو حیزبە پێشکەوتنخوازەکانیترەوە ، وە لەگەڵیاندا بەرەیەکی میللیان پێك هێنا.

سەرەرای ئەم پێشکەوتنە لە هەمو لایەن ، وکۆرێکدا ، کەوا یەکێتی سۆڤیت وەدەستی هێنابو ، لەم کاتەشدا بە تەنگوچەلەمەیەکی ناوخودا تێ دەپەری ، لەپێشدا باسی ناخۆشیە کەی کە لە نێوان ستالین ، وتروتسکی دا هەبو بۆ کردیت ، ئەنجامی ئەم ناکۆکی یە هەندی کەس حوکومەتەکەی ئێستایان بەدڵ نەبوو ، ئەمانە لەیەکتری نزیك بونەوە بە جۆرێك کە گوایا دەستیان لەگەڵ دەولەتە فاشستەکاندا تێکەڵ کردوە ، دیسانەوە دەوترا کە گوایا (باجودا) کە سەرۆکی ئیستیخباراتی سۆڤیت بو لەگەڵ ئەو کەسانەدا هاوکاری کردوە لە موئامەرەکردنیاندا لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٤ دا (کیروف) کە یەکێك بو لە ئەندامە بەرزەکانی حوکومەتی سۆڤیت بەدەسیسە کوژرا ، ئنجا حوکومەتی سۆڤیت کردەوەیەکی توند وتیژی نواند بەرامبەر بە دوژمنەکانی خۆی. لە ساڵی ١٩٣٧ تدا زنجیرە موحاکەمەیەك دەستی پێکرد ، لە هەمو لایەکی جیهاندا لەسەری بو بە مشتومر ، چونکە ئەم موحاکەمە کردنە گەلێك پیاوی گرنگ وبەرزی پێوەبو ، لەوانە کە موحاکەمە کران ، وحوکوم درا بەسەریاندا ، ئەو کەسانە بون کە سەر بە(تروتسکی) وپێشەوا راست رەوەکانی (الیمینیون) وەکو: (ریکوف ، تومسکی ، بوخارین ) بون لەگەڵ هەندی لە ئەفسەرە بەرزەکانی سوپا ، لەسەروویانەوە (مارشال توشاشفسکی).

زۆر زەحمەتە رایەکی روون وئاشکرا دەربربرێت دەربارەی ئەم موحاکەمەکردنانە ، وە ئەو کارەساتانەی کەوا دوا یە دوای موحاکەمە کردنەکە هاتن ، چونکە رووداوەکان نەناسراو ، و ئاڵۆزن بەلام ئەوی گومانی تێدانییە گەلێك کەس ئەم موحاکەمە کردنانەیان پێناخۆش بو ، تەنانەت دوستەکانی روسیاش ، وەهێرشی نارەوایان زیاتر دەبردەسەر ، بەلام چاودێری کەران لەو باوەرەدا بون ، کە بە راستی موئامەرە ، وپیلانێکی گەورە دژی حکومەتی (ستالین) هەبو بۆیە ئەم موحاکەمە کردنانە روویان دا ، هەروها دەرکەوت کە موئامەرەجی ، وپیلان گێرەکان

خەلکێکی زۆریان لەگەلدانییە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەستی خەلکی دژی ناحەزانی (ستالین) بو. لەگەل ئەم هەموەشدا ئەو تیرسرەوانـدن ، وکپ کردنەوەیە کە توشی هەندێ بێتاوان هات نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی بێگومان ئەمە زیانی گەیاند بەجێ وشوێنی سۆڤیت لەناو دەلەتاندا.

بوژانەوە ئابوری:

ئەو تەنگو چەلەمە ئابورییەی کە لە ساڵی ١٩٣٠ دا دەستی پێکرد ، وجیهانی سەرمایەداری چەند ساڵێك ئیفلیج کرد ، نیشانەکانی چاك بونی دەرکەوت ، ئەو بو گەلێك لە ولاتان بوژانەوە ، بە تایبەتی ئینگلتەرە چونکە کەم کردنەوەی نرخی جونەیهی ئیسترلینی ، ودانانی کوسپی گومرگ و بەکارهێنانی بازارەگانی ئیمپراتوریەت ولە لەگەل دا هاتەکانی (موارد) بەریتانیادا بەراستی زۆر یارمەتییان دا ، ئیتر بازاری ناوخۆی بوژایەوە دوای ئەوە باجی گومرکیان زۆر خستە سەر شتومەکەکانی کە لەدەرەوە دەهێنران ، وەحوکومەتیش باربوی پیشەسازیەکانی دەکرد ، وەگەلێك ئیصلاحاتی کشتوکاڵی کرد ، گەلێك رێکخراوێك هات بۆ کەم کردنەوەی بەربەرەکانی لەناو یەکتردا ، لەپاشاندا ئینگلیزەکان گەلێك تەقەلایان دا بو نەخشە دانان بۆ بەرهەم هێنان ، ودابەش کردنی بە جۆرێکی فراوان ، هەروها زۆریان لەدانیمارك ، وولاتە ئەسکەندنا فیەکان کرد کە شتومەکی بەریتانیا بکرن.

ئەم بوژانەوەیە لەسەر حیسابی زیان گەیاندن بو بە بازرگانی نێو دەولەتان. کچم ددبێت بەم بۆ نەیەوە بێتەوە یادت کە بەریتانیا قەرزەکانی ئەمەریکای نەدایەوە ، وە لە پاشەرۆژیشدا نیازی نییە بیان داتەوە ، ئیتر هەندێ لە چاکەی هۆکانی بوژانەوە ئابوریەکە دەگەرێتە وە بۆ بەرنامە ئەستورەکەی لە مەر چەکدار کردن ، کە هەندێ لەدەولەتان بەئەنجامیان دەگەیاند ، وپێی هەلدەستان ، بۆ یە ئەم بوژانەوەیە بەشتێکی مسۆگەر دانانرێت ، بەتایبەتی کە بێ ئیشی هێشتا بە جۆرێکی فراوان بڵاوبۆتەوە.

ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا:

لەو کاتەوە کە ئینگلتەرە وادەردەکەویت کە تۆزیك بوژابێتەوە لەئەنجامی تەنگو چەلدمە ئابوریەکەدا ، هەست دەکەین کە بەریتانیا توشی گەلیك نەخۆشی قورس بوە ئەو هیزە سیاسی ، وئابوریەکانی کەوا هەولّ دەدەن ، ولەکاردان ئەم ئیمپراتوریەتە بفەوتینن ، بەردەوام لەپیگەیشتن دان ، تەنانەت حوکوم فەرماکانی ئیمپراتوریەتەکە هیچ هیوایەکیان بە مانەوەی ئیمپراتۆریەتەکە نەماوە ، ناتوانن کیشەو بەرەکانی ناودوەیان جیبەجی بکەن: هیندستان سورە لەسەر ئەوەی کە دەبیت سەربەخۆیی ، خۆیی دەست کەویت ، وروژ بە بەروژ لە بەهیزبوندایە. (فلسطین)ە بچوکەکە بە توندی شلە قاندویەتی ، لە جیهانی سەرمایەداریشدا ئەمەریکا گەوردترین بەربەرەکانانی کەری ئینگلتەرەیە ، وای لیهاتوە سەرپیچی لە دەسەلاتی بەریتانیا دەکات ، کەوتوتە ئەو تەوژمەوە کە لە ئینگلتەرەی جیادەکاتەود ، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە حوکومەتی بەریتانیا بەلای دەولەتە فاشستەکاندا دەچیت ، وەیەکیتی سۆڤیت بەسەرکەوتویی سوشیالیستی بنیات دەنیت ، کەوا بە تەواودتی دژی هەمو ئیستیعماریکە ، ئەلمانیا ، وئیتالیا بەتیلایی چاو سەیری ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا دەکەن هەردوکیان دەیانەویت تا بۆیان بکریت لیی بیچرن ، ئەوی زیاتر ئەم دوانەی هان دا ئەوەبو کە ئینگلتەرە لە (میونیخ) دا ملّی بۆ کەچ کردن ، سەبارەت بەوەی کە بەدەولەتیك دەژمیررا لە سەرەی دووەمدا ، وە بەجۆریکی رسوا ، وبی بایەخ ئەو دوو دەولەتە گفتوگویان لەگەلدا دەکرد ، ئینگلتەرە دەیتوانی جی ، وشوینی خوی بچەسبینی ، وقایمیکاتەوە ، ئەگەر پشتیوانی دیموکراتیەت بواید ، و ئاسایشی گشتی (الأمن الجماعي) بسەلماندایە ، و قوبولی بکردایە. کەچی ئینگلتەرە وازی لەم ریبازە هینا وچوەپال (هتلر). ئیستا ئیستیعماری ئینگلیزی ، خۆی لە گیژاویکدا ددبینیت بەئومیدی رزگاربون نییە لیی. ئەو گیژاوەی کە لە ئەنجامی ناکۆکیەکانی کەوا سیاسەتی (میونیخ) بەسەری هینا.

موستەعمەرەو ، ولاتە ژیردەستەکان:ـ

ئەلمانیا ئیستا داوای هەندی موستەعمەرە دەکات ، وەپیمان دەلین کە گوایا ئەلمانیا لە دەولەتە (هەژاردکانە) و کە (بە بەشی خۆی رازی

نىيە) ، ئنجا ئايا هەڵویستی دەولەتە بچکۆلەکان چونە کەوا هیچ موستەعمەرەیان نىيە؟! وە ئايا هەڵویستی میللەتە (هەژارە) راستەقینەکان و ئەم موستەعمەرانە چونە؟ مەسەلەکە هەموی بە بەردەوامی ، ومانەوە ، ونەمانەوەی رژێمی ئیستیعماریە وەیدندە. قایل بون وقانیع بونی هەردەولەتێك لەراستیدا بەو سیاسەتە ئابوریەوە بەندە کە ئەو دەولەتە لەسدری دەروات. ئیتر هیچ قایل بون ، وقانیع بون ، وتێر خواردنێك نىيە لەسایەی رژێمی ئیستیعماریدا سەبارەت بە نەبونی یەکسانی ، روسیای رژێمی قەیسەریش پێش شۆرشەکە دەولەتێك بو (بەبەشی خۆی رازی نەبو) هەمیشە ددیەویست لەسەر حیسابی هیتر پان وفراوان بێت ، بەلاّم ئێستا لە جاران بچوکترە کەچی (بە بەشی خۆی رازی) یە وەچاوچنۆکیە ئیستیعماریانەکەیی نەماوە بەلکو لەسەر سیاسەتێکی ئابوری جیاواز دەروات.

ئەلمانیا موستەعمدرەی دەوێت نەك لەبەر ئەوەی کە کەرەسە ، و(موادی خام) وشتی تری بابەتەی دەست ناکەوێت ، خۆ بازار لەبەردەمیدایە هدرچیەکی بىيەوێت بىکرێت ، بەلاّم ئەم موستەعمەرەی بو ئەووە دەوێت کە میللەتەکانی ئەم موستەعمەرانە ، بچەوسێنێتەوە بۆ سودی تەنیا خۆی ، دەیەوێت سکە هدرزانەکەی خۆی واتە مارکد (راگیراوە) کدی (المجمدة) بدات بە ئەوان ، ئنجا زۆریان لىبکات کە شتومەکی ئەلمانیای پىبکرن.

دەربارەی هەندێ کارەساتی سدرەکی کە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی رابوردوودا روویان دابو لەگەل ئەنجامەکانی کە لێوەی پەیدابون بوّم نوسیبویت ، بەلاّم بەراستی نازانم ئێستا لەکوێدا بوەستم ، چونکە تەماشای دەوروبەرم دەکەم لە هەمولایەکدا ئاژاوە ، وپشیوی دەبینم ، هیچ چارەیەنىيە مەگەر ئەوە نەبێت کە جیهانی ددبێت کێشە وبەرەکانی خۆی لەمەڵبەندی نێودەولەتاندا جێبەجێ بکات ، لەجیهانی ئەوەی کە لە مەڵبەندی هەرێمیەکی تەسك دابێت ، بۆیە جێبەجێ کردنی ئەم کێشەیە پێداویستیەکی زۆر پێویستە ، وە لە هەمان کاتدا ئەم کێشانە رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبن ، وەتارمایی جەنگ جیهانی گرتوتەود. ئەوروپا کە شانازی بەسەرۆکایەتی جیهانی شارستانیەوە دەکات ، وردە وردە ، دەگدرێتەوە بۆ سەرددمی سرکی ، وکیوێلەیی ، وەچینە فەرمان رەواکانی کە تیایدان

ناتوانن كێشه وبەرەكانی كە دەوریــان داوان ، چـەنــد جــێبــەجــێ كــردن وحەلێكیان بۆ بدۆزنەوە.

رێكەوتنامەكەی (میونیخ) هێزەكانی ناو جیهــانــی لاســەنــگ كــردو ، هەلگیرایەوە ، ناوچەكانی خوارووی رۆژهەلاتی ئەوروپا دەستیان كرد بە مل كەچ كردن بۆ نازیەكان ، ئەمانیش جم وجۆلیان زیادیكرد ، موئــامــەرە ، وپیلانیان لە هەمو ولاتاندا زۆربو ، دەولەتە بچوكەكانی ئەوروپا كە پێیان دەلێن تاقمی (أوسلو) كە بریتین لە (دانیمــارك ، ونــرویــج ، ســویــد ، فنلندە ، هۆلندە ، وبلجیكا ، ولوكسمبرغ) كە دیان دۆستایەتی بەریتانیــا هیچی تێدایە سەنیيە ، و بێكەلكە ، جاری بێلایەنی (الحیاد) خۆیانیــان دا ، وەنەیان ویست هاوبەش بن لە هیچ لێپرسینەوەیەكدا. دەســت درێــژی كردنی ژاپۆنیش لە رۆژهەلاتدا زیادی كرد (كانتون)ی داگیــركــرد ئــیــتــر

دەستی كرد بە زۆرانیازی لەگەل بەرژەوەندی بەریتانیا لە (هونگ كۆنــك) دا ، وەزع وباریش لە (فلسطین) دا خراپتر دەبو ، پەیوەندایەتی نــێــوان ئینگلتەرە ، وئەمەریكا زۆر ساردبو لەو كاتەوە كە (جمــبــرلــن) لایــەنــی دەولەتە فاشستەكانی دەگرت سەرۆك روزفلت هێــرشــی دەیــردە ســەر بــیــر وباوەری نازێتی و شێوازەكانی ، زۆرانبازیــەكــەی ئــەوروپــا ، لــەگــەل هەلویستی بەریتانیا ، و فەرەنسە بەرامبەر بەدەست دریزی فاشستــەكــان ، بەستی وبێزار یەكی لەناو ئەمەریكا بەرپاكرد ، ئیتر ئەمــەریــكــا خۆی لەكاروباری ئەوروپا نەدەگەیاند ئنجا دەستــی كــرد بــەخــۆ ئــامــادەكــردن وچەكداركردن بەشێوەیەكی فراوان ، وەیەكێتی سۆڤیتیش هەر بە هەمان شت هەلسا كە هەستی كرد سیاسەتی بەستنی پەیماننامە ، وبروانامە لــەگــەل دەولەتە رۆژئاوییەكاندا سەرنەكەوت ، چونكە ترسی ئەوەی لێنیــشــت زۆری لێبكرێت دورەپەرێز بوەستیەوە وجیابكرێتەوە ، گــەرچــی ئــەمــەریــكــا ، وروسیاش دەیان زانی دورەپەرێزی وبێلایەنی لەم جیهانە نەشلەقاوەنیە كە شەپۆلەكانی چەپۆكانیانە ، ئەگەر جەنگ بقەومێت هەردوكیان تێوەی دەكلێن بۆیە دەستیان كرد بە خۆ ئامادەكردن.

**ئەمەریكا:**

سیاسەتە ناوخۆكەی كە سەرۆك روزفــلــت دای نــابــو ، لــەنــاو ولاتــە

یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا توشی هەندرێك کوسپ هات کە دادگای بەرز ، (المحكمة العليا) وکەسانی سەربەکۆنەپەرستی هێنا بۆیانەریێ ، هەڵبژاردنەکانی ، ئەم دواییە دەریخست کە ناحەزانی لە جمهوری خوازەکان لەناو کۆنگرس دا لەزیادبوندان ، لەگەڵ ئەمەشدا خۆشەویستی روزفلت لەلایەن میللەتەوە بەهێزە ، وەکار کردنی لە میللەت هێشتا هەر گەورەیە ، روزفلت لەسەر سیاسەتی پەرەپێدانی پەیوەندایەتی بەدڵ وبەگیان لەگەل دەولەتەکانی ئەمەریکای خوارووودا دەرۆیشت ، لەمەکسیکدا ناخۆشی کەوتە نێوان حوکومەت ، وخاوەن بەرژەوەندیەکانی نەوت لەئەمەریکایی ، وئینگلیز ، کۆدەتا ، وئینقیلابێکی گەورەی تێداروویدا ، بەمە میللەت توانی مافی موڵکایەتی زەوی ، وزار بۆ خۆی بپچرێت ، وبیچەسپێنی ، کەنیسە وخاوەن بەرژەوەندیە نەوتینەکان گەلێك لە جیاوازی ، ومافەکانیان لەکیس چو ، لەبەر ئەمە ئەمانە هەڵوێستێکی دژیان بەرامبەر بە هەمو کردارێکی چاکخوازی وئیصلاحێك هەیە.

تورکیا :

لەم جیهانە پر لە زۆرانبازیەدا ، وادەردەکەوێت کە تورکیا تاکە دەولەتێکە کە هیچ دوژمنی نییە ، ناکۆکی یە کۆنەکەی خۆیی لەگەل یۆنان ودەولەتەکانی بالقان دا جێبەجێ کرد ، وەپەیوەندایەتی خۆی لەگەڵ ئینگلتەرە ، ویەکێتی سۆڤیتدا چاك کرد بەڵام لەگەڵ فەرەنسەدا لەسەر لیۆاری ئەسکەندەرۆنە کە لەپێشدا باسیم بۆ کردیت ناکۆك بو ، کە یەکێکە لە پێنج دەولەتە بچوکەکەی کە فەرەنسە لەسوریە ، بەش بەشیکرد لیۆای ئەسکەندەرۆنە زۆربەی عەرەبن ، فەرەنسییەکان بە بیروورای تورکیا قایل بون ، لەوێدا دەولەتێکی بچکۆلەی جیاوازیان دوروست کرد.

بەم جۆرە ددبینین تورکیا بەسەرکردایەتی یەزیرەکەی (کەمال ئەتاتورك) توانی خۆی لەکێشەکانی دەرەوە رزگارکات. وهەمو تێکۆشانی نەرخان کات بۆ چاك کردن ، و ئیصلاحاتی ناوەوە ، ئەتاتورك خزمەتی وڵاتەکەیی بە دڵسوزانەکرد لە ١٠ نوفەمبەری ١٩٣٨تدا مرد ، دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت کە تێکۆشانەکانی هاتۆتە بەر وسەرکەوتوە ، دوای خۆی جەنراڵ (عصمت اینونو)ی هاوڕێی کۆنی هاتە جێگەکەی ،

## ئیسلام:

کەمال ئەتاتوریك ئەو توانایەی کە لە ئیسلامدا هەیە بەرەو ئاراستێکی نوێی برد جل وبەرگی نوێی کردە بەر میللەت ، توزی سەدەکانی ناوەراستی لێتەکاندن ، ولاتەکەی بە دیمەنی ئەم سەردەمە وە دەرخست ، ئەتاتورك زۆر کاریکردە ولاتە ئیسلامیەکانی رۆژ هەلاتی ناوەراست ، گەلێك دەولەتی نوێ پەیدابون ، ئەم کارە لە ولاتەکانیتری وەکو هیندستان بەئاشکرا دەرنەکەوت چونکە دانیشتوە موسولمانەکانی لەگەل هیتردا لە ژێر کۆتی ئیستیعمار دان.

## زۆرانبازی لەم جیهانەدا:

ئەوروپا ، وەدەریای باسفیکی بەجوت مەلبەندێکی زۆرانبازی پێك دێنن لەم جیهانەدا ، ئنجا لە هەریەکی لەم دوو مەلبەندەدا فاشستیەتێکی تاوانبار هەیە کە دەیەوێت دیموکراتیەت ، وئازادی بفەوتێنێت ، هەروەها دەیەوێت جیهان داگیرکات ، بەم پێیە جۆرێك لە فاشستێتی نێو دەولەتان پێگەیشت و پەردەیسەند ، کە بەئاشکرا جەنگ هەلئاگیرسێنێت ، بەلکو هەمیشە لەناو ولاتانیتردا دەسیسە وپیلان دەکرێت ، پشێوی دەنێتەوە ، چاودروانی هەلە ئادەست یخانە ناو کاروبارەوە ، وەشان بەشانی ئەمە بەپیر جەنگەوە دەچێت ، بەپیرۆزی دەزانێت ، وزۆردەملی دەکات ، وەپروپا غەنددیەکی(١) درو دەلەسەی پێوێنە ، وبەوریکی فراوان بلاو دەکاتەوە ـ فاشستێتی لەژێر پەردەی دوژمنایەتی کردنی شیوعیتیدا ـ هەول دەدات ئەو ولاتانە داگیرکات کە دەرەقەتی نایەن ، بەلام شیوعیتی نێودەولەتان هەرگیز لێی دەرنەکەوتوە کە حەز تاوان ودەست درێژی دەکات بەلکو بەپێچەوانەوە چەند سالێکە هەمیشە لایەنی ئاشتی جیهانی ، دیموکراتیەت دەکرێت. لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا موئامەرە وپیلانێکی نازیتی دۆزرایەوە ، وموحاکەمەکرا. لە سالی ١٩٣٧تدا لەفەرەنسەدش دا پیلان

---

(١) یەکێك لە دروشمە بەناوبانگەکانی نازیەکان ئەوەیە: "درۆبکە، درۆبکە تاهەمو کەسێك بروات پێدەکات.."

وەرگێڕی کوردی

وموئامەردەیەکی دژ بە جمهوریەت دۆزرایەوە کە (کاجولاردس) رێکی خستبو بەبارمەتی ئەو جەگانەی کە لە ئەلمانیا وئیتالیای وەرگرتبو ، پیلان گێرەکان ، بەگەلێك کوشتن بەدەسیسە ، وفرێ دانی یۆ مبا هەستان. لەئینگلتەرەشدا رێکخراوێکی فاشستیانە دروست بو(٢) کە دەسەلاتێکی گەورە وفراوانیان هەیە لە هەڵسوراندنی سیاسەتی دەرەوەی ئینگلتەرەدا.

فاشستێتی نێودەولەتان هەر ئستیعمارنیی‌یە لە ناشیرین دیمەتیدا بەرووتی بەڵکو گەلێك لەم زیاترە لەهاندانی ناکۆکیەکانی ئاینی ، وتایەفەگەریدا ، هەروەکو چۆن لە سەدەکانی ناوەراستدا روویان دەدا. لە ئەلمانیادا کەنیسەی کاثو لیك وپروتستانتەکان کپ کرانەوە

لە ئەلمانیا وئیتالیادا بیروبارەری رەگەز پەروەری بەپیرۆز دادەنرا ، لەئەنجامی ئەم رەگەز پەروەریەدا جولەکەکان بە جۆرێکی وادرندانە فەوتێنران کە لەشی بێکرژ دەبێت لەسەرەتای نۆفەمبەری ١٩٣٨ تدا جولەکەیەکی بۆلندەیی کە چاوی بەجەزرەبەو ئەشکنجی رۆلەکانی میللەتەکەی خۆی کەوت ، تێك چو ، هات کابرایەکی دیبلوماسی ئەلمانی کوشت لەباریس دا ئەم ئیشە ئیشی تاکە سێك بو ، بەڵام دوای ئەمەیە چەند مانگێك حوکومەتی ئەلمانیا یەکسەر دەستی کرد بە هێرشکی تۆقاندن بە جۆرێکی رەسمی ورێك وپێك لەئەلمانیادا دژی جولەکەکان. هەمو پەرستگەکانیان سوتاندن ، بازرگانێکە ودوکانەکانیان تێك شکاندن ، وتالانیان کرد ، پەلاماری ئافرەت ، وپیاویان دەدان لەشەقامەکان ، ومالەکانیاندا ، هەر بەمە وازیان نەهێنا جەزایەکی (٨٠) ملیون جونەیهیان خستە سەر هەمو جولەکەکانی ناو ئەلمانیا.

کارەساتی خۆکوشتن زیادیکرد ، خەلکی پۆل پۆل وتاك تاك هەلدە هاتن دلیان پربو لە غەم زکیتە ، بەرێزێك دەرویشتن دوایی نەدەهات ـ بەلام بۆ کوێ؟ جیهان ئەمرۆ پربوە لەپەنابەر ، وئاوارەبوەکان: جولەکەی دیموکرانی سوشیالیستی ئەلمان لە (سودیت)ەوە ، فەلاحەکانی ئەسپانیا لەناوچەکانەوە کە فرانکو داگیریکردود ، خەلکی (چین)و حەبەشەیی. ئەم ئاوارە ،

---

٢) وەکو تاقمەکەی (موزلی) لە بەریتانیادا.

وەرگێری کوردی

وپەنابەراتە بەرهەمی تالّی نازێتی ، وفاشستێتی‌یە ، ئەمرۆ جیهان پڕە لەترس ، ولەرز ، گەلێك ڕێكخراو دروست بوە بو سەرپەرشتی كردنی پەنابەرە كان ، لەگەل ئەم هەموەشدا ئەو سیاسەتەی كە ئینگلتەرە ، وفەرەنسە لەسەری ددرۆیشتن لایەنی ئەلمانیای نازی ، وئیتالیای فاشستی دەگرت ، بەم جۆرە ئینگلتەرە ، وفەرەنسد هانی تۆقاندنی فاشستیانەو ، روخاندنی شارستانێتی ، ودەربە دەركردنی بە صەد هەزاران كەسیان دەدا لە مالەكاتیان تاكو ببنە پەنابەری بێلاند. ئەگەر ئەمە بیروباوەری دەولەتە فاشستیەكان بێت "ئیتر هیچ هاوپەیمانی‌یەك لەگەل ئەلمانیادا دەبێت!" هەروەكو غاندی وتویەتی: "ئەگینە چۆن هاوپەیمانی دەگونجێت لە تێوان دەولەتێك دا كە خۆی تەرخان كردبێت بۆ پشتیوان كردنی داد (العدل) ودیموكراتیەت ، ولەگەل دەولەتێكدا كە بەئاشكرا دوژمنی ئەم دووانە بێت!؟ وەیان ئینگلتەرد دا كەوا ئێستا بەلای دیكتاتوریەتی سوپایی‌دا دەچێت ئەو دیكتاتوریەتەی كە هەمو ستەم وخراپەیەكی پێوەیە؟".

ئەگەر ئینگلتەرە ، وفەرەنسە هەردووكیان بەهانە بۆ دەولەتە فاشستیەكان بیتەوە وەلەسەریان یكەنەوە ، ئیتر بۆیە شتێكی سەیرنی‌یە كە دەوڵەتە بچوكەكان لەناوەراست ، و خوارووی رۆژهەلاتی ئەوروپادا كەم ببنەوە ، وبچنە باوەشی نازیەكانەوە ، وە ئەم دەولەتانەش بەزوویی بێن بە فاشستی ودوای ئەلمانیا یكەون ، بەلام ئیتالیا بو بە هاوكارێكی بچوك دوای ئەوەی ئەلمانیا لەچاوە ، وراوی سیاسیدا ئیتالیای بەزاند ، هەر یەكە لە ئەلمانیا وئیتالیا داوای فراوان یوتێكی ئیستیعماریانە دەكات بۆ خۆی ، ئاواتی راستە قینەی ئەلمانیا فراوان بونە بەرەو رۆژهەلات ، بەرەو (ئوكرانیا ، ویەكێتی سۆڤیت) بێگومان ئینگلتەرە ، وفەرەنسە لە هێنانە دی ئەم ئاواتەیدا هانی دەدەن بەهیوای ئەوەی كە بەلای موستەعمدرەكانی خۆیاندا نەچێت.

ئەمرۆ لەجیهاندا دوو دەوڵەتی گەورە هەیە كە یەكێتی سۆڤیت ، وولا تەیەككگرتوە كانی ئەمەریكایە ، كە لە هەمو دەولەتەكانی جیهانی بە هێزترن ، وە هەریەكەیان لەناو سنورەكەی خۆیدا خۆی بەخێو دەكات ، وەهەریەكەیان ئەوەندە بە هێزە كە ناشكێت و ، نابەزێت ، وەهەردووكیشیان بەرهەلستی فاشستێتی ، ونازێتی دەكەن ، بەلام هۆكانیان

لم بارەیەوە جیاوازە ، یەکێتی سۆڤیت لە ئەوروپادا تاکە شوردیەکی قایمە بەرامبەر بە فاشستێتی ، خۆ ئەگەر ببەزێت و بشکێت مانای کۆتایی دیموکراتیدتە لە ئەوروپادا بە ئینگلتەرە ، وفەرەنسەشەوە ، بەلام ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا زۆردورن لەئەوروپاوە ، بۆیە بە ئارەزووی خۆی ناتوانێت دەست بخاتە کاروباری ئەوروپاوە ، خۆ ئەگەر ئەم دەست خستنە ناو کاروبارەوە روویدات ج لەئەوروپا وەیا دەریای باسفیکیدا ، ئەمەریکا ئەوسا دەتوانێت هێزی مەزنی خۆی دەرخات.

دەولەتە دیموکراتیە تازە پێگەیشتوەکان ، ودکو هیندستان ، ورۆژهەلات لایەنی ئازادی دەگرت. هەندێ لە ولاتەکانی سەربەمیللەنانی بەریتانیا (کومنویلث) لەم رووەوە لە بەریتانیا زیاتر دەستێکی بالایان هەیە. بەراستی دیمکراتیەت ، وئازادی لەم رۆژانە دا بەرامبەر گەلێک مەترسی مەزن راوەستاوە ، ئەم مەترسیانەش لەزیاد بوندان ، چونکە ئەوانەی کە دڵسوزیش بۆ دیموکراتی ، وئازادی لەپشتەوە تێیدەسرەوێنن ، ئەسپانیا و(چین) بون بەنمونەیەکی بەرز ودەرکەتو لەحەز لێکردنی دیموکراتیەتدا ، لەناومەیدنی ، وکوێرەوەری جەنگدا ، لەناو ئەو دوو ، ولاتەدا میللەتێکی تازە پەیدابو ، ئیتر رامیەرین ، و پێشکەوتنی ولاتەکە لە هەمو مەیدانەکاندا گرتویاندتە ئەستۆی خۆیان.

حەبەشە لە ساڵی ١٩٣٥دا ، داگیرکرا ، لە ساڵی ١٩٣٦دا پەلاماری ئەسپانیا درا ، سەر لەنوێ لە ساڵی ١٩٣٧تدا هێرش برایە وە سەر (چین) ساڵی ١٩٣٨تدا نەمسا داگیر کرا ، لەنەخشەی ئەوروپا سررایەوە ، جیکوسلوفاکیا پارچە پارچەبو ، چاوچنۆکەیان تالاتیان کرد ، هەمو ساڵێک مەینەتییەکی نوێی لەگەلدایە ، ئایا ساڵی ١٩٣٩ کە بەرەو پیری دەچین چیدەقەومێت ، وەچی بۆ ئێمە ، ویۆ جیهان دێنێت.

تەواو

# ناوەرۆك

**سەرپەرشتی چاپ و دەرهێنانی هونەری عومەر ئیبراهیم عەزیز**

**رقم الايداع في دار الكتب والوثائق ببغداد ٧٠٧ لسنة ١٩٩٠**

# لمحات من تاريخ العالم

جەواهێر لال نەهرۆ لە ١٤ تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٩ ز.دا لەشاری (الله آباد) لەهیندستان لەدایك بووە

مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ ز.دا یەکەم جاربە «غاندی» گەیشتووە.

خۆی و ژنەکەی بەهۆی بزوتنەوەی نەتەوایەتی و ئازادیخوازانەیانەوە بەدەیان جار گیراون و بەردراون.

چەند جارێك هەڵبژێراوە بەسەرۆکی (پارتی کۆنگرەی نیشتمانی هیندی) و (بەشداری وەزارەتی کردووە).

چۆتە وەزارەتەوەو، کاروباری دەرەوەو، تەندروستی پێسپێرراوە، وە کراوە بەجێنشینی سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕێنەر.

چەند جارێکیش بوە بەسەرەك وەزیرانی هیندستان.

بەیەکێ لەپێشەوا مەزنەکانی جیهانی ئەم چەرخە دەژمێررێت.

لەبارەی مێژوو، سیاسەت و، نیشتمان پەروەریدا نووسراوی زۆری هەیە.

لەساڵی ١٩٦٤ زدا کۆچی دوایی کردووە.


* نەخشەی بەرگ : فاضل شەورۆ

* سەرپەرشتی چاپ : عمر ابراهیم عزیز

نرخی (      ) دینارە السعر (      ) دینار

١٩٩٠/٢٠٠٠